صحيح البخاري
بە کوردی
وەرگێڕاوی هەموو فەرموودە صەحیحەکانی
ئیمامی بوخارییە کە ژمارەیان (٧٥٦٣) فەرموودەیە
بەرگی یەکەم
نوسینی
أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري
وەرگێرانی
محمد ملا صالح بامۆکی
صحيح البخاري

# صحیح البخاری

## بە کوردی

### بەرگی یەکەم

پەڕاوەکانی نیگا ، ئیمان و باوەڕ ، زانست و زانیاری ، دەستنوێژ ، خۆشۆردن ، حەیز، تەیەممومم ، نوێژ ، کاتەکانی نوێژ، بانگدان

نوسینی

أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري

وەرگێڕانی

محمد ملا صالح بامۆکی

# ( صحيح البخاري ) به كوردی


بەرگی یەکەم

نووسینی..أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاری

وەرگێڕانی.. محمد ملا صالح بامۆکی

چاپی یەکەم ٢٠٢٣

تیراژ : ١٠٠٠ دانه

دیزاین ..


لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشك

ژمارەی سپاردنی ( ١١٢٦ ) ساڵی ٢٠٢٣ ی

وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

# پێشەكی

**خوای گەورە دەفەرمووێ:** ﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

**واتە: ئەی موحەممەد ﷺ قورئانمان بۆ تۆ ناردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بكەیتەوە بۆ خەڵكی ئەوەی بۆیان نێردراوە.**

**وە دەفەرمووێ:** ﴿ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ﴿٧﴾ ﴾ الحشر.

**واتە: وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغە كرد وازی لێ بێنن.**

**وە دەفەرمووێ:** ﴿ مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ ﴾ النساء.

**واتە: هەر كەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بكات ئەوە بەڕاستی گوێڕایەڵی خوای كردووە.**

**بەردەوام سوپاسی خوای گەورە دەكەم كە یارمەتی دام بۆ وەرگێڕانی صەحیحی ئیمام بوخاری بۆ سەر زمانی كوردی، ئەو كتێبەی كە دوای قورئانی پیرۆز ڕاستترین و دروستترین كتێبە بەلای زانایانی فەرموودەناسی ئیسلامەوە، تا هاوزمانانی كوردی موسوڵمانم كە زمانی عەرەبی نازانن لەم سەرچاوە گرنگ و گەورەی فەرموودە تێ بگەن و شارەزای ببن.**

## بەڕێزان ئەوەی هاندەرم بوو صەحیحی بوخاری وەرگێڕم بۆ زمانی کوردی لەم چەند خاڵە دەیخەمە ڕوو:

١- فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ پاش قورئان سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی ئیسلامن، وە ئەم کتێبەش گرنگترین سەرچاوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ.
٢- زۆربەی خەڵکی کورد زمانی عەرەبی بەچاکی نازانن، ئەوەش هۆکارە بۆ تێنەگەیشتن لە قورئان و لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بەجوانی، بەڵام بە وەرگێڕانیان بۆ زمانی کوردی لێیان تێ دەگەن.
٣- ئاسانکارییە بۆ وتارخوێن و بانگخواز و نووسەران کە لە بابەتەکانیاندا فەرموودەی تیایە، بەئاسانترین ڕێگا مانای فەرموودەکانیان لەبەردەستدا بێت و سوود لە وەرگێڕدراوەکە ببینن بۆ بابەتەکانیان.

## خوێنەرانی بەڕێز سەبارەت بەم وەرگێڕدراوی صەحیحی بوخارییە بە پێویستی دەزانین چەند خاڵێک بۆ ئێوەی ڕوون بکەینەوە:

١- دەقی فەرموودەکانمان کردۆتە کوردی، بەڵام زنجیرەی ئەو کەسانەی دەماودەم لە یەکدییەوە فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە کە پێی دەوترێ: ڕشتەی فەرموودەکە، یان سەنەدی فەرموودەکە وەرمانەگێڕاوە، جگە لە کەسی یەکەم کە بەزۆری یەکێکە لە هاوەڵان یا هەندێ جار کەسێکی کەیە، چونکە ئەوە تەنها ناوە بە عەرەبی بێت، یان بە کوردی هیچ جیاوازییەکی نییە.
٢- صەحیحی بوخاری جگە لە خاڵی یەکەمی دەقاودەق وەك خۆی وەرمانگێڕاوە بۆ زمانی کوردی.

٣- ئەو فەرموودانەی دووبارە یان چەندبارە بوونەتەوە وەك خۆی هێناومانە، وە هیچ فەرموودەیەكمان لانەبردووە، بۆ ئەوەی ئەم صەحیحی بوخارییە وەرگێڕدراوەكەی وەكوو دەقە عەرەبییەكەی بێت.

٤- ئەو وشە و ڕستانەی خراونەتە نێوان ئەم جۆرە كەوانەیەوە: ( ) ئەوە لە دەقی فەرموودەكەدا نییە، خۆمان زیادمان كردووە كە مانای فەرموودەكە پێویستی پێیەتی و بەوە تەواو ڕێك دەبێت، وە بە هەمان شێوە ئەم كەوانەیە بەكار هاتووە بۆ نووسینی هەندێ وشە و ناوی عەرەبی كە لەنێو كوردییەكەدا نووسراون.

٥- هەندێ جار لە پەراوێزەكەدا ڕوونكردنەوەمان لەسەر وشە و بابەت و ڕشتە و هەر شتێك پێویست بێت داوە و نووسیوە.

٦- پێش دەستپێكردن بە وەرگێڕانی صەحیحی بوخاری، بەكورتی ژیاننامەیەكی ئیمام بوخاریمان نووسیوە، تا خوێنەر شارەزاییەكی هەبێت لەسەر نووسەری صەحیحی بوخاری، هەروەها بەكورتیش باسی كتێبی صەحیحی بوخاریمان كردووە بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەرانی بەڕێزی ئەم كتێبە.

٧- بەشێكی زۆر لە فەرموودەكانی صەحیحی ئیمام بوخاری دووبارە بۆتەوە، بۆیە ژمارەی فەرموودە دووبارەكانمان لە پەراوێزدا نووسیوە، بۆ نموونە فەرموودەی ژمارە (٤٦) لە پەراوێزدا نووسیومانە: ٣٩٣٩، ٤٤٢٤، ٧٢٦٤، واتە هەمان فەرموودەی ژمارە (٤٦) لەو ژمارانەدا دووبارە بۆتەوە.

سلێمانی/ گەڕەكی كازیوە

ڕۆژی شەممە: ٢٠١٩/١١/١٦ زایینی - ١٨/ ربیع الثاني/١٤٤١ كۆچی

كاتژمێر: ٧:٢٠ سەرلەبەیانی

# ئیمام بوخاری رحمه الله

## ١- ناو و ڕەچەڵەکی:

**ئیمام بوخاری پلەی** (أمير المؤمنين في الحديث)**ی هەیە و پێی بەخشراوە لەنێو زانایانی فەرموودەدا، نازناوی ئەبو عەبدوڵایە، ناوی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبڕاهیمی کوڕی موغیرەی کوڕی بەردیزبەی[١] کوڕی ئەحنەفی کوڕی جوعفی بوخارییە[٢].**

**وە بەردیزبە: لەسەر ئایینی ئاگرپەرستی بوو، بەڵام موغیرەی کوڕی بەردیزبە لە سەردەمی یەمانی جوعفیدا کە -والی بوخارا بووە- موسوڵمان بووە، باپیرەشی کە ئیبڕاهیمی کوڕی موغیرەیە، ئیبنو حەجەر دەڵێ: هیچ شتێك لەبارەیەوە نازانین و نەماندیوە.**

**بەڵام باوکی ئیمام بوخاری کە ئیسماعیلە زانایەکی بەڕێز و گەورە بووە، فەرموودەی لە حەممادی کوڕی زەید و ئیمام مالیك بیستووە، وە زانایانی عێراق فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، وە باوکی سەرەڕای زانابوونی خواناس و لەخواترس بوو، لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: پێ نازانم نە یەك درهەمی حەرام، نە یەك درهەم گومان لە حەڵاڵی هەبێت لە ماڵ و سامانمدا هەبێت.**

---

[١] بەردیزبە: بە زمانی خەڵکی بوخارا: واتە: جوتیار.

[٢] بوخارا شارێکی گەورەیە یەکەم جار لەسەر دەستی عوبەیدوڵای کوڕی زیاد ئازاد کراوە، لە سەردەمی خیلافەتی موعاویەدا ﷺ، وە کۆتا جار لەسەر دەستی قوتەیبەی کوڕی موسلیمدا بەتەواوی ئازاد کرا، ئێستا دەکەوێتە وڵاتی ئۆزبەکستانەوە. معجم البلدان: ١/٢٥٠-٢٥١، وموسوعة المورد: لمنير بعلبكي: ١٣٢/٢.

## ٢- لەدایكبوونی و پێگەشتنی:

ئیمام بوخاری ڕۆژی هەینی لەپاش نوێژی هەینی لە (١٣)ی مانگی شەوالی ساڵی (١٩٤)ی كۆچی لە بوخارا لەدایك بووە، هەر منداڵ بووە باوكی مردووە، بۆیە دایكی ئەركی بەخێوكردنی گرتۆتە ئەستۆ، لەبەر ئەوەی باوكی ئیمام بوخاری سامانێكی زۆری بۆ بەجێ هێشتبوون، دایكی توانی بەجوانی بەخێوی بكات و پەروەردەیەكی چاكی بكات، لە منداڵیدا چاوەكانی كوێر دەبێت، ئینجا دایكی لە خوا دەپاڕێتەوە لە خەودا ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ دەبینێ پێی دەفەرمووێ: بێگومان خوا چاوەكانی كوڕەكەتی چاك كردەوە بەهۆی دوعای زۆری تۆوە بۆی، كە لە خەو هەڵدەسێ، دەبینێ چاوەكانی ئیمام بوخاری چاك بۆتەوە.

## ٣- ئەو سەردەمەی ئیمام بوخاری تیایدا ژیاوە:

أ- بارودۆخی سیاسی:

ئەو ڕۆژگارەی ئیمام بوخاری تیایدا ژیاوە سەردەمی عەباسییەكان بووە، ئیمام بوخاری لە ژیانیدا دە خەلیفەی عەباسی هاوچەرخی بوون كە ئەمانەن: ئەمین و مەئمون و موعتەصیم كە هەرسێكیان كوڕی هاروونەڕەشید بوون، واسیق و موتەوەكیل كە كوڕی موعتەصیم بوون، مونتەصیر كوڕی موتەوەكیل بووە، موستەعین كوڕی موعتەصیم بووە، موعتەز كوڕی موتەوەكیل بووە، مەهدی كوڕی واسیق بووە، موعتەمید كوڕی موتەوەكیل بووە. سەردەمی عەباسییەكان بە دوو قۆناغ (سەردەم)دا تێ پەڕیوە، یەكەمیان حوكمیان بەهێز و دامەزراو بووە، دووهەمیان لاوازی و ئاڵۆزی هەبووە لە وڵاتدا، چەندین جار خەڵك لە خەلیفەكان هەڵگەڕاونەتەوە، بگرە هەندێ جار دەوڵەتی سەربەخۆ دروست بووە، وە لەو دەوڵەتانەی كە لەو سەردەمەدا دروست بوون: دەوڵەتی (الطاهرية)

لە نێوان (٢٠٥ - ٢٥٩) كۆچی لە خوراسان دروست بووە، تاهیری كوڕی حوسەین دروستی كرد و نەیسابوری كرد بە پایتەختی دەوڵەتەكەی، ئیمام بوخاری لە سایەی ئەو دەوڵەتەدا ژیاوە.

ب- زانست لەو سەردەمەدا:

سەدەی سێیەمی كۆچی بوژانەوەیەكی زانستی گەورەی بەخۆوە بینی لە هەموو ڕوویەكەوە، كە درێژەدان بوو بەو بەرەوپێشچوونە زانستییەی كە لە دوو سەدەی پێشووتردا دروست بووبوو، بەڵام لە سەدەی سێیەمدا زیاتر ڕووی لە پسپۆڕی جۆراوجۆر كرد بەتایبەتی زانستی قورئان و سوننەت، زۆر زانای گەورە هەڵكەوتن لە هەموو بوارەكاندا، لە سوننەت و فەرمووودەناسیشدا باشترین سەردەم و بەپیتترین قۆناغ بوو، فەرمووودە بەشێوەیەكی بەربلاو نووسرایەوە، بەجۆرەها شێواز تۆمار كرا لە چەندین كتێبی بەهێز و بەپێزدا لەوانە: موسنەدی ئیمام ئەحمەد و جامیعی صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم و سوننەنی سەعیدی كوڕی مەنصور و موصەنەفی ئیبنو ئەبو شەیبە و موسنەدی حومەیدی و سونەنی داریمی و سونەنی ئەبو داود و جامیعی تیرمیزی، بەكورتی ئەو سەردەمە بەرهەمی سەردەمەكانی دیكەی تیا هاتە بەرهەم.

## ٤- زیرەكی و بلیمەتی ئیمام بوخاری لە منداڵییەوە:

ئیمام بوخاری هەر بە منداڵی كاتێ لە حوجرەی منداڵان و سەرەتای خوێندنیدا بوو زۆر زیرەك بوو، توانایەكی بێوێنەی هەبوو لە لەبەركردندا، وە لە سەرەتای حەزكردن بە خوێندن و لەبەركردنی فەرمووودەدا بوو، موحەممەدی كوڕی یوسفی فیرەبری -كە قوتابی بوخاری بووە- دەڵێ: موحەممەدی كوڕی ئەبو حاتیمی وەڕاق بۆی گێڕاینەوە وتی: بە موحەممەدی كوڕی ئیسماعیلی بوخاریم

وت: سەرەتای دەستپێكردنت بۆ وەرگرتنی فەرمووده كەی بوو؟ وتی: لەكاتێكدا من له سەرەتای خوێندندا بووم لەبەركردنی فەرمووده خرایه نێو دڵمەوه، وتم تەمەنت چەند بوو لەو كاتەدا؟ وتی: ده ساڵ یان كەمتر بووم، ڕۆژێكیان مامۆستا فەرموودەیەكی دەگێڕایەوه وتی: سوفیان له ئەبو زوبەیرەوه له ئیبراهیمەوه گێڕاویەتەوه، منیش به مامۆستام وت: ئەبو زوبەیر له ئیبراهیمەوه نەیگێڕاوەتەوه، مامۆستاش لێم توڕه بوو، پێم وت: ئەگەر دەستنووسەكەت لایه بۆم بگێڕەوه، ڕۆشته ژوورەوه و سەیری كرد و هاته دەرەوه وتی: ئەی چۆنه كوڕی بچكۆل؟ وتم: زوبەیری كوڕی عەدی له ئیبراهیمەوه گێڕاویەتەوه، جا مامۆستا قەڵەمەكەی لێ وەرگرتم و ڕاستی كردەوه و وتی: ڕاست دەكەیت، هاوڕێیەكی وتی: ئەو كاته تەمەنت چەند بوو؟ وتی: یازده ساڵ بووم، بوخاری دەڵێ: كه تەمەنم بوو به شازده ساڵ كتێبەكانی عەبدوڵای كوڕی موبارەك و وەكیعم لەبەر كرد، پاشان لەگەڵ دایكم و ئەحمەدی برام ڕۆشتین بۆ حەج، كه حەجمان كرد دایكم و ئەحمەدی برام گەڕانەوه بەڵام من مامەوه بۆ وەرگرتنی فەرمووده كه تەمەنم بوو به هەژده ساڵ دەربارەی قەزاوەت و وتەی هاوەڵان و تابیعین كتێبێكم نووسی، هەروەها لەلای گۆڕی پێغەمبەردا ﷺ كتێبی (التأريخ)م نووسی له شەوانی مانگەشەودا.

موحەممەدی كوڕی سەلامی بیكەندی -مامۆستای بوخاری بوو- دەڵێ: هەر كاتێ ئەم كوڕه بچكۆلەیه دێت بۆ لام بۆ وەرگرتنی فەرمووده دەترسم و سەرم لێ دەشێوێ و فەرموودەكانم لێ تێكەڵ دەبێت، واته: دەترسێ به ئامادەبوونی بوخاری هەڵه بكات، چونكه دەزانێ بوخاری پێی دەزانێ گەر هەڵه بكات.

## ٥- سەفەر و گەڕانی بە وڵاتاندا بۆ وەرگرتنی فەرموودە:

ئیمام بوخاری لە سەفەرکردندا پشکێکی گەورەی بەردەکەوێ، کەم شار و وڵات هەبووە بوخاری سەفەری بۆ نەکردبێت، ئیمام بوخاری دەڵێ: سەفەرم کردووە بۆ میسر و بۆ جەزیرە دوو جار، بۆ بەسرە چوار جار، شەش ساڵ لە حیجاز ماومەتەوە، لە ژمارە نایەت ئەوەندە چوومەتە کوفە و بەغداد، حاکیم کە یەکێکە لە فەرموودەناسەکانی خوڕاسان حاکیم دەڵێ: پێنج ساڵ لە نەیساپوردا ماوەتەوە فەرموودەی وتۆتەوە و گێڕاوەتەوە، وە ئیمام بوخاری دەڵێ: گەشتووم بە هەزار مامۆستای فەرموودە لە خەڵکی حیجاز و مەککە و مەدینە و واسیت و بەغداد و شام و میسر. خۆی دەڵێ: شەوی وا هەبووە بیست جار هەستاوم چراکەم داگیرساندووە شتێك هاتووە بە خەیاڵمدا نوسیوومە و چراکەم کوژاندووەتەوە، جارێکی دی شتێکم بۆ هاتووە هەستاومەتەوە.

ئیمام بوخاری هەشت جار ڕۆشتووەتە بەغداد -لەو کاتەدا بەغداد پایتەختی خیلافەتی ئیسلامی و شوێنی زانست و زانایان بوو- لە هەموو جارەکاندا چووەتە خزمەتی ئیمام ئەحمەد و ئیمام ئەحمەد هانی داوە لە بەغداد نیشتەجێ بێت و بمێنێتەوە نەك لە خوڕاسان[1].

---

[1] بڕوانە: البداية والنهاية: ٣٤/٦، وطبقات الشافعية الكبرى: ٢١٧/٢.

## ٦- توانایەكی زۆری هەبووە لە لەبەركردندا:

ئیمام بوخاری توانایەكی كەموێنەی هەبووە لە لەبەركردندا، خوای گەورە بەهۆی ئەو و هاوشێوەكانی لە زانایانی فەرموودەناس فەرموودە و سوننەتی پێغەمبەری ﷺ پاراستووە، ئیمام بوخاری دەڵێ: سەد هەزار فەرموودەی صەحیح و دوو سەد هەزار فەرموودەی غەیرە صەحیحم لەبەرە[١].

جەعفەری كوڕی موحەممەدی قەتان دەڵێ: لە موحەممەدی كوڕی ئیسماعیلم بیست دەیوت: لە هەزار مامۆستا زیاتر فەرموودەم وەرگرتووە و نووسیوەتەوە لە هەر مامۆستایەكیان دە هەزار فەرموودە زیاترم وەرگرتووە، یەك فەرموودەم لە هیچ كام لە مامۆستایەكان نەنووسیوەتەوە ڕشتە و سەنەدەكەیم لەبەر نەبێ[٢].

ئەبو ئەزهەر دەڵێ: لە سەمەرقەند چوار سەد كەس لەوانەی فەرموودەیان وەردەگرت و دەنووسییەوە كۆبوونەوە و پێیان خۆش بوو هەڵە بە موحەممەدی كوڕی ئیسماعیلی بوخاری بكەن، كۆمەڵێ فەرموودەیان هێنا و تێكەڵیان كردن و شێواندیانن بەسەر یەكدا، ڕشتەی شامییەكانیان تێكەڵ بە ڕشتەی عێراقییەكان كرد و بەپێچەوانەشەوە، هەروەها ڕشتەی مەككەییەكانیان تێكەڵ بە ڕشتەی یەمەنییەكان كرد، دەربارەیان پرسیاریان لە بوخاری كرد هەمووی بۆ ڕاست كردنەوە و نەیانتوانی یەك هەڵەی پێ بكەن و لێی بدۆزنەوە، نە لە دەقی فەرموودەكاندا، نە لە ڕشتە و سەنەدەكانیاندا[٣].

---

١ بڕوانە: الكامل لإبن عدي: ١٣١/١ وتأريخ بغداد: ٢٥/٢.

٢ بڕوانە: تأريخ بغداد: ١٠/٢، والسير: ٤٠٧/١٢، وتأريخ الإسلام: ٢٥١/١٩.

٣ بڕوانە: السير: ٤١١/١٢، وهدي الساري: ٤٨٦، وتأريخ الإسلام: ٢٥١/١٩-٢٥٢٩.

## ٧- شێوەی ڕوخسار و لەشولاری و ڕەوشت و ئاكاری و بەندایەتی و دنیابەكەمگرتنی و خۆپارێزی.

ئیمام بوخاری پیاوێكی لاواز بوو، باڵای مامنێوەند و ڕەنگی ڕوخساری بەلای گەنمیدا بووە، زۆر بەكەمی نان و خواردنی دەخوارد لەعیبادەت و دنیابەكەمگرتن و ڕەوشت و ئاكارجوانیدا بەشێكی زۆر چاكی تێدا بوو لە هەموو ئەو لایەنانەدا.

ئیمام بوخاری دەیوت: لە هەموو ساڵێكدا پێنج سەد درهەم داهاتی باخ و زەویوزارم هەیە لەپێناو زانستی فەرموودەدا خەرجی دەكەم، چونكە ئەوەی لەلای خودایە چاكتر و بەردەوامترە[1].

لە پێش نوێژی بەیانییاندا سێیەك تا نیوەی قورئانی دەخوێند، لە هەموو سێ ڕۆژێكدا لە بەرەبەیاندا خەتمێكی قورئانی دەكرد[2].

موحەممەدی كوڕی یوسفی فیرەبری دەڵێ: موحەممەدی كوڕی ئیسماعیلی بوخاری پێی وتم: هیچ فەرموودەیەكم نەنوسیووە و نەخستۆتە صەحیحەكەمەوە ئیللا لەپێشدا خۆم شۆردووە و دوو ڕكات نوێژم كردووە[3].

## ٨- مامۆستاكانی:

سەفەر و گەڕانە زۆرەكانی ئیمام بوخاری دەرفەتی گەشتن بە ژمارەیەكی زۆر لە زانایانی فەرموودەناسی بۆ ڕەخساندووە، بوخاری دەڵێ: بە خزمەتی هەزار و

---

[1] بڕوانە: تغليق التغليق: ٣٩٥/٥، وهدي الساري: ل٤٨٠.

[2] بڕوانە: تأريخ بغداد: ١٢/٢، وتهذيب الكمال: ٤٤٦/٢٤، وطبقات الشافعية: ٢٢٤/٢.

[3] بڕوانە: تأريخ بغداد: ٩/٢، وتأريخ دمشق: ٧٢/٥٢، وصفة الصفوة لابن الجوزي: ١٧٠/٤.

هەشتا كەس گەشتووم هەموویان زانا بوون بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وە حاكمی نەیساپوری دەڵێ: بوخاری بە زۆرێك لە زانایان گەشتووە كە فەرموودەی لێ وەرگرتوون لە هەر یەك لەم وڵات و شارانە: مەككە و مەدینە و شام[١] و بوخارا و مەرۆ و بەڵخ و هەرات و نەیساپور و ڕەی و بەغداد و واسیت و بەسرە و كوفە و میسر و جەزیرە، بوخاری سەفەری كردووە بۆ هەموو ئەو شار و وڵاتانە و لە هەموویاندا ماوەتەوە و بە خزمەت زاناكانی گەشتووە.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی مامۆستاكانی ئیمام بوخاری دەكاتە پێنج چین و ئاست:

١- چین و ئاستی یەكەم: ئەوانەی فەرموودەیان بۆ گێڕاوەتەوە كە لە تابیعین[٢] بیستووە: وەك موحەممەدی كوڕی عەبدوڵای ئەنصاری لە حومەیدەوە گێڕاویەتەوە وە مالیكی كوڕی ئیبڕاهیم كە لە یەزیدی كوڕی عوبەیدەوە و ئەبو نوعەیم كە لە ئەعمەشەوە گێڕاویەتەوە، مامۆستای ئەمانە هەموویان تابیعی بوون.

٢- چین و ئاستی دووەم: ئەوانەی لە سەردەمی ئەوانەی چینی یەكەمدا بوون، بەڵام فەرموودەیان لە تابیعینە باوەڕپێكراوەكان نەبیستووە. وەك ئادەمی كوڕی ئەبو ئیاس و سەعیدی كوڕی مەریەم و سەوری و ئەیوبی كوڕی سولەیمان.

٣- چین و ئاستی سێیەم: چینی مامنێوەندی مامۆستاكانیەتی: ئەوانەن بە تابیعین نەگەشتوون، بەڵكوو بە گەورەكانی شوێنكەوتەی تابیعین گەشتوون، وەك: سولەیمانی كوڕی حەرب و قوتەیبەی كوڕی سەعید و نوعەیمی كوڕی حەماد و عەلی كوڕی مەدینی و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، ئەم چینە ئیمام موسلیم فەرموودەی لێیان بیستووە.

---

[١] واتە شارەكانی شام.

[٢] ئەوانەی هاوەڵانیان بینیوە و باوەڕدار و موسوڵمان بوون.

٤- چین و ئاستی چوارەم: هاوڕێکانیەتی لە وەرگرتنی فەرموودەدا کە بە ماوەیەکی کەم پێش بوخاری فەرموودەیان بیستووە: وەك موحەممەدی کوڕی یەحیای زوهری و ئەبو حاتیمی ڕازی و عەبدی کوڕی حومەید و کۆمەڵێ لەم جۆرە کەسانە.

٥- چین و ئاستی پێنجەم: کۆمەڵێك هەبوون بە قوتابی بوخاری هەژمار دەکران لە ڕووی تەمەنەوە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا، ئیمام بوخاری بۆ سوودوەرگرتن فەرموودەی لێ گێڕاونەتەوە، وەك: عەبدوڵای کوڕی حەمادی ئامولی و عەبدوڵای کوڕی ئوبەی قازی و موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی سەڕاج و موحەممەدی کوڕی عیسای تیرمیزی، ژمارەی ئەو مامۆستایانەی کە لە صەحیحەکەیدا فەرموودەی لێ گێڕاونەتەوە (٣٢٤) مامۆستان، ئەوانەشی زۆرترین فەرموودەی لێ گێڕاونەتەوە لە صەحیحەکەیدا نزیکەی بیست مامۆستان.

## ٩- قوتابییەکانی:

قوتابییەکانی ئیمام بوخاری ئێجگار زۆر بوون و لە ژمارە نایەن، فیرەبری دەڵێ: نەوەد هەزار کەس صەحیحی بوخارییان بیستووە لە ئیمام بوخاری[1] ، لەو ژمارە و زیاتریش گێڕدراوەتەوە کە فەرموودەیان لە ئیمام بوخاری بیستبێ، لەوانە: ئیمام موسلیم و ئیمام تیرمیزی و ئیمام ئەحمەدی کوڕی شوعەیبی نەسائی و ئەبو زورعەی ڕازی و ئیمام ئیبنو خوزەیمەی نەیسابوری و ئیمام ئەبو بەکری

[1] بڕوانە: سير أعلام النبلاء: ١٢/٢٩٨.

بەزار، وە ئەوانەی جامیعی صەحیحەكەیان لێ گێڕاوەتەوە. ئەم چوار كەسە بوون:

١- موحەممەدی كوڕی یوسفی فیرەبری كە بەناوبانگترینی ئەوانەیە كە صەحیحەكەیان لێ گێڕاوەتەوە.

٢- ئیبڕاهیمی كوڕی مەعقیلی نەسەفی.

٣- حەمادی كوڕی شاكیری نەسەوی.

٤- مەنسوری كوڕی موحەممەدی بەزدەوی.

وە خەتیبی بەغدادی دەڵێ: كۆتاهەمین كەس كە صەحیحی بوخاری لە ئیمام بوخاری بیستووە لە بەغداد حوسەینی كوڕی ئیسماعیلی مەحامیلی بوو[1].

## ١٠- پلە و پێگەی لەلای زانایان:

ئیمام بوخاری لە پلەیەكی بەرزی زانستی و دینداری و ئەوەندە بەرزدا بوو مامۆستاكانی و زانا هاوچەرخەكانی و قوتابییەكانی هەموویان بەشێوەیەكی زۆر گەورە و بەسەرسامییەوە باسی ئیمام بوخارییان كردووە:

پیاوێك پرسیاری لە قوتەیبەی كوڕی سەعید كرد دەربارەی ئیمام بوخاری ئەویش وتی: سەرنجی فەرموودەی پێغەمبەرم ﷺ داوە و سەرنجی بۆچوونە ئەقڵییەكانم داوە و لەگەڵ شەرعزان و عابید و خواناسان دانیشتووم، بەڵام كەسم نەدیوە وەك موحەممەدی كوڕی ئیسماعیل بێت[2]. ئیمام ئەحمەد دەڵێ: خوڕاسان وێنەی موحەممەدی كوڕی ئیسماعیلی بەخۆوە نەبینیوە[3]، وە ئەبو

---

[1] بڕوانە: تأريخ بغداد: ٥/٢.

[2] بڕوانە: سير أعلام النبلاء: ٤٣١/١٢، تغليق التغليق: ٤٠٢/٥.

[3] بڕوانە: طبقات الحنابلة: ٢٧٧/١، وتأريخ دمشق: ٦٨/٥٢.

بەکری کوڕی خوزەیمە دەڵێ: لە ژێر ئاسماندا لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل زاناتر نییە بە فەرموودە[1]. حاکیم دەڵێ: ئیمام موسلیم ڕۆشت بۆ لای بوخاری و نێوچاوانی ماچ کرد و وتی: لێم گەڕێ با هەردوو پێیەکانت ماچ بکەم ئەی مامۆستای مامۆستایان و گەورەی فەرموودەناسان و دکتۆری فەرمووده و نەخۆشییەکانی[2]، ئیمام نەوەوی دەڵێ: بەسە بۆ گەورەیی بوخاری کە زۆربەی ئەوانەی وەسف و ستاییشی دەکەن و پیایا هەڵئەدەن مامۆستا و زانا بەناوبانگەکانی خودی بوخارین[3]. سەخاوی دەڵێ: هەر کەس سەیری هەڵبژاردنە فیقهییەکان بکات لە جامیعەکەیدا دەزانێ کە بوخاری موجتەهیدێکی سەرکەوتووی زانا بووە[4].

ئیبنو حەجەریش کە -ڕاڤەی صەحیحی بوخاری کردووە- دەڵێ: ئەگەر دەرگای وەسف و ستاییش بکرێتەوە بۆ پیاهەڵدانی بوخاری لە لایەن ئەوانەی لەدوای بوخاری هاتوون کاغەز تەواو دەبێت و ژیانی کۆتایی دێت، چونکە ئەو دەریایەکە کەناری نییە[5].

---

[1] بڕوانە: معرفة علوم الحدیث للحاکم: ل ١١٣-١١٤، وتأریخ بغداد: ١٠٢/١٣.

[2] بڕوانە: عمدة القاري، والسامع: ل ٥٩.

[3] بڕوانە: تهذیب الأسماء واللغات: ٧١/١.

[4] بڕوانە: عمدة القاري والسامع: ل ٥٩.

[5] بڕوانە: هدى الساري: ل ٤٨٥.

## ١١-کتێب و نووسراوەکانی:

**ئیمام بوخاری لە زۆر زانست و بابەتدا کتێب و نووسراوی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە بابەتی فەرموودە و زانستەکانی دەرناچن، هەندێکی دەربارەی فەرموودەیە و هەندێکی دەربارەی ئەو کەسانەیە کە فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە، هەندێکی لە عیللەت و نەخۆشییەکانی فەرموودەدایە و بەشێکی لە تەفسیردایە و هەشیانە لە بیروباوەڕدایە، ژمارەی کتێبەکانی بیست و سێ کتێبە لەم بوارانەدا:**

١- **لە فەرموودەدا، وەك:** (الجامع الصحيح) و (الأدب المفرد) و (بر الوالدين) و (رفع اليدين في الصلاة) و (القراءة خلف الإمام).

٢- **لە مێژووی ئەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، وەك:** (التأريخ الكبير) و (التأريخ الأوسط) و (الكنى) و (أسماء الصحابة).

٣- **لە تەفسیردا، وەك:** (التفسير الكبير) **کە فێرەبری فوتابی و موحەممەدی کوڕی ئەبو حاتیم باسیان کردووە کە دەڵێن فێرەبری نووسیویەتی.**

٤- **لە بیروباوەڕدا یەك کتێبی نووسیووە بە ناوی:** (خلق أفعال العباد والرد على الجهمية وأصحاب التعطيل) **کە باسێکی گرنگی بیروباوەڕی تیا ڕوون کردۆتەوە.**

## ١٢- دوا ساتەکانی ژیانی و کاتی مردنی:

**لەگەڵ کاربەدەستی شاری بوخارا خالیدی کوڕی ئەحمەدی زوهلی هەندێ کێشە دروست دەبێت لە نێوانیاندا، لەسەر ئەوەی خالید داوا لە ئیمام بوخاری دەکات کە کتێبی صەحیحەکەی و مێژووەکەی لەگەڵ خۆی ببات بۆ لای خالید تا لە ئیمام بوخاری ببیستێ، ئیمام بوخاری دەڵێ: من عیلم زەلیل ناکەم نایبەمە بەردەرگای کەس، ئەگەر تۆ پێویستت پێیەتی وەرە لە مزگەوتەکەم ئامادە بە**

یان له ماڵی خۆم، ئەگەر هیچیانت بەدڵ نییه تۆ دەسەڵاتداری ڕێگەم مەده فەرمووده بەسەر خەڵكیدا بخوێنمەوه تا من لەلای خوا بەهانەم هەبێت كه من زانستم نەشاردۆتەوه. ئیدی خالیدیش خەڵكی لێ هان دەدات و ئیمام بوخاریش دەڕوات بۆ سەمەرقەند بۆ گوندێك بە ناوی خەرتەنك كه دوو فەرسەخ له سەمەرقەندەوه دووره، كه هەندێ خزمی هەبووه لەوێ، ئینجا چەند ڕۆژێك لەوێ دەمێنێتەوه و نەخۆش دەكەوێ به نەخۆشییەكی زۆر قورس و گران، مانگێكی پێ ناچێ و له شەوی شەممەی جەژنی ڕەمەزانی ساڵی (٢٥٦)ی كۆچی له تەمەنی شەست و دوو ساڵیدا تەنیا سیازده ڕۆژی كەم بوو وەفات دەكات، وه هەر له گوندی خەرتەنك دەنێژرێ، پاش نوێژی جەژنی ڕەمەزان[1].

دوای وەفاتی هەر ئەو شەوه یەك له هاوەڵانی بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دەگات و دەبینێ چاوەڕێی كەسێك دەكات، دوای ئەوەی لێی دەپرسێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: چاوەڕێی موحەممەدی كوڕی ئیسماعیل دەكەم.

***

---

[1] بڕوانە: تأريخ بغداد: ٣٤/٢، وتهذيب الكمال: ٤٦٧/٢٤، والسير: ٤٦٧/١٢.

## ناوی تەواوی صەحیحی ئیمام بوخاری

(الجامع المسند الصحيح المختصر من أُمور رسول الله ﷺ وسننه وأيامه)[1] **کە لەنێو موسوڵماناندا بە** (الجامع الصحيح) **یان** (صحيح البخاري) **ناسراوە، بەڵام ئیبنو حەجەر دەڵێ: ناوی:** (الجامع الصحيح المسند من حديث رسول الله ﷺ وسننه وأيامه)[2].

## ١- چ شتێک هۆکار بوو ئیمام بوخاری صەحیحەکەی بنووسێت؟

**پێش ئیمام بوخاری فەرموودەناسان فەرموودەی صەحیحیان بەجیا نەدەنووسی، بەڵکوو فەرموودەی صەحیح و حەسەن و لاوازیان پێکەوە دەنووسییەوە و جیاکردنەوەیان جێ دەهێشت بۆ خوێنەر کە خۆی بە هەڵسەنگاندنی ڕاوییەکان دەزانێ صەحیحە یان حەسەنە یان لاوازە، تا بوخاری هات صەحیحەکەی نووسی، ئەوەی وای لێ کرد بینووسێ ئەم باسەیە کە بوخاری دەڵێ: ئێمە لەلای ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی بووین وتی: خۆزگە کتێبێکی کورتتان کۆ دەکردەوە لە فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش ئەو وتەیەی ئەو چووە نێو دڵمەوە، بۆیە دەستم کرد بە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی کتێبی** (الجامع الصحيح)[3].

---

[1] بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح في علوم الحديث: ل ٢٤-٢٥، ورجال صحيح البخاري: ٢٤/١، وفهرست ما رواه ابن عطية: ل ٤٥، وتهذيب الأسماء واللغات: ٧٣/١.

[2] بڕوانە: الهدي الساري: ل ٦.

[3] بڕوانە: أعلام المحدثين، والهدي الساري: ل ٩٢٨.

## ٢- چۆن فەرموودەكانی كۆ دەكردەوە؟

ئیمام بوخاری لە كۆكردنەوەی فەرموودەكانی صەحیحەكەیدا زۆر وردەكاری و لێكۆڵینەوەی بەكار هێناوە، بۆ نووسینی هەر فەرموودەیەك لە كتێبەكەیدا بۆ ئەو مەبەستە ئەوپەڕی هەوڵی داوە تا ئەو كتێبەی دەینووسێ جێگەی متمانە و بڕوای موسوڵمانان بێت. بەڵگە لەسەر ئەمەی وتمان ئەمانەی خوارەوەیە:

بوخاری دەڵێ: فەرموودەكانی ئەم كتێبی (الجامع)ەم لەنێو شەش سەد هەزار فەرموودەدا هەڵبژاردووە لە ماوەی شازدە ساڵدا و كردوومەتە بەڵگە بۆ خۆم لە نێوان خۆم و خوادا[١]، وە دەڵێ: لەم كتێبەمدا تەنها فەرموودەی صەحیحم هێناوە و دامناوە، زۆرم واز لێ هێناوە بۆ ئەوەی كتێبەكە گەورە نەبێت و درێژ نەبێتەوە.

وە بوخاری دەڵێ: سەرەتای نووسینی كتێبی (الجامع)م لە مزگەوتی حەرام دەست پێ كرد، وە هیچ فەرموودەكم تیا نەنووسیوە هەتا ئیستیخارەم بۆ كردووە و دوو ڕكات نوێژم بۆ كردووە و دڵنیا بوومەتەوە كە صەحیحە ئینجا نووسیومە[٢].

## ٣- گەورەیی و تایبەتمەندییەكانی (الجامع الصحیح):

١- زانایانی ئیسلام[٣] یەكدەنگن هەرچی فەرموودەی صەحیحی بوخارییە ڕاست و دروست و صەحیحە وە هەموویان قبووڵە و كاری پێ دەكەن كە ئەم كۆدەنگییە بۆ هیچ كتێبێكی دیكە نەبووە.

---

[١] بڕوانە: هدي الساري: ل ٥١٣.

[٢] بڕوانە: هدي الساري: ل ٥١٣.

[٣] كەمێكیان نەبێت كە لەچاو ئەو ڕێژە زۆرەی زانایانەوە زۆر زۆر كەمن.

٢- بوخاری بۆ دانان و هەڵبژاردنی فەرموودەکانی صەحیحەکەی بەرزترین پلەی پشکنین و وردەکاری لەبەرکردنی ڕاوییەکان و متمانەپێبوونیانی ڕەچاو کردووە.

٣- لەپاش تەواوبوونی صەحیحەکەی، پیشانی کۆمەڵێ لە زانا پلەبەرزەکانی فەرموودەناسی داوە، وەك: ئیبنو مەعین و ئیبنولەدینی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، هەموویان شایەتی صەحیحی فەرموودەکانیان بۆ داوە جگە لە چوار فەرموودەیان نەبێت.

٤- یەکەم کتێبە کە تەنها فەرموودەی صەحیحی تێدا کۆکراوەتەوە کە پێش ئەو کاری وا نەکراوە، هەر کەسیش پاش ئەو هاتووە شوێن پێی ئەوی هەڵگرتووە لە فەرموودەناسان.

٥- تەنها ئەو مەرجی بەیەکگەیشتنی لە نێوان قوتابی و مامۆستادا داناوە، جیا لە هەموو زانایانی فەرموودەناسی دیکە کە تەنها هاوچەرخیان بەمەرج گرتووە.

٦- لە سەرباسەکانی صەحیحەکەیدا داهێنان و وردەکاری زۆری تیادا بەکار هێناوە، کە هیچ کام لە هاوڕێکانی و هاوچەرخەکانی شتی لەو جۆرەیان نەکردووە.

٧- دووبارەکردنەوەی فەرموودەکان لە زۆر جێگای صەحیحەکەیدا بۆ چەند مانا و مەبەستی بەسوود و دەرهێنان و ئاماژەکردن بە چەندەها یاسا و حوکمی شەرعی لە فەرموودەکاندا دووبارە کراونەتەوە.

# ٤- شێوەی سەرباسەکانی ئیمام بوخاری لە صەحیحەکەیدا

**ئیمام بوخاری لە صەحیحەکەیدا سێ شێوازی بەکار هێناوە کە ئەمانەن:**
أ- سەرباسە ڕوون و ئاشکراکان کە ئەم جۆرانە لەخۆ دەگرێت:

**١- بەشێوەی باسلێوەکردنێکی گشتی کە نێوەڕۆکی باسەکە چەند جۆرێك هەڵبگرێ، وەك ئەم دەقە** (بَابُ البَوْلِ فِي المَاءِ الدَّائِمِ) **باسی میزکردنە نێو ئاوی وەستاو، پاشان ئەم فەرموودەی هێناوە: ((با هیچ کەستان میز نەکاتە نێو ئاوی وەستاوەوە، پاشان خۆی تیادا بشوات))، مەبەستی لەسەرباسەکە ئەوەیە ڕوونی کردۆتەوە کە مەبەست ڕێگرییە لە میزتێکردن و خۆشۆردن لێی ئەگەر میزی تێ کرد.**

**٢- بەشێوەی پرسیار سەرباسەکە دێنێ: ئەمەش لەوانەیە بۆ ئەوە بێ چونکە باسەکە بۆچوونی جیاوازی تیایە وەك ئەم سەرباسە: (ئایا ئەو کەسانەی ئامادەی نوێژی هەینی نابن لە ئافرەتان و منداڵان و کەسانی دیکە خۆشۆردن لەسەریان واجبە؟) پاشان فەرموودەکان دێنێ لەو بارەیەوە.**

**٣- جاری وا هەیە سەرباسەکەی لە ئایەتێکەوە وەرگرتووە: وەك:** بَابٌ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ ﴿٥﴾﴾ التوبة.

**٤- هەندێ جار وتەیەکی صەحابەیەك یان زانایەك دەکاتە سەرباس. وەك:** (بَابٌ: فِي كَمْ تُصَلِّي المَرْأَةُ فِي الثِّيَابِ)، **عیکریمە دەڵێ: ئەگەر ئافرەت بە یەك پۆشاك هەموو لەشی داپۆشێت، بەلای منەوە دروستە بۆی (نوێژی پێوە بکات).**

ب- سەرباسی حوکموەرگرتن لە فەرموودەکەدا:

**لەم شێوەیاندا ئیمام بوخاری ئەو حوکمەی، یان ئەو سوودەی لە فەرموودەکەی، یان لە فەرموودەکانی باسەکە وەریدەگرێت دەیکاتە ناونیشان و سەرباس وەك:**

له (باسی هۆنراوه خوێندنەوه له مزگەوتدا) ئەم فەرموودەیە دێنێ: (ئەی حەسان لەبری پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵام بدەرەوه).

(ئەمه باسێكە: كەسانی زانا و خاوەن فەزڵ لەپێشترن بۆ پێشنوێژیكردن)، ئینجا ئەم فەرموودەیە دەنووسێ: (( ... فەرمان بكەن به ئەبو بەكر با پێشنوێژی بكات بۆ خەڵكەكە)).

ج- شێوەی سێیەم سەرباس و ناونیشانی ڕەها:

كه بریتییه لەو ناونیشانانەی تەنها وشەی (بابٌ) (باسێك)ی بۆ نووسیوه هیچ باس و ناونیشانی لەگەڵدا نییه ئەمەش بۆ دوو مەبەست بەكار دێنێ و دەنووسێت:

یەكەم: ئەو باسه پەیوەندی به باسەكەی پێش خۆیەوه هەیه و تەواوكەریەتی لەبەر زیاده مانا و سوودێك جیای كردۆتەوه له باسەكەی پێشوو، وەك ئەوه وایه بەشێك بێت له باسەكەی پێش خۆی، بۆ نموونه وەك: (باسی ئەوەی ناپەسەنده له شین و شەپۆڕ لەسەر مردوو)، ئینجا فەرموودەی: ((هەر كەسێك لەسەری بگریێن سزا دەدرێ بەهۆی ئەوەی لەسەری گریاون))، پاشان دەڵێ: (ئەمه باسێكه)، وه پاشان فەرموودەی جابیر دەربارەی كوژرانی باوكی له غەزای ئوحوددا دێنێ له بەشێكیدا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد لاشەكەی هەلگیرا ئینجا گوێی له دەنگی هاوار و گریانی ژنێك بوو فەرمووی: ((ئەو ژنه كێیه؟)) عەرزیان كرد كچی عەمره -یان خوشكی عەمره- فەرمووی: ((حا بۆچی دەگری؟ -یان: مەگری- بەردەوام فریشتەكان به باڵەكانیان دایانپۆشیبوو سێبەریان بۆ كردبوو هەتا لاشەكەی هەلگیرا))، ئەم فەرموودەیه ئەوه دەگەیەنێت كه گریان بەدەنگی بەرز بۆ مردوو ناپەسەنده به بەڵگەی ئەوەی كه فریشتەكان بەباڵیان دایانپۆشیوه و سێبەریان بۆ كردووه، ئەمەش حوكمێكه له فەرموودەكانی باسەكەی پێشوودا نەبوو كه فەرموودەكەی ئەم باسه گەیاندی.

دووەم: شاوەلیوڵای دەهلەوی دەڵێ: ئیمام بوخاری بە سەرباس و ناونیشانەكانی لە صەحیحەكەیدا ویستوویەتی ئەوپەڕی توانای خۆی بخاتە كار بۆ هەڵگۆزین و دەرهێنانی بابەتانێكی زیاتر لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەمەش كارێكە كەس لە زانایان پێش ئیمام بوخاری نەكەوتووە، بەڵام ئەوەندە هەیە پێی چاك بوو كە فەرموودەكان دابەش بكات بەگوێرەی ناونیشانەكان، وە لەو باس و ناونیشانانەدا نهێنی دەرهێنان و هەڵێنجان لە فەرموودەكان دابنێت.

## ٥- دووبارەكردنەوەی فەرموودەكان، یان بەشبەشكردنیان، یان كورتكردنەوەیان

زانای پایەبەرزی فەرموودەناس موحەممەدی كوڕی تاهیری مەقدیسی دەڵێ: بوخاری لە صەحیحەكەیدا جاری وا هەیە فەرموودەیەك لە چەند جێگایەكدا دووبارە دەكاتەوە، لەهەر باس و جێگایەكدا بە ڕشتەیەكی دیكە دەیهێنێ، بە زانایی و شارەزایی خۆی مانا و حوكمێكی لێ دەردەهێنێ كە لەگەڵ باس و جێگاكەدا بگونجێت، زۆر كەم بگرە فەرموودەیەك نییە لە دوو جێگادا بەیەك سەنەد و یەك دەق بێنێ، بەڵكوو بۆ چەند مەبەست و سوودی جیاواز دەیهێنێ لەوانە:

١- فەرموودەكە لە هاوەڵێكەوە دەگێڕێتەوە، پاشان لە جێگایەكی دیكە لە هاوەڵێكی دیكەوە دەگێڕێتەوە.

٢- یان هەندێك فەرموودە بە یاساكانی خۆی بەصەحیح دادەنێ و دەیانهێنێ بەهۆی هاتنی لە چەند ڕێگایەكەوە، بۆیە لە هەر جێگایەك دەیهێنێ جیاوازە لە ڕێگا و ڕشتەكەی دیكە.

٣- جارى وا هەیە هەندێ فەرمووده دەگێڕێتەوە لە ڕاوییەکەوە کە بەتەواوی هەموو فەرموودەکەی هێناوە، پاشان لەڕێگەیەکی دیکەوە دەیگێڕێتەوە بەکورتتر لە ڕێگەی یەکەم. هەردووکیان دەگێڕێتەوە تا گومان دروست نەبێت کە هەردوو فەرمووده و ڕشتەکەیان صەحیحن.

٤- یان لە هەندێ فەرموودەدا ڕاوییەکان بەشێوەی جیاواز فەرموودەکە دەگێڕنەوە بۆ هەر شێوەیەکیان باسێکی سەربەخۆی داناوە، چونکە وشە و دەقی هەریەکەیان مانایەك دەبەخشێت جیا لەوەی دیکەیان.

٥- هەندێ جار تێکگیران هەیە لە فەرموودەیەکدا لەنێوان پەیوەستبوون و پەیوەستنەبووندا، ئیمام بوخاری پەیوەستبوونەکەی لای ڕاسترە، بەڵام پێچەوانەکەشی دێنێ تا بڵێ ئەوە پەیوەستنەبوونە و بەلایەوە پشتی پێ نابەسترێت.

٦- یان پێچەوانەیی هەیە لە فەرموودەیەکدا لە نێوان ئەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێت یان وتەی هاوەڵان بێت، ئیمام بوخاری یەکێکیانی لا ڕاسترە، پێچەوانەکەشی هێناوە تا بڵێ هیچ کاریگەری نییە.

٧- جاری وا هەیە لە ڕشتەیەکدا کەسێك هەیە لە ڕشتەیەکی دیکەدا ئەو کەسە نییە، ئیمام بوخاری هەردوو ڕشتەکە دێنێ، کە هەردووکیان بەلایەوە صەحیحن.

٨- یان فەرموودەیەکی بە (عَنْ فُلَانٍ) هێناوە. پاشان بە سەنەدێکی دیکە بە (سَمِعْتُ) لە جێگای (عَنْ)دا هێناویەتی بۆ ئەوەی ڕوون بێتەوە کە ئەو دوو کەسەی یەکەمیان لە دووهەمی بیستووە ئەو گومانەی بە ڕشتە (عَنْ فُلَانٍ) دروست بووە ، بە ڕشتەی (سَمِعْتُ) نەمێنێ.

ئەمانە هەمووی بۆ ئەو فەرموودانەیە کە دەقی فەرموودەکە وەك خۆی لە زیاتر لە شوێنێکدا دووبارە بۆتەوە:

★ بەڵام سەبارەت بە بەشبەشكردنی فەرموودەكە بۆ چەند بەشێك و چەند باسێك كە لە هەر شوێنێكدا بەشێكی فەرموودەكە دێنێ. ئەوە ئەگەر دەقەكە كورت بوو، یان هەندێكی پەیوەندی هەبوو بە هەندێكیەوە، جاری وا هەیە دوو حوكم یان زیاتر لە فەرموودەیەكدا هەیە، ئەو دووبارەی دەكاتەوە بەو پێیە، هەرچەندە خاڵی نابێت لە هەندێ وردەكاری فەرموودەناسی وەك گێڕانەوەی فەرموودەكە لەجاری دووەمدا لە مامۆستایەكەوە جیا لە مامۆستاكەی ڕشتەی یەكەم جار ئەمەش سوودەكەی هێنانی زیاتر لە ڕشتەیەكە بۆ فەرموودەكە.

جاری وا هەیە ناكرێ فەرموودەكە بەڕشتەیەكی دیكە بگێڕێتەوە، چونكە فەرموودەكە تەنها یەك ڕشتەی هەیە.

ئەو كاتە جاریێ بەپەیوەستی دەیگێڕێتەوە، لە جێگایەكی دیكەدا بە موعەلەقی دەیگێڕێتەوە، یان جاریێ بەتەواوی فەرموودەكە دەهێنێ، جارێكی دیكە ئەو بەشە دێنێ كە بۆ باسەكەی پێویستە.

بەڵام ئەگەر دەقەكە چەند بڕگەیەكی تیابێت و هیچیان پەیوەندی بەوی دیكەوە نەبێت، ئەوكات هەر بەشێكی فەرموودەكە لە باسێكی سەربەخۆدا دەهێنێ، تا باسەكە درێژ نەبێتەوە هەندێ جار فەرموودەكە هەمووی دێنێ.

★ وە سەبارەت بەوەی بەشێكی فەرموودەكە دێنێ، پاشان بەشەكەی دیكەی لە جێگایەكی دیكەدا ناهێنێ، بەزۆری ئەو كارە ناكات مەگەر ئەو بەشەی نایهێنێ وتەی هاوەڵێك بێت، بڕگەیەكی تیایە حوكمی فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ هەیە ئەوەی كە ناهێنێ، چونكە پەیوەندی بە باسی صەحیحەكەیەوە نییە، وەك فەرموودەی هوزەیلی كوڕی شوڕەحبیل لە عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە ؓ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: «إِنَّ أَهْلَ الإِسْلَامِ لَا يُسَيِّبُونَ، وَإِنَّ أَهْلَ الجَاهِلِيَّةِ كَانُوا يُسَيِّبُونَ». بەم

جۆرە هێناویەتی کە لە وتەیەکی درێژی عەبدوڵا کورت کراوەتەوە کە ئەمە بەشێکیەتی کە حوکمی فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ هەیە.

بەو شێوەیە کۆتایی بەم بەشە دێنین، دەربارەی کتێبی صەحیحی ئیمام بوخاری.

★★★

قَالَ الشَّيْخُ الإِمَامُ الْحَافِظُ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْمُغِيرَةِ الْبُخَارِيُّ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى آمِينَ:

**مامۆستا و پێشەوا و حافیز لە زانستی فەرمووده‌دا باوکی عەبدوڵا کە ناوی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبڕاهیمی کوڕی موغیرەی بوخارییە خودای بەرز و بڵند ڕەحمی پێ بکات ئامین، دەڵێ:**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ١- كتابُ بدْءِ الوَحْيِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١- پەڕاوی سەرەتای دەست پێکردنی نیگا

## ١- بابٌ: كَيْفَ كَانَ بَدْءُ الْوَحْيِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟

وَقَوْلُ اللَّهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ﴿١٦٣﴾ ﴾ النساء.

١- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا يحيى بْنُ سَعِيدٍ الأنصَارِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بن إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيُّ، أَنَّهُ سَمِعَ عَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه عَلَى المِنْبَرِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّمَا الأَعْمَالُ بالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا،فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ.[1].

## ١- باسێک: سەرەتای دەست پێکردنی هاتنی نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟

**هەروەها باسی ئەو فەرمایشتەی خودا کە ناوی بەرز و بڵندە: (بێگومان ئێمە نیگامان کردووە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ)، وەك چۆن نیگامان کرد بۆ نوح و پێغەمبەرانی پاش ئەو ﷺ).**

---

[1] واتە: کۆچەرەکە هیچ پاداشتێکی لای خوای کەورە نییە، چونکە بەمەبەستی دیکە کۆچی کردووە.

١- عەلقەمەی کوڕی وەققاصی لەیسی دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بوو لەسەر دوانگە دەیوت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان هەموو کردەوەکان (ڕاستی و دروستییان) بە نیاز و نییەتەوە پەیوەستن، وە مرۆڤ هەر نییەتێکی هەبێ ئەوەی بۆ دەنووسرێ، جا هەر کەس کۆچکردنەکەی (بۆ مەدینە) بۆ بەدەستهێنانی دونیا بێت، یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێك بێت، ئەوا کۆچکردنەکەی تەنها بۆ ئەوەیە کە لەپێناویدا کۆچی کردووە))[1].

## ٢- بابٌ

٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ ﷺ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ -وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ- فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ الْمَلَكُ رَجُلاً فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ». قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ، فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا(٢).

## ٢- باسێک

٢- دایکی باوەڕداران عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە حاریسی کوڕی هیشام ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن نیگات

[1] بڕوانە: ٥٤، ٢٥٢٩، ٣٨٩٨، ٥٠٧٠، ٦٦٨٩، ٦٩٥٣.

[2] بڕوانە: ٣٢١٥.

بۆ دێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((هەندێك جار كە نیگام بۆ دێ وەك زرینگەی زەنگ وایە -كە سەختترین[١] جۆری نیگایە بەلامەوە- كە لێم جیا دەبێتەوە[٢] هەرچی فەرمووە تێی دەگەم و وەرمگرتووە و لەبەرم كردووە، هەندێك جاریش فریشتەكە (كە جیبریلە) لە شێوەی پیاوێكدا خۆیم نیشان دەدا و قسەم لەگەڵدا دەكات، ئەوەی دەیڵێ وەریدەگرم و لەبەری دەكەم))، عائیشە ﵂ دەڵێ: سوێند بە خوا پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لە ڕۆژی زۆر سارددا نیگای بۆ دابەزیوە، كاتێك لێی جیا بۆتەوە، نێوچەوانی ئارەقی پیادا هاتۆتە خوارەوە[٣].

## ٣- بابٌ

٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ -وَهُوَ التَّعَبُّدُ- اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ، فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ اقْرَأْ. قَالَ «مَا أَنَا بِقَارِئٍ». قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ اقْرَأْ. قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ اقْرَأْ. فَقُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ﴾

---

[١] بۆیە ئەو جۆرە سەختترین جۆری نیگا بوو بەلایەوە، چونكە تێگەیشتن لێی سەخت و قورس بوو، تێگەیشتن لە وتەیەك كە لە شێوەی دەنگی زەنگ بێ، بێگومان سەختتر و ئاڵۆزترە لە تێگەیشتن لە وتەی پیاوێك كە ڕووبەڕوو لەگەڵی بدوێ.

[٢] فریشتەی نیگا، یان نیگاكە.

[٣] لەبەر قورسی نیگاكە، كە بۆی هاتووە و وەریگرتووە.

العلق. فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رضي الله عنها فَقَالَ: «زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي». فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ «لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي». فَقَالَتْ خَدِيجَةُ: كَلاَّ وَاللَّهِ مَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ. فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ -وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ- فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ:يا ابْنَ عَمِّ اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ. فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ:ياابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَبَرَ مَا رَأَى. فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللَّهُ عَلَى مُوسَى، يالَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ». قَالَ نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا. ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ وَفَتَرَ الْوَحْيُ[1].

## ٣- باسێک

**٣- عوروەی کوڕی زوبەیر لە دایکی ئیمانداران عائیشەوە رضي الله عنها گێڕاویەتەوە کە وتوویەتی: سەرەتای هاتنی نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەوبینینی ڕاست دەستی پێ کرد، بەجۆرێ هەر خەوێکی دەبینی وەك هەڵهاتنی ڕۆژ دەهاتە دی، پاشان گۆشەگیری لا خۆشەویست کرا، ئیدی (مانگی ڕەمەزان) لە ئەشکەوتی حیرا گۆشەگیر دەبوو، (فَيَتَحَنَّثُ) -واتە: خواپەرستیکردن- چەند شەو دەمایەوە خواپەرستی دەکرد، خواردنی ئەو ماوەیەی لەگەڵ خۆی دەبرد و نەدەگەڕایەوە**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٩٢، ٤٩٥٣، ٤٩٥٥، ٤٩٥٦، ٤٩٥٧، ٦٩٨٢.

بۆ ماڵەوە (تا خواردنەکەی تەواو دەبوو)، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە (ی خێزانی) و بەشی ئەوەندەی دیکە خواردنی لەگەڵ خۆی دەبرد، (بەم شێوەیە بەردەوام بوو) هەتا ڕاستی بۆ هات ئەو کاتەی لە ئەشکەوتی حیرائدا بوو، کە فریشتەی نیگا بوو، هاتە لای پێی فەرموو: بخوێنە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من خوێندەوار نیم))، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئینجا گرتمی و زۆر بەتوندی گوشیمی و باوەشی پیا کردم، پاشان بەریدام، ئینجا فەرمووی: بخوێنە! منیش وتم: خوێندەوار نیم، جا بۆ جاری دووەم گرتمی و زۆر بەتوندی گوشیمی و باوەشی پیا کردم، پاشان بەریدام و فەرمووی: بخوێنە، منیش وتم: خوێندەوار نیم، جا بۆ جاری سێیەم گرتمی و زۆر بەتوندی گوشیمی و باوەشی پیا کردم، پاشان بەریدام و فەرمووی: (بخوێنە! بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، مرۆڤی دروست کردووە لە خوێنێکی مەییو، بخوێنە! پەروەردگاری تۆ (لە هەموو کەس) بەخشندەترە)))، (عائیشە ﵂ دەڵێ:) جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵەلەرزە و شڵەژاوی گەڕایەوە بەهۆی ئەو ڕووداوەوە، ڕۆیشتەوە بۆ لای (خێزانەکەی) خەدیجەی کچی خوەیلید ﵂ فەرمووی: ((دامپۆشن، دامپۆشن))، جا دایانپۆشی تا ترسەکەی نەما، جا هەواڵی ڕووداوەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە، پێی فەرموو: ((بەڕاستی لە خۆم ترسام (بمرم لە ترسا، یان نەخۆش بکەوم)))، خەدیجەش ﵂ وتی: نا، سوێند بە خوا شتی وا نابێ، خوا هەرگیز شەرمەزار و سەرشۆڕت ناکات، چونکە تۆ مافی خزمایەتی بەجێ دێنی و یارمەتی و دەستگیرۆیی بێنەوا و هەتیو دەکەیت، ماڵ دەبەخشی بە نەداران و خواردن بە میوان دەدەیت و ڕێزی لێ دەگریت، وە یارمەتی خەڵکی دەدەیت لە کاتی هەر لێقەومان و کارەساتێکدا، (گەر ناهەق نەبێت). ئینجا خەدیجە ﵂ لەگەڵ خۆی بردی تا گەیشتە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوزا، کە ئامۆزای خەدیجە بوو، پیاوێک

**بوو لە سەردەمی نەفامیدا ببوو بە گاور (وازی لە بتپەرستی هێنابوو)، وەرەقە بە زمانی عیبری (زمانی جوولەکە) نووسینی دەنووسی، هەر بۆیە بە زمانی عیبری ئەوەندەی خوا بیویستایە ئینجیلی دەنووسی، پیاوێکی پیری بەساڵاچوو بوو، کوێر بووبوو، خەدیجە ﵂ بە وەرەقەی وت: ئەی ئامۆزای خۆم گوێ بگرە بۆ برازای خۆت، (کە پێغەمبەرە ﷺ)، وەرەقەش وتی (بە پێغەمبەر ﷺ): برازای خۆم چیت دیوە؟ جا پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی دیبووی بۆی گێڕایەوە، وەرەقەش پێی وت: ئەمە ئەو (فریشتە) نهێنیپارێزەیە کە خوا ناردی بۆ لای مووسا (کە جیبریلە ﵇)، ئای خۆزگە لە کاتی بانگەوازەکەتدا گەنج بوومایە، خۆزگە زیندوو بوومایە کاتێك گەلەکەت دەرتدەکەن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بۆ گەلەکەم دەرمدەکەن؟!))، وەرەقە وتی: بەڵێ دەرتدەکەن، چونکە هەر پیاوێك وێنەی ئەم پەیامەی تۆی هێنابێ حەتمەن دژایەتی کراوە، جا ئەگەر گەیشتمە ئەو ڕۆژگارەت (کە دەرتدەکەن) پشتیوانییەکی بەهێزت لێ دەکەم، پاشان زۆری پێ نەچوو وەرەقە وەفاتی کرد، دابەزینی نیگاش بۆ ماوەیەك وەستا و دوا کەوت.**

٤- قَالَ ابن شِهَابٍ وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحمن أن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الأنصَارِيَّ قَالَ- وَهُوَ يحدث عَنْ فَتْرَةِ الوَحْيِ -فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: «بَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي فَإِذَا المَلَكُ الذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ على كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ ﴾ إلى قوله: ﴿ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥ ﴾ المدثر. فَحَمِيَ الوَحْيُ وَتَتَابَعَ، تَابَعَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ وَأبو صَالِحِ. وَتَابَعَهُ هِلَالُ بْنُ رَدَّادٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ يُونُسُ وَمَعْمَر: بَوَادِرُهُ[1].

---

[1] بڕوانە: ٣٢٣٨، ٤٩٢٢، ٢٩٢٣، ٤٩٢٤، ٤٩٢٥، ٤٩٢٦، ٤٩٥٤، ٦٢١٤.

**٤- سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، جابیری کوڕی عەبدوڵای ئەنصاری ﷺ -باسی دواکەوتنی نیگای دەگێڕایەوە- وتی: جا پێغەمبەر ﷺ لە قسەکانیدا فەرمووی: ((لە کاتێکدا بە ڕێگادا دەڕۆیشتم لەناکاو گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمانەوە، چاوەکانم بەرز کردەوە (بۆ ئاسمان) بینیم ئەو فریشتەیەیە کە لە (ئەشکەوتی) حیرا هات بۆ لام، لەسەر کورسییەك دانیشتووە لە نێوان ئاسمان و زەویدا، منیش زۆر لێی ترسام و گەڕامەوە (بۆ ماڵەوە و) وتم: دامپۆشن، دامپۆشن، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە، هەستە (خەڵکی) بێدارکەرەوە، هەتا ئەو فەرمایشتەی: (وە بەردەوام بە لەسەر دوورکەوتنەوە لە بتپەرستی و هەر کردەوەیەکی هاوبەشدانەرانە)، ئیدی نیگا بەگەرمی و بەبەردەوامی دەستی بە دابەزین کرد)). عەبدوڵای کوڕی یوسف و ئەبو سالیح ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یەحیای کوڕی بوکەیر دەکەن، هەروەها هیلالی کوڕی ڕەداد لە زوهرییەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەقیلی کوڕی خالید دەکات، یونس و مەعمەر لە گێڕانەوەکەیاندا وتوویانە:** (بَوَادِرُهُ)[1] **لە جیاتی** (فُؤَادُهُ).

## ٤- بابٌ

٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ أَبِي عَائِشَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ ﴾

---

[1] (بَوَادِر) کۆی وشەی (بَادِرَة)یە: کە بریتییە لەو گۆشتەی لە نێوان مل و سەرشانداییە، واتە: لە ترسان ئەو گۆشتە دەلەرییەوە. إرشاد الساري: ٩٦/١.

القيامة. قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ -فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَنَا أُحَرِّكُهُمَا لَكُمْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحَرِّكُهُمَا. وَقَالَ سَعِيدٌ: أَنَا أُحَرِّكُهُمَا كَمَا رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يُحَرِّكُهُمَا. فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ -فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى:

﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ القيامة. قال:جَمْعُهُ له في صَدْرِك و تَقْرَأُه: ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة. قال: فاسْتَمِعْ لهُ وأَنْصِتْ، ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القيامة. ثمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ تَقْرَأَهُ. فَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ اسْتَمَعَ، فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ قَرَأَهُ النَّبِيُّ ﷺ كَمَا قَرَأَهُ[1].

## ٤- باسێک

**٥- ئیبنو عەباس ﷺ دەربارەی ئەم فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (زمانت مەجووڵێنە بە خوێندنەوەی نیگا، بۆئەوەی پەلەی تێدا بکەی) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دابەزینی قورئان (و لەبەرکردنی) زۆر نارەحەت دەبوو، هەر بۆیە لێوەکانی بەپەلە دەجووڵاند، ئیبنو عەباس وتی: منیش لێوەکانم دەجووڵێنم بۆتان، بەو شێوەیەی پێغەمبەر ﷺ دەیجووڵاندن، وە سەعیدیش (یەکێکە لە ڕاوییەکان) وتی: منیش لێوەکانم دەجووڵێنم بۆتان، بەو شێوەیەی کە ئیبنو عەباسم بینی لێوەکانی دەجووڵاند، ئینجا لێوەکانی جووڵاند، ئەوسا خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتانەی دابەزاند:** ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ القيامة. **عەبدوڵا وتی: واتە: کۆکردنەوەی لە سنگتدا و بیخوێنیتەوە:** ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة. **وتی: واتە: (گوێی بۆ ڕابگرە و**

---

[1] بڕوانە: ٤٩٢٧، ٤٩٢٨، ٤٩٢٩، ٥٠٤٤، ٧٥٢٤.

بێدەنگ بە)، ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القيامة. واتە: (پاشان بێگومان لەسەر ئێمەیە کە (پێت لەبەر بکەین و) لەبەر بیخوێنیتەوە)، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەو (بەڵێن)ە، ئەگەر جیبریل ﷺ هاتبایە بۆ لای، گوێی بۆ دەگرت، وە کاتێك جیبریل دەڕۆیشت پێغەمبەر ﷺ قورئانەکەی دەخوێندەوە، بەو شێوەیەی جیبریل ﷺ دەیخوێندەوە.

## ٥- بابٌ

٦- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، ح وَحَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ وَمَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، نَحْوَهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ، فَلَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ[1].

## ٥- باسێک

٦- ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لە هەموو کەس بەخشندەتر بوو، وە لە ڕەمەزاندا لە هەموو کات بەخشندەتر بوو کاتێك کە جبریل ﷺ بە خزمەتی دەگەیشت، جیبریلیش ﷺ هەموو شەوێکی ڕەمەزان بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەگەیشت، قورئانی پێ دەور دەکردەوە، (بۆ ئەوەی لەبیری نەچێتەوە) لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە بای خێرا بەخشندەتر و دەستکراوەتر بوو لە خێرکردن وماڵبەخشیندا)).

---

[1] بڕوانە: ١٩٠٢، ٢٢٢٠، ٣٥٥٤، ٤٩٩٧.

## ٦- بابٌ

٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ فِي رَكْبٍ مِنْ قُرَيْشٍ -وَكَانُوا تُجَّارًا بِالشَّأْمِ- فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَادَّ فِيهَا أَبَا سُفْيَانَ وَكُفَّارَ قُرَيْشٍ، فَأَتَوْهُ وَهُمْ بِإِيلِيَاءَ، فَدَعَاهُمْ فِي مَجْلِسِهِ، وَحَوْلَهُ عُظَمَاءُ الرُّومِ، ثُمَّ دَعَاهُمْ وَدَعَا بِتَرْجُمَانِهِ فَقَالَ: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا بِهَذَا الرَّجُلِ الَّذِى يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلْتُ: أَنَا أَقْرَبُهُمْ نَسَبًا. فَقَالَ أَدْنُوهُ مِنِّى، وَقَرِّبُوا أَصْحَابَهُ، فَاجْعَلُوهُمْ عِنْدَ ظَهْرِهِ. ثُمَّ قَالَ لِتَرْجُمَانِهِ: قُلْ لَهُمْ إِنِّي سَائِلٌ هَذَا عَنْ هَذَا الرَّجُلِ، فَإِنْ كَذَبَنِى فَكَذِّبُوهُ. فَوَاللَّهِ لَوْلاَ الْحَيَاءُ مِنْ أَنْ يَأْثِرُوا عَلَيَّ كَذِبًا لَكَذَبْتُ عَنْهُ. ثُمَّ كَانَ أَوَّلَ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَنْ قَالَ: كَيْفَ نَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قُلْتُ: هُوَ فِينَا ذُو نَسَبٍ. قَالَ: فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ مِنْكُمْ أَحَدٌ قَطُّ قَبْلَهُ؟ قُلْتُ لاَ. قَالَ: فَهَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مِنْ مَلِكٍ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَأَشْرَافُ النَّاسِ يَتَّبِعُونَهُ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ فَقُلْتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ. قَالَ: أَيَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ قُلْتُ: بَلْ يَزِيدُونَ. قَالَ: فَهَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ سَخْطَةً لِدِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ؟ قُلْتُ لاَ. قَالَ: فَهَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قُلْتُ لاَ، وَنَحْنُ مِنْهُ فِي مُدَّةٍ لاَ نَدْرِى مَا هُوَ فَاعِلٌ فِيهَا. قَالَ: وَلَمْ تُمْكِنِّى كَلِمَةٌ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئًا غَيْرُ هَذِهِ الْكَلِمَةِ. قَالَ: فَهَلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَيْفَ كَانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ؟ قُلْتُ: الْحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ سِجَالٌ، يَنَالُ مِنَّا وَنَنَالُ مِنْهُ. قَالَ: مَاذَا يَأْمُرُكُمْ؟ قُلْتُ: يَقُولُ: اعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدَهُ، وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَاتْرُكُوا مَا يَقُولُ آبَاؤُكُمْ، وَيَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ وَالصِّدْقِ وَالْعَفَافِ وَالصِّلَةِ. فَقَالَ لِلتَّرْجُمَانِ: قُلْ لَهُ: سَأَلْتُكَ عَنْ نَسَبِهِ، فَذَكَرْتَ أَنَّهُ فِيكُمْ ذُو نَسَبٍ، فَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي نَسَبِ قَوْمِهَا، وَسَأَلْتُكَ هَلْ قَالَ أَحَدٌ مِنْكُمْ هَذَا الْقَوْلَ؟ فَذَكَرْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ لَوْ كَانَ أَحَدٌ قَالَ: هَذَا الْقَوْلَ قَبْلَهُ لَقُلْتُ رَجُلٌ يَأْتَسِى بِقَوْلٍ قِيلَ قَبْلَهُ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مِنْ مَلِكٍ؟ فَذَكَرْتَ أَنْ لاَ، قُلْتُ: فَلَوْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مِنْ مَلِكٍ؟ قُلْتُ: رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ أَبِيهِ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ فَذَكَرْتَ أَنْ لاَ، فَقَدْ أَعْرِفُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَذَرَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ وَيَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ، وَسَأَلْتُكَ أَشْرَافُ

النَّاسِ اتَّبَعُوهُ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ فَذَكَرْتَ أَنَّ ضُعَفَاءَهُمُ اتَّبَعُوهُ، وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، وَسَأَلْتُكَ أَيَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ فَذَكَرْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدُونَ، وَكَذَلِكَ أَمْرُ الإِيمَانِ حَتَّى يَتِمَّ، وَسَأَلْتُكَ أَيَرْتَدُّ أَحَدٌ سَخْطَةً لِدِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ فَذَكَرْتَ أَنْ لاَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حِينَ تُخَالِطُ بَشَاشَتُهُ الْقُلُوبَ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَغْدِرُ؟ فَذَكَرْتَ أَنْ لاَ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ لاَ تَغْدِرُ، وَسَأَلْتُكَ بِمَا يَأْمُرُكُمْ، فَذَكَرْتَ أَنَّهُ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ، وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَيَنْهَاكُمْ عَنْ عِبَادَةِ الأَوْثَانِ، وَيَأْمُرُكُمْ بِالصَّلاَةِ وَالصِّدْقِ وَالْعَفَافِ. فَإِنْ كَانَ مَا تَقُولُ حَقًّا فَسَيَمْلِكُ مَوْضِعَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ، وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خَارِجٌ، لَمْ أَكُنْ أَظُنُّ أَنَّهُ مِنْكُمْ، فَلَوْ أَنِّي أَعْلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إِلَيْهِ لَتَجَشَّمْتُ لِقَاءَهُ، وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عَنْ قَدَمِهِ. ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي بَعَثَ بِهِ دِحْيَةُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى، فَدَفَعَهُ إِلَى هِرَقْلَ، فَقَرَأَهُ فَإِذَا فِيهِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ. سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ، يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الأَرِيسِيِّينَ وَ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ آل عمران. قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَلَمَّا قَالَ مَا قَالَ، وَفَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ كَثُرَ عِنْدَهُ الصَّخَبُ، وَارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ وَأُخْرِجْنَا، فَقُلْتُ لأَصْحَابِي حِينَ أُخْرِجْنَا: لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، إِنَّهُ يَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ. فَمَا زِلْتُ مُوقِنًا أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللَّهُ عَلَيَّ الإِسْلاَمَ. وَكَانَ ابْنُ النَّاظُورِ، صَاحِبُ إِيلِيَاءَ وَهِرَقْلَ، سُقُفًّا عَلَى نَصَارَى الشَّأْمِ، يُحَدِّثُ أَنَّ هِرَقْلَ حِينَ قَدِمَ إِيلِيَاءَ أَصْبَحَ يَوْمًا خَبِيثَ النَّفْسِ، فَقَالَ بَعْضُ بَطَارِقَتِهِ: قَدِ اسْتَنْكَرْنَا هَيْئَتَكَ. قَالَ ابْنُ النَّاظُورِ: وَكَانَ هِرَقْلُ حَزَّاءً يَنْظُرُ فِي النُّجُومِ، فَقَالَ لَهُمْ حِينَ سَأَلُوهُ: إِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ حِينَ نَظَرْتُ فِي النُّجُومِ مَلِكَ الْخِتَانِ قَدْ ظَهَرَ، فَمَنْ يَخْتَتِنُ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ؟ قَالُوا: لَيْسَ يَخْتَتِنُ إِلاَّ الْيَهُودُ فَلاَ يُهِمَّنَّكَ شَأْنُهُمْ وَاكْتُبْ إِلَى مَدَايِنِ مُلْكِكَ، فَيَقْتُلُوا مَنْ فِيهِمْ مِنَ الْيَهُودِ. فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى أَمْرِهِمْ أُتِيَ هِرَقْلُ بِرَجُلٍ أَرْسَلَ بِهِ مَلِكُ غَسَّانَ، يُخْبِرُ عَنْ خَبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا اسْتَخْبَرَهُ هِرَقْلُ قَالَ: اذْهَبُوا فَانْظُرُوا أَمُخْتَتِنٌ هُوَ أَمْ لاَ. فَنَظَرُوا إِلَيْهِ، فَحَدَّثُوهُ أَنَّهُ مُخْتَتِنٌ، وَسَأَلَهُ عَنِ الْعَرَبِ

فَقَالَ: هُمْ يَخْتَتِنُونَ. فَقَالَ هِرَقْلُ: هَذَا مَلِكُ هَذِهِ الأُمَّةِ قَدْ ظَهَرَ. ثُمَّ كَتَبَ هِرَقْلُ إِلَى صَاحِبٍ لَهُ بِرُومِيَةَ، وَكَانَ نَظِيرَهُ فِي الْعِلْمِ، وَسَارَ هِرَقْلُ إِلَى حِمْصَ، فَلَمْ يَرِمْ حِمْصَ حَتَّى أَتَاهُ كِتَابٌ مِنْ صَاحِبِهِ يُوَافِقُ رَأْيَ هِرَقْلَ عَلَى خُرُوجِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَنَّهُ نَبِيٌّ، فَأَذِنَ هِرَقْلُ لِعُظَمَاءِ الرُّومِ فِي دَسْكَرَةٍ لَهُ بِحِمْصَ ثُمَّ أَمَرَ بِأَبْوَابِهَا فَغُلِّقَتْ، ثُمَّ اطَّلَعَ فَقَالَ:يا مَعْشَرَ الرُّومِ، هَلْ لَكُمْ فِي الْفَلاَحِ وَالرُّشْدِ وَأَنْ يَثْبُتَ مُلْكُكُمْ فَتُبَايِعُوا هَذَا النَّبِيَّ؟ فَحَاصُوا حَيْصَةَ حُمُرِ الْوَحْشِ إِلَى الأَبْوَابِ، فَوَجَدُوهَا قَدْ غُلِّقَتْ، فَلَمَّا رَأَى هِرَقْلُ نَفْرَتَهُمْ، وَأَيِسَ مِنَ الإِيمَانِ قَالَ: رُدُّوهُمْ عَلَيَّ. وَقَالَ: إِنِّي قُلْتُ مَقَالَتِي آنِفًا أَخْتَبِرُ بِهَا شِدَّتَكُمْ عَلَى دِينِكُمْ، فَقَدْ رَأَيْتُ. فَسَجَدُوا لَهُ وَرَضُوا عَنْهُ، فَكَانَ ذَلِكَ آخِرَ شَأْنِ هِرَقْلَ. رَوَاهُ صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ وَيُونُسُ وَمَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[1].

## ٦- باسێک

**٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: ((ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب ﷺ بۆی گێڕامەوە: کە هیرەقل (پادشای ڕۆم) ناردی بە شوێنیدا، کە لەو کاروانەی قورەیشدا بوو کە بازرگان بوون لە شام، لەو ماوەیەی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگربەستی ڕاگەیاندبوو لەگەڵ ئەبو سوفیان و بێباوەڕانی قورەیشدا، جا ئەبو سوفیان و هاوڕێکانی ڕۆیشتن بۆ لای هیرەقل لەو کاتەدا هیرەقل لە ئیلیا (قودس) بوو، هیرەقل بانگی کردن بۆ کۆڕی تایبەتی خۆی، گەورەپیاوانی ڕۆم لەدەوری بوون، پاشان بانگی کردن، وەرگێڕەکەشی بانگ کرد، هیرەقل وتی: کامتان لە پشت و خزمایەتیدا نزیکترن لەو پیاوەی کە گوایە پێغەمبەرە بە قسەی خۆی؟ ئەبو سوفیان وتی: وتم: من لە هەموویان نزیکترم بە خزمایەتی لەو پیاوە، هیرەقل وتی: نزیکی بکەنەوە لێم، هاوڕێکانیشی نزیک بکەنەوە لە پشتیەوە دایاننێن،**

[1] بڕوانە: ٥١، ٢٦٨١، ٢٨٠٤، ٢١٤١، ٢١٧٨، ٣١٧٤، ٤٥٥٣، ٥١٨٠، ٦٢٦٠، ٧١١٦، ٧٥٤١.

پاشان بە وەرگێڕەکەی وت: بە هاوڕێکانی ئەبو سوفیان بڵێ: من پرسیار لەم پیاوە (ئەبو سوفیان) دەکەم دەربارەی ئەو پیاوە (پێغەمبەر ﷺ)، ئەگەر درۆی لەگەڵمدا کرد و ڕاستی پێ نەوتم، ئەوە ئێوەش بەدرۆی بخەنەوە، ئەبو سوفیان وتی: سوێند بە خوا ئەگەر شەرم و حەیای ئەوەم نەکردایە (هاوڕێکانم) درۆکانم بگێڕنەوە، درۆم دەکرد دەربارەی موحەممەد ﷺ، پاشان یەکەم پرسیار کە لێی کردم دەربارەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە وتی: ڕەچەڵەکی چۆنە لە نێوتاندا؟ وتم: ئەو (موحەممەد ﷺ) لە بنەماڵەیەکی ڕەسەن و خانەدانە لەنێوماندا، هیرەقل وتی: ئایا هەرگیز کەسێکی دیکە لەنێوتاندا پێش ئەم موحەممەدە ﷺ ئەم قسەیەی ئەوی کردووە؟ وتم: نەخێر، وتی: ئایا هیچ کام لە باوك و باپیرانی پادشا بوون؟ وتم: نەخێر، وتی: جا خەڵکی دیار و گەورە شوێنی دەکەون یان لاواز و هەژارەکانیان؟ وتم: بەڵکوو هەژار و لاوازەکانیان شوێنی دەکەون، وتی: ژمارەیان زیاد دەکات یان کەم دەکات؟ وتم: بەڵکوو زیاد دەکەن، وتی: ئایا کەسیان بەهۆی تووڕەبوون و ڕقهەستانی لە ئایینەکەی پاشگەز دەبێتەوە دوای ئەوەی چووەتە نێویەوە و باوەڕی پێ هێناوە؟ وتم: نەخێر، وتی: ئێوە تۆمەتبارتان دەکرد بە درۆکردن پێش ئەوەی ئەم باسەی دەیڵێ بیڵێ؟ وتم: نەخێر، وتی: ئایا ناپاکی و غەدر دەکات؟ وتم: نەخێر، بەڵام ئێمە لەگەڵیدا لە ئاگربەستداین، نازانین چی دەکات لەو ماوەی ئاگربەستەدا (غەدر دەکات یان نا)، ئەبو سوفیان دەڵێ: نەمتوانی هیچ وشەیەك بخەمە نێو قسەکانم (کە مایەی کەموکوڕی بێ بۆ موحەممەد ﷺ)، جگە لەو قسەیە، هیرەقل وتی: ئایا جەنگتان لەگەڵیدا کردووە؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەنجامی جەنگکردنتان

لەگەڵیدا چۆن بووە؟ وتم: جەنگ لە نێوانماندا بە نۆبەیە، جارێ ئەو سەر دەکەوێ و جارێ ئێمە، ئەو زیان بە ئێمە دەگەیەنێ و ئێمەش زیان بەو دەگەیەنین، وتی: بە چ شتێك فەرمانتان پێ دەکات؟ وتم: دەڵێ: بەتەنها خودا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی، ئەوەی باوك و باپیرانتان دەیڵێن (لە بتپەرستی) وازی لێ بێنن، هەروەها فەرمانمان پێ دەکات بە نوێژ و ڕاستگۆیی و داوێنپاکی و بەجێهێنانی مافی خزمایەتی، هیرەقل بە وەرگێڕەکەی وت: پێی بڵێ: پرسیارم لێ کردی دەربارەی ڕەچەڵەك و باو و باپیرانی، لە وەڵامدا وتت: ئایا لە نێوتاندا لە بنەماڵەیەکی دیاری هۆزەکەیانە، پێغەمبەرانیش لە بنەماڵە ڕەسەن و خانەدانەکانی هۆزەکەیان ڕەوانە دەکرێن و دەکرێنە پێغەمبەر، وە پرسیارم لێ کردی کەسی دیکە لەنێوتاندا ئەم قسەیەی ئەوی کردووە؟ لە وەڵامدا ووتت: نا، دەڵێم: ئەگەر کەسێکی دیکە ئەم قسەیەی بکردایە پێش ئەو، (ئەو کات) بێگومان دەموت: ئەم کابرایە شوێن قسەیەك دەکەوێ کە پێشتر کراوە و وتراوە، وە پرسیارم لێ کردیت: ئایا لە باوك و باپیرانیدا کەس هەبووە پادشا بووبێت؟ وتت: نەخێر، بۆیە دەڵێم: ئەگەر لە باوك و باپیرانیدا کەسێك پادشا بووبێت دەموت: ئەو کابرایە داوای پادشایەتی باووباپیرانی دەکات، وە پرسیارم لێ کردیت ئایا ئێوە تۆمەتبارتان دەکرد بە درۆکردن، پێش ئەوەی ئەم باسەی ئێستا دەیڵێ بیڵێ؟ وتت: نەخێر، بەڕاستی بەوەدا دەزانم کە ناگونجێ کەسێك بەدەم خەڵکەوە درۆ نەکات، بەدەم خواوە درۆ بکات، پرسیارم لێ کردیت خەڵکانی خانەدان و دەسەڵاتدار شوێنی دەکەون، یان لاواز و هەژارەکان؟ وتت: لاواز و هەژارەکانیان شوێنی دەکەون، دەی هەر ئەوانەن

شوێنکەوتووانی پێغەمبەران ﷺ، وە پرسیارم لێ کردیت شوێنکەوتووانی زیاد دەکەن یان کەم دەکەن؟ وتت: بێگومان ئەوان زیاد دەکەن، کاروباری ئیمان هەر بەو جۆرەیە هەتا کامڵ دەبێ و گەورە دەبێ، پرسیارم لێ کردی ئایا کەسیان پاشگەز دەبێتەوە لە ئایینەکەی، بەهۆی توڕەبوون و ڕقهەستانی لە ئایینەکەی، دوای ئەوەی ئیمانی پێ هێناوە و چووەتە نێویەوە؟ وتت: نەخێر، دەی ئیمان بەو جۆرەیە کاتێ ڕووناکی و کامەرانی تێکەڵ بە دڵەکان دەبێت، پرسیارم لێ کردیت: ئایا ئەو موحەممەدە ناپاکی دەکات؟ وتت: نەخێر، بەهەمان شێوە پێغەمبەرانیش غەدر و ناپاکی ناکەن، وە پرسیارم لێ کردیت بە چ شتێك فەرمانتان پێ دەکات؟ وتت: فەرمانتان پێ دەکات خوا بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنێن، وە ڕێگریتان لێ دەکات لە پەرستنی بتەکان، وە فەرمانتان پێ دەکات بە نوێژ و ڕاستگۆیی و داوێنپاکی، جا ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێی: (ئەبو سوفیان دەربارەی موحەممەد ﷺ) ڕاست بێت، ئەوە دەسەڵاتی ئەو دەگاتە ئەو دوو جێپێیەی من (کە قودسە)، بێگومان من دەمزانی ئەو پێغەمبەرە پەیدا دەبێ، بەڵام نەمدەزانی ئەو لە ئێوەیە، جا ئەگەر بمزانیایە دەگەمە لای، گوێم بەسەختی و ناڕەحەتی نەدەدا بۆ گەیشتن بە خزمەتی، وە ئەگەر من لە خزمەتیدا بوومایە پێیەکانیم دەشۆرد، پاشان داوای نامەکەی پێغەمبەری خوای کرد کە دحیە ناردبووی بۆ کاربەدەستی بوصرا، ئەویش دابووی بە هیرەقل جا خوێندیەوە کە ئەمەی تیا بوو: (بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان لە موحەممەدەوە کە بەندە و پێغەمبەری خوایە بۆ هیرەقلی گەورەی ڕۆم، سەلام لەو کەسە بێ کە شوێن ڕاستی و ڕێنمایی دەکەوێ، لە پاش ئەوە من بانگت دەکەم کە

شایەتومان بێنیت و موسوڵمان ببی، موسوڵمان ببە پارێزراو دەبی (لە دونیا و دوارۆژدا)، خوای گەورە دوو جار پاداشتت دەداتەوە[١]، خۆ ئەگەر موسوڵمان نەبیت و پشت هەڵکەیت، ئەوە بێگومان گوناهی ئەو جوتیارانەی لە ژێر دەستی تۆدان لە ئەستۆی تۆدایە (واتە: خەڵکی ئەو وڵاتە بەگشتی، چونکە ئەو پادشا و گەورەیانە)، وە (ئەی موحەممەد بڵێ: ئەی خاوەن پەڕتووکە ئاسمانییەکان وەرن بۆ لای وتەیەکی یەکسان (هاوبەش) لە نێوان ئێمە و ئێوەدا کە جگە لە خوا هیچ شتێك نەپەرستین و هیچ شتێك نەکەین بە هاوبەشی خوا، با هەندێکمان هەندێکی دیکەمان نەکەین بە پەرستراو لەجیاتی خوا، جا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئێوەش بڵێن ئێوە شاهێد بن کە ئێمە موسوڵمانین)، ئەبو سوفیان وتی: کاتێ هیرەقل ئەو قسانەی کرد کە کردی، وە لە خوێندنەوەی نامەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆیەوە لەلایدا هات و هاوار و دەنگ بەرز کردنەوەی زۆر دروست بوو، ئێمەیان کردە دەرەوە، ئینجا کاتێك ئێمەیان کردە دەرەوە بە هاوڕێکانم وت: بەڕاستی بابەتی کوڕی ئەبو کەبشە[٢] گەورە بوو، ئەوەتا پادشای ڕۆم لێی دەترسێ، ئیدی من دڵنیا بووم کە پێغەمبەر ﷺ زاڵ دەبێ و سەر دەکەوێ، تا خوا ئیسلامەتی خستە دڵمەوە و موسوڵمان بووم. وە (إبن الناظور)[٣] دەگێڕێتەوە کە کاربەدەستی ئیلیا و هیرەقل هەردووکیان گەورە قەشە و زانای گاورەکانی شام بوون،

---

[١] جارێکیان لەبەر ئەوەی باوەڕی هێناوە بە پێغەمبەرایەتی عیسا (علیه السلام)، وە جارێکیشیان لەبەر ئەوەی بڕوا بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ دەهێنێ.

[٢] واتە: پێغەمبەر ﷺ، ئەبو کەبشە یەکێکە لە باپیرەکانی پێغەمبەر ﷺ و هەندێ دەڵێن: باوکی شیری پێغەمبەرە ﷺ.

[٣] واتە: کوڕی باخەوان.

دەگێڕنەوە کاتێك هیرەقل دێت بۆ ئیلیا، ڕۆژێکیان بێتوانا و غەمبار دەبێ، هەندێ لە پیاوەخانەدان و نزیکەکانی پێی دەڵێن: حاڵ و شێوەت باش نایەتە بەرچاومان، (إبن الناظور) وتی: هیرەقل ئەستێرەناس بوو سەیری ئەستێرەکانی دەکرد (بەو هۆیەوە فاڵی دەگرتەوە و دەربارەی شتی پەنهان قسەی دەکرد)، کاتێك پیاوانی نزیکی پرسیاریان لێ کرد (هۆی چییە تێك چووی)؟ هیرەقل پێی وتن: ئەمشەو کاتێك سەیری ئەستێرەکانم دەکرد بینیم پادشای خەتەنەکراوان زاڵ بوو (سەر کەوت)، پێم بڵێن: ج گەلێك لەم سەردەمەدا خەتەنە دەکەن؟ وتیان: جگە لە جوولەکە هیچ گەلێك خەتەنە ناکەن، کاری ئەو جوولەکانە غەمبارت نەکات (ترست نەبێ لێیان)، نامە بنووسە بۆ هەموو شارەکانی ژێر دەسەڵاتت، هەرچی جوولەکەی تێدایە بیانکوژن، جا لە کاتێکدا ئەوان لەنێو ئەو قسەوباسەیاندا بوون پیاوێکیان هێنا بۆ لای هیرەقل، کە پادشای غەسان ناردبووی، دەنگ و باسی پێغەمبەری خوای ﷺ پێ ڕادەگەیاندن، جا کاتێك هیرەقل هەواڵەکەی بیست، وتی: بیبەن و سەیری بکەن بزانن ئایا خەتەنە کراوە یان نا؟ ئەوانیش (ڕووتیان کردەوە) سەیریان کرد (خەتەنەکراو بوو)، ئیدی بە هیرەقلیان وت کە خەتەنە کراوە، هیرەقل پرسیاری لەو پیاوە عەرەبە کرد ئایا عەرەب خەتەنە دەکەن؟ ئەویش وتی: بەڵێ خەتەنە دەکەن، هیرەقل وتی: ئەم گەلە (کە خەتەنە دەکەن) زاڵ دەبن و دەسەڵات دەگرنە دەست، پاشان هیرەقل بۆ هاوڕێکی خۆی نووسی کە لە (شاری) ڕۆمییە بوو، وەك هیرەقل شارەزا و زانا بوو، جا هیرەقل ڕۆیشت بۆ حیمص، جا لە حیمص نەڕۆیشت تاوەکوو نامەیەکی لە هاوڕێکەیەوە (کە لە ڕۆمییە بوو) بۆ هات، کە ئەویش بۆچوونی

وەك هیرەقل بوو، كە پێغەمبەرێك دەركەوتووە و بێگومان ئەو (لەلایەن خواوە نێردراوە و) پێغەمبەرە ﷺ، ئینجا هیرەقل مۆڵەتی دا بە پیاوماقوڵ و ناودارانی ڕۆم لە کۆشکەکەیدا لە حیمص (کۆ ببنەوە)، پاشان فەرمانی دا هەموو دەرگاکانی کۆشکەکە داخران، پاشان (لە جێگایەکی بەرز) کە لە هەمووانەوە دیار بوو، وتی: ئەی گەلی ڕۆم! ئایا ئێوە دەتانەوێ ڕزگار و دەرباز بن و ڕێگای ڕاست بگرنە بەر و دەسەڵاتتان بەردەوام بێ، ئەوە پەیمان بدەن بەو پێغەمبەرە ﷺ!! هەموویان بە جارێك ڕایانکرد، وەك ڕاکردنی کەرەکێوی ڕۆیشتن بەرەو دەرگاکان بینییان دەرگاکان داخراون، کاتێ هیرەقل بینی چۆن ڕایانکرد و سڵەمینەوە، بێهیوا بوو لە باوەڕهێنانیان، وتی: بیانهێننەوە بۆ لام، وتی: من ئەو قسەیەی پێش ئێستا کردم ویستم توندی دەستپێوەگرتنتان بە ئایینەکەتانەوە تاقی بکەمەوە، بێگومان بینیم توند دەستتان بە ئایینەکەتانەوە گرتووە، ئەوانیش کڕنووشیان بۆ برد و لێی ڕازی بوون، (ئەمە کۆتا کاری هیرەقل بوو سەبارەت بە باوەڕهێنان و بانگکردنیان بۆ باوەڕهێنان). سالیحی کوڕی کەیسان و یونس و مەعمەر لە زوهرییەوە ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە[1].

---

[1] سەرنج: ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت ) دەفەرمووێ: (لە کاتێکدا بابەتی باوەڕهێنانی هیرەقل لەبارەی باوەڕهێنانیەوە لە لای زۆر کەس ڕوون نەبوو، چونکە ڕەنگە باوەڕهێنانەکەی ئاشکرا نەکردبێ، چونکە ترساوە لەوەی کە بیکوژن، ڕەنگیشە هەر دوودڵ بووبێ و لەو گوماندا مابێتەوە هەتا بەکافری مرد، بۆیە ڕاوییەکە لە کۆتایی چیرۆکەکە وتی: (ئەمە کۆتا کاری هیرەقل بوو)، ئیمام بوخاریش بەم دێڕە کۆتایی بەم باسە هێنا کە بە فەرموودەی: .إنما الأعمال بالنيات. دەستی پێ کردبوو، ئەمەش ئاماژەدانی بوخارییە بۆ ئەوەی کە ئەگەر نییەتەکەی ڕاست بووبێ لە ئیمانهێنانیدا، ئەوە سوودی پێ دەگەیەنێ بەشێوەیەکی گشتی، ئەگەرنا ئەوە پەشیمان دەبێتەوە و زەرەرمەند دەبێ. بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري: ٦١/١.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٢- كتابُ الإيمانِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٢- پەڕاوی ئیمان و باوەڕ

## ١- بَابُ الإِيْمَانِ وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((بُنِيَ الإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ))

وَهُوَ قَوْلٌ وَفِعْلٌ، وَيَزِيدُ وَيَنْقُصُ. قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ لِيَزْدَادُوٓاْ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْۗ ﴿٤﴾ ﴾ الفتح، ﴿ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ ﴾ الكهف، ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًىۗ ﴿٧٦﴾ ﴾ مريم، ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾ محمد. وَقَوْلُهُ: ﴿ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنًا ﴿٣١﴾ ﴾ المدثر، وَقَوْلُهُ: ﴿ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًاۚ ﴿١٢٤﴾ ﴾ التوبة، وَقَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا ﴿١٧٣﴾ ﴾ آل عمران، وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا ﴿٢٢﴾ ﴾ الأحزاب. وَالْحُبُّ فِي اللَّهِ وَالبُغْضُ فِي اللَّهِ مِنَ الإِيمَانِ، وَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ إِلَى عَدِيِّ بْنِ عَدِيٍّ: إِنَّ لِلإِيمَانِ فَرَائِضَ وَشَرَائِعَ وَحُدُودًا وَسُنَنًا، فَمَنِ اسْتَكْمَلَهَا اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَكْمِلْهَا لَمْ يَسْتَكْمِلِ الإِيمَانَ، فَإِنْ أَعِشْ فَسَأُبَيِّنُهَا لَكُمْ حَتَّى تَعْمَلُوا بِهَا، وَإِنْ أَمُتْ فَمَا أَنَا عَلَى صُحْبَتِكُمْ بِحَرِيصٍ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ ﷺ: ﴿ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِيۖ ﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ مُعَاذٌ: اجْلِسْ بِنَا نُؤْمِنْ سَاعَةً. وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: اليَقِينُ الإِيمَانُ كُلُّهُ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: لَا يَبْلُغُ العَبْدُ حَقِيقَةَ التَّقْوى حَتَّى يَدَعَ مَا حَاكَ فِي الصَّدْرِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ ۞ شَرَعَ لَكُم ﴿١٣﴾ ﴾ الشورى. أَوْصَيْنَاكَ يا مُحَمَّدُ وإِيَّاهُ دِينًا وَاحِدًا. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًاۚ ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة: سَبِيلًا وَسُنَّةً.

## ١- باسی باوەڕ و ئەم فەرمموودەی پێغەمبەر ﷺ:
## «ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە»

ئیمان گوفتار و کردارە، زیاد و کەم دەکات، خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (بۆئەوەی باوەڕیان زیاد بکات لەگەڵ ئەو باوەڕەی کە هەیانە)، (وە ڕێنموونیمان بۆ زیاد کردن)، (وە خوا ڕێنموونی زیاد دەکات بۆ ئەوانەی کەوا ڕێنموونی کردوون)، (وە ئەو کەسانەی ڕێنموونی کراون (خوا) ڕێنموونییان زیاد دەکات و پارێزکارییان پێ دەبەخشێت)، وە ئەم فەرماییشتەی خوا: (بۆ ئەوەش کە باوەڕداران زیاتر باوەڕیان دامەزراو بێت)، وە ئەم فەرماییشتەی خوا: ((لەنێو دووڕووان هەیە دەڵێ: (کام لە ئێوە بەم سوورەتە باوەڕی زیادی کرد، جا ئەو کەسانەی باوەڕدارن ئەوە باوەڕیان زیادی کرد)، هەروەها ئەم فەرماییشتەی خوا کە ناوی گەورە و بەرزە: (کەواتە بترسن لێیان، کەچی ئیمانداران بەمە باوەڕیان زیادی کرد)، وە ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: (تەنها باوەڕ و گەردنکەچییان زیادی کرد)، وە خۆشویستن و ڕقلێبوونەوە لەبەر خوا بەشێکە لە ئیمان. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامەیەکی نووسی بۆ عەدی کوڕی عەدی بەم جۆرە: بێگومان ئیمان چەند فەرز و یاسا و سنوور و سوننەتی هەیە، جا هەر کەس ئەوانە هەموو بەتەواوی بەجێ بهێنێ، ئەوە بەشەکانی ئیمانی بەتەواوی بەجێ هێناوە، وە هەر کەسێکیش هەمووی بەجێ نەهێنێ، ئەوە بەشەکانی ئیمانی هەموو بەجێ نەهێناوە، جا ئەگەر خوا تەمەنم پێ بدا و بژیم ئەوە ئەو بەشانەتان بۆ ڕوون دەکەمەوە، هەتا کاری پێ بکەن، وە ئەگەر بمرم ئەوە من سوور نیم لەسەر هاوڕێیەتی (و ژیان) لەگەڵ ئێوەدا، وە ئیبراهیم ﷺ فەرمووی: (بۆئەوەی دڵم ئارام و ئاسوودە بێت) وە موعاز ﷺ بە هاوڕێیەکی

وت: وەرە با دانیشین باوەڕمان نوێ بکەینەوە[١]، وە ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: دڵنیابوون بریتییە لە باوەڕ هەمووی[٢]، وە ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: مرۆڤ ناگاتە پارێزکاری و تەقوای تەواو و ڕاستەقینە هەتا وازنەهێنێ لەو شتانەی خوتووکەی دڵی مرۆڤ دەدات و دڵنیا نییە لێیان، وە موجاهید دەڵێ: مانای ئەم بەشە ئایەتە: ﴿ شَرَعَ لَكُم ﴿١٣﴾ ﴾ الشورى، ڕێبازی ئایین و بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، وە ئیبنو عەباس ﷺ لەسەر ئەم بەشە ئایەتە: ﴿ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة، دەڵێ: (هەر پێغەمبەرێك) ڕێگا و ڕێبازێکمان بۆ دیاری کردووە.

## ٢- بابٌ: دُعَاؤُكُمْ إِيمَانُكُمْ

٨- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا حَنْظَلَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ»[٣].

## ٢- باسێک: دوعا و نزاتان واتە ئیمان و باوەڕتان

٨- ئیبن عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزرێنراوە (کە ئەمانەن): شایەتیدان کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، بەجێهێنانی نوێژەکان بەچاکی، زەکاتدانی سەروەت و سامان و حەجکردن و ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان)).

---

[١] یان: وەرە با دانیشین باوەڕمان زیاد کەین .

[٢] یان: دڵنیابوون بریتییە لە بەشی هەرە گرنگی باوەڕ .

[٣] بروانە: ٤٥١٥.

## ٣- باب أُمُورِ الإِيمَانِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُواْ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾ البقرة، وَقَوْلِهِ ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ﴾ المؤمنون.

## ٣- باسی ئەو شتانەی پەیوەستن بە ئیمانەوە

**باسی ئەو فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند کە دەفەرمووێ: (چاکە تەنها ئەوە نییە کە ڕوو بکەنە لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکوو چاکە ئەومیە کە مرۆڤ باوەڕ بێنێ بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان و پێغەمبەران، وە ماڵ و دارایی خۆی لەگەڵ ئەوەی لەلای خۆشەویستە ببەخشێ بە خزمان و هەتیوان و بێنەوایان و هەژاران و ڕێبوارانی پەککەوتوو و سواڵکەران و لەپێناو ئازادکردنی کۆیلەکاندا، وە نوێژ بکات و زەکات بدات و پەیمانەکانیان ببەنە سەر کاتێ پەیمان دەدەن، وە خۆڕاگر بن لە کاتی هەژاری و نەخۆشی و لە کاتی جەنگدا، ئا ئەوانەن کە ڕاستیان کردووە، وە هەر ئەوانەن پارێزکاران)، وە ئەم فەرماییشتەی خوای گەورە: (بێگومان باوەڕداران ڕزگار و سەرفراز دەبن).**

٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الجُعْفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ».

**٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئیمان شەست و ئەوەندە بەشە، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان)).**

## ٤- بابٌ: الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ

١٠- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي السَّفَرِ وَإِسْمَاعِيلَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ -هو ابن أبي هِنْد- عَنْ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ -وهو ابن عمرو- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ دَاوُدَ عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

## ٤- باسێک: موسوڵمان ئەو کەسەیە کە موسوڵمانان لە زمان و دەستی بێوەی بن

**١٠- عەبدوڵای کوڕی عەمرۆ ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((موسوڵمان (ی ڕاستەقینە) ئەو کەسەیە موسوڵمانان لە زمان و دەستی پارێزراو و بێوەی بن، وە کۆچەریش ئەو کەسەیە واز بێنێ لەوەی ئەوەی خوا قەدەغەی کردووە وازی لێ دەهێنێ)). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ئەبو موعاویە وتی: داود -کە کوڕی ئەبو هیندە- بۆی گێڕاینەوە لە عامیرەوە وتی: لە عەبدوڵام بیست -کە کوڕی عەمرە- ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە. وە عەبدولئەعلا وتی: لە داودەوە گێڕایەوە ئەویش لە عامیرەوە لە عەبدوڵاوە گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

---

[١] بڕوانە: ٦٤٨٤.

## ٥- بابٌ: أَيُّ الإِسْلَامِ أَفْضَلُ؟

١١- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الْقُرَشِيِّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بُرْدَةَ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الإِسْلَامِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ».

## ٥- باسێک: کام موسوڵمانەتییە چاکتر و گەورەترە؟

**١١- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: وتیان: ((ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام کەس لە هەڵگرانی ئیسلام باشترە؟ فەرمووی: ((ئەو کەسەی موسوڵمانان لە زمان و دەستی پارێزراو بن)).**

## ٦- بَابٌ: إِطْعَامُ الطَّعَامِ مِنَ الإِسْلَامِ

١٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ أَيُّ الإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»[١].

## ٦- باسێک: نان و خواردندان بە خەڵکی بەشێکە لە ئیسلام

**١٢- عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و وتی: کام لە تایبەتمەندییەکانی ئیسلام باشترینە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خواردن بدەیت (بە هەژاران) و سەلام بکەیت لەو کەسەی دەیناسی و لەوەی نایناسی)).**

---

[١] بڕوانە: ٢٨، ٦٢٣٦.

## ٧- بابٌ: مِنَ الإِيمَانِ أنْ يُحِبَّ لأخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ

١٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَعَنْ حُسَيْنٍ المُعَلِّمِ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ[1]، عَنْ أَنَسٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ».

## ٧- باسێك: بەشێک لە ئیمان ئەوەیە ئەو شتەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێ

**١٣- ئەنەس ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((هیچ کەسێکتان ئیمانی (تەواو) نابێ، هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا ئیماندارەکەشی پێی خۆش نەبێ)).**

## ٨- بابٌ: حُبُّ الرَّسُولِ ﷺ مِنَ الإِيمَانِ

١٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ».

## ٨- باسێک: خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ بەشێکە لە ئیمان

**١٤- ئەبو هورەیرە ﵁ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێکتان ئیمانی (تەواو) نابێ هەتا من خۆشەویستتر نەبم لەلای لە باوك و منداڵی خۆی)).**

---

[1] ئەم فەرموودەیە بەسەنەد گێڕدراوەتەوە لە قەتادەوە، شوعبە و حوسەینی موعەلیم گێڕاویانەتەوە لە قەتادەوە.

١٥- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ[1]، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ح، وَحَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ».

**١٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەسێکتان ئیمانی (تەواو) نییە هەتا من خۆشەویستتر نەبم لەلای لە باوکی و منداڵی و هەموو خەڵکی بەتێکڕا)).**

# ٩- بابُ حَلاَوَةِ الإِيمَانِ

١٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ»[2].

# ٩- باسی شیرینی ئیمان

**١٦-ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((سێ خەسڵەت هەن هەر کەس تێیدا هەبێ، شیرینی ئیمان هەست پێ دەکات و بەدەستی دەهێنێ، یەکەم: دەبێ خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو کەس خۆشەویستتر بن لەلای، دووەم: وە ئەگەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بووێت، سێیەم: وە پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی، وەك چۆن پێی ناخۆشە کە فڕێ بدرێتە نێو ئاگرەوە)).**

---

[1] ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕشتە گێردراوەتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ.

[2] بڕوانە: ٢١، ٦٠٤١، ٦٩٤١.

## ١٠- بابٌ: عَلاَمَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ

١٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَبْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ»[١].

## ١٠- باسێک: خۆشویستنی ئەنصارییەکان نیشانەی ئیمانداریيە

**١٧- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، فەرموویەتی: ((نیشانەی ئیمانداری خۆشویستنی ئەنصارەکانە، نیشانەی دووڕوویيش ڕقلێبوونەوەی ئەنصارەکانە)).**

## ١١- بابٌ

١٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ عَائِذُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ ﷺ وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا، وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ، وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: «بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ به فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَهُ اللَّهُ، فَهُوَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ، وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ». فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ[٢].

## ١١- باسێک

**١٨- عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ کە بەشداری غەزای بەدری کردبوو یەکێك بووە لە نوێنەر و چاودێرەکان لە شەوی عەقەبەدا (بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ دا)**

[١] بڕوانە: ٣٧٨٤.

[٢] بڕوانە: ٣٨٩٢، ٣٨٩٣، ٣٩٩٩، ٤٨٩٤، ٦٧٨٤،٦٨٠١، ٦٨٧٣، ٧٠٥٥، ٧١٩٩، ٧٢١٣، ٧٤٦٨.

وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەدەوریدا بوون، فەرمووی: ((پەیمانم پێ بدەن لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خوا و دزی نەکەن و داوێنپیسی نەکەن و منداڵەکانتان نەکوژن و بوهتان (بۆ خەڵکی) هەڵنەبەستن لە نێوان دەست و پێتاندا[1]، سەرپێچی (من و کاربەدەستانتان) نەکەن لە چاکەدا، جا هەر کەسێکتان پەیمانەکەی بردە سەر ئەوە پاداشتی لەلای خوایە، وە هەر کەسێکتان پێچەوانەی شتانێکی پەیمانەکەی کرد، جا بەهۆیەوە لە دونیادا سزا درا ئەوە بۆتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی و تاوانی لەسەر نەماوە، هەرکەسێکیش پێچەوانەی پەیمانەکەی کرد پاشان خوا بۆی داپۆشی، ئەوە کاروباری لای خوایە، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ، وە ئەگەر ویستی سزای دەدات))، ئێمەش پەیمانمان پێی دا لەسەر ئەو خاڵانە.

## ١٢- بابٌ: مِنَ الدِّينِ الْفِرَارُ مِنَ الْفِتَنِ

١٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الجِبَالِ وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ»[2].

## ١٢- باسێک: ڕاکردن لە فیتنە و ئاژاوە، لە دین و ئیمانەوەیە

١٩- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نزیکە کە چاکترین ماڵ و سەروەتی موسوڵمان مێگەلەمەڕێك بێت، بیانداتە بەر بەرەو

---

[1] واتە: لە خۆتانەوە بەبێ بەڵگە بوهتان بۆ خەڵکی هەڵمەبەستن، وە مەبەست لە (لەنێوان دەست و پێیەکانتاندا) واتە: لەلایەن خۆتانەوە بەبێ بەڵگە. بڕوانە: إرشاد الساري: ١/١٤٤.

[2] بڕوانە: ٣٦٠٠، ٣٣٠٠، ٦٤٩٥، ٧٠٨٨.

لووتكەی چیاكان و ئەو شوێنانەی كە بارانی لێ دەبارێ (كە دۆڵەكانە)، بەهۆی ئایینەكەیەوە هەڵدێ و دوور دەكەوێتەوە لە ئاژاوە و فیتنە (نەوەك تووشی ببێت))).

## ١٣- بَابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِاللَّهِ))

وَأَنَّ المَعْرِفَةَ فِعلُ القَلْبِ؛ لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ﴿٢٢٥﴾ ﴾ البقرة.

٢٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَمَرَهُمْ، أَمَرَهُمْ مِنَ الأَعْمَالِ بِمَا يُطِيقُونَ، قَالُوا: إِنَّا لَسْنَا كَهَيْئَتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَيَغْضَبُ حَتَّى يُعْرَفَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ ثُمَّ يَقُولُ: «إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَأَعْلَمَكُمْ بِاللَّهِ أَنَا».

## ١٣- باسی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ:
## «من لە هەمووتان زاناترم بە خوا»

وە بێگومان زانین كاری دڵە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڵام ئەو كردەوەیەی بەدڵ بیكەن لێتان وەردەگرێ).

٢٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر فەرمانێكی پێ بكردنایە، فەرمانی پێ دەكردن بەو كارانەی كە بتوانن جێبەجێی بكەن و لە توانایاندا هەبێت، (هاوەڵان) وتیان: ئێمە وەك تۆ نین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونكە بەڕاستی خوا لە گوناهەكانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ تووڕە دەبوو بەجۆرێك تووڕەیی لە ڕوخساریدا دەبینرا و دەزانرا، پاشان دەیفەرموو: ((بێگومان خواناسترین و زاناترینتان بە خوا منم)).

## ١٤- بابٌ: مَنْ كَرِهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ مِنَ الإِيمَانِ

٢١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ: مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ أَحَبَّ عَبْدًا لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لله، وَمَنْ يَكْرَهُ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ»[1].

## ١٤- باسێک: هەر کەسێک پێی ناخۆش بێ بگەڕێتەوە بۆبێباوەڕی، وەک چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە نێو ئاگرەوە (ئەمە) بەشێکە لە ئیمان

**٢١- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سێ خەسڵەت هەن هەر کەس تێیدا بێ شیرینی ئیمان هەست پێ دەکات و بەدەستی دەهێنێ، یەکەم: هەر کەسێك خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو کەس خۆشەویستتر بن لەلای، دووەم: وە هەر کەسێك کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوویێت، سێیەم: وە هەر کەسێك پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی، وەك چۆن پێی ناخۆشە کە فڕێ بدرێتە نێو ئاگرەوە دوای ئەوەی خوا ڕزگاری کردووە)).**

## ١٥- بابُ تَفَاضُلِ أَهْلِ الإِيمَانِ فِي الأَعْمَالِ

٢٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، - عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ

---

[1] بڕوانە: ١٦.

يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ. فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدِ اسْوَدُّوا، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الْحَيَا - أَوِ الْحَيَاةِ، شَكَّ مَالِكٌ- فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ، أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً؟». قَالَ وُهَيْبٌ حَدَّثَنَا عَمْرٌو «الْحَيَاةِ». وَقَالَ: «خَرْدَلٍ مِنْ خَيْرٍ»[1].

## ١٥- باسی جیاوازیی ئیمانداران بەپێی کردەوەکانیان

**٢٢- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((بەهەشتییەکان دەچنە بەهەشتەوە، دۆزەخییەکانیش دەچنە دۆزەخەوە، پاشان خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: ئەوەی بە ئەندازەی دەنکەخەرتەلەیەك ئیمان لە دڵیدا هەیە لە دۆزەخ دەریبێنن، جا خەڵکانێك لە دۆزەخ دەردەهێنرێن کە ڕەش هەڵگەڕاون (بوون بە خەڵووز)، پاشان فڕێ دەدرێنە نێو ڕووباری باران - یان ژیانەوە، مالیك ئەم گومانەی بردووە- (کە ئاوێکە هەرچی بخرێتە نێویەوە زیندووی دەکاتەوە) (ئینجا لاشەیان) دروست دەبێتەوە، وەك چۆن تۆوێك لە قەراغی جۆگەلەیەکدا دەڕوێ و سەوز دەبێت، ئایا نابینی چۆن دەڕوێ و زەرد دەبێ و کەروێشکە[2] دەکات؟ (با لێی دەدات و دەیجوڵێنێ و دیمەنێکی جوانی دەبێت))). وهەیب دەڵێ: عەمر وشەی (نَهَرِ الْحَيَا)ی بە (الْحَيَاةِ) بۆ گێڕاینەوە، وە لە جیاتی (خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ) بە (خَرْدَلٍ مِنْ خَيْرٍ)ی گێڕایەوە.**

---

[1] بڕوانە: ٤٥٨١، ٤٩١٩، ٦٥٦٠، ٦٥٧٤، ٧٤٣٨، ٧٤٣٩.

[2] کەروێشکە: جۆرە جوڵەیەکەی ڕووەکە لەو کاتەی کە با لێی دەدات ئەنجامی دەدات، بەتایبەتی گەنم و جۆ ئەم جوڵەیە دەکەن.

٢٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ، وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا دُونَ ذَلِكَ، وَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ». قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الدِّينَ»[1].

**٢٣- ئەبو سەعیدى خودرى ﷺ دەیوت: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەومدا بینیم خەڵکانێك کراسیان لەبەردا بوو پیشانم دران، هەندێکیان کراسەکانیان (ئەوەندە کورت بوو) نەدەگەیشتە مەمکەکانیان، هەندێکى دیکەیان (کراسەکانیان) لەوەش کورتتر بوو، بەڵام عومەرى کوڕى خەتابم نیشان درا کراسێکى لەبەردا بوو (ئەوەندە درێژ بوو) ڕایدەکێشا بەدواى خۆیدا))، (هاوەڵان) وتیان: ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەو خەوەت بە چى لێك دایەوە؟ فەرمووى: ((بە ئایین لێکم دایەوە)). (واتە: ئایینەکەى کامڵتر بوو لەوانى دیکە).**

## ١٦- بابٌ: الْحَيَاءُ مِنَ الإِيمَانِ

٢٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الحَيَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعْهُ، فَإِنَّ الحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ»[2].

## ١٦- باسێك: شەرمكردن بەشێكە لە ئیمان

**٢٤- سالیمى کوڕى عەبدوڵا لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەرى خوا ﷺ تێ پەڕى بە لاى پیاوێکى ئەنصاڕیدا کە لەوکاتەدا سەرزەنشتى براکەى دەکرد**

---

[1] بڕوانە: ٣٦٩١، ٧٠٠٨، ٧٠٠٩.

[2] بڕوانە: ٦١١٨.

دەربارەی شەرم و حەیا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە، چونکە بێگومان شەرم بەشێکە لە ئیمان)).

**١٧- بابٌ:** ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۝٥﴾ التوبة.

٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمُسْنَدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو رَوْحٍ الْحَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاقِدِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلَامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ».

## ١٧- باسێك: (لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا:) (جا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و تەوبەیان کرد و بەچاکی نوێژیان کرد و زەکاتیان دا، وازیان لێ بێنن)

**٢٥- ئیبنو عومەر ﷺ گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێ کراوە بەوەی کە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگم هەتا شایەتومان دێنن، کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەری خوایە و نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن، جا ئەگەر ئەمەیان کرد خوێن و ماڵ و سامانیان لە من دەپارێزن، مەگەر بە هەقێك ئیسلام بڕیاری دابێ (وەك ئەوەی کەسێکی کوشتبێ، یان ماڵی کەسێکی لابێت) لێپرسینەومیان لەلای خوایە (لەوەی لە دڵ و دەروونیاندایە و شاردوویانەتەوە))).**

# ١٨- بابُ مَنْ قَالَ إنَّ الإيمَانَ هُوَ الْعَمَلُ

لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الزخرف، وَقَالَ عِدَّةٌ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ الحجر، عَنْ قَوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ. وَقَالَ: ﴿ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الصافات.

# ١٨- باسی ئەو کەسەی دەڵێ: بێگومان باوەڕ بریتییە لە کردەوە و کارکردن (بە شەریعەتی ئیسلام)

**بەبەڵگەی ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەمە ئەو بەهەشتەیە کە ئێوە بوونەتە میراتگری و خاوەنی بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەوەیە کە لە دونیادا دەتانکرد)، هەندێ لە زانایان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (جا سوێند بە پەروەردگارت پرسیار دەکەین لە هەموویان دەربارەی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە)، دەڵێن: مەبەست لەوەی کردوویانە وتەی: (لا إله إلاّ الله)یە، وە خوای گەورە دەفەرمووێ: (بۆ وێنەی ئەم بەهەشتە با خەڵکی کار بکەن و خۆیان ماندوو بکەن).**

٢٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، وَمُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَا: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ أَيُّ العَمَلِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: «إِيمَانٌ باللَّهِ وَرَسُولِهِ». قِيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». قِيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «حَجٌ مَبْرُورٌ»[1].

**٢٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا کام کردەوە چاکتر و گەورەترە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئیمان بوون بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ)). وترا: دوای ئەوە چی دیکە؟ فەرمووی: ((جیهاد و تێکۆشان**

---

[1] بڕوانە: ١٥١٩.

له ڕێی خوادا)) وترا: دوای ئەو چی دیکه؟ فەرمووی: ((حەجێکی وەرگیراو که گوناهو ڕیای تێدا نەبێ)).

## ١٩- بَابٌ: إِذَا لَمْ يَكُنِ الإِسْلاَمُ عَلَى الْحَقِيقَةِ وَكَانَ عَلَى الاسْتِسْلاَمِ أَوِ الْخَوْفِ مِنَ الْقَتْلِ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا ﴾ الحجرات، فَإِذَا كَانَ عَلَى الحَقِيقَةِ فَهُوَ عَلَى قَوْلِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾ آل عمران، ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ ﴾ آل عمران.

## ١٩- باسێک: ئەگەر موسوڵمانبوونی بەڕاستی و له دڵەوه نەبێ، بەڵکو موسوڵمانبوونێکی سەرزارەکی و ملکەچبوون بێت یان له ترسی کوشتن بێت[١]

به بەڵگەی ئەم فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (عەرەبە دەشتەکییەکان وتیان: ئیمانمان هێناوە، تۆش (ئەی موحەممەد) بڵێ: ئیمانتان نەهێناوە،

---

[١] سەرنج: ئیمام بوخاری بەم سەرباسە و هێنانەوەی بەڵگەی ئایەت و فەرمودەکە دەیەوێت بڵێ ئیسلامەتی دوو جۆرە: جۆری یەکەم ئیسلامەتی سەرزارەکی و ناچاری کە تەنها ڕووکەشە و ناخی نەگرتۆتەوە و ڕەنگی نەداوەتەوە لەسەر کردەوەکان، جۆری دووەم: ئەو ئیسلامەتییە ڕاستەقینەی کە خودا مەبەستیەتی ئەوەیە کە دڵ و دەروونی مرۆڤی داگرتبێت و ڕەنگی دابێتەوە لەسەر کردەوەکان، بۆیە وشەی (مسلم) بە کەسێک دەوترێت کە بەڕواڵەت موسوڵمان بێت، ئەگەر چی نەزانیت نێو دڵ و دەروونی چۆنە و چی تیایە، وە بەکەسێکیش دەوترێ (مؤمن) کە بەدڵ و کردەوەی ڕووکەشێتی موسوڵمان بێت، بۆیە هەموو (مؤمن)ێک (مسلم)یشە، بەڵام مەرج نییە کە هەموو (مسلم)ێک (مؤمن) بێت. بڕوانە: فتح الباری: ١٠٨/١ و إرشاد الساری: ١١٠/١-١١١.

**بەڵکوو بڵێن: موسوڵمان بووین، (ئەمە گەردنکەچی سەرزارەکی ناچارییە)، بەڵام ئەگەر گەردنکەچی ڕاستەقینە بێت، ئەوا بە واتای ئەم فەرمایشتەی خوایە کە ناوی بەرز و گەورەیە: (بێگومان (تەنها) ئایینی ڕاستەقینە لەلای خوا ئیسلام و گەردنکەچییە). (هەر کەسێك شوێن هەر ئایینێك بکەوێ جگە لە ئیسلام، ئەوە لێی وەرناگیرێ).**

٢٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَامِرُ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْطَى رَهْطًا وَسَعْدٌ جَالِسٌ، فَتَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلاً هُوَ أَعْجَبُهُمْ إِلَيَّ، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَكَ عَنْ فُلاَنٍ؟ فَوَاللَّهِ إِنِّي لأَرَاهُ مُؤْمِنًا. فَقَالَ: «أَوْ مُسْلِمًا». فَسَكَتُّ قَلِيلاً، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي فَقُلْتُ: مَا لَكَ عَنْ فُلاَنٍ؟ فَوَاللَّهِ إِنِّي لأَرَاهُ مُؤْمِنًا، فَقَالَ: «أَوْ مُسْلِمًا». ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ، فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي، وَعَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «يَا سَعْدُ، إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ خَشْيَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ». وَرَوَاهُ يُونُسُ، وَصَالِحٌ، وَمَعْمَرٌ، وَابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[1].

**٢٧- عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس لە سەعدەوە ﷺ گێڕایەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵی دا بە چەند کەسێك سەعدیش دانیشتبوو، (سەعد دەڵێ:) پێغەمبەر ﷺ بەشی پیاوێکی نەدا کە بەلای منەوە چاکترینیان بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی بەشی فلان کەست نەدا؟! سوێند بە خوا من دەزانم ئیمانداره، فەرمووی: ((یان موسوڵمانە))، سەعد دەڵێ: منیش کەمێك بێدەنگ بووم، پاشان زانیاریم دەربارەی ئەو پیاوە وای لێ کردم گەڕامەوە بۆ**

---

[1] بڕوانە: ١٤٧٨.

قسەکەی پێشووم، وتم: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی بەشی فلان کەست نەدا؟ سوێند بە خوا من دەزانم ئیماندارە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((یان موسوڵمانە))، جارێکی دیکە ئەوەی دەمزانی لەبارەی ئەو کابرایە وای لێ کردم قسەکەم جارێکی دیکە وتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ وتەکەی خۆی دووبارە کردەوە، پاشان فەرمووی: ((ئەی سەعد دڵنیا بە من بەشی کەسێك دەدەم لە کاتێکدا کەسێکی دیکە لەو خۆشەویستترە لەلام، ئەترسم خوا بەسەردەمدا بیخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە (بۆیە بەشی ئەوە دەدەم تا دامەزراو بێت لەسەر ئیمان و خوا نەیخاتە دۆزەخەوە) )). ئەم فەرموودەیە یونس و سالیح و مەعمەر و برازایەکی زوهری لە زوهرییەوە گێڕاویانەتەوە.

## ٢٠- بابٌ: إِفْشَاءُ السَّلَامِ مِنَ الإِسْلَامِ

وَقَالَ عَمَّارٌ: ثَلَاثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَدْ جَمَعَ الإِيمَانَ: الإِنْصَافُ مِنْ نَفْسِكَ، وَبَذْلُ السَّلامِ لِلْعَالَمِ، وَالإِنْفَاقُ مِنَ الإِقْتَارِ.

## ٢٠- باسێک: سەلامکردن و بڵاوکردنەوەی بەشێکە لە ئیسلام

عەمار ﷺ دەڵێ: سێ ئاکار (تایبەتمەندی) هەن هەر کەس لە خۆیدا کۆیان بکاتەوە، ئەوە بێگومان ئیمانی لە خۆیدا کۆ کردۆتەوە: دەربارەی خۆت دادگەر بیت[١]، وە سەلامکردن لە گشت خەڵکی، وە بەخشین لە کاتی نەداری و پێویستیدا.

---

[١] هەر فەرمانێکی خوا لەسەرتە بەجێی بێنیت و هەر شتێکیشی لێ قەدەغە کردوویت نەیکەیت و وازی لێ بێنیت. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٦٣/١ .

٢٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»[١].

**٢٨- عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتی: کام کردەوە لە ئیسلامدا باشترینە؟ فەرمووی: ((نان و خواردن بدەی (بە خەڵکی)، سەلام بکەیت لەو کەسەی دەیناسیت و لەو کەسەش کە نایناسیت)).**

## ٢١- بابُ كُفْرَانِ الْعَشِيرِ وَكُفْرٍ دُونَ كُفْرٍ

فِيهِ: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أُرِيتُ النَّارَ فَإِذَا أَكْثَرُ أَهْلِهَا النِّسَاءُ يَكْفُرْنَ»، قِيلَ أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: «يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ»[٣].

## ٢١- باسی سپڵەیی و پێنەزانیی ئافرەتان بەرامبەر مێردیان و کوفری بچووک

**ئەو فەرموودەی لەو بارەیەوە هاتووە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە.**

---

[١] بڕوانە: ١٢، ٦٢٣٦.

[٢] بڕوانە: ٣٠٤.

[٣] بڕوانە: ٤٣١، ٧٤٨، ١٠٥٢، ٣٢٠٢، ٥١٩٧.

٢٩- ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئاگری دۆزەخم نیشان درا بینیم کە زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتان بوون، (لەبەر ئەوەی) ناسوپاسگوزار بوون)) وترا: ئایا بێباوەڕبوون بە خوا؟ فەرمووی: ((سپڵە و ناسوپاسگوزار بوون بەرانبەر هاوسەرەکانیان، دان نانێن بە چاکەکردن لەگەڵیاندا، ئەگەر بەدرێژایی ساڵ چاکە بکەیت لەگەڵ یەکێکیاندا، پاشان شتێکی خراپت لێ ببینێ، دەڵێت: هەرگیز چاکەم لە تۆ نەدیوە)).

## ٢٢- بابٌ: الْمَعَاصِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ وَلاَ يُكَفَّرُ صَاحِبُهَا بِارْتِكَابِهَا إِلاَّ بِالشِّرْكِ

لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ)). وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾ النساء.

## ٢٢- باسێک: ئەو گوناهو تاوانانەی کە کاری سەردەمی نەفامین و خاوەنەکەی کافر ناکرێ بە ئەنجامدانیان جگە لە هاوبەشدانان بۆ خوا

بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ (کە بە ئەبو زەڕی فەرموو): ((بێگومان تۆ کەسێکی سیفەتێکی سەردەمی نەفامیت تێدایە)). لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان خوا لەو کەسە خۆش نابێت کە هاوبەشی بۆ دابنێ، بەڵام جگە لەوە لە هەموو تاوانێك خۆش دەبێ بۆ

هەرکەسێ خۆی بیەوێ، وە هەر کەس هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان بوختانێکی گەورەی بۆ خوا هەڵبەستووە).

٣٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ :حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاصِلٍ الأَحْدَبِ، عَنِ الْمَعْرُورِ قَالَ : لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ، وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ، وَعَلَى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ :إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلاً، فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ، فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ، إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ».[1]

٣٠- مەعڕور دەڵێ: لە ڕەبەزە بە ئەبو زەڕ ﷺ گەیشتم دوو پۆشاکی جوانی لەبەردا بوو، غوڵامەکەشی دوو پۆشاکی جوانی لەبەردا بوو، منیش پرسیارم لێ کرد هۆی ئەوە چییە؟ ئەبو زەڕ ﷺ وتی: لەگەڵ پیاوێکدا (کە بیلال بوو بوو بەشەڕمان) جنێومان بە یەکدی دا، نەنگیم لە دایکی گرت و عەیبدارم کرد، (وتم: کوڕی ئافرەتە ڕەشەکە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەی ئەبو زەڕ، نەنگیت لێ گرت بەهۆی دایکیەوە؟ بێگومان تۆ کەسێکی سیفەتێکی نەفامیت تێدایە، براکانتان کارەکانتان بۆ جێبەجێ دەکەن، خوا خستوونیەتە ژێر دەستی ئێوەوە، جا هەر کەسێك براکەی لەژێر دەستیدا بوو، با لەوەی خۆی دەیخوا دەرخواردی ئەویشی بدات، خۆی چ جۆرە پۆشاکێك دەپۆشێ ئەو جۆرە پۆشاکەش بەو بپۆشێ، داواکاریەکییان لێ مەکەن کە لە تواناباندا نییە بیکەن (و گرانە)، ئەگەر داوای کارێکی قورس و گرانیشتان لێ کردن هاوکارییان بکەن)).

---

[1] بڕوانە: ٢٥٤٥، ٦٠٥٠.

## ٢٣- بابٌ: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ﴾ الحجرات، فَسَمَّاهُمُ الْمُؤْمِنِينَ

٣١- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْمُبَارَكِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ وَيُونُسُ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: ذَهَبْتُ لأَنْصُرَ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِى أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أَنْصُرُ هَذَا الرَّجُلَ. قَالَ: ارْجِعْ، فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: «إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ»[١].

## ٢٣- باسێک: (ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران دژ بەیەک جەنگان، ئەوا ئاشتەوایی بکەن لە نێوانیاندا) بڕوانە خودا بە باوەڕدار ناوی بردوون

**٣١- ئەحنەف کوڕی قەیس دەڵێ: (ڕۆیشتم تا یارمەتی ئەو پیاوە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ) بدەم (لە جەنگی جەمەلدا)، جا ئەبو بەکرە پێم گەیشت، وتی: دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆیت؟ وتم: دەچم یارمەتی ئەو پیاوە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) دەدەم، وتی: بگەڕێوە، چونکە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر دوو موسوڵمان بە شمشێرەکانیان[٢] ڕووبەڕووی یەکدی بوونەوە (بۆ جەنگکردن لەگەڵ یەکدی)، ئەوە بکوژ و کوژراو لە ئاگری دۆزەخدان))، (ئەبو بەکرە دەڵێ:) وتم: ئەی**

---

[١] بڕوانە: ٦٨٧٥، ٧٠٨٣.

[٢] یان هەر چەکێکی دیکە.

**پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بکوژەکە دەچێتە دۆزەخەوە، ئەی کوژراوەکە لەبەرچی، تاوانی چییە؟ فەرمووی: ((لەبەرئەوەی بەدڵنیاییی ئەویش سوور بووە لەسەر کوشتنی براکەی (بۆیە دەچێتە دۆزەخەوە))).**

## ٢٤- بابٌ: ظُلْمٌ دُونَ ظُلْمٍ

٣٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ ح[1]. قَالَ: وَحَدَّثَنِي بِشْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾ ﴾ الأنعام. قَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَيُّنَا لَمْ يَظْلِمْ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ لقمان[2].

## ٢٤- باسێک: ستەمی بچووکتر

## (لە ستەمی گەورە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات)

**٣٢- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕواکەیان تێکەڵ بە ستەم (واتە: هاوبەشدانان بۆ خوا) نەکردووە). هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: کام لە ئێمە ستەمی نەکردووە؟ ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێگومان هاوبەشدانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە).**

---

[1] ئیمام بوخاری ئەم فەرموودەیەی بە دوو سەنەد و ڕشتە گێڕاوەتەوە. پیتی (ح) بەلای فەرموودەناسەکانەوە واتە: گۆڕان لە سەنەدێکەوە بۆ سەنەدێکی دیکە.

[2] بڕوانە: ٣٣٦٠، ٣٤٢٨، ٣٤٢٩، ٤٦٢٩، ٤٧٧٦، ٦٩١٨، ٦٩٣٧.

## ٢٥- بابُ عَلَامَاتِ الْمُنَافِقِ

٣٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ أَبُو الرَّبِيعِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ أَبُو سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ»[1].

## ٢٥- باسی نیشانەکانی کەسی دووڕوو

**٣٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((نیشانەی (کەسی) دووڕوو سیانن: هەر کات قسەی کرد درۆ دەکات، کاتێك بەڵێنێکی دا نایباتە سەر، ئەگەر شتێکی پێ سپێردرا ناپاکی لێ دەکات)).**

٣٤- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ». تَابَعَهُ شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ[2].

**٣٤- عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((چوار (سیفەت) هەن لە هەر کەسێکدا هەبن ئەوە دووڕوویێکی تەواوە و هەر کەسێکیش سیفەتێکیانی تێدابێ لەو سیفەتانە، ئەوە سیفەتێکی دووڕوویی تێدایە هەتا وازی لێ دێنێ، کاتێ شتێکی پێ سپێردرا ناپاکی لێ بکات، وە کاتێ قسە بکات درۆ بکات، کاتێ پەیمانێك بدات و نەیباتە سەر، وە کاتێ کێشە و ناکۆکی هەبێ لەگەڵ خەڵکدا جنێو**

---

[1] بڕوانە: ٢٦٨٢، ٢٧٤٩.

[2] بڕوانە: ٢٤٥٩، ٣١٧٨.

بدات)). شوعبەش لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتە بۆ فەرموودەی پێشوو کە عەبدوڵای کوڕی عەمر گێڕاویەتەوە.

## ٢٦- بابٌ: قِيَامُ لَيْلَةِ الْقَدْرِ مِنَ الإِيمَانِ

٣٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأعرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يَقُمْ لَيْلَةَ القَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[1].

## ٢٦- باسێک: هەستان و زیندووکردنەوەی شەوی قەدر بەشێکە لە ئیمان

٣٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس شەوی قەدر هەستێ (و بە پەرستش زیندووی بکاتەوە) و باوەڕی پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت، (خوا) لە هەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ)).

## ٢٧- بابٌ: الْجِهَادُ مِنَ الإِيمَانِ

٣٦- حَدَّثَنَا حَرَمِيُّ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنِا عُمَارَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ بْنُ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «انْتَدَبَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبيلِهِ -لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا إِيمَانٌ بِي وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي- أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ، أَوْ أُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، وَلَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا قعَدْتُ خَلفَ سَرِيَّةٍ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيَا، ثمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٧، ٣٨، ١٩٠١، ٢٠٠٨، ٢٠٠٩، ٢٠١٤.

[2] بڕوانە: ٢٧٨٧، ٢٧٩٧، ٢٩٧٢، ٣١٢٣، ٧٢٢٦، ٧٢٢٧، ٧٤٥٧، ٧٤٦٣.

## ٢٧- باسێک: خەبات و تێکۆشان بەشێکە لە ئیمان

٣٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((خوا دەستەبەر (زامن)ی کردووە بۆ ئەو کەسەی لەپێناوی خوادا بڕوات بۆ غەزا و تێکۆشان -(خوا دەفەرمووێ:) ئەگەر پاڵنەری دەرچوونەکەی تەنها باوەڕبوونی بە من و بەڕاستدانانی پێغەمبەرانم بێت- کە بیگەڕێنمەوە (بۆ نێو ماڵ و منداڵی) لەگەڵ پاداشت و دەستکەوتێك یان (ئەگەر شەهید بێت و) بیخەمە بەهەشتەوە، وە ئەگەر سەخت و بارگرانی نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، هەرگیز لە هیچ دەستە سوپایەك دوا نەدەکەوتم و بەجێ نەدەمام، وە ئاواتەخواز بووم لەپێناوی خوادا بکوژرامایە، پاشان زیندوو بوومایەوە، پاشان بکوژرامایە، پاشان زیندوو بوومایەوە، پاشان بکوژرامایە)).

## ٢٨- بابٌ: تَطَوُّعُ قِيَامِ رَمَضَانَ مِنَ الإِيمَانِ

٣٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[1].

## ٢٨- باسێک: سوننەتی شەونوێژ (تەراویح) کردنی ڕەمەزان بەشێکە لە ئیمان

٣٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس لە (شەوانی) ڕەمەزاندا بە باوەڕی تەواو و ئومێدی پاداشتی دواڕۆژەوە شەونوێژ (تەراویح) بکات، خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ)).

---

[1] بڕوانە: ٣٥.

## ٢٩- بَابٌ: صَوْمُ رَمَضَانَ احْتِسَابًا مِنَ الإِيمَانِ

٣٨- حَدَّثَنَا ابنُ سَلَامٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[1].

## ٢٩- باسێک: ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان بە هیوای پاداشتی دواڕۆژ لە ئیمانەوەیە

**٣٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێ بە باوەڕی پتەو و چاوەڕوانی پاداشتەوە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ، خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبورێ)).**

## ٣٠- بَابٌ: الدِّينُ يُسْرٌ

وَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ: ((أَحَبُّ الدِّينِ إِلَى اللَّهِ الحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ)).

٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلَامِ بْنُ مُطَهَّرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنِ مَعْنِ بْنِ مُحَمَّدٍ الغِفَارِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلا غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنَ الدُّلْجَةِ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٥.

[2] بڕوانە: ٥٦٧٣، ٦٤٦٣، ٧٢٣٥.

## ٣٠- باسێک: ئایین (ی ئیسلام) ئاسانه

وه باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((خۆشەویسترین خەسڵەتی ئایین لەلای خوا دینداریيەکی ڕاستی ئاسانە)).

٣٩- ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((بێگومان ئایین ئاسانە، هەرگیز نەبووە کەسێ ئایینی زۆر بەتوندی گرتبێ (ڕۆچووبێ لە بەندایەتیدا)، حەتمەن ئایین زاڵ بووە بەسەریدا و بەزاندوویەتی (بۆی نەچۆتە سەر و وازی لێ هێناوە)، کە وا بوو ڕاستەڕێ بگرن[1]، وە (ئەگەر نەتانتوانی بگەنە چڵەپۆپە لە چاکەکردندا) نزیك ببنەوە لێی ئەوەندەی بۆتان دەکرێ، موژدە بێ لێتان[2] (لەسەر بەردەوامیتان لە پەرستشدا)، پشت ببەستن (بە ئەنجامدانی لەم سێ کاتەدا) بەیانییان و ئێواران و ساتەکانی کۆتایی لە شەودا)).

## ٣١- بابٌ: الصَّلَاةُ مِنَ الإِيمَانِ

وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، يَعْنِي صَلاَتَكُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ.

٤٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ أَوَّلَ مَا قَدِمَ الْمَدِينَةَ نَزَلَ عَلَى أَجْدَادِهِ -أَوْ قَالَ أَخْوَالِهِ- مِنَ الأَنْصَارِ، وَأَنَّهُ صَلَّى قِبَلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا -أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا- وَكَانَ يُعْجِبُهُ أَنْ تَكُونَ قِبْلَتُهُ قِبَلَ الْبَيْتِ، وَأَنَّهُ صَلَّى أَوَّلَ صَلاَةٍ صَلاَّهَا صَلاَةَ الْعَصْرِ، وَصَلَّى مَعَهُ قَوْمٌ، فَخَرَجَ رَجُلٌ مِمَّنْ صَلَّى مَعَهُ، فَمَرَّ عَلَى

---

[1] وە لەسەر ڕاستی و دروستی بن بەبێ زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمیکردن.

[2] یان پاداشتتان پێ دەگات لەسەربەردەوامیتان لەسەر کاری باش.

أَهْلِ مَسْجِدٍ، وَهُمْ رَاكِعُونَ، فَقَالَ: أَشْهَدُ بِاللَّهِ لَقَدْ صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَلَ مَكَّةَ. فَدَارُوا كَمَا هُمْ قِبَلَ الْبَيْتِ، وَكَانَتِ الْيَهُودُ قَدْ أَعْجَبَهُمْ إِذْ كَانَ يُصَلِّي قِبَلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، وَأَهْلُ الْكِتَابِ، فَلَمَّا وَلَّى وَجْهَهُ قِبَلَ الْبَيْتِ أَنْكَرُوا ذَلِكَ. قَالَ زُهَيْرٌ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ فِي حَدِيثِهِ هَذَا أَنَّهُ مَاتَ عَلَى الْقِبْلَةِ قَبْلَ أَنْ تُحَوَّلَ رِجَالٌ وَقُتِلُوا، فَلَمْ نَدْرِ مَا نَقُولُ فِيهِمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة[1].

## ٣١- باسێک: نوێژکردن بەشێکە لە ئیمان

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند کە دەفەرمووێ: (خوا هەرگیز ئیمانتان (نوێژەکانتان) بەزایە نادات و نافەوتێنێ).**

**٤٠- بەڕا ﷺ دەگێڕێتەوە سەرەتا کە پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، لەلای باوانی -یان وتی: خاڵوانی- دابەزی کە (خاڵوانی) ئەنصارِی بوون، بۆ ماوەی شازدە مانگ -یان حەڤدە مانگ- ڕوو بە (بەیتولمەقدیس) نوێژی کرد، بەڵام حەزی دەکرد کەعبە ببێتە ڕووگەی؟ (خوا ئاواتەکەی بەجێ هێنا) وە یەکەم نوێژ کە (ڕوو بە کەعبە) کردی نوێژی عەسر بوو، کۆمەڵێك لە موسوڵمانانیش ئەو نوێژەیان لەگەڵیدا کرد، جا پیاوێك لەوانەی نوێژی لەگەڵیدا کرد لە مزگەوت چووە دەرەوە، تێ پەڕی بەلای مزگەوتێکدا خەڵکەکەی نوێژیان دەکرد (ڕوو بە بەیتولمەقدیس) ئەویش پێی وتن: سوێند دەخۆم بە خوا من نوێژ(ی عەسر)م لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد ڕوو بە کەعبە، ئیدی ئەوانیش لەنێو نوێژەکەیاندا ڕوویان وەرچەرخاند ڕوو بە کەعبە، (نوێژەکەیان تەواو کرد)، جوولەکە و خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان حەزیان دەکرد و پێیان خۆش بوو کە**

---

[1] بڕوانە: ٣٩٩، ٤٤٨٦، ٤٤٩٢، ٧٢٥٢.

پێغەمبەر ﷺ ڕوو بە بەیتولمەقدیس نوێژی دەکرد، کەچی کاتێ ڕووی کردە کەعبە ئەومیان پێ ناخۆش بوو، ڕەخنەیان لێ گرت. زوهەیر دەڵێ: ئەبو ئیسحاق لە بەرائەوە بۆی گێڕاینەوە لەو فەرموودەدا: کە پیاوانێك پێش ئەوەی قیبلە بگۆڕدرێ مردن، یان کوژران ڕوویان لە بەیتولمەقدیس کردبوو (لە کاتی نوێژەکانیان)، جا نەماندەزانی دەربارەیان چی بڵێین، ئیدی خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (خوا هەرگیز نوێژەکانتان بەزایە نادات).

## ٣٢- بابُ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ

٤١- قَالَ مَالِكٌ: أَخْبَرَنِي زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ أَخْبَرَهُ، أَنَهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا أَسْلَمَ العَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلَامُهُ يُكَفِّرُ اللَّهُ عَنْهُ كُلَّ سَيِّئَةٍ كَانَ زَلَفَهَا، وَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ القِصَاصُ، الحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا إِلَّا أَنْ يَتَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهَا».

## ٣٢- باسی جوانیی موسوڵمانێتی مرۆڤ

٤١- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئەگەر بەندەیەك موسوڵمان بوو، وە موسوڵمانێکی باش و چاك بوو، ئەوە خوا لە هەموو گوناهەکانی کە لە ڕابردوودا کردوویەتی خۆش دەبێت، ئیدی دوای (موسوڵمانبوونەکەی) تۆڵە و پاداشت هەیە: چاکە یەك بە دە تا یەك بە حەوت سەد پاداشتی بۆ دەنووسرێ، خراپەش بەوێنەی خۆی (یەك بە یەکە) سزای بۆ دەنووسرێ، مەگەر ئەوەی خوا چاوپۆشی لێ بکات (ئەوا هیچی لەسەر نانووسێ))).

٤٢- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلَامَهُ فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، وَكُلُّ سَيِّئَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِمِثْلِهَا».

**٤٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان دیندارییەکەی چاك بوو، ئەوا هەر چاکەیەك کە دەیکات بە دە هێندە تا حەوت سەد هێندە بۆی دەنووسرێ، وە هەر خراپەیەك کە دەیکات بە یەك خراپە وەك خۆی بۆی دەنووسرێ)).**

## ٣٣- بابٌ: أَحَبُّ الدِّينِ إِلَى اللَّهِ أَدْوَمُهُ

٤٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْن الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ، قَالَ: «مَنْ هذِه؟». قَالَتْ: فُلَانَةُ. تَذْكُرُ مِنْ صَلَاتِهَا. قَالَ: «مَهْ، عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا». وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَيهِ مَا دَامَ عَلَيهِ صَاحِبُهُ[1].

## ٣٣- باسێک: خۆشەویستترین دینداری لەلای خوا بەردەوامترینیەتی

**٤٣- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای (عائشە) لەو کاتەدا ئافرەتێکی لەلا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم ئافرەتە کێیە؟)) وتی: فلانە ئافرەتە باسی نوێژەکەی دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دەست**

---

[1] بڕوانە: ١١٥١.

**هەڵگرە! (واتە: ستاییشی مەکە)، ئەوەندە بەندایەتی بکەن کە لە توانادایە، چونکە سوێند بە خوا، خوا (لە پاداشتدانەوەتان) بێزار و وەڕەس نابێ هەتا ئێوە (لە بەندایەتی) وەڕەس نەبن، وە خۆشەویستترین دینداری لەلای خوا ئەوەیە خاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری)).**

## ٣٤- بابُ زِيَادَةِ الإِيمَانِ وَنُقْصَانِهِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ ﴾ الكهف. وقوله: ﴿ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنًا ﴿٣١﴾ ﴾ المدثر. وَقَالَ: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة،[1] فَإِذَا تَرَكَ شَيْئاً مِنَ الكَمَالِ فَهُوَ نَاقِصٌ.

٤٤- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ شَعِيرَةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ بُرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ أَبَانُ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «مِنْ إِيمَانٍ». مَكَانَ: «مِنْ خَيْرٍ»[2].

---

[1] سەرنج: ئیمام بوخاری ئەم ئایەتانەی هێناوە، وەک بەڵگە لەسەر ئەوەی ئیمان زیاد و کەم دەکات، پاشان لەسەر ئەو ئایەتە: ﴿ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئایینەکەتانم بۆ تەواو کردوون، دەیەوێ بڵێ: مادام ئایینم بۆ تەواو کردوون، کەواتە پێشتر ناتەواو بووە جا تەواوی کردووە، کەواتە ئیمان ناتەواو دەبێ و تەواویش دەبێ. بڕوانە إرشاد الساري: ١/١٨٩.

[2] بڕوانە: ٤٤٧٦، ٦٥٦٥، ٧٤١٠، ٧٤٤٠، ٧٥٠٩، ٧٥١٠، ٧٥١٦.

# ٣٤- باسی زیادکردن و کەمکردنی باوەڕ و ئیمان

وە ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند کە دەفەرمووێ: (ڕێنموونیمان بۆ زیاد کردن)، ئەم فەرماییشتەش (ئەوانەی باوەڕیان هێناوە باوەڕەکەیان زیاد دەکات) وە دەفەرمووێ: (ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواو کردن)، جا کەواتە ئەگەر شتێك لە تەواوی و کامڵی وازی لێ بهێنرێ ئەوە (باوەڕ و ئیمان) ناتەواوە.

٤٤- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) و کێشی دەنکەجۆیەك لە خێر لە دڵیدا هەبێ لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە، وە ئەو کەسەش بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) کێشی دەنکەگەنمێك لە خێر لە دڵیدا هەبێ، لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە، هەروەها ئەو کەسەش بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) کێشی گەردیلەیەك لە خێر لە دڵیدا هەبێ لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە (بە هەتاهەتایی لە دۆزەخدا نابێ))). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ئەبان دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەنەس لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆی گێڕاینەوە، بەم جۆرە (مِنْ إِيـمَانٍ: لە ئیمان) لە جێگای (مِنْ خَيْرٍ: لە چاکە).

٤٥- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ، سَمِعَ جَعْفَرَ بْنَ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا أَبُو الْعُمَيْسِ، أَخْبَرَنَا قَيْسُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ قَالَ لَهُ:يا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا، لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا. قَالَ: أَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴿٣﴾﴾ المائدة. قَالَ عُمَرُ: قَدْ عَرَفْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ وَالْمَكَانَ الَّذِى نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ قَائِمٌ بِعَرَفَةَ يَوْمَ جُمُعَةٍ[1].

---

[1] بڕوانە: ٤٤٠٧، ٤٦٠٦، ٧٢٦٨.

**٤٥- عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە جوولەکەکان پێی وت: ئەی پێشەوای باوەڕداران، ئایەتێك لە قورئانەکەتاندا هەیە دەیخوێننەوە، ئەگەر ئەو ئایەتە بۆ ئێمەی گەلی جوولەکە دابەزیبایە، ڕۆژی دابەزینی ئەو ئایەتەمان دەکردە جەژن، عومەر وتی: کام ئایەتە؟ (کابرای جوولەکە) وتی:** ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ۝٣﴾ المائدة. **واتە: (ئایینەکەتانم بۆ تەواو کردن)، عومەر وتی: بەدڵنیاییەوە دەزانین ئەو ڕۆژە و ئەو شوێنەی کە ئەو ئایەتەی تێدا دابەزی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی هەینی بوو، لەو کاتەدا لەسەر کێوی عەرەفە ڕاوەستا بوو.**

## ٣٥- بابٌ: الزَّكَاةُ مِنَ الإِسْلاَمِ

وَقَوْل اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥﴾ البينة.

٤٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَمِّهِ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، ثَائِرُ الرَّأْسِ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ، وَلاَ يُفْقَهُ مَا يَقُولُ حَتَّى دَنَا، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الإِسْلاَمِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ». فَقَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: «لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَصِيَامُ رَمَضَانَ». قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: «لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ». قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الزَّكَاةَ. قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: «لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ». قَالَ فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لاَ أَزِيْدُ عَلَى هَذَا وَلاَ أَنْقُصُ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٨٩١، ٢٦٧٨، ٦٩٥٦.

# ٣٥- باسێک: زەکاتدان بەشێکە لە ئیسلام

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەوان (جوولەکە و گاوران) فەرمانی ئەوەیان پێ کرابوو کە تەنیا خوا بپەرستن بەدڵسۆزی و گەردنکەچ بن بۆی، وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەوەیە ئایینی ڕاست و دروست (کە ئیسلامە)).

٤٦- تەلحەی کوڕی عوبەیدولاّ ﷺ دەڵێ: پیاوێکی قژئاڵۆز و ئاڵسکاوی لە خەڵکی نەجد هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، دەنگەدەنگی دەبیستراو نەدەزانرا و لێی حاڵی نەدەبووی چی دەڵێ، تا نزیك بۆیەوە، ئەو کات (زانیمان) پرسیار دەکات دەربارەی (ئەوەی کە) ئیسلام چییە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((لە شەو و ڕۆژێکدا ئەنجامدانی پێنج نوێژە))، پیاوەکە وتی: ئەی جگە لەمانە نوێژی دیکەم لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر مەگەر خۆت نوێژی سوننەت بکەی))، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان))، پیاوەکە وتی: جگە لەوە ڕۆژووی دیکەم لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر مەگەر ڕۆژووی سوننەت بگری))، تەلحە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی زەکاتیشی بۆ کرد، پیاوەکە وتی: جگە لەو زەکاتە هیچی دیکەم لەسەرە ببیەخشم؟ فەرمووی: ((نەخێر مەگەر خۆت ببیەخشی وەك خێر)) تەلحە دەڵێ: پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت و دەیوت: سوێند بە خوا نە لەمە زیاتر دەکەم نە کەمتر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((سەرفراز و ڕزگار دەبێ ئەگەر ڕاست بکات)).

## ٣٦- بَابٌ: اتِّبَاعُ الجَنَائِزِ مِنَ الإِيمَانِ

٤٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَلِيٍّ المَنْجُوفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ عَنِ الحَسَنِ وَمُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا وَيُفْرَغَ مِنْ دَفْنِهَا، فَإِنَّهُ يَرْجِعُ مِنَ الأَجْرِ بِقِيرَاطَيْنِ، كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ، وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ تُدْفَنَ فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ». تَابَعَهُ عُثْمَانُ المُؤَذِّنُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، نَحْوَهُ[1].

## ٣٦- باسێک: شوێنکەوتنی تەرمی مردوو بەشێکە لە ئیمان

**٤٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك بەئیمان و چاوەڕوانی پاداشتەوە شوێن تەرمی موسوڵمانێك بکەوێ و لەگەڵیدا بێ تا نوێژی لەسەر دەکرێ و لە ناشتنی دەبنەوە، ئەوە بێگومان بە دوو قیرات[2] پاداشتەوە دەگەڕێتەوە، هەر قیراتێکیش بە ئەندازەی کێوی ئوحودە، بەڵام کەسێك نوێژی لەسەر کرد، ئینجا پێش ئەوەی بنێژرێ گەڕایەوە، ئەوە بە قیراتێك پاداشتەوە دەگەڕێتەوە)). بۆ پاڵپشتی ئەم فەرموودەیە عوسمانی بانگبێژ دەڵێ: عەوف لە موحەممەدەوە بۆی گێڕاینەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاوشێوی فەرموودەی پێشووی گێڕاوەتەوە.**

---

[1] بڕوانە: ١٣٢٤، ١٣٢٣، ١٣٢٥.

[2] قیرات: بریتییە لە کێشانەیەک کە بەپێی ڕۆژگار گۆڕاوە، هەروەها لە هەندێک وڵات و شوێن قیرات بە نیوەی دەیەکی دینارێکیش وتراوە، لێرەدا مانای یەکەم گونجاوترە، لەم فەرموودەیەشدا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: کێشانەی هەریەکەیان بەئەندازەی قورسایی کێوی ئوحودە، واتە: ئەو کەسەی بەو مەرجانە شوێن جەنازە بکەوێت، دوو جار بەئەندازەی قورسایی کێوی ئوحود لەگەڵ خۆی دەباتەوە.

## ٣٧- بَابُ خَوْفِ الْمُؤْمِنِ مِنْ أَنْ يَحْبَطَ عَمَلُهُ وَهُوَ لاَ يَشْعُرُ

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ: مَا عَرَضْتُ قَوْلِي عَلَى عَمَلِي إِلَّا خَشِيتُ أَنْ أَكُونَ مُكَذِّبًا[1]. وَقَالَ ابن أَبِي مُلَيْكَةَ: أَدْرَكْتُ ثَلَاثِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ كُلُّهُمْ يَخَافُ النِّفَاقَ عَلَى نَفْسِهِ، مَا مِنْهُمْ أَحَدٌ يَقُولُ: إِنَّهُ عَلَى إِيمَانِ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ. وَيُذْكَرُ عَنِ الحَسَنِ مَا خَافَهُ إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا أَمِنَهُ إِلَّا مُنَافِقٌ. وَمَا يُحْذَرُ مِنَ الإِصْرَارِ عَلَى النفَاقِ وَالْعِصْيَانِ مِنْ غَيْرِ تَوْبَةٍ؛ لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾﴾ آل عمران.

## ٣٧- باسی ترسی باوەڕدار لەوەی کردەوە چاکەکانی بەتاڵ و پووچەڵ بێتەوە و ئەویش هەستی پێ نەکات

**ئیبراهیمی تەیمی (لە زانایانی تابیعینە) دەڵێ: هەرکات قسەی خۆم لەگەڵ کردەوەم بەراورد کردبێ حەتمەن ترساوم بەدرۆ بخرێمەوە، ئیبنو ئەبو مولەیکە دەڵێ: بە سی (٣٠) هاوەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گەیشتووم، هەر هەموویان ترسی دووڕوویيان هەبوو لە خۆیان، هیچ کام لەوان نەبوو بڵێ: لەسەر باوەڕێکە وەك باوەڕی جیبریل و میکائیل (علیهما السلام)، وە لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: تەنها باوەڕدار لە خوا دەترسێ، تەنها دووڕووش بێباك و دڵنیایە و لە خوا**

---

[1] (مُكَذِّبًا) ئەم وشەیە بە کەسرەی (ذال- مُكَذِّبًا) هاتووە، وە بە فەتحەی (ذال- مُكَذَّبًا) هاتووە، ئەگەر هی دووەمیان وەرگرین کە لە سەرەوە هاتووە، واتە: هەرکات قسەکانم لەگەڵ کردەوەکانم بەراورد کردبێت، ترساوم لەوەی بەدرۆ بخرێمەوە لەلایەن چواردەورەکەم، بەڵام هی یەکەم (مُكَذِّبًا) وەرگرین گونجاوترە، وە زۆربەی گێڕەرەوانی صەحیحی بوخاری بەو جۆرەیان گێڕاوەتەوە، واتە: ترساوم کردەوەکانم قسەکانم بەدرۆ بخاتەوە، واتە: کردەوەی چاکم زۆر نییە لەو ئاستەدا بم، بڕوانە فتح الباري:١/١٤٧-١٤٨ .

ناترسێ، ناترسێ لە بەردەوامبوون لەسەر دووڕوویی و سەرپێچی و تاوانکردن بێئەوەی تەوبە بکات، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە بەردەوام نین لەسەر ئەو تاوانانەی کە کردبوویان لە کاتێکدا دەزانن تاوانە)).

٤٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ زُبَيْدٍ قَالَ: سَأَلْت أَبَا وَائِلٍ عَنِ الْمرْجِئَةِ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[1].

٤٨- عەبدوڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((جنێودان بە موسوڵمان دەرچوونە لە گوێڕایەڵی خوا، جەنگکردنیش لە دژی وەك کوفر و بێباوەڕییە)).

٤٩- أَخْبَرَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْن جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يُخْبِرُ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَتَلَاحَى رَجُلَانِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: «إِنِّي خَرَجْتُ لأُخْبِرَكُمْ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَإِنَّهُ تَلَاحَى فُلَانٌ، وَفُلَانٌ، فَرُفِعَتْ وَعَسَى أَنْ يَكُون خَيْرًا لَكُمْ، التَمِسُوهَا فِي السَّبْعِ وَالتِّسْعِ وَالْخَمْسِ»[2].

٤٩- عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ هاتە دەرەوە، بۆ ئەوەی (کاتی) شەوی قەدر (بە موسوڵمانان) ڕابگەیەنێ، لەو کاتەدا دوو پیاو لە موسوڵمانان هەرا و ناکۆکییان بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

---

[1] بڕوانە: ٦٠٤٤، ٧٠٧٦.

[2] بڕوانە: ٢٠٢٣، ٦٠٤٩.

((من له مالْ هاتمه دەرەوه تا پێتان بلێم شەوی قەدر چ شەوێکه، بەلاّم فلاّن کەس و فلاّن کەس بوو بە دەمەقالێ و کێشەیان بەهۆیەوه لەبیرم برایەوه، جا بەڵکوو لەبیربردنەوەکەم چاکتر بێ بۆتان، ئێوه له شەوی بیست و حەوت و بیست و نۆ و بیست و پێنجی ڕەمەزاندا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا)).

## ٣٨- بابُ سُؤَالِ جِبْرِيلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الإِيمَانِ وَالإِسْلَامِ وَالإِحْسَانِ وَعِلْمِ السَّاعَةِ

وَبَيَانِ النَّبِيِّ ﷺ لَهُ، ثُمَّ قَالَ: ((جَاءَ جِبْرِيلُ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ)). فَجَعَلَ ذَلِكَ كُلَّهُ دِينًا، وَمَا بَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ لِوَفْدِ عَبْدِ الْقَيْسِ مِنَ الإِيمَانِ، وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ آل عمران.

٥٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا أَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ بَارِزًا يَوْمًا لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ: مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ: «الإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَبِلِقَائِهِ وَرُسُلِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ». قَالَ: مَا الإِسْلاَمُ؟ قَالَ: «الإِسْلاَمُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكَ بِهِ، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ». قَالَ: مَا الإِحْسَانُ؟ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ». قَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: «مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَسَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذَا وَلَدَتِ الأَمَةُ رَبَّهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رُعَاةُ الإِبِلِ الْبُهْمُ فِي الْبُنْيَانِ، فِي خَمْسٍ لاَ يَعْلَمُهُنَّ إِلاَّ اللَّهُ». ثُمَّ تَلاَ النَّبِيُّ ﷺ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان. الآيَةَ. ثُمَّ أَدْبَرَ فَقَالَ: «رُدُّوهُ». فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا. فَقَالَ: «هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَ يُعَلِّمُ النَّاسَ دِينَهُمْ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: جَعَلَ ذَلِكَ كُلَّهُ مِنَ الإِيمَانِ[1].

---

[1] بڕوانه: ٤٧٧٧.

# ٣٨- باسی پرسیارکردنی جیبریل له پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان، وه زانینی کاتی هاتنی دواڕۆژ

وه ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوه جیبریل ﷺ بوو هات شارەزاتان بکات له ئایینەکەتان)، جا پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەو پرسیارانەی به ئایین ناو برد، هەروەها ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاندی عەبدولقەیسی ڕوون کردەوه دەربارەی ئیمان، وه فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند که دەفەرمووێ: (وه هەر کەسێك جگه له ئیسلام ئایینێکی دیکه هەڵبژێرێ لێی وەرناگیرێ، وه له ڕۆژی دواییدا له ڕیزی دۆڕاوەکانه).

٥٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ له شوێنێکدا بوو (وەکوو دوانگه)، له خەڵکەکەوه دیار بوو، لەو کاتەدا جیبریل ﷺ (له شێوەی پیاوێکدا) هات بۆ لای و فەرمووی: ئیمان چییه؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئیمان ئەوەیه باوەڕ بێنی به (بوونی) خوا و به فریشتەکانی و به دیداری خوا له ڕۆژی دواییدا، وه باوەڕ بێنی به پێغەمبەرانی و به زیندووبوونەوه))، فەرمووی: ئیسلام چییه؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئیسلام ئەوەیه: خوا بپەرستی و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەی، بەچاکی نوێژەکان بکەی، زەکاتی فەرزکراو بدەی، ڕۆژووی ڕەمەزان بگری))، فەرمووی: ئیحسان چییه؟ فەرمووی: ((وا خوا بپەرستی وەك ئەوەی به چاوت خوا ببینی، خۆ ئەگەر تۆش خوا نەبینی خۆ ئەو (بەردەوام) تۆ دەبینێ))، پاشان فەرمووی: کەی ڕۆژی دوایی دێ؟ فەرمووی: ((پرسیارلێکراو شارەزاتر نییه له پرسیارکەر، بەڵام هەواڵی نیشانەکانیت پێ دەدەم، کاتێك دێت که منداڵ به چاوی سووك سەیری دایك و باوکی دەکات، وه ئەگەر شوانی حوشتری ڕەشتاڵه کۆشك و تەلاری بەرزیان دروست کرد، شانازییان پێوه کرد))، (زانینی هاتنی قیامەت یەکێکه) لەو پێنج شتەی که جگه له خوا

**کەس نایزانێ، ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە:** (إن الله عنده علم الساعة). واتە: (بێگومان زانیاری هاتنی ڕۆژی دوایی هەر لەلای خوایە)، **تا کۆتایی ئایەتەکە، ئینجا (کابرای کە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد) ڕۆیشت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بیگەڕێننەوە))، ئەوانیش ڕۆیشتن، بەڵام کەسیان نەدی (دیار نەما)، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوە جیبریل بوو، بۆ ئەوە هاتبوو خەڵکی شارەزا بکات لە ئایینەکەیان))، ئەبو عەبدولڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: هەموو ئەو شتانەی لە بەشەکانی ئیمان ژمارد و داینا (واتە: ئیمانی تەواو و کامڵ پێك هاتووە لە هەموو ئەو شتانەی لەو فەرموودەیەدا باس کرا).**

## ٣٩- بابٌ

٥١- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سُفْيَانَ، أَنَّ هِرَقْلَ قَالَ لَهُ: سَأَلْتُكَ هَلْ يَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ، فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدُونَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ. وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ سَخْطَةً لِدِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ، فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حِينَ تُخَالِطُ بَشَاشَتُهُ الْقُلُوبَ، لاَ يَسْخَطُهُ أَحَدٌ[1].

## ٣٩- باسێک

**٥١- عوبەیدولڵای کوڕی عەبدولڵا دەگێڕێتەوە کە عەبدولڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما بۆی گێڕایەوە، وتی: ئەبو سوفیان بۆی گێڕامەوە، کە هیرەقل پێی وت: پرسیارم لێ کردیت ئایا شوێنکەوتووەکانی زیاد دەکەن، یان کەم دەکەن؟ تۆش وتت:**

---

[1] بڕوانە: ٧.

بێگومان زياد دەكەن، دەى باوەڕيش بەهەمان شێوەيە زياد دەكات هەتا كامڵ و تەواو دەبێ، (وتى:) وە پرسيارم لێ كردى ئايا كەسيان بەهۆى ڕق و توڕەبوون و ڕقهەستانى لە ئايينەكەى پاشگەز دەبێتەوە پاش ئەوەى چۆتە نێويەوە؟ تۆش وتت: نەخێر، دەى باوەڕيش بە هەمان شێوەيە كاتێ كامەرانى و ڕووناكييەكەى تێكەڵ بە دڵەكان دەبێ، هيچ كەس توڕە نابێت و ڕقى لێى نابێتەوە.

## ٤٠- بابُ فَضْلِ مَنِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ

٥٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْحَلَالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لَا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، ألا إِنَّ حِمَى اللَّهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ، أَلَا وَإِنَّ فِي الجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وَهِيَ القَلْبُ»[١].

## ٤٠- باسى گەورەيى ئەو كەسەى دوور دەكەوێتەوە لە گومانەكان لەبەر ئايينەكەى

٥٢-نوعمانى كوڕى بەشير ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرى خوام ﷺ بيست دەيفەرموو: ((ئەوەى حەڵاڵە ڕوون و ئاشكرايە، ئەوەشى حەرامە ڕوون و ئاشكرايە، بەڵام لە نێوانياندا شتانێك هەن لە هەردوولا دەچن (لە حەڵاڵ و لە حەرام)، جێگەى گومانن زۆربەى خەڵكى (حوكمەكەيان) نازانن، ئينجا ئەو كەسەى خۆى لە شتى

---

[١] بڕوانە: ٢٠٥١.

**گوماناوی بپارێزێ، ئەوە ئایین و ناموسی خۆی لە ناتەواوی و نەنگی پاراستووە، بەڵام کەسێك بکەوێتە نێو شتی گوماناوی (و بیکات)، وەك شوانێ وایە ماڵاتەکەی لە دەوروبەری (لەوەڕی) قەدەغەکراودا[1] بلەوەڕێنێ، دوور نییە ماڵاتەکەی لە لەوەڕە قەدەغەکراوەکەش بلەوەڕێ، بێدار بن بەڕاستی هەموو پادشایەك قەدەغەی خۆی هەیە، بێداریش بن قەدەغەی خواش لەسەر زەویدا ئەو شتانەن کە حەرامی کردوون، ئاگادار بن لە لەشی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر چاك و باش بوو، ئەوسا هەموو (پارچەکانی) لەشی مرۆڤ چاك و باش دەبێت، خۆ ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە خراپ بوو، ئەوسا هەموو لەشی خراپ و ناساز دەبێ، ئاگادار بن! ئەو پارچە گۆشتەش دڵە)).**

## ٤١- بابٌ: أَدَاءُ الخُمُسِ مِنَ الإِيمَانِ

٥٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الجَعْدِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أَقْعُدُ مَعَ ابن عَبَّاسٍ، يُجْلِسُنِي عَلَى سَرِيرِهِ، فَقَالَ: أَقِمْ عِنْدِي حَتَّى أَجْعَلَ لَكَ سَهْمًا مِنْ مَالِي. فَأَقَمْتُ مَعَهُ شَهْرَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ القَيْسِ لَمَّا أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنِ القَوْمُ» أَوْ «مَنِ الوَفْدُ؟». قَالُوا: رَبِيعَةُ. قَالَ: «مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ -أَوْ بالْوَفْدِ- غَيْرَ خَزَايَا وَلَا نَدَامَى». فَقَالوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا لَا نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيَكَ إِلَّا فِي شَهْرِ الحَرَامِ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هذا الحَيُّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ فَصْلٍ، نُخْبِرْ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، وَنَدْخُل بِهِ الجَنَّةَ. وَسَأَلُوهُ عَنِ الأشربَةِ. فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ، وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، أَمَرَهُمْ بِالإِيمَانِ باللهِ وَحْدَهُ، قَالَ: «أتدْرُونَ مَا الإِيمَانُ باللهِ وَحْدَهُ؟». قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لَا إله إِلَّا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ

---

[1] کە نابێ خەڵکی دیکە ئاژەڵ و مەڕوماڵاتەکانیانی تێدا بلەوەڕێنن.

اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصِيَامُ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ المَغْنَمِ الخُمُسَ». وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: عَنِ الحنْتَمِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ. وَرُبَّمَا قَالَ: المُقَيَّرِ. وَقَالَ: «احْفَظُوهُنَّ، وَأَخْبِرُوا بِهِنَّ مَنْ وَرَاءَكُمْ»[1].

## ٤١- باسێک: پێنجیەکی ماڵ و سامان بەخشین بەشێکە لە ئیمان

**٥٣- ئەبو جەمرە دەڵێ: من لەگەڵ ئیبنو عەباسدا ﷺ دادەنیشتم ئەو لەسەر كورسی تەختەكەی خۆی دایدەنیشاندم، جا (ئیبنو عەباس ﷺ) وتی: لای من نیشتەجێ بە و دانیشە[2] هەتا بەشێك لە ماڵ و سامانەكەمت پێ بدەم، منیش دوو مانگ لەلای مامەوە، پاشان وتی: كاتێك شاندی خێڵی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم هۆزە كێن؟ -یان ئەم شاندە كێن؟))-، وتیان: هۆزی ڕەبیعەین (چونكە خێڵی عەبدولقەیس بەشێكن لە هۆزی ڕەبیعە)، فەرمووی: ((بەخێربێن ئەو هۆزەی -یان ئەو شاندەی- بەبێ ڕیسوایی و پەشیمانی هاتوون))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە ناتوانین بێینە خزمەتت تەنیا لەو مانگانەدا نەبێ كە (جەنگ تێیاندا) قەدەغەیە، چونكە لە نێوان ئێمە و جەنابتدا بێباوەڕانی هۆزی موزەڕ هەیە، كەواتە فەرمانێكی ڕوون و ئاشكرامان پێ بفەرموو تا بیگەیەنین بە هۆزەكەمان (هەمووومان كاری پێ بكەین)، بەهۆیەوە بچینە بەهەشتەوە، هەروەها پرسیاریان لێ كرد دەربارەی خواردنەوەكان، ئینجا فەرمانی پێ كردن بە چوار شت و قەدەغەی چوار شتیشی**

---

[1] بڕوانە: ٨٧، ٥٢٣، ١٣٩٨، ٣٠٩٥، ٣٥١٠، ٤٣٦٨، ٤٣٦٩، ٦١٧٦، ٧٥٥٦.

[2] بۆئەوەی یارمەتیم بدەیت كە ئەگەر ئەو كەسانە لە قسە و زمانی من تێ نەگەیشتن تۆ تێیان بگەیەنیت و قسەكانم وەربگێڕیت بۆ زمانی ئەوان، چونكە ئەبو **جەمرە** زمانی فارسی دەزانی. إرشاد الساري: ٢١٢/١.

**لێ کردن، فەرمانی پێ کردن بە باوەڕهێنان بە خوای تاك و تەنها، فەرمووی: ((ئایا دەزانن باوەڕهێنان بە خوای تاك و تەنها چۆنە؟)) وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((بریتیە لە شایەتومانهێنان بەم جۆرە:** (أشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ)[1]، **نوێژکردن و زەکاتدان و ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان و دەبێ پێنجیەکی دەستکەوتی جەنگ بدەن (بە دەوڵەتی ئیسلامی)))، قەدەغەی چوار شتیشی لێ کردن (کە خواردنەوەیان تێ دەکردن، چ ئاو بێ، یان سرکە، یان دۆشاو، کە ئەم شتانەن:) گۆزەی حەنتەم (کە لە قوڕ و مووو خوێن دروست دەکرا)، کولەکەی هەڵکۆڵراو، دەفری هەڵکۆڵراو لە قەدی دار خورما، وە دەفری قیڕ و زەفت تێهەڵسواو[2]. (ڕاوییەکە دەڵێ:) وا بزانم وتی: قیڕتێهەڵسواویش. پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمانەی وتم لەبەری بکەن، (کە گەڕانەوە) بیگەیەنن بە هۆزەکەتان)).**

## ٤٢- بابُ مَا جَاءَ أَنَّ الأَعْمَالَ بِالنِّيَّةِ وَالْحِسْبَةِ وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى

فَدَخَلَ فِيهِ الإِيمَانُ، وَالْوُضُوءُ، وَالصَّلَاةُ، وَالزَّكَاةُ، وَالْحَجُّ، وَالصَّوْمُ، وَالأَحْكَامُ. وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ ﴿٨٤﴾ ﴾ الإسراء. عَلَى نِيَّتِهِ: ونَفَقَةُ الرَّجُلِ على أهلِه -يَحتسِبُها- صَدَقَةٌ . وَقَالَ النَّبِيّ ﷺ: ((وَلَكِن جِهَادٌ وَنِيَّةٌ))[3].

---

[1] واتە: شاهێدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە.

[2] هۆی قەدەغەکردنی ئەو چوارە کە شلەمەنییان تێ دەکرێ لەبەر ئەوەیە سرکە و دۆشاو تێیاندا زوو دەبێتە عارەق.

[3] بڕوانە: ١٣٤٩.

# ٤٢- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کردەوەکان بەپێی نییەت و داواکردنی پاداشتن، وە هەر کەس چ مەبەست و نییەتێکی هەبێ ئەوەی بۆ دەنووسرێ

**جا باوەڕ و دەستنوێژ و نوێژ و زەکات و حەج و ڕۆژوو، هەموو حوکمەکان دەگرێتەوە، خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: هەرکەس لەسەر نییەت و شێوازی خۆی کار دەکات) واتە: لەسەر نییەتی خۆی (وە خەرجی پیاو بۆ ماڵ و منداڵی خۆی بە نییەتی پاداشتوەرگرتن بێت، بە ماڵبەخشین دادەنرێت)، وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (بەڵام جیهاد و نییەت ماوە).**

٥٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن مَسْلَمَةَ قَالَ: أَخبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ، عَنْ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[1].

**٥٤- عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان هەموو کردەوەکان بەپێی نییەت و مەبەستەکانیانن، هەر کەسێکیش چ نییەت و مەبەستێکی (لە کردەوەکەیدا) هەبێ، ئەوەی بۆ هەیە (لای خوا)، جا هەرکەس (نییەتی) کۆچکردنەکەی لەپێناو ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ بێت، ئەوە بە کۆچ و هیجرەت لەبەر خوا و پێغەمبەر ﷺ دادەنرێ (پاداشتی ئەوەی دەدرێتەوە)، بەڵام ئەو کەسەی کۆچکردنەکەی بۆ ئەوە بێت دونیای دەست**

---

[1] بڕوانە: ١.

**کەویْت، یان لە بەر ئافرەتێك بێت (بۆ ئەوەی) مارەی بكات، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردووە (لەلای خوا هیچ پاداشتێکی نییە))).**

٥٥- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْن مِنْهَالٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ يَحْتَسِبُهَا فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ»[1].

**٥٥- ئەبو مەسعود ﷛ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێك ماڵ خەرج بكات بۆ منداڵ و خێزانی خۆی نییەت و (مەبەستی ڕەزامەندی خوا و) پاداشتوەرگرتن بێت، ئەوە بەخێر و چاکە بۆی دادەنرێت)).**

٥٦- حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاص أنَهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلَّا أُجِرْتَ عَلَيْهَا، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِيِّ امْرَأَتِكَ»[2].

**٥٦- سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان تۆ هیچ ماڵ و پارەیەك خەرج ناكەیت کە مەبەستت پێی ڕەزامەندی خوا بێت، حەتمەن پاداشت دەدرێیتەوە لەسەری، تەنانەت ئەو خواردنەش کە دەیخەیتە نێو دەمی خێزانەکەتەوە)).**

---

[1] بڕوانە: ٤٠٠٦، ٥٣٥١.

[2] بڕوانە: ١٢٩٥، ٢٧٤٢، ٢٧٤٤، ٣٩٣٦، ٤٤٠٩، ٥٣٥٤، ٥٦٥٩، ٥٦٦٨، ٦٣٧٣، ٦٧٣٣.

# ٤٣- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((الدِّينُ النَّصِيحَةُ للهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ))

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴿٩١﴾ ﴾ التوبة.

# ٤٣- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: «ئایین بریتییە لە دڵسۆزی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و کاربەدەستانی موسوڵمانان و تێکڕای موسوڵمانان»

**وە باسی ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر ئامۆژگاری بکەن لەبەر خوا و پێغەمبەرەکەی).**

٥٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسُ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ[1].

**٥٧- جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پەیمان و بەیعەتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەسەر نوێژکردن بەڕێکوپێکی و زەکاتدان و ئامۆژگاریکردن و دڵسۆزی بۆ هەموو موسوڵمانێك.**

٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلَاقَةَ قَالَ: سَمِعْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ يَوْمَ مَاتَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، قَامَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: عَلَيْكُمْ بِاتِّقَاءِ اللَّهِ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَالْوَقَارِ وَالسَّكِينَةِ حَتَّى يَأْتِيَكُمْ أَمِيرٌ، فَإِنَّمَا يَأْتِيكُمُ الآنَ. ثُمَّ قَالَ: اسْتَعْفُوا لأَمِيرِكُمْ، فَإِنَّهُ كَانَ يُحِبُّ العَفْوَ. ثمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ قُلْتُ: أُبَايِعُكَ عَلَى الإِسْلَامِ. فَشَرَطَ عَلَيَّ: «وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ». فَبَايَعْتُهُ عَلَى هذا، وَرَبِّ هذا المَسْجِدِ إِنِّي لَنَاصِحٌ لَكُمْ. ثُمَّ اسْتَغْفَرَ وَنَزَلَ[2].

---

[1] بڕوانە: ٥٨، ٥٢٤، ١٤٠١، ٢١٥٧، ٢٧١٤، ٢٧١٥، ٧٢٠٤.

[2] بڕوانە: ٥٧.

٥٨- زیادی کوڕی عیلاقە دەڵێ: لەو ڕۆژەدا کە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ مرد (کاربەدەستی بەصرە بوو)، لە جەریری کوڕی عەبدوڵام بیست: (وتاری دەدا) هەستایەوە و سوپاس و ستاییشی خوای کرد و وتی: پێویستە پابەند بن بە لە ترسان و پارێزگاریکردن لە سنوورەکانی خوا، تاك و تەنیایە و هیچ هاوبەشێکی نییە، وە دامەزراو و لەسەرخۆ بن، پەلە مەکەن هەتا کاربەدەستتان بۆ دێت (لە شوێنی موغیرە)، جا دڵنیا بن بەزوویی دێت بۆلاتان، پاشان وتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن بۆ کاربەدەستەکەتان (کە مردووە)، چونکە بەڕاستی ئەو حەزی بە لێخۆشبوون بوو لە خەڵکی، پاشان وتی: جا دوای وتەکەم (دەمەوێ پێتان بڵێم) من جارێکیان ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پێم وت: پەیمانت پێ دەدەم لەسەر ئیسلامەتی، پێغەمبەریش ﷺ بە مەرجی دانا لەسەرم: ((کە ئامۆژگاریکار بم بۆ هەموو موسوڵمانێك))، منیش لەسەر ئەو مەرجە پەیمانم پێی دا، جا سوێند بە خوای ئەم مزگەوتە من ئامۆژگاریکارێکی دڵسۆزم بۆتان، پاشان داوای لێبوردنی لە خوا کرد و دابەزی (لە مینبەرەکە).

***

## ١- بابُ فَضْلِ العِلْمِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾ المجادلة، وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾ طه.

## ١- باسی گەورەیی زانست و زانیاری

**هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (خوای گەورە ئەوانەتان کە باوەڕیان هێناوە بەرزیان دەکاتەوە، وە ئەوانەشی زانیارییان پێ دراوە چەند پلەیەك بەرز دەکاتەوە، وە خوا بەو کردەوانەی دەیکەن ئاگادارە)، وە ئەو فەرمایشتەی خوا ﷻ (کە فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات بڵێ): (ئەی پەروەردگارم! زانست و زانیاریم زیاد بکە).**

# ٣- بابُ مَنْ سُئِلَ عِلْمًا وَهُوَ مُشْتَغِلٌ فِي حَدِيثِهِ فَأَتَمَّ الْحَدِيثَ، ثُمَّ أَجَابَ السَّائِلَ

٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ ح[١]. وَحَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْن فُلَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي هِلَالُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ عَطَاءِ ابْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحَدِّثُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ،فَكَرِهَ ما قَالَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ. حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ: «أَيْنَ -أُرَاهُ- السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ؟»، قَالَ: هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «فَإِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا وُسِّدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»[٢].

## ٣- باسی کەسێک پرسیاری زانیارییەکی لێ بکرێ لە کاتێکدا سەرقاڵی قسەکردن بێ، جا دوای تەواوکردنی قسەکانی وەڵامی پرسیارکەرەکە بداتەوە

**٥٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لە کۆڕێکدا قسەی دەکرد بۆ خەڵکی، دەشتەکییەك هاتە خزمەتی وتی: کەی ڕۆژی دوایی دێت؟ ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بوو قسەی دەکرد، جا هەندێ لە هاوەڵان وتیان: گوێی لێ بوو (دەشتەکییەکە) چی وت، بەڵام قسەکەی بەدڵ نەبوو، وە هەندێکی دیکەیان وتیان: نا وا نییە، هەر گوێی لێ نەبوو (بۆیە وەڵامی نەدایەوە)، تا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە قسەکانی بۆیەوە فەرمووی: ((کوانێ -(موحەممەدی کوڕی**

---

[١] ئیمام بوخاری ئەم فەرموودەیەی بە دوو سەنەد گێڕاوەتەوە.

[٢] بڕوانە: ٦٤٩٦.

فولەیح دەڵێ:) وا بزانم فەرمووی:- ئەو کەسەی پرسیاری لەبارەی ڕۆژی دوایی کرد؟)) کابراش وتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((هەر کات سپاردە زایە کرا و پارێزگاری لێ نەکرا ئەوسا چاوەڕوانی هاتنی دواڕۆژ بکە))، کابرا وتی: زایەکردنی سپاردە چۆنە؟ فەرمووی: ((هەر کات کاروباری خەڵك درایە دەستی کەسی نەشیاو بۆ ئەو کارە، ئەوسا چاوەڕوانی هاتنی دواڕۆژ بکە)).

## ٣- بابُ مَنْ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْعِلْمِ

٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ عَارِمُ بْنُ الفَضْلِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: تَخَلَّفَ عَنَّا النَّبِيُّ ﷺ فِي سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا، فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقَتْنَا الصَّلَاةَ وَنَحْن نَتَوَضَّأ، فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا، فَنَادى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ» مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا[1].

## ٣-باسی ئەوەی بەدەنگی بەرز زانیاری ڕادەگەیەنێ

٦٠- عەبدوڵای کوڕی عەمرﷺ دەڵێ:لە سەفەرێکدا کە سەفەرمان کرد پێغەمبەر ﷺ بەجێ ما لە ئێمە، کاتێ گەیشتەوە پێمان نوێژمان دوا خستبوو (خەریك بوو کاتی نوێژ نەدەما)، ئێمەش دەستنوێژمان دەگرت (و قاچمان بەجوانی نەدەشۆرد)، جا دەستی تەڕمان هێنا بەسەر پێیەکانماندا، پێغەمبەر ﷺ (کە ئەوەی بینی) دوو یان سێ جار بە دەنگی بەرز فەرمووی: ((هاوار و لەناوچوون و سزای سەخت لەنێو ئاگردا بۆ ئەو کەسانەی پاژنەی پێیەکانیان بەجوانی ناشۆن)).

[1] بڕوانە: ٩٦، ١٦٣.

## ٤- بابُ قَوْلِ المُحَدِّث: حَدَّثنَا أوْ أخبرَنا وأنْبَأنَا

وَقَالَ لَنَا الحُمَيْدِيُّ: كَانَ عِنْدَ ابن عُيَيْنَةَ: حَدَّثَنَا وَأَخْبَرَنَا وَأَنْبَأَنَا وَسَمِعْتُ وَاحِدًا. وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ: حَدَّثنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وهُوَ الصَّادِقُ المَصْدُوقُ. وَقَالَ شَقِيقٌ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ كَلِمَةً. وَقَالَ حُذَيْفَةُ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدِيثَيْنِ. وَقَالَ أَبُو العَالِيَةِ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِي ﷺ فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبهِ. وَقَالَ أَنَسٌ: عَنِ النَّبِي ﷺ فيما يَرْوِيهِ عَنْ رَبهِ ﷻ. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: عَنِ النَّبِي ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبكُمْ ﷻ.

## ٤- باسی ئەو کەسەی فەرمووده دەگێڕێتەوە بڵێ: (حدثنا) یان (أخبرنا) یان (أنبأنا)

**(ئیمام بوخاری دەڵێ:) حومەیدی پێی گوتین: بە لای ئیبنو عویەینەوە:** (حدثنا) **و** (أخبرنا) **و** (أنبأنا) **و** (سمعتُ) **وەك یەك وان و جیاوازییان نییە، وە ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی وتین: ((کە ڕاستگۆی و باوەڕپێکراوە))، شەقیق لە عەبدوڵاوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: وتەیەکم لە پێغەمبەر ﷺ بیست، حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو فەرموودەی بۆ باس کردین، ئەبولعالییە لە ئیبنو عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوە. ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەریش ﷺ لە پەروەردگاریەوە ﷻ دەیگێڕێتەوە. ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لە پەروەردگارتانەوە دەیگێڕێتەوە.**

٦١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لَا يَسْقُط وَرَقُهَا، وَإِنَّهَا مَثَلُ المُسْلِم، فَحَدِّثُونِي مَا

هِيَ؟». فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ البَوَادِي. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، فَاسْتَحْيَيْتُ، ثُمَّ قَالُوا: حَدِّثْنَا مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «هِيَ النَّخْلَةُ»[١].

**٦١- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لەنێو درەختەکاندا درەختێك هەیە گەڵای ناوەریّ وەك موسوڵمان وایە[٢]، دەی پێم بڵێن: کام درەختەیە؟)) خەڵکەکەش دەستیان کرد بە بیرکردنەوە لە درەختەکانی دەرودەشت، عەبدوڵا وتی: هات بە دڵمدا کە ئەو درەختە دارخورمایە، بەڵام شەرمم کرد (بیڵێم)، پاشان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان بڵێ ئەو درەختە کامەیە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دارخورمایە)).**

## ٥- بابُ طَرْحِ الإِمَامِ الْمَسْأَلَةَ عَلَى أَصْحَابِهِ لِيَخْتَبِرَ مَا عِنْدَهُمْ مِنَ الْعِلْمِ

٦٢- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لَا يَسْقُطُ وَرَقُهَا، وَإِنَّهَا مَثَلُ المُسْلِمِ، حَدِّثُونِي مَا هِيَ؟». قَالَ: فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ البَوَادِي. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَهَا النَّخلَةُ، ثُمَّ قَالُوا: حَدِّثْنَا مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «هِيَ النَّخْلَةُ»[٣].

---

[١] بڕوانە: ٦٢، ٧٢، ١٣١، ٢٢٠٩، ٤٦٩٨، ٥٤٤٤، ٥٤٤٨، ٦١٢٢، ٦١٤٤.

[٢] لە بەردەوامی و بەرەکەت و زۆری خێر و چاکەدا ، خورما بەرەکەت لە هەموو بەشێکیدا هەیە، کاتێك پێ دەگات تا وشك دەبێت دەخورێ، تەنانەت ناوکەکەی دەکرێتە دەرمان و ئالیك، موسوڵمانیش هەر وایە لە ژیانیدا تا دوای مردنی سوودی بۆ خۆی و کەسانی دیکەش هەیە.

[٣] بڕوانە: ٦١.

## ٥- باسی پێشەوا و سەرکردە پرسیارێک لە هاوڕێکانی بکات تا تاقییان بکاتەوە چەند زانیارییان هەیە

٦٢- ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان لەنێو درەختەکاندا درەختێك هەیە گەڵای ناوەریّ وەك موسوڵمان وایە (لە بەردەوامی و زۆر خێرداریدا)، دەی پێم بڵێن: کام درەختەیە؟)) (ئیبن عومەر) وتی: خەڵکەکەش دەستیان کرد بە ناوهێنانی درەختەکانی دەرودەشت، عەبدوڵا وتی: هات بە دڵمدا کە ئەو درەختە دارخورمایە، پاشان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان بڵێ ئەو درەختە کامەیە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دارخورمایە)).

## ٦- بابُ مَا جَاءَ فِي الْعِلْمِ: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾ طه.

## ٦- باسی ئەوەی دەربارەی زانست و زانیاری هاتووە (ئەو فەرمایشتەی خوداش کە دەفەرمووێ): (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئەی پەروەردگارم زانیاریم زیاد بکە).

## ٧- بابٌ: الْقِرَاءَةُ وَالْعَرْضُ عَلَى الْمُحَدِّثِ

وَرَأَى الحَسَنُ وَالثَّوْرِيُّ وَمَالِكٌ القِرَاءَةَ جَائِزَةً، وَاحْتَجَّ بَعْضُهُمْ فِي القِرَاءَةِ عَلَى العَالِمِ بِحَدِيثِ ضِمَامِ بْنِ ثَعْلَبَةَ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: اللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: فهذِه قِرَاءَةٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، أَخْبَرَ ضِمَامٌ قَوْمَهُ بِذَلِكَ فَأَجَازُوهُ. وَاحْتَجَّ مَالِكٌ بِالصَّكِّ يُقْرَأُ عَلَى القَوْمِ فَيَقُولُونَ: أَشْهَدَنَا فُلَانٌ. وُيقْرَأُ ذَلِكَ قِرَاءَةً عَلَيْهِمْ، وَيُقْرَأُ عَلَى المُقْرِئِ،

فَيَقُولُ القَارِئُ: أَقْرَأَنِي فُلَانٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ، ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الَحسَنِ الوَاسِطِيُّ، عَنْ عَوْفٍ، عَنِ الَحسَنِ قَالَ: لَا بَأْسَ بِالْقِرَاءَةِ عَلَى العَالِمِ. وَأَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ الفِرَبْرِيُّ، وحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيل البُخَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: إِذَا قُرِئَ عَلَى الُمحَدِّثِ فَلَا بَأْسَ أَنْ يَقُولَ: حَدَّثَنِي. قَالَ: وَسَمِعْتُ أَبَا عَاصِمٍ يَقُولُ عَنْ مَالِكٍ وَسُفْيَانَ: القِرَاءَةُ عَلَى العَالِمِ وَقِرَاءَتُهُ سَوَاءٌ.

## ٧- باسێك: خوێندنەوە و پیشاندانی فەرموودە بەو كەسەی فەرموودە دەگێڕێتەوە

**حەسەن (ی بەصری) و سەوری و مالیك بۆچوونیان وایە (وەرگرتنی فەرموودە) بەخوێندنەوە بۆ زانای فەرموودەناس دروستە[١]، هەندێ لە زانایان بەڵگەیان بۆ دروستی (وەرگرتنی فەرموودە) بە خوێندنەوە بۆ زانای فەرموودەناس بەم فەرموودەی زیمامی كوڕی سەعلەبە هێناوەتەوە، كە بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئایا خوا فەرمانی پێ كردوویت كە ئەو پێنج نوێژە بكەیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ))، دەڵێن: جا ئەمە خوێندنەوەی فەرموودەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ، دواتر زیمام ئەم فەرموودەیەی بە هۆزەكەی ڕاگەیاند، ئەوانیش لێیان وەرگرت و ڕازی بوون (و موسوڵمان بوون)، ئیمام مالیك ڕێگەی داوە بەوەی نامەیەك فەرموودەی نووسراوی تێدا بخوێنرێتەوە بۆ كەسانێك و ئینجا بڵێن: فلان كەس ئێمەی كرد بە شایەت (كە ئەم فەرموودەی بیستووە)، جا ئەو فەرموودەیە بخوێنرێتەوە بەسەریاندا، وە بخوێنرێتەوە بەسەر ئەو كەسەدا كە**

---

[١] بەم جۆرە: قوتابییەكە فەرموودەكە بخوێنێتەوە و مامۆستا گوێی لێ بگرێ، ئەگەر هەڵەی كرد بۆی ڕاست بكاتەوە، دروستە بۆ قوتابییەكە دواتر ئەو فەرموودە بگێڕێتەوە بۆ كەسانی دی. بڕوانە: الباعث الحثيث شرح اختصار علوم الحديث لابن كثير: ٣٢٩/١.

خوێندوویەتیەوە، جا ئەو کەسەی خوێندوویەتەوە (لە کاتی ڕیوایەتکردنیدا) بڵێ: فلان کەس بۆی خوێندمەوە. (ئیمام بوخاری دەڵێ:) موحەممەدی کوڕی سەلام بۆی گێڕاینەوە وتی: موحەممەدی کوڕی حەسەنی واسیتی لە عەوفەوە ئەویش لە حەسەنەوە بۆی گێڕاینەوە کە (حەسەن) وتوویەتی: خوێندنەوەی فەرموودە بۆ زانای فەرموودەناس هیچی تیا نییە و قەیناکات[1]، وە موحەممەدی کوڕی یوسفی فیرەبری بۆی گێڕاینەوە، هەروەها موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری بۆی گێڕاینەوە وتی[2]: عوبەیدوڵای کوڕی مووسا بۆی گێڕاینەوە لە سوفیانەوە، وتی: ئەگەر فەرموودە خوێندرایەوە بۆ زانای فەرموودە ئاساییە و دروستە بڵێیت: (حدثني) هیچی تێدا نییە، دەڵێ: لە ئەبو عاصیمم بیستووە لە مالیك و سوفیانەوە گێڕایەوە و دەیوت: وتوویانە: خوێندنەوەی فەرموودە بۆ زانای فەرموودە لەگەڵ خوێندنەوەی خودی زاناکە بۆ فەرموودەکە وەك یەك وان و یەکسانن .

٦٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدٍ -هُوَ الْمَقْبُرِيُّ- عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ وَالنَّبِيُّ ﷺ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ. فَقُلْنَا: هذا الرَّجُلُ الأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ. فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: ابن عَبْدِ الْمُطَّلِبِ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «قَدْ أَجَبْتُكَ». فَقَالَ الرَّجُلُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ

---

[1] واتە: گێڕانەوەی پێ دروستە.

[2] ئەم وتەیە: (وە موحەممەدی کوڕی یوسفی فیرەبری بۆی گێڕاینەوە، هەروەها موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری بۆی گێڕاینەوە وتی:) لە زۆرێک لە نوسخەکانی ئیمام بوخاریدا نییە و گێڕەرەوەکان زۆربەیان نەیانهێناوە، ماناکەشی بەو شێوەیە دروست نییە کە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری کە ئیمام بوخاری خۆیەتی لە خۆیەوە ڕیوایەت بکات و بیگێڕێتەوە، لەوانەیە ئەوە وتەی یەکێک لە قوتابییەکانی ئیمام بوخاری بێت.

عَلَيْكَ فِي المَسْأَلَةِ، فَلَا تَجِدْ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ. فَقَالَ: «سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ». فَقَالَ: أَسْأَلُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ، اللَّهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ». قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، اللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ نُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الخَمْسَ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ». قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، اللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ نَصُومَ هذا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ». قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، اللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ». فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكرٍ. رَوَاهُ مُوسَى، وَعَلِيُّ بْنُ عَبْدِ الحَمِيدِ، عَنْ سُلَيمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. بهذا.

**٦٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە مزگەوتدا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، پیاوێك بەسواری وشترێك هاتە نێو مزگەوت، لە حەوشەی[1] مزگەوتدا وشترەکەی یەخ دا پاشان بەستیەوە، پاشان پێیانی وت: کامتان موحەممەدن؟ پێغەمبەریش ﷺ لەنێویاندا پاڵی دابۆیەوە، ئێمەش وتمان: ئەو پیاوە سوور و سپییەیە کە پاڵی داوەتەوە، پیاوەکە پێی وت: ئەی کوڕی عەبدولوتەلیب! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: گوێم لێتە، ئینجا بە پێغەمبەری ﷺ وت: من پرسیارت لێ دەکەم پرسیارەکانیشم توند و ڕەقن بەرامبەرت، توڕە مەبە و لەبەر دڵت گران نەبێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەر پرسیارێك دێت بەدڵتدا بیکە))، وتی: سوێندت دەدەم بە پەروەردگاری خۆت و بە**

---

[1] لە گێڕانەوەی ئیبنو عەباسدا کە ئیمام ئەحمەد و حاکیم گێڕاویانەتەوە دەڵێ: (فأناخ بعيره على باب المسجد فعقله ثم دخل)، جا بەپێی ئەم گێڕانەوەیە بێت لە گێڕانەوەکەی ئەنەسدا کورتکردنەوە ڕووی داوە کە بەم جۆرەی لێ دێت: (فأناخه في ساحة المسجد، او نحو ذلك). بڕوانە فتح الباری:١/٢٠٠ .

پەروەردگاری ئەوانەی پێش تۆ ئایا خودا تۆی ناردووە بە پێغەمبەر بۆ هەموو مرۆڤایەتی؟ فەرمووی: ((خوایە گیان تۆ شایەت بە بەڵێ وایە))، وتی: داوات لێ دەکەم توخوا ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژ بکەین؟ فەرمووی: ((خوایە گیان تۆ شایەت بە بەڵێ وایە))، وتی: داوات لێ دەکەم توخوا ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی ساڵانە ئەم مانگی ڕەمەزانە بەڕۆژوو بین؟ فەرمووی: ((خوایە گیان تۆ شایەت بە بەڵێ وایە))، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی کە ئەم زەکاتە لە دەوڵەمەندەکانمان وەربگریت و دابەشی بکەیت بەسەر هەژارانماندا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوایە گیان تۆ شایەت بە بەڵێ وایە))، پیاوەکە وتی: باوەڕم هێنا بەو ئایینەی تۆ هێناوتە، وە من نوێنەری هۆزەکەمم بۆ لای تۆ، وە من زیمامی کوڕی سەعلەبەم لە خێڵی بەنو سەعدی کوڕی بەکر. مووسا و عەلی کوڕی عەبدولحەمید گێڕاویانەتەوە، لە سولەیمانەوە ئەویش لە سابیتەوە، سابیتیش لە ئەنەسەوە هەمان فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە (بە دەستەواژە و شێوەیەکی جیاواز).

## ٨- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي الْمُنَاوَلَةِ وَكِتَابِ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْعِلْمِ إِلَى الْبُلْدَانِ

وَقَالَ أَنَسٌ: نَسَخَ عُثْمَانُ المَصَاحِفَ، فَبَعَثَ بِهَا إِلَى الآفَاقِ[1]. وَرَأَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَمَالِكٌ ذَلِكَ جَائِزًا. وَاحْتَجَّ بَعْضُ أَهْلِ الحِجَازِ فِي المُنَاوَلَةِ بِحَدِيثِ النَّبِيِّ ﷺ، حَيْثُ كَتَبَ لِأَمِيرِ السَّرِيَّةِ كِتَابًا وَقَالَ: ((لَا تَقْرَأْهُ حَتَّى تَبْلُغَ مَكَانَ كَذَا وَكَذَا)). فَلَمَّا بَلَغَ ذَلِكَ المَكَانَ قَرَأَهُ عَلَى النَّاسِ، وَأَخْبَرَهُمْ بِأَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ.

---

[1] بڕوانە: ٣٥٠٦.

# ٨- باسی ئەوەی دەوترێ دەربارەی (مناولة)(١) وە نووسراوی زانایان بە زانست و ناردنی بۆ خەڵکی شارەکانی دیکە

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: بە فەرمانی عوسمان ﷺ چەند قورئانێك نووسرایەوە و ناردی بۆ هەموو لایەك، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر و یەحیای کوڕی سەعید و مالیك ﷺ ئەو کارە بە دروست دەزانن، هەندێ لە زانایانی حیجاز بەڵگە دەهێننەوە بۆ دروستی (مُناولة) بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە نامەیەکی نووسی بۆ فەرماندەی سریەیەك فەرمووی: ((مەیخوێنەرەوە تا دەگەیتە ئەو جێگا و ئەو جێگایە))، جا کاتێ گەیشتە ئەو شوێنە خوێندیەوە بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون و ئاگاداری کردنەوە بە فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ.**

٦٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ بِكِتَابِهِ رَجُلًا، وَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ البَحْرَيْنِ، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ البَحْرَينِ إِلَى كِسْرى، فَلَمَّا قَرَأَهُ مَزَّقَهُ. فَحَسِبْتُ أَنَّ ابن الْمسَيَّبِ قَالَ: فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ(٢).

**٦٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بە پیاوێکدا (کە عەبدوڵای کوڕی حوزافە بوو) نارد و فەرمانی پێ کرد کە بیدات**

---

١ مناولة: بریتیە لەوەی زانایەکی فەرموودە کتێبێک یان دەفتەرێک کە ئەو فەرموودانەی لەخۆ گرتووە کە ئەو زانایە وەریگرتووە، دەیدات بە قوتابییەك و دەڵێ: ئەوەش گێڕاوەی منە، تێوەش لە من بگێڕنەوە.

٢ بڕوانە: ٢٩٣٩، ٤٤٢٤، ٧٢٦٤.

**به گەورەی وڵاتی بەحرەین (کە مونزیری کوڕی ساوا بوو)، ئەویش دای بە کیسرا، ئینجا کاتێ کیسرا نامەکەی خوێندەوە دڕاندی، (ئیبنو شیهاب دەڵێ:) وا بزانم سەعیدی کوڕی موسەیەب وتی: پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای لێ کردن کە پارچە پارچە بن و دەسەڵات و پاشایەتییەکەیان لەنێو بچێ.**

٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الحَسَنِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَتَبَ النَّبِيُّ ﷺ كِتَابًا -أَوْ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ- فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لَا يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلَّا مَخْتُومًا. فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ. فَقُلْتُ لِقَتَادَةَ مَنْ قَالَ نَقْشُهُ مُحَمَّد رَسُولُ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنَسٌ[1].

**٦٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نووسی یان -ویستی نامەیەك بنووسێ-، عەرزیان کرد: ئەو پادشایانە نامەیەك مۆری لێ نەدرابێ نایخوێننەوە، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ ئەنگوستیلەیەکی لە زیو دروست کرد نەخشی (محمد رسول الله)ی لێ هەڵکۆڵرابوو (تا نامەکانی پێ مۆر بکات)، ئەنەس دەڵێ: هەر دەڵێی سەیری سپییاتی ئەنگوستیلەکە دەکەم لە دەستیدا، (شوعبە دەڵێ:) بە قەتادەم وت: کێ وتی نەخشی (محمد رسول الله)ی لێ هەڵکۆڵرابوو؟ وتی: ئەنەس.**

---

[1] بڕوانە: ٢٩٣٨، ٣١٠٦، ٥٨٧٠، ٥٨٧٢، ٥٨٧٤، ٥٨٧٥، ٥٨٧٧، ٥٨٧٩، ٧١٦٢.

## ٩- بابُ مَنْ قَعَدَ حَيْثُ يَنْتَهِي بِهِ الْمَجْلِسُ، وَمَنْ رَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا

٦٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّ أَبَا مُرَّةَ -مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ- أَخْبَرَهُ، عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ. فِي الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ، إِذ أَقْبَلَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَذَهَبَ وَاحِدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلا أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلَاثَةِ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَآوى إِلَى اللَّهِ، فَآوَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَا، فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ، فَأَعرَضَ اللَّهُ عَنْهُ»[1].

## ٩- باسی ئەو کەسەی لەو جێگایە دادەنیشێت کە دانیشتنەکە لەوێدا کۆتایی پێ هاتووە، هەروەها ئەوەی لە کۆڕی دانیشتنەکەدا کەلێن و بۆشاییەک دەبینێ و تێیدا دادەنیشێت

**٦٦- ئەبو واقیدی لەیسی ﷺ دەڵێ: ((جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا دانیشتبوو، خەڵکیش لەگەڵیدا دانیشتبوون، لەپڕ سێ کەس هاتن، جا دووانیان هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، یەکێکیان ڕۆیشت، دەڵێ: جا دووانەکەیان لەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستان، جا یەکێکیان بۆشاییەکی بەدی کرد لە حەڵقەی کۆڕەکەدا و لەوێدا دانیشت، ئەوەی دیکەیان لەپشت خەڵکەکەوە دانیشت، کەسی**

[1] بڕوانە: ٤٧٤.

**سێیەمیان پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێ بوویەوە فەرمووی: (دەربارەی ئەم سێ کەسە هەواڵتان بدەمێ؟ یەکێکیان پەنای بۆ خوا برد و بەرەو خوا چوو، خواش گرتیە خۆی و پەنای دا، ئەوەی دیکەیان شەرمی کرد ڕووی نەهات (جێگای خۆی بکاتەوە)، بۆیە خواش بەزەیی پێدا هاتەوە و سزای نەدا، ئەوەی سێیەمیان ڕووی لێ وەرگێڕا، خواش پشتی لەو هەڵکرد و لێی تووڕە بوو)).**

## ١٠- باب قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ ((رُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ))

٦٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن عَوْنٍ، عَنِ ابن سِيرِينَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ذَكَرَ النَّبِيَّ ﷺ قعَدَ عَلَى بَعِيرِهِ، وَأَمْسَكَ إِنْسَانٌ بِخِطَامِهِ - أَوْ بِزِمَامِهِ- قَالَ: «أَيُّ يَوْمٍ هذا؟». فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ سِوى اسْمِهِ. قَالَ: «أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ؟». قُلْنَا بَلَى. قَالَ: «فَأَيُّ شَهْرٍ هذا؟». فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ. فَقَالَ: «أَلَيْسَ بِذِي الحِجَّةِ؟». قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ بَيْنَكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هذا، فِي شَهْرِكُمْ هذا، فِي بَلَدِكُمْ هذا. لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الغَائِبَ، فَإِنَّ الشَّاهِدَ عَسَى أَنْ يُبَلِّغَ مَنْ هُوَ أَوْعَى لَهُ مِنْهُ»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٥، ١٧٤١، ٣١٩٧، ٤٤٠٦، ٤٦٦٢، ٥٥٥٠، ٧٠٧٨، ٧٤٤٨.

# ١٠- باسی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: «هەندێک جار ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێ دەگەیەنرێ لەوەی خۆی بیستوویەتی چاکتر لێی تێ دەگات»

٦٧- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە باوکی باسی پێغەمبەری ﷺ کرد (لە ڕۆژی جەژنی قوربان لە میندا) لەسەر پشتی وشترەکەی دانیشت (وتارێکی بۆ حاجیەکان دا)، پیاوێك جڵەوی-یان هەوساری-وشترەکەی گرتبوو، فەرمووی: ((ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟)) ئێمەش بێدەنگ بووین، تا وا گومانمان برد پێغەمبەر ﷺ بە ناوێکی دیکە جگە لە ناوی خۆی ناوی دەبات، فەرمووی: ((ئایا ئەمڕۆ ڕۆژی جەژنی قوربان نییە؟)) وتمان: بەڵێ وایە، فەرمووی: ((ئەم مانگە چ مانگێکە؟)) ئێمەش بێدەنگ بووین، تا وا گومانمان برد پێغەمبەر ﷺ بە ناوێکی دیکە جگە لە ناوی خۆی ناوی دەبات، ئینجا فەرمووی: ((مەگەر مانگی (ذي الحجة) نییە؟)) وتمان: بەڵێ وایە، فەرمووی: ((دەی دڵنیا بن (دەستدرێژی بۆ) خوێن و ماڵ و نامووستان لە یەکدی حەڕامە، وەك چۆن تاوانکردن لەم ڕۆژەدا و لەم مانگەدا و لەم شارەدا (کە مەککەیە) حەڕامە، با ئامادەبووان ئەم ئامۆژگارییە ڕابگەیەنن بە ئامادەنەبووان، لەوانەیە ئامادەبوو بیگەیەنێ بە کەسێ، (ئەو کەسە) لە ئامادەبووەکە چاکتر لێی تێ بگات و لەبەری بکات)).

# ١١- بابٌ: الْعِلْمُ قَبْلَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد. فَبَدَأَ بِالْعِلْمِ، وَأَنَّ الْعُلَمَاءَ هُمْ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ، وَرَّثُوا العِلْمَ، مَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا

يَطْلُبُ بِهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الجَنَّةِ. وَقَالَ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر، وَقَالَ: ﴿ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت، ﴿ وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ ﴾ الملك، وَقَالَ: ﴿ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الزمر، وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ((مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَهِّمْهُ فِي الدِّينِ)) و: ((إِنَّمَا العِلْمُ بِالتَّعَلُّم)). وَقَالَ أَبُو ذَرٍّ: لَوْ وَضَعْتُمُ الصَّمْصَامَةَ عَلَى هذِه -وَأَشَارَ إِلى قَفَاهُ- ثُمَّ ظَنَنْتُ أَنِّي أُنْفِذُ كَلِمَةً سَمِعْتُهَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ قَبْلَ أَنْ تُجِيزُوا عَلَيَّ لأَنْفَذْتُهَا. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿ كُونُواْ رَبَّٰنِيِّۦنَ ﴾ آل عمران، عُلَمَاءَ فُقَهَاءَ. وَيُقَالُ: الرَّبَّانِيُّ: الذِي يُرَبِّي النَّاسَ بِصِغَارِ العِلْمِ قَبْلَ كِبَارِهِ.

## ١١- باسێک: زانست لە پێش گوفتار و کردارەوەیە

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا چاك بزانە كە هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە خوا)، ئەوەتا بە عیلم و زانست دەستی پێ كردووە، وە بەڕاستی زانایان میراتگری پێغەمبەرانن ﷺ، پێغەمبەران ﷺ زانیارییان بە میرات جێ هێشتووە، هەركەس ئەو زانیارییە وەربگرێ، ئەوە بەشێكی زۆر فراوانی دەست كەوتووە، وە هەركەس ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ دەستخستنی زانست و زانیارییەك، خوا بەو كارە ڕێگای (چوونە) بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات، وە خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (بێگومان لە بەندەكانی خوا زانایان بەزانیارییەوە لە خوا دەترسن)، وە دەفەرمووێ: (تەنها زانایان بەچاكی لە ئایەتەكانی خوا تێ دەگەن)، وە (بێباوەڕان) دەڵێن: ئەگەر ئێمە لە دونیادا بمانبیستایە و ژیریمان بەكار بهێنایە، ئێمە لە هاوڕێیانی دۆزەخ نەدەبووین)، وە خوا دەفەرمووێ: (ئایا كەسانێ زانا و شارەزان یەكسانن لەگەڵ كەسانێكدا**

نەزانن؟) وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((هەرکەس خوا بیەوێ چاکەی بۆی هەبێت، لە ئایین چاك شارەزای دەکات))، وە دەفەرمووێ: ((بێگومان زانست ئەوەیە فێری ببیت (لە پێغەمبەر و زانایانەوە) و بیخوێنیت))، وە ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: ئەگەر شمشێری تیژ لەسەر ئەمەم دابنێن -ئاماژەی بۆ پشتەملی کرد-، پاشان بەتەما بم وشەیەك بڵێم کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە، پێش ئەوەی لە گەردنم بدەن و بمکوژن بێگومان دەیڵێم، وە ئیبنو عەباس ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ كُونُوا۟ رَبَّـٰنِيِّـۧنَ ﴾، دەڵێ: (ربّانی) واتە: (لەسەرخۆیان و) زانایان و تێگەیشتووان، وە دەوترێ: (الرَّبَّانِيُّ) ئەو زانایەیە کە خەڵك فێر دەکات بە بابەتە بچووك ڕوون و ئاسانەکانی زانست پێش بابەتە گەورە و قورسەکانی زانست و زانیاری.

## ١٢- بابُ مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَوَّلُهُمْ بِالْمَوْعِظَةِ وَالْعِلْمِ كَيْ لاَ يَنْفِرُوا

٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ ابن مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوعِظَةِ فِي الأَيَّامِ، كَرَاهَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا[1].

## ١٢- باسی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ناوبەناو ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد و زانیاری پێ دەدان تا بێزار نەبن

٦٨- ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناوبەناو ئامۆژگاری دەکردین لە ڕۆژەکانی هەفتەدا (بۆئەوەی لە سەرمان قورس نەبێت و) لە ترسی ئەوەی نەوەك بێزار و وەڕس بین.

---

[1] بروانە: ٧٠، ٦٤١١.

٦٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْن سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو التَّيَّاحِ، عَن أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا»[1].

**٦٩- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (( (لە كارەكانتاندا لەڕوونكردنەوەی ئیسلامدا) ئاسانكار بن نەك قورس و گرانكار، وە موژدەدەر بن نەك دوورخەرەوە و تۆقێنەر)).**

## ١٣- بابُ مَنْ جَعَلَ لِأَهْلِ الْعِلْمِ أَيَّامًا مَعْلُومَةً

٧٠- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُذَكِّرُ النَّاسَ فِي كُل خَمِيسٍ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ:يا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لَوَدِدْتُ أَنَكَ ذَكَّرْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ. قَالَ: أَمَا إِنَّهُ يَمْنَعُنِي مِنْ ذَلِكَ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، وَإِنِّي أَتَخَوَّلُكُمْ بِالَمْوْعِظَةِ كَمَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَوَّلُنَا بِهَا، مَخَافَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا[2].

## ١٣- باسی كەسێك چەند ڕۆژێكی دیاریكراو دابنێ، بۆ فێربوونی فێرخوازان

**٧٠- ئەبو وائیل دەڵێ: عەبدوڵا ﷺ هەموو پێنج شەممەیەك ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد، ئینجا پیاوێك پێی وت: ئەی باوكی عەبدوڕەحمان! ئاواتەخواز بووم كە هەموو ڕۆژێك ئامۆژگاریت بكردینایە، عەبدوڵاش وتی: بەڵام بەڕاستی ئەوەی ڕێگریم لێ دەكات كە هەموو ڕۆژێك ئامۆژگاریتان بكەم (ئەوەیە) من نامەوێ**

---

[1] بڕوانە: ٦١٢٥.

[2] بڕوانە: ٢٨٢١.

**بێزارتان بكەم، وە من ناوبەناو ئامۆژگاریتان دەكەم وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ ناوبەناو ئامۆژگاری ئێمەی دەكرد، لە ترسی ئەوەی بێزار و وەڕەس بین[١].**

## ١٤- بابٌ: مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ

٧١- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابن شِهَابٍ قَالَ: قَالَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ خَطِيبًا يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ واللهُ يُعْطِي، وَلَنْ تَزَالَ هذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللَّهِ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ»[٢].

## ١٤- باسێک: ئەو کەسەی خودا ویستی خێری پێی هەبێت چاک شارەزای دەکات لە ئایین

**٧١- حومەیدی كوڕی عەبدوڕەحمانی دەڵێ: گوێم لێ بوو موعاویە ﷺ وتاری دەدا و دەیوت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر كەسێك خوا مەبەستی خێری بۆی بووێ چاك لە ئایین تێی دەگەیەنێ و شارەزای دەكات، دڵنیاش بن من تەنها دابەشكەر (ی غەنیمەت و دەستكەوتەكانی جەنگ)م، خواش دەبەخشێ (بە هەریەك لە ئێوە بەو ئەندازەی خۆی بیەوێت)، وە بەردەوام (بەشێكی) ئەم ئوممەتی ئیسلامە لەسەر فەرمانی خوا (ئایین) دامەزراو و بەردەوام دەبێت، ئەوانەی پێچەوانە و دژیانن هیچ زیانیان پێ ناگەیەنن، تا فەرمانی خودا دێت بە هاتنی قیامەت)).**

---

[١] ئەگەر هەموو ڕۆژێک ئامۆژگاریمان بکات.

[٢] بڕوانە: ٣١١٦، ٣٦٤١، ٧٣١٢، ٧٤٦٠.

## ١٥- بابُ الْفَهْمِ فِي الْعِلْمِ

٧٢- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ أَبِي نَجِيحٍ: عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ إِلَى الَمدِينَةِ، فَلَمْ أَسْمَعْهُ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا حَدِيثًا وَاحِدًا، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَأُتِيَ بِجُمَّارٍ فَقَالَ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً مَثَلُهَا كَمَثَلِ المُسْلِمِ». فَأَرَدْتُ أَنْ أقولَ هِيَ النَّخْلَةُ، فَإِذَا أَنَا أَصْغَرُ القَوْمِ فَسَكَتُّ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هِيَ النَّخْلَةُ»[1].

## ١٥- باسی گەورەیی تێگەیشتن لە زانستدا

**٧٢- موجاهید دەڵێ: هاوڕێی ئیبنو عومەرم ﷺ بووم لە ڕۆیشتن بۆ مەدینە، لێم نەبیست لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووده بگێڕێتەوە جگە لە یەك فەرمووده، وتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین كرۆكێكی دارخورمایان بۆ هێنا، فەرمووی: ((لەنێو درەختەكاندا درەختێك هەیە نموونەی وەك موسوڵمان وایە))، (عەبدولاّ دەڵێ:) ویستم بڵێم: دارخورمایە، بەلاّم كە سەیرم كرد من لەنێو خەڵكەكەدا لە هەمووان بچووكترم لە تەمەندا، بۆیە قسەم نەكرد و بێدەنگ بووم، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو درەختە دارخورمایە)).**

## ١٦- بابُ الاغْتِبَاطِ فِي العِلْمِ وَالْحِكْمَةِ

وَقَالَ عُمَرُ: تَفَقَّهُوا قَبْلَ أَنْ تُسَوَّدُوا. وَقَدْ تَعَلَّمَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ فِي كِبَرِ سِنِّهِمْ

٧٣- حَدَّثَنَا الُحمَيْدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ - عَلَى غَيْرِ مَا حَدَّثَنَاهُ الزُّهْرِيُّ- قَالَ: سَمِعْتُ قَيْسَ بْنَ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ

---

[1] بڕوانە: ٦١.

قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الحَقِّ، وَرَجُل آتَاهُ اللَّهُ الحِكْمَةَ، فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا»[1].

## ١٦- باسی ئاواتپێخواستن لە (بەهرەی) زانست و داناییدا

**عومەر ﷺ دەڵێ: (لە ئایین) شارەزا بن پێش ئەوەی ببنە کاربەدەست، وە بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی گەورەییاندا فێری ئایین و زانیاری بوون .**

**٧٣- عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئاوات و خۆزگەپێخواستنی گەورە تەنها لە دوو شتدایە: ئاواتخواستن بە پیاوێك خوا سەروەت و سامانی پێ بەخشیوە و زاڵی کردووە لەسەر بەخشینی لە پێناوی حەق و ڕاستیدا، وە بە پیاوێك کە خوا دانایی و شارەزایی پێ دابێ (کە لەنێوان خەڵکیدا) حوکمی پێ دەکات و خەڵکی دیکەش فێر دەکات)).**

## ١٧- بابُ مَا ذُكِرَ فِي ذَهَابِ مُوسَى ﷺ فِي الْبَحْرِ إِلَى الْخَضِرِ

وَقَوْلِهِ: ﴿ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴿٦٦﴾ ﴾ الكهف.

٧٤- حَدَّثَنَي مُحَمَّدُ بْنُ غُرَيْرٍ الزُّهْرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ حَدَّثَ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَهُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ تَمَارى هُوَ وَالْحُرُّ بْنُ قَيسٍ بْنِ حِصْنِ الفَزَارِيُّ فِي صَاحِبِ مُوسَى قَالَ ابن عَبَّاسٍ: هُوَ خَضِرٌ.

---

[1] بڕوانه: ١٤٠٩، ٧١٤١، ٧٣١٦.

فَمَرَّ بِهِمَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، فَدَعَاهُ ابن عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي تَمَارَيْتُ أَنَا وَصَاحِبِي هذا فِي صَاحِبِ مُوسَى الذِي سَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، هَلْ سَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ يَذْكُرُ شَأْنَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَمَا مُوسَى فِي مَلَإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ؟ قَالَ مُوسَى: لَا. فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَى مُوسَى: بَلَى، عَبْدُنَا خَضِرٌ. فَسَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ اللَّهُ لَهُ الحُوتَ آيَةً، وَقِيلَ لَهُ: إِذَا فَقَدْتَ الحُوتَ فَارْجِعْ، فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ، وَكَانَ يَتَّبِعُ أَثَرَ الحُوتِ فِي البَحْرِ، فَقَالَ لِمُوسَى فَتَاهُ: ﴿ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ ﴾ الكهف، ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الكهف، فَوَجَدَا خَضِرًا، فَكَانَ مِنْ شَأْنِهِمَا الذِي قَصَّ اللَّهُ ﷻ فِي كِتَابِهِ»[1].

## ١٧-باسی ئەوەی باس کراوە لەبارەی ڕۆیشتنی مووسا ﷺ بە دەریادا بۆ لای خەضیر

**هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خودا: (مووسا پێی وت: ئایا شوێنت بکەوم تا هەندێ زانیاریم فێر بکەیت لەو زانستە ڕاستەی کە فێر کراویت لەلایەن خواوە؟).**

**٧٤- ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە: کە ئەو و حوڕی کوڕی قەیسی کوڕی حیصنی فەزاری دەربارەی هاوەڵەکەی مووسا ﷺ دەمەقاڵێ و مشتومڕیان بوو، ئیبنو عەباس دەیوت: خەزیرە، ئوبەی کوڕی کەعب بەلایاندا تێ پەڕی، ئینجا ئیبنو عەباس ﵄ بانگی کرد و وتی: من و ئەم هاوڕێیەم دەربارەی هاوەڵەکەی**

[1] بڕوانە: ٧٨، ١٢٢، ٢٢٦٧، ٢٧٢٨، ٣٢٧٨، ٣٤٠٠، ٣٤٠١، ٤٧٢٦، ٤٧٢٧، ٦٦٧٢، ٧٤٧٨.

**مووسا ﷺ مشتومڕمانە ئاخۆ ئەو کەسەی کە مووسا ﷺ داوای ڕێگایەکی (لە خوا) کرد بۆئەوەی بە خزمەتی بگات، ئایا لە پێغەمبەرت ﷺ بیستووە لەبارەیەوە شتێك باس بکات؟ ئوبەی وتی: بەڵێ، لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە کاتێکدا مووسا ﷺ لەنێو کۆمەڵێك لە جوولەکەکاندا بوو، پیاوێك هات بۆ لای وتی: ئایا کەسێك دەناسیت لە تۆ زاناتر بێت؟ مووساش ﷺ فەرمووی: نەخێر، ئینجا خوا نیگای کرد بۆ مووسا ﷺ کە بەڵێ، بەندەمان خەزیر (لە تۆ زاناترە)، جا مووسا ﷺ داوای ڕێگایەکی (لە خوا) کرد بۆئەوەی بگاتە لای؟ ئینجا خوای گەورە ماسییەکی کردە نیشانە بۆی (بۆ گەیشتن بە خەزیر)، وە پێی وترا: لە هەر شوێنێکدا ماسییەکەت لێ وون بوو، بگەڕێرەوە ئیدی بێگومان تۆ پێی دەگەیت، وە ئەو خزمەتکارە (ی کە لەگەڵ مووسادا ﷺ بوو) سەیری شوێنی ماسییەکەی دەکرد لە دەریاکەدا، جا خزمەتکارەکەی مووسا ﷺ بە مووسای ﷺ وت: ( ئایا دەزانی کاتێ ڕۆیشتینە پەنای گابەردەکە (پشوومان دا) من ماسییەکەم لەبیر چوو (بیهێنم)، وە هەر شەیتان لەبیری بردمەوە کە باسی بکەم بۆت)، مووسا ﷺ وتی: (ئەوە ئەو نیشانەیە کە ئێمە دەمانویست، جا ئیدی بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە)، ئیتر خەزیریان دۆزییەوە، جا دەنگ و باسیان ئەوە بوو کە خوا ﷻ لە قورئاندا گێڕاویەتەوە)).**

## ١٨- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الكِتَابَ))

٧٥- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ضَمَّنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَقَالَ: «اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الكِتَابَ»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٤٣، ٣٧٥٦، ٧٢٧٠.

## ١٨- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: «خوایە شارەزای بکە لە قورئان»

٧٥- ئیبنو عەباس ؓ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باوەشی پیا کردم وگوشیمی بە خۆیەوە فەرمووی: ((خودایە! قورئانی فێر بکە و شارەزای بکە لێی)).

## ١٩- بابٌ: مَتَى يَصِحُّ سَمَاعُ الصَّغِيرِ؟

٧٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزتُ الاحْتِلَامَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِمِنًى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ، فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ وَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ، فَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ، فَلَمْ يُنْكَرْ ذَلِكَ عَلَيَّ[1].

## ١٩- باسێک: لە چ تەمەنێکدا دروستە منداڵ فەرموودە ببیستێ؟[2]

٧٦- عەبدوڵای کوڕی عەباس ؓ دەڵێ: لەو ڕۆژەدا کە تەمەنم نزیکی باڵغبوون بوو بە سواری ماکەرێکەوە هاتم، وە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا نوێژی دەکرد (بە پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان)، ڕووی لە دیوار یان سوترە نەبوو،

---

[1] بڕوانە: ٤٩٣، ٨٦١، ١٨٥٧، ٤٤١٢.

[2] سەرنج: ئیمام بوخاری ئەم سەرباسەی داناوە بۆ ئەم فەرموودەیە مەبەستی ئەوەیە بەڵگە بهێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە سەماع و بیستنی فەرموودە و زانست مەرج نییە خاوەنەکەی باڵغ بێت، ئەوەتا ئیبنو عەباس ؓ باڵغیش نەبووە لەو کاتەدا و هاتووە نوێژی کردووە لە ڕیزی هاوەڵاندا بەبەردەم نوێژی هاوەڵاندا ڕۆیشتووە لەو تەمەنەدا، دوایی پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵان سەرزەنشتیان نەکردووە، واتە: ئەم زانیارییەی گێڕاوەتەوە کە لە منداڵیدا بەسەری هاتووە پێش باڵغبوونی. بڕوانە: عمدة القاري: ١/٤٥٥-٤٥٦ .

**جا منيش (بەسوارى گوێدرێژەكەوە) بەبەردەم بەشێك لە ڕيزى نوێژخوێنەكاندا ڕۆيشتم، (پاشان دابەزيم و) گوێدرێژەكەم بەرەڵا كرد تا بلەوەڕێ، خۆشم چوومە نێو ڕيزى نوێژخوێنەكانەوە بەم كارەشم ڕەخنەم لێ نەگيرا.**

٧٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُسْهِرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنِي الزُّبَيْدِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ قَالَ: عَقَلْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ مَجَّةً مَجَّهَا فِي وَجْهِي- وَأَنَا ابن خمسِ سِنِينَ- مِنْ دَلْوٍ[1].

**٧٧- مەحموودى كوڕى ڕەبيع ﷺ دەڵێ: لەبيرمە پێغەمبەر ﷺ هەندێ ئاوى لە دۆڵچەيەك (سەتڵێك)دا كردە دەمى و پرژاندى بە ڕوخسارمدا -لەو كاتەدا من منداڵێكى پێنج ساڵان بووم-.**

## ٢٠- بابُ الْخُرُوجِ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ

وَرَحَلَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ فِي حَدِيثٍ وَاحِدٍ.

٧٨- حَدَّثَنَا أَبُو القَاسِمِ خَالِدُ بْنُ خَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَرْب قَالَ: قَالَ الأوزَاعِيُّ: أَخبَرَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ، أَنَّهُ تَمَارى هُوَ وَالْحرُّ بْنُ قَيْسِ بْنِ حِصْنٍ الفَزَارِيُّ فِي صَاحِبِ مُوسَى، فَمَرَّ بِهِمَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، فَدَعَاهُ ابن عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي تَمَارَيتُ أَنَا وَصَاحِبِي هذا فِي صَاحِبِ مُوسَى الذِي سَأَلَ السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذكُرُ شَأنَهُ؟ فَقَالَ أُبَيٌّ: نَعَمْ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَذْكُرُ شَأنَهُ يَقُولُ: «بَيْنَمَا مُوسَى فِي مَلإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: أَتَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ

---

[1] بروانە: ١٨٩، ٨٣٩، ١١٨٥، ٦٣٥٤، ٦٤٢٢.

مِنْكَ؟ قَالَ مُوسَى. لَا. فَأَوْحَى اللَّهُ ﷻ إِلَى مُوسَى: بَلَى، عَبْدُنَا خَضِرٌ. فَسَأَلَ السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، فَجَعَلَ اللَّهُ لَهُ الحُوتَ آيَةً، وَقِيلَ لَهُ إِذَا فَقَدْتَ الحُوتَ فَارْجِعْ، فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ، فَكَانَ مُوسَى ﷺ يَتَبِعُ أَثَرَ الحُوتِ فِي البَحْرِ. فَقَالَ فَتَى مُوسَى لِمُوسَى: ﴿ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ﴿٦٣﴾ ﴾ الكهف، قَالَ مُوسَى: ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الكهف، فَوَجَدَا خَضِرًا، فَكَانَ مِنْ شَأْنِهِمَا مَا قَصَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ»[1].

## ٢٠- باسی گەڕان و سەفەرکردن لەپێناو بەدەستهێنانی زانستدا

**جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ ماوەی یەك مانگ ڕێگا ڕۆیشتووە بۆ لای عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ﷺ لەبەر یەك فەرموودە (کە لەلای بووە).**

**٧٨- ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەو و حوڕی کوڕی قەیسی کوڕی حیصنی فەزاری دەربارەی هاوەڵەکەی مووسا ﷺ دەمەقاڵێ و مشتومڕیان بوو، جا ئوبەی کوڕی کەعب بەلایاندا تێ پەڕی، ئینجا ئیبنو عەباس بانگی کرد و وتی: من و ئەم هاوڕێیەم دەربارەی هاوەڵەکەی مووسا ﷺ مشتومڕمانە ئەو کەسەی کە مووسا ﷺ داوای ڕێگایەکی لە خوا کرد کە بەخزمەتی بگات، ئایا لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستووە لەبارەیەوە شتێك باس بکات؟ ئوبەی وتی: بەڵێ، لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە باسی دەکرد و دەیفەرموو: ((لە کاتێکدا مووسا ﷺ لەنێو کۆمەڵێك لە جوولەکەکاندا بوو لەناکاو پیاوێك هات بۆ لای وتی: ئایا**

---

[1] بڕوانە: ٧٤.

كەسێك دەناسیت لە تۆ زاناتر بێت؟ مووساش ﷺ فەرمووی: نەخێر، ئینجا خودا ﷻ نیگای كرد بۆ مووسا ﷺ كە بەڵێ، بەندەمان خەزیر (لە تۆ زاناترە)، جا مووسا ﷺ داوای ڕێگایەكی لە خوا كرد بۆئەوەی بگاتە خزمەتی؟ خوای گەورەش ماسییەكی كردە نیشانە بۆی (بۆ گەیشتن بە خەزیر)، وە پێی وترا: ئەگەر (لە هەر شوێنێكدا) ماسییەكەت لێ وون بوو، بگەڕێرەوە ئیدی بێگومان تۆ پێی دەگەیت، بۆیە مووسا ﷺ سەیری شوێنی ماسییەكەی دەكرد لە دەریاكەدا، جا خزمەتكارەكەی مووسا بە مووسای وت: ( ئایا دەزانی كاتێ ڕۆیشتینە پەنا گابەردەكە (پشووماندا) من ماسییەكەم لەبیر چوو (بیهێنم)، شەیتان لەبیری بردمەوە كە باسی بكەم بۆت، مووسا وتی: (ئەوە ئەو نیشانەیە كە ئێمە دەمانویست، جا ئیدی بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە و) خەزیریان دۆزییەوە، جا چیرۆكەكەیان بەو شێوەیە بوو كە خوای گەورە لە قورئاندا گێڕاویەتەوە)).

## ٢١- بابُ فَضْلِ مَنْ عَلِمَ وَعَلَّمَ

٧٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلَاءِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ مِنَ الهُدى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ الغَيْثِ الكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضًا، فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ قَبِلَتِ المَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الكَلأَ وَالْعُشْبَ الكَثِيرَ، وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ المَاءَ، فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا، وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لَا تُمْسِكُ مَاءً، وَلَا تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقِهَ فِي دِينِ اللَّهِ وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ، فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدى

اللَّهِ الذِي أُرْسِلْتُ بِهِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ إِسْحَاق: وَكَانَ مِنْهَا طَائِفَة قَيَّلَتِ الَماءَ. قَاعٌ: يَعْلُوهُ الَماءُ، وَالصَّفْصَفُ: الُمسْتَوِي مِنَ الأَرْضِ.

## ٢١- باسی گەورەیی ئەو کەسەی فێری زانیاری بووە و خەڵکیش فێر دەکات

**٧٩- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((نموونەی ئەو پەیامەی خوا بە مندا ناردوویەتی (بۆ مرۆڤەکان) لە ڕێنموونی و زانیاریدا، وەك نموونەی بارانێکی زۆر و بەفەڕ وایە ببارێ بەسەر پارچە زەوییەکدا، جا بەشێك لەو زەوییە زەوییەکی چاك و بەپیتە[1]، ئاوەکە هەڵدەمژێ و لەوەڕ و گژوگیای زۆری پێ دەڕوێ و سەوز دەبێ، وە بەشێکی دیکەی زەوییەکە وشك و ڕەق و بێپیتە، ئاوی بارانەکەی تێدا دەمێنێتەوە، ئینجا خوا بەهۆی ئەو ئاوە سوود دەگەیەنێ بە خەڵکی، جا خەڵکی خۆیان لێی دەخۆنەوە و ئاژەڵی لێ ئاو دەدەن و کشتوکاڵی پێ دەکەن، وە ئەو بارانە لە پارچە زەوییەکی دیکە دەبارێ کە زەوییەکی تەخت و بێ گژوگیایە، نە ئاو هەڵدەگرێ (دەمژێ) و نە لەوەڕ و گژوگیا دەڕوێنێ و سەوز دەکات، جا ئەوە نموونەی ئەو کەسەیە کە لە ئایینی خوا شارەزا بووبێت و خوا سوودی پێ گەیاند بێ بەو پەیامەی بە مندا ناردوویەتی، جا خۆی فێر بووە و خەڵکیشی فێر کردووە، وە نموونەی کەسێکە کە پشتی لە ئایین کردووە و ئەو ڕێنماییەی**

---

[1] سەرنج: پێغەمبەری خودا ﷺ دەیەوێت پەیامەکەی بچووێنێت بە بارانێکی زۆری بەفەڕ، خەڵکیش بەو زەوییەی کە ئەو بارانەی لێ دەبارێت، جا خەڵکی وا هەیە زۆر سوود لە پەیامەکەی پێغەمبەر ﷺ وەردەگرێ بۆ خۆی، هەیشە بۆ خۆی و بۆ خەڵکیش سوودی لێ وەردەگرێ، هەیشە هیچ سوودێکی لێ وەرناگرێت، وەک زەوییەکی کرێن (بێ گژوگیا)ی بەرداوییە، کە هەرچەند بارانی لێ ببارێت سوودی پێ ناگەیەنێت، هیچی لێ سەوز نابێت.

خوای وەرنەگرتووە کە بەمندا نێردراوە)). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ئیسحاق وتی: هەندێکی ئاوەکە دەخوات و هەڵیدەمژێ. (قَاعٌ) واتە: ئاوەکە بەسەریدا دەڕوات، وە وشەی (الصَّفْصَفُ) واتە: زەوییەکی تەخت و ڕێك.

## ٢٢- بابُ رَفْعِ الْعِلْمِ وَظُهُورِ الْجَهْلِ

وَقَالَ رَبِيعَةُ: لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ عِنْدَهُ شَيْءٌ مِنَ العِلْمِ أَنْ يُضَيِّعَ نَفْسَهُ.

٨٠- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: .إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ، وَيَثْبُتَ الجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا.[١].

## ٢٢-باسی نەمانی زانست و دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی نەزانی

ڕەبیعە دەڵێ: دروست نییە بۆ کەسێ زانیارییەکی لەلا بێت خۆی بفەوتێنێ[٢].

٨٠- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە نیشانەکانی (نزیکبوونەوەی) ڕۆژی دوایی ئەوەیە: زانست و زانیاری هەڵدەگیرێ و نامێنێ و نەزانی بڵاو دەبێتەوە و مەی دەخورێتەوە، وە داوێنپیسی بڵاو دەبێتەوە و بەئاشکرا ئەنجام دەدرێ)).

٨١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثًا لَا يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: .مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَقِلَّ العِلْمُ، وَيَظْهَرَ الجَهْلُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا، وَتَكْثُرَ النِّسَاءُ وَيَقِلَّ الرِّجَالُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً القَيِّمُ الوَاحِدُ.[٣].

---

[١] بڕوانە: ٨١، ٥٢٣١، ٥٥٧٧، ٦٨٠٨.

[٢] مەبەستی ئەوەیە بڵاوی نەکاتەوە و خۆی نەناسێنێ، تا زانیارییەکە لەناو دەچێ.

[٣] بڕوانە: ٨٠.

٨١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: فەرموودەیەكتان بۆ دەگێڕمەوە كەس لەدوای من بۆتان ناگێڕدرێتەوە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە نیشانەكانی (نزیكبوونەوەی) ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە: عیلم و زانیاری كەم دەبێتەوە و نامێنێ، نەزانی و بێئاگایی لە ئایین بڵاو دەبێتەوە، داوێنپیسی و زینا بەئاشكرا بڵاو دەبێتەوە، ئافرەتان زۆر دەبن و پیاوان كەم دەبنەوە (بە هۆی ئاشووب و شەڕەوە)، هەتا وای لێ دێ كە پەنجا ئافرەت یەك سەرپەرشتیاری پیاویان دەبێ)).

## ٢٣- بابُ فَضْلِ الْعِلْمِ

٨٢- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ ابن عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ، فَشَرِبْتُ حَتَّى إِنِّي لأَرى الرِّيَّ يَخْرُجُ فِي أَظْفَارِي، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ». قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْعِلْمَ»[1].

## ٢٣- باسی گەورەیی زانست و زانیاری

٨٢- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست فەرمووی: ((لە كاتێكدا من خەوتبووم لە خەوەكەمدا پەرداخێك شیریان بۆ هێنام منیش خواردمەوە، (بە جۆرێ پاراو بوومەوە) تاوەكوو (تێر شیر بووم و) وام دەزانی پاراوی لە نینۆكەكانمەوە دەردەچێ، پاشان پاشماوەكەم دا بە عومەری كوڕی

---

[1] بڕوانە: ٣٦٨١، ٧٠٠٦، ٧٠٠٧، ٧٠٢٧، ٧٠٣٢.

خەتاب)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەو خەومت بەچی لێکدایەوە؟ فەرمووی: ((بە عیلم و زانست)).

## ٢٤- بَابُ الفُتْيَا وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى الدَّابَّةِ وَغَيْرِهَا

٨٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَفَ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ بِمِنًى لِلنَّاسِ يَسْأَلُونَهُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ، فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أذبَحَ؟ فَقَالَ: «اذْبَحْ وَلَا حَرَجَ». فَجَاءَ آخَرُ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ، فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: «ارْمِ وَلَا حَرَجَ». فَمَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلَا أُخِّرَ إِلَّا قَالَ: «افْعَلْ وَلَا حَرَجَ»[1].

## ٢٤- باسی فەتوادان لە کاتێکدا فەتوادەر بەسواری وڵاخ و شتی دیکەوە بێت

٨٣- عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا لە مینا ڕاوەستا بوو لەبەر ئەوەی خەڵکی پرسیاریان لێ دەکرد، پیاوێك هات بۆلای وتی: نەمزانی سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی سەر ببڕم؟ فەرمووی: ((قوربانییەکەت سەر ببڕە و قەیناکات))، پیاوێکی دیکە هات وتی: نەمزانی قوربانییەکەم سەر بڕی بەر لەوەی بەردبارانی شەیتان بکەم؟ فەرمووی: ((بەردبارانی شەیتان بکە و قەیناکات)). (عەبدوڵا دەڵێ:) پێغەمبەر ﷺ پرسیاری هەر شتێکی لێ بکرایە کە پێش خرابوو یان دوا خرابوو، یەکسەر پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((ئەوە بکە ئاساییە و قەیناکات)).

---

[1] بڕوانە: ١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥.

## ٢٥- بابُ مَنْ أَجَابَ الْفُتْيَا بِإِشَارَةِ الْيَدِ وَالرَّأْسِ

٨٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَن النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ فِي حَجَّتِهِ، فَقَالَ: ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ فَأَوْمَأَ بِيَدِهِ قَالَ: «وَلَا حَرَجَ». قَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ فَأَوْمَأَ بِيَدِهِ: «وَلَا حَرَجَ»[1].

## ٢٥-باسی کەسێک وەڵامی پرسیارە شەرعییەکان بە ئاماژەی دەست و سەر بداتەوە

**٨٤- ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: لە حەج (ی ماڵئاوایی)ەکەیدا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا و کابرا وتی: قوربانیم سەر بڕیوە پێش ئەوەی بەردبارانی شەیتان بکەم؟ پێغەمبەریش ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد وتی: ((قەیناکات))، وتی: سەرم تاشی بەرلەوەی قوربانی سەر ببڕم؟ جا بە دەستی ئاماژەی کرد: ((قەیناکات)).**

٨٥- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: أَخبَرَنَا حَنْظَلَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ سَالِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُقْبَضُ العِلْمُ، وَيَظْهَرُ الجَهْلُ وَالفِتَنُ، وَيَكْثُرُ الهَرْجُ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا الهَرْجُ؟ فَقَالَ هَكَذَا بِيَدِهِ، فَحَرَّفَهَا، كَأَنَّهُ يُرِيدُ القَتلَ[2].

**٨٥- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: (((بە مردنی زاناکان) زانست نامێنێ و نەزانی و ئاشوب بڵاو دەبێتەوە، وە (هەرج)**

---

[1] بڕوانە: ١٧٢١، ١٧٢٢، ١٧٢٣، ١٧٣٤، ٦٦٦٦.

[2] بڕوانە: ١٠٣٦، ١٤١٢، ٣٦٠٨، ٣٦٠٩، ٤٦٣٥، ٤٦٣٦، ٦٠٣٧، ٦٥٠٦، ٦٩٣٥، ٧٠٦١، ٧١١٥، ٧١٢١.

زۆر دەبێت)) وترا: (هەرج) چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێ: ئاوەها دەستی جوڵاند وەك ئەوەی مەبەستی کوشتن بێت.

٨٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَت: أَتَيْتُ عَائِشَةَ -وَهِيَ تُصَلِّي- فَقُلْتُ: مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ إِلَى السَّمَاءِ، فَإِذَا النَّاسُ قِيَامٌ، فَقَالَتْ: سُبحَانَ اللهِ! قُلْتُ: آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَيْ: نَعَمْ - فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلَّانِي الغَشْيُ، فَجَعَلْتُ أَصُبُّ عَلَى رَأْسِي المَاءَ، فَحَمِدَ اللهَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَثْنَى عَلَيهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أَكُنْ أُرِيتُهُ إِلَّا رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي حَتَّى الجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ -مِثلَ أَوْ- قَرِيبَ- لَا أَدْرِي أيَ ذَلِكَ قَالَت أَسْمَاءُ- مِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَجَّالِ، يُقَالُ: مَا عِلْمُكَ بهذا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا المُؤْمِنُ -أَوِ المُوقِنُ لَا أَدْرِي بِأَيِّهِمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ- فَيَقُولُ: هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدى، فَأَجَبْنَا وَاتَّبَعْنَا، هُوَ مُحَمَّدٌ. ثَلَاثا، فَيُقَالُ: نَمْ صَالِحًا، قَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُوقِنًا بِهِ. وَأَمَّا المُنَافِقُ- أَوِ المُرْتَابُ لَا أَدْرِي أيَ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ- فَيَقُولُ لَا أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ»[1].

٨٦- ئەسما ﵄ وتی: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە ﵄ لەو کاتەدا نوێژی (خۆرگیرانی) دەکرد، وتم: ئەوە خەڵکی چییانە (شڵەژاون و پەشۆکاون)؟ عائیشەش ﵄ ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان (واتە: خۆر گیراوە)، کە سەیرم کرد بینیم خەڵك وەستاون (و نوێژ دەکەن)، (عائیشە) وتی: سبحان الله، (ئەسما دەڵێ:) وتم: ئەم خۆرگیرانە نیشانەیەکە (خوا بەندەکانی پێ دەترسێنێ)؟ ئەویش بەسەری ئاماژەی کرد: بەڵێ وایە، ئیدی منیش نوێژم دابەست (نوێژەکە زۆری پێ چوو)، وام لێ هات

[1] بروانه: ١٨٤، ٩٢٢، ١٠٥٣، ١٠٥٤، ١٠٦١، ١٢٣٥، ١٣٧٣، ٢٥١٩، ٢٥٢٠، ٧٢٨٧.

نزيك بوو لەهۆش خۆم بچم، بۆيە دەستم كرد بە ئاوكردن بەسەرمدا، (دوای تەواوبوونی نوێژەكە) ئینجا پێغەمبەر ﷺ سوپاس و ستاییشی خوای گەورەی كرد، پاشان فەرمووی: ((ئەوەی كە پێشتر نیشانم نەدرابوو دڵنیا بن لەم شوێنەدا كە ڕاوەستاوم (نیشانم درا و) بینیم هەتا بەهەشت و دۆزەخیش، وە نیگام بۆ هات بێگومان ئێوە لە گۆڕەكانتاندا تاقی دەكرێنەوە وەكوو -یان نزيك لە - -نازانم ئەسما كام لەو دوو وشەی وت- تاقیكردنەوەی دەجالە كوێرە جادووگەرەكە وایە، دەوترێ: (بەو كەسەی خراوەتە گۆڕەوە) چ زانیارییەكت هەیە دەربارەی ئەو پیاوە (كە موحەممەدە ﷺ )؟ جا ئەوەی كە باوەڕدار بێت - یان خاوەن دڵنیایی بێ- نازانم ئەسما كامیانی وت- دەڵێ: ئەو پیاوە موحەممەدە و پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئایینی ڕۆشن و ڕێنمایی هێنابوو، ئێمەش باوەڕمان پێ هێنا و شوێنی كەوتین، ئینجا سێ جار دەڵێ: ئەمە موحەممەدە ئەوسا پێی دەوترێت: بەخۆشی بخەوە، بێگومان ئێمە دەمانزانی كە تۆ باوەڕی پتەوت پێیەتی، بەڵام ئەوەی دووڕوو -یان دوودڵ- بوو بێت، -نازانم ئەسما كامیانی وت- دەڵێ: نازانم ئەو پیاوە (موحەممەدە ﷺ) كێیە، (تەنیا ئەوە نەبێ) گوێم لە خەڵك بوو چییان دەوت، منیش دەموتەوە)).

## ٢٦- بابُ تَحْرِيضِ النَّبِيِّ ﷺ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى أَنْ يَحْفَظُوا الإِيمَانَ وَالْعِلْمَ وَيُخْبِرُوا مَنْ وَرَاءَهُمْ

وَقَالَ مَالِكُ بْنُ الحُوَيْرِثِ: قَالَ لنَا النَّبِيُّ ﷺ: ((ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ))[١].

---

[١] بڕوانە: ٦٢٨.

٨٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أُتَرْجِمُ بَيْنَ ابن عَبَّاسٍ وَبَيْنَ النَّاسِ، فَقَالَ: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ القَيْسِ أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «مَنِ الوَفْدُ» -أَوْ- «مَنِ القَوْمُ؟». قَالُوا: رَبِيعَةُ. فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ -أَوْ بِالْوَفْدِ- غَيْرَ خَزَايَا وَلَا نَدَامَى». قَالُوا: إِنَّا نَأْتِيكَ مِنْ شُقَّةٍ بَعِيدَةٍ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الحَيُّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ، وَلَا نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيَكَ إِلَّا فِي شَهْرٍ حَرَامٍ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ نُخْبِرِ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، نَدْخُلُ بِهِ الجَنَّةَ. فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ، وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، أَمَرَهُمْ بِالإِيمَانِ بِاللَّهِ ﷻ وَحْدَهُ. قَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ بِاللَّهِ وَحْدَهُ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لَا إله إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَتُعْطُوا الخُمُسَ مِنَ المَغْنَمِ». وَنَهَاهُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْحنْتَمِ وَالمُزَفَّتِ. قَالَ شُعْبَةُ: رُبَّمَا قَالَ: النَّقِيرِ، وَرُبَّمَا قَالَ: الْمقَيَّرِ. قَالَ: «احْفَظُوهُ وَأَخْبِرُوهُ مَنْ وَرَاءَكُمْ»[1].

## ٢٦- باسی هاندانی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاندی عەبدولقەیس کە شارەزا ببن لە باوەڕ و زانست و بیگەیەنن بە هۆزەکەیان

**مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێمان: ((بگەڕێنەوە بۆ لای کەسوکارتان و شارەزایان بکەن (لە ئیسلام))).**

**٨٧- ئەبو جەمرە دەڵێ: من وەرگێڕ بووم لە نێوان ئیبنو عەباس ﷺ و خەڵکەکەدا، ئیبنو عەباس ﷺ وتی: کاتێك شاندی خێڵی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم شاندە کێن؟)) -یان- ((ئەو هۆزە کێن؟)) وتیان: هۆزی ڕەبیعەین (چونکە خێڵی عەبدولقەیس بەشێکن لە هۆزی**

---

[1] بڕوانە: ٥٣.

**ڕەبیعە)، فەرمووی: ((بەخێر بێن ئەو شاندەی (بە هاتنتان) بەبێ ڕیسوابوون و پەشیمانی، وتیان: ئێمە لە شوێنێکی دوورەوە دێینە خزمەتت، لە نێوان ئێمە و جەنابتدا ئەم هۆزە بێباوەڕە هەن کە هۆزی موزەڕە، بۆیە ناتوانین بێینە خزمەتت تەنیا لەو مانگەدا نەبێ کە (جەنگ تێیدا) حەرامە، کەواتە چەند فەرمانێکمان پێ بفەرموو تا بیگەیەنین بە هۆزەکەمان و (هەمووومان کاری پێ بکەین) بەهۆیەوە بچینە بەهەشتەوە، ئینجا فەرمانی پێ کردن بە چوار شت و قەدەغەی چوار شتیشی لێ کردن، فەرمانی پێ کردن بە باوەڕهێنان بە خوای گەورەی تاك و تەنها، فەرمووی: ((دەزانن باوەڕهێنان بە خوای تاك و تەنها چۆنە؟)) وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((بریتییە لە شایەتومانهێنان بەم جۆرە:** (أشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)[١]**، وە نوێژکردن و زەکاتدان و ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان، وە پێنجیەکی دەستکەوتی جەنگ بدەن (بە دەوڵەتی ئیسلامیی)))، وە ڕێگریشی لێ کردن لەم شتانە: کولەکەی هەڵکۆڵراو، گۆزەی حەنتەم (کە لە قوڕ و موو دروست دەکرا)، دەفری قیڕ و زەفت تێهەڵسواو[٢]. شوعبە (لەگێڕانەوەکەیدا دەڵێ: ئەبو جەمرە) جاری وا بوو دەیوت:** (النَّقِيرِ)[٣]**، جاری واش بوو دەیوت:** (المقَيَّرِ)[٤]**، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمانەی گوتم لەبەری بکەن و (کە گەڕانەوە) بیگەیەنن بە هۆزەکەتان)).**

---

[١] واتە: شاهێدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک ڕاست نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە.

[٢] هۆی قەدەغەکردنی ئەو چوارە کە شلەمەنییان تێ دەکرێ لەبەر ئەوەیە سرکە و دۆشاو تێیاندا زوو دەبێتە عارەق .

[٣] واتە: (النَّقير)ی لێ قەدەغە کردن کە هەڵکوڵراوە لە بنکی دارخورما.

[٤] واتە: (المقَيَّر)ی لێ قەدەغە کردن کە دەفری قیر و زەفت تێهەڵسواوە.

## ٢٧- بابُ الرِّحْلَةِ فِي الْمَسْأَلَةِ النَّازِلَةِ وَتَعْلِيمِ أَهْلِهِ

٨٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الحَسَنِ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ قَالَ: أَخبَرَنَا عُمَرُ ابْنُ سَعِيدِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحارِثِ، أَنَّهُ تَزَوَّجَ ابنةً لأَبِي إِهَابِ بْنِ عَزِيزٍ، فَأَتَتْهُ امرَأَةٌ فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُ عُقْبَةَ وَالَّتِي تَزَوَّجَ بِهَا. فَقَالَ لَهَا عُقْبَةُ: مَا أَعْلَمُ أَنَّكِ أَرْضَعْتِنِي وَلَا أَخْبَرْتِنِي. فَرَكِبَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «كَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟». فَفَارَقَهَا عُقْبَةُ، وَنَكَحَت زَوْجًا غَيْرَهُ[١].

## ٢٧- باسی سەفەرکردن بۆ پرسیارکردن دەربارەی ڕووداوێک و ئاگادارکردنی خێزانی لێی

**٨٨- عوقبەی کوڕی حاریس ﵁ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێکی مارە کرد کچی ئەبو ئیهابی کوڕی عەزیز بوو، ئینجا ئافرەتێك هات وتی: بێگومان من شیرم داوە بە عوقبە و ئەو ئافرەتەش کە مارەی کردووە، عوقبەش پێی وت: من ئاگادار نیم کە تۆ شیرت بە من دابێ، پێشتریش ئەمەت بە من نەوتووە، ئینجا سواری وڵاخەکەی بوو ڕۆیشت بۆ مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((چۆن دەبێتە (خێزانت) لە کاتێکدا وتراوە (کە شیرتان بەیەکەوە خواردووە)))، ئیدی عوقبەش لێ جیا بۆیەوە، ئافرەتەکە شووی کرد بە پیاوێکی دیکە.**

---

[١] بڕوانە: ٢٠٢٥، ٢٦٤٠، ٢٦٥٩، ٢٦٦٠، ٥١٤٠.

# ٢٨- بابُ التَّنَاوُبِ فِي الْعِلْمِ

٨٩- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ (ح). قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَ ابن وَهْبٍ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَجَارٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ -وَهْيَ مِن عَوَالِي المَدِينَةِ- وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا، فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِخَبَرِ ذَلِكَ اليَوْمِ مِنَ الوَحْيِ وَغَيْرِهِ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَنَزَلَ صَاحِبِي الأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ، فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا، فَقَالَ: أَثَمَّ هُوَ؟ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ. قَالَ: فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي فَقُلْتُ: طَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: لَا أَدْرِي. ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ: أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ قَالَ: «لَا». فَقُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ[1].

## ٢٨- باسی بەنۆرە ڕۆیشتن بۆ وەرگرتنی زانست

**٨٩- عومەر (ی کوڕی خەتاب) ﷺ دەڵێ: من و دراوسێیەکی ئەنصاریم لەنێو خێڵی بەنو ئومەیەی کوڕی زەید بووین -کە گوندێکە لەنێو گوندەکانی (خۆرهەڵاتی) سەرووی مەدینە- هەردووکمان بەسەرە (بەنۆرە) دەچووین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو (عوتبانی کوڕی مالیك) ڕۆژێك دەچوو (بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ)، منیش ڕۆژێ دەچووم (بۆ وەرگرتنی دەنگ و باس و نیگا)، جا هەر ڕۆژێك من بڕۆشتمایە، هەر هەواڵێکی ئەو ڕۆژە هەبووایە لە نیگا و شتی دیکە بۆم دەهێنا، ئەو ڕۆژەش ئەو بڕۆشتایە هەمان کاری منی دەکرد، جارێك ئەو دراوسێ ئەنصارییەم لە سەرەی خۆیدا دابەزی (بۆ مەدینە و گەڕایەوە)، بەتوندی لە دەرگای (ماڵی) منی دا و وتی: عومەر لەوێیە؟ منیش**

---

[1] بڕوانە: ٢٤٦٨، ٤٩١٣، ٤٩١٤، ٤٩١٥، ٥١٩١، ٥٢١٨، ٥٨٤٣، ٧٢٥٦، ٧٢٦٣.

ترسام و ڕۆیشتمه دەرەوه بۆ لای، وتی: ڕووداوێكی گەوره ڕووی داوه، عومەر وتی: منیش (ڕۆیشتم بۆ مەدینه و) چووم بۆ ماڵی حەفصه، دەبینم دەگری، وتم: چییه پێغەمبەری خوا ﷺ تەڵاقی داون؟ وتی: نازانم، پاشان چوومه خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هەر بەپێوه بووم پێم وت: خێزانەكانت تەڵاق داوه؟ فەرمووی: ((نەخێر)) منیش وتم: الله أكبر.

## ٢٩- بابُ الْغَضَبِ فِي الْمَوْعِظَةِ وَالتَّعْلِيمِ إِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ

٩٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ قَالَ: أَخبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابن أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَا أَكَادُ أُدْرِكُ[١] الصَّلَاةَ مِمَّا يُطَوِّلُ بِنَا فُلَانٌ. فَمَا رَأَيتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْ يَوْمِئِذٍ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ مُنَفِّرُونَ، فَمَنْ صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ المَرِيضَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الحَاجَةِ»[٢].

## ٢٩- باسی تووڕەبوون له كاتی ئامۆژگاری و فێركردندا ئەگەر ئامۆژگاریكار شتێكی ناپەسەندی بینی

٩٠- ئەبو مەسعودی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من (له نوێژی جەماعەت دوا دەكەوم) فریا ناكەوم لەبەر ئەوەی فڵانه كەس (پێشنوێژیمان بۆ دەكات)، ئەوەنده درێژی دەكاتەوه بۆمان (منیش لاواز و نەخۆشم)، هیچ كات پێغەمبەرم ﷺ نەدیوه له ئامۆژگاریكردندا ئەوەندەی ئەو

---

[١] سەرنج: ئیبنو حەجەر له قازی عیازەوه دەگێڕێتەوه دەفەرمووێ: ڕەنگه وشەی (أُدْرِكُ) (أترك) بووبێت و بەهەڵه گێردرابێتەوه، له ڕاستیشدا ئەگەر ئاوا بێت، مانای فەرموودەكه ڕوونتره، واته: كابرا دەڵێ: خەریكه واز له نوێژ بێنم لەبەر درێژكردنەوەی نوێژی جەماعەتی فڵانه كەس.

[٢] بڕوانه: ٧٠٢، ٧٠٤، ٦١١٠، ٧١٥٩.

**ڕۆژه توڕه بووبێت، ئەوسا فەرمووی: ((ئەی خەڵكینه! بێگومان هەندێ له ئێوه دوورخەرەوەی خەڵكن (له مزگەوت و نوێژی جەماعەت)، بۆیه هەركامتان پێشنوێژی كرد بۆ موسوڵمانان، با نوێژەكەی درێژ نەبێت و بەكورتی بیكات، چونكه بێگومان نەخۆش و لاواز و پیر و خاوەن ئیشیان تێدایه))[1].**

٩١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن محَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْن بِلَالٍ الَمدِينِيُّ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ -يَزِيدَ مَوْلَى الُمنْبَعِثِ- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الُجهَنِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَأَلَه رَجُلٌ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: «اعْرِفْ وِكَاءَهَا -أَوْ قَالَ: وِعَاءَهَا- وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، ثُمَّ اسْتَمْتِعْ بِهَا، فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ». قَالَ: فَضَالَّةُ الإِبِلِ، فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ -أَوْ قَالَ احْمَرَّ وَجْهُهُ- فَقَالَ: «وَمَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ المَاءَ، وَتَرْعَى الشَّجَرَ، فَذَرْهَا حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا». قَالَ: فَضَالَّةُ الغَنَمِ قَالَ: «لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ»[2].

**٩١- زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەڵێ: پیاوێك دەربارەی شتی دۆزراوە پرسیاری له پێغەمبەر ﷺ كرد، ئەویش فەرمووی: ((بزانه! (ئەو توورەكەی ماڵه دۆزراوەكەی تێدایه) به چی دەمی بەستراوە -یان فەرمووی: توورەكەكه چییه و چۆنه؟- ئینجا تا ماوەی یەك ساڵ (جار جار) جاڕی بۆ بده، (ئەگەر خاوەنی نەبوو) ئینجا بەكاری بێنه و خەرجی بكه بۆ خۆت، بەڵام ئەگەر دواتر خاوەنەكەی هات و پەیدا بوو، بۆی بگێڕەوە و بیدەرەوە))، وتی: ئەی وشتری ونبوو (حوكمی چۆنه)؟ پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە توڕه بوو تاوەكوو دەموچاوی**

---

[1] دەبێ پێشنوێژ ئاگاداری هەموویان بێت و نوێژەكەی بەشێوەیەك بێت ئەوانه ناڕەحەت نەبن.

[2] بڕوانه: ٢٣٧٢، ٢٤٢٧، ٢٤٢٨، ٢٤٢٩، ٢٤٣٦، ٢٤٣٨، ٥٢٩٢، ٦١١٢.

**سوور هەڵگەڕا -یان وتی: دەموچاوی سوور هەڵگەڕا- ئینجا فەرمووی: ((تۆ چیتە بەسەریەوە؟ جەومنە ئاوی خۆی و پێڵاوی خۆی پێیە[1]، خۆی دەچێت بۆ ئاوخواردنەوە و گەڵای درەخت دەخوات، لێی گەڕێ تا خاوەنەکەی پێی دەگات و دەیدۆزێتەوە))، وتی: ئەی ونبووی مەڕومالآت (حوکمی چییە و چۆنە)؟ فەرمووی: ((یان بۆ تۆیە، یان بۆ براکەتە، یان بۆ گورگە)).**

٩٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلَاءِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ أَشْيَاءَ كَرِهَهَا، فَلَمَّا أُكْثِرَ عَلَيْهِ غَضِبَ، ثمَّ قَالَ لِلنَّاسِ: «سَلُونِي عَمَّا شِئْتُمْ». قَالَ رَجُلٌ مَنْ أَبِي؟ قَالَ: «أَبُوكَ حُذَافَةُ». فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «أَبُوكَ سَالِمٌ مَوْلَى شَيْبَةَ». فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَتُوبُ إِلَى اللَّهِ ﷻ[2].

**٩٢- ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری شتانێکی لێ کرا کە پێی ناخۆش بوو، جا کە پرسیاری زۆری لێ کرا توڕە بوو، پاشان فەرمووی بە موسوڵمانان: ((بە ئارەزووی خۆتان چ پرسیارێکم لێ دەکەن بیکەن))، پیاوێك وتی: باوکی من کێیە؟ فەرمووی: ((باوکت حوزافەیە))، پیاوێکی دیکە هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکی من کێیە؟ فەرمووی: ((باوکت سالیمە، کە بەندەی ئازادکراوی شەیبەیە))، ئینجا کە عومەر توڕەیی لە دەموچاوی پێغەمبەردا ﷺ بینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لای خوا ﷻ تەوبە دەکەین و پەشیمانین (لەوەی کە تۆمان توڕە کرد).**

---

[1] مەبەستی بە (پێڵاوی خۆی پێیە) ئەوەیە کە سمی وشتر بەشێوەیەکە دەتوانێ زۆر بە پێ بڕوات، وە ئاویش هەڵدەگرێ بۆ کاتی پێویست.

[2] بڕوانە: ٧٢٩١.

## ٣٠- بابُ مَنْ بَرَكَ عَلَى رُكْبَتَيْهِ عِنْدَ الإِمَامِ أَوِ الْمُحَدِّث

٩٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ، فَقَامَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُذَافَةَ فَقَالَ: مَنْ أَبِي؟ فَقَالَ: «أَبُوكَ حُذَافَةُ». ثُمَّ أَكْثَرَ أَنْ يَقُولَ: «سَلُونِي». فَبَرَكَ عُمَرُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيًّا فَسَكَتَ[١].

## ٣٠- باسی ئەوەی لەبەردەم پێشەوا و فەرموودەزاندا، لەسەر ئەژنۆ دانیشتبێت

**٩٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵ هاتە دەرەوە (جا پرسیاری زۆری لێ کرا و ئەویش تورە بوو)، ئینجا عەبدوڵای کوڕی حوزافە هەستا و وتی: باوکی من کێیە؟[٢] فەرمووی: ((باوکت حوزافەیە))، پاشان زۆر دەیفەرموو: ((پرسیارم لێ بکەن)) ئینجا عومەر لەسەر هەردوو ئەژنۆی دانیشت وتی: ڕازین بەوەی خوا پەروەردگارمانە و ئیسلام ئاییمانە و موحەممەد ﷺ پێغەمبەرمانە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو.**

## ٣١- بابُ مَنْ أَعَادَ الْحَدِيثَ ثَلَاثًا لِيُفْهَمَ عَنْهُ

فَقَالَ: ((أَلَا وَقَوْلُ الزُّورِ)). فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا. وَقَالَ ابن عُمَرَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ((هَلْ بَلَّغْتُ؟)). ثَلَاثًا[٣].

---

[١] بڕوانە: ٥٤٠، ٧٤٩، ٤٦٢١، ٦٣٦٢، ٦٤٦٨، ٦٤٨٦، ٧٠٨٩، ٧٠٩٠، ٧٠٩١، ٧٢٩٤، ٧٢٩٥.

[٢] سەرنج: هۆکاری پرسیاری ئەمانە دەربارەی باوکیان لەم فەرموودەیە و لەوەی پێشووشدا ئەوە بووە کە لە سەردەمی نەفامیدا هەندێک جار تانە لە ڕەچەڵەکی هەندێ کەس دراوە و پێی وتراوە فڵانە کەس باوکی تۆ نییە، بۆیە کابرا ویستوویەتی دڵنیا بێتەوە لە نەسەبی خۆی .

[٣] بڕوانە: ١٧٤٢.

٩٤- حَدَّثَنَا عَبْدَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ المثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا ثُمَامَةُ بْن عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَلَّمَ سَلَّمَ ثَلَاثًا، وَإِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلَاثًا[١].

## ٣١- باسی ئەوەی سێ جار وتەکەی دووبارە دەکاتەوە تا لێی تێ بگەن

**پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئاگاداری قسەی درۆ بن!!)) جا بەردەوام ئەم وتەیەی دەوتەوە، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سێ جار فەرمووی: ((ئایا ڕاسپاردەکەم گەیاند؟)).**

**٩٤- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەلامی بکردایە سێ جار سەلامی دەکرد، کاتێ وتەی بفەرمووایە سێ جار دووبارەی دەکردەوە .**

٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلَاثًا حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ، وَإِذَا أَتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ ثَلَاثًا[٢].

**٩٥- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەگەر وتەیەکی بفەرمووایە سێ جار دووبارەی دەکردەوە تا لێی تێ بگەن، وە کاتێ بهاتایە بۆ نێو کۆمەڵێك و سەلامی لێ بکردنایە، سێ جار سەلامی لێ دەکردن.**

٩٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: تَخَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ سَافَرْنَاهُ، فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقْنَا الصَّلَاةَ صَلَاةَ

---

[١] بڕوانە: ٩٥، ٦٢٤٤.

[٢] بڕوانە: ٩٤.

الْعَصْرِ وَنَحْنُ نَتَوَضَّأُ، فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ» مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا[1].

**٩٦- عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: لە سەفەرێکدا کە کردمان پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ ما لە ئێمە، جا کاتێ گەیشتەوە پێمان نوێژمان دوا خستبوو، وە نوێژەکە نوێژی عەسر بوو (خەریك بوو کاتی نوێژ نەدەما)، ئێمەش دەستنوێژمان دەگرت و (قاچمان بەجوانی نەدەشۆرد)، دەستی تەڕمان دەهێنا بە پێیەکانماندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دوو یان سێ جار بەدەنگی بەرز فەرمووی: ((هاوار و لەناوچوون و سزای سەخت لەناو ئاگردا بۆ ئەو کەسانەی بەچاکی و بەجوانی پاژنەی پێیەکانیان ناشۆن)).**

## ٣٢- بابُ تَعْلِيمِ الرَّجُلِ أَمَتَهُ وَأَهْلَهُ

٩٧- أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ -هُوَ ابن سَلَامٍ- حَدَّثَنَا الْمحَارِبِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ حَيَّانَ قَالَ: قَالَ عَامِرٌ الشَّعْبِيُّ: حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَهُمْ أَجْرَانِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ ﷺ، وَالْعَبْدُ الْمَمْلُوكُ إِذَا أَدى حَقَّ اللَّهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ يَطَؤُهَا فَأَدَّبَهَا، فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ» ثُمَّ قَالَ عَامِرٌ: أَعْطَيْنَاكَهَا بِغَيْرِ شَيْءٍ، قَدْ كَانَ يُرْكَبُ فِيمَا دُونَهَا إِلَى الْمدِينَةِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٠.

[2] بڕوانە: ٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٤٦، ٥٠٨٣.

## ٣٢- باسی پیاو کەنیزەک و خێزانی فێری زانست بکات

٩٧- ئەبو بوردە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سێ کەس دوو پاداشتیان هەیە، کەسێك لە خاوەن کتێبەکان باوەڕی بە پێغەمبەرەکەی خۆی و بە موحەممەدیش ﷺ هێنابێ، بەندەیەك کە ماف خوا و ماف گەورەکەی بەجێ بێنێ، پیاوێکیش کەنیزەکێکی هەبێ سەرجێیی لەگەڵ بکات و بەچاکی ئەدەبی دابدات، وە بەجوانی فێری ئایین و زانستی بکات، پاشان خۆی ئازادی بکات و مارەی بکات (و مارەیی بداتێ) ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە)). پاشان عامیر (ی شەعبی بە یەکێك لە ڕاوییەکانی[1]) وت: ئەم فەرموودەیە (یان ئەم زانیارییە)مان پێ دایت بەبێ بەرامبەر، لە کاتێکدا جاران بۆ لەمە کەمتر سەفەر دەکرا بۆ مەدینە.

## ٣٣- بَابُ عِظَةِ الإِمَامِ النِّسَاءَ وَتَعْلِيمِهِنَّ

٩٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَيُّوبَ قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً قَالَ: سَمِعْتُ ابن عَبَّاسٍ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَوْ قَالَ عَطَاءٌ: أَشْهَدُ عَلَى ابن عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ وَمَعَهُ بِلَالٌ، فَظَنَّ أَنَّهُ يُسْمِعِ النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي الْقُرْطَ وَالْخَاتَمَ، وَبِلَالٌ يَأْخُذُ فِي طَرَفِ ثَوْبِهِ. وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَطَاءٍ، وَقَالَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَشْهَدُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ[2].

## ٣٣-باسی ئامۆژگاری و فێرکردنی پێشەوا بۆ ئافرەتان

٩٨- عەتا دەڵێ: لە ئیبنو عەباسم بیست ﷺ وتی: شایەتی دەدەم لەسەر پێغەمبەر ﷺ، یان عەتا وتی: شایەتی دەدەم لەسەر ئیبنو عەباس کە

---

[1] بە پیاوێکی خوراسانی کاتێ پرسیاری لێ کرد کە پیاوێک کەنیزەکەکەی ئازاد بکات، پاشان خۆی مارەی بکات.

[2] بڕوانە: ٨٦٣، ٩٦٢، ٩٦٤، ٩٧٥، ٩٧٧، ٩٧٩، ٩٨٩، ١٤٣١، ١٤٤٩، ٤٨٩٥، ٥٢٤٩، ٥٨٨٠، ٥٨٨١، ٥٨٨٣، ٧٣٢٥.

پێغەمبەری خوا ﷺ بیلالیشی لەگەڵدا بوو (لە ڕیزی نوێژی پیاوانەوە) ڕۆیشت (بۆ ڕیزی ژنان)، گومانی وا بوو کە ئافرەتان گوێیان لە وتارەکەی نەبوو، جا ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێ کردن بە ماڵبەخشین، جا هەر ئافرەت بوو گوارە و ئەنگوستیلەی فڕێ دەدا و بیلالیش کۆشی بۆ گرتبوونەوە. ئیسماعیل لە ئەیوبەوە دەیگێڕێتەوە لە عەتائەوە دەڵێ: ئیبنو عەباس وتی: شایەتی دەدەم بۆ پێغەمبەر ﷺ.

## ٣٤- بَابُ الْحِرْصِ عَلَى الْحَدِيثِ

٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَن عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ القِيَامَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ ظَنَنْتُ يا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْأَلَنِي عَنْ هذا الحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الحَدِيثِ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ مَنْ قَالَ: لَا إله إِلَّا اللَّهُ، خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ -أَوْ- نَفْسِهِ»[1].

## ٣٤- باسی سووربوون لەسەر وەرگرتنی فەرموودە

٩٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ بەختەوەرترین کەسە بەهۆی تکا و شەفاعەتی تۆوە لە ڕۆژی دواییدا؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی خۆشم گومانم وا بوو ئەی ئەبو هوڕەیرە کە کەس پێش تۆ ئەو پرسیارەم لێ ناکات؟ لەبەر ئەوەی دەزانم تۆ زۆر سووری لەسەر (زانینی) فەرموودەکانم، بەختەوەرترین کەس بە (بەرکەوتنی) شەفاعەتی من لە ڕۆژی

[1] بڕوانە: ٦٥٧٠.

دواییدا، ئەو كەسەیە بە دڵێكی، یان دەروونێكی پاك و ساف بڵێ: (لَا إله إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە خوا)).

## ٣٥- بابٌ: كَيْفَ يُقْبَضُ الْعِلْمُ؟

وَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ إِلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ: انْظُرْ مَا كَانَ مِنْ حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَاكْتُبْهُ، فَإِنِّي خِفْتُ دُرُوسَ العِلْمِ وَذَهَابَ العُلَمَاءِ، وَلَا تَقْبَلْ إِلَّا حَدِيثَ النَّبِيِّ ﷺ، وَلْتُفْشُوا العِلْمَ، وَلْتَجْلِسُوا حَتَّى يُعَلَّمَ مَنْ لَا يَعْلَمُ، فَإِنَّ العِلْمَ لَا يَهْلِكُ حَتَّى يَكُونَ سِرًّا. حَدَّثَنَا العَلَاءُ بْنُ عَبْدِ الجَبَّارِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ بِذَلِكَ يَعْنِي: حَدِيثَ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ إِلَى قَوْلِهِ: ذَهَابَ العُلَمَاءِ.

١٠٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ العِلْمَ انْتِزَاعًا، يَنْتَزِعُهُ مِنَ العِبَادِ، ولكن يَقْبِضُ العِلْمَ بِقَبْضِ العُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا، اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا، فَسُئِلُوا، فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا». قَالَ الفِرَبْرِيُّ: حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ قَالَ: حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ هِشَامٍ نَحْوَهُ[١].

## ٣٥- باسێك: چۆن زانست و زانیاری نامێنێ؟

عومەری كوڕی عەبدولعەزیز نامەی نووسی بۆ ئەبو بەكری كوڕی حەزم: سەیر بكە! بزانە چ فەرموودەیەكی پێغەمبەرتان ﷺ لایە بینووسنەوە، چونكە بەڕاستی من ترسم هەیە لە نەمانی زانیاری و مردنی زانایان، تەنها فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەربگرە و بینووسەوە تا زانست بڵاو ببێتەوە، وە دانیشن بۆ

---

[١] بروانە: ٧٣٠٧.

فێرکردنی ئەو کەسانەی نەشارەزان، چونکە بێگومان زانست لەنێو ناچێ هەتا پەنهان نەکرێ. (ئیمام بوخاری دەڵێ:) عەلائی کوڕی عەبدولجەبار بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدولعەزیزی کوڕی موسلیم لە عەبدوڵای کوڕی دینارەوە ئەم وتەیەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی گێڕاوەتەوە تا: (مردنی زانایان).

١٠٠- عەبدوڵای کوڕی عەمرِی کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان خوای گەورە عیلم و زانست وەرناگرێتەوە بە دەرهێنانی لە سینەی زاناکان، بەڵکوو عیلم و زانست وەردەگرێتەوە بەبردنەوەی زانایان و مردنیان، هەتا وای لێ دێ زانایەکی (ڕاستەقینە) نامێنێ، جا خەڵکی چەند گەورەیەکی نەزان هەڵدەبژێرن بۆ خۆیان پرسیاریان لێ دەکرێ (دەربارەی ئایین)، ئەوانیش بەبێ عیلم و زانیاری فەتوا دەدەن، ئەوسا خۆیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن)). فیرەبری دەڵێ: عەباس بۆی گێڕاینەوە و وتی: قوتەیبە بۆی گێڕاینەوە و وتی: جەریر لە هیشامەوە وێنەی ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە.

## ٣٦- بابٌ: هَلْ يُجْعَلُ لِلنِّسَاءِ يَوْمٌ عَلَى حِدَةٍ فِي الْعِلْمِ

١٠١- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شعْبَة قَالَ: حَدَّثَنِي ابن الأصبَهَانِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ ذَكْوَانَ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: قَالَتِ النِّسَاءُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: غَلَبَنَا عَلَيْكَ الرِّجَالُ، فَاجْعَلْ لَنَا يَوْمًا مِنْ نَفْسِكَ. فَوَعَدَهُنَّ يَوْمًا لَقِيَهُنَّ فِيهِ، فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُن، فَكَانَ فِيمَا قَالَ لَهُنَّ: «مَا مِنْكُنَّ امْرَأَة تُقَدِّمُ ثَلَاثَةً مِنْ وَلَدِهَا إِلَّا كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: وَاثْنَتَيْنِ؟ فَقَالَ: «وَاثْنَتَيْنِ»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٢٤٩، ٧٣١٠.

## ٣٦- باسێک: ئایا ڕۆژێکی تایبەت دادەنرێ بۆ ئافرەتان، بۆ زانیاری فێرکردنیان

**١٠١- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ژنان بە پێغەمبەریان ﷺ وت: پیاوان نۆرەی ئێمە نادەن بێینە خزمەتت (بۆ فێربوونی ئایینەکەمان)، کەواتە ڕۆژێکمان بۆ دیاری بکە بێینە خزمەتت، پێغەمبەریش ﷺ بەڵێنی ڕۆژێکی پێ دان، لەو ڕۆژەدا چوونە خزمەتی و پێیان گەشت، جا ئامۆژگاری کردن (ئەوەی پێویست بوو) فەرمانی پێ کردن، جا لەو ئامۆژگارییانەی بۆی کردن ئەوە بوو کە پێی وتن: ((هەر ئافرەتێك لە ئێوە سێ جگەرگۆشەی پێش خۆی بمرن، ئەوە دەبنە پەرژین بۆی لە (چوونە) ئاگری دۆزەخ، ئافرەتێکیش وتی: دووانیشی بمرێ هەر وایە؟ فەرمووی: (بەڵێ دووانیش هەر وایە))).**

١٠٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَصْبَهَانِيِّ، عَنْ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بهذا[1]. وَعَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَصبَهَانِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: «ثَلَاثَةً لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ»[2].

**١٠٢- موحەممەدی کوڕی بەشار بۆی گێڕاینەوە، وتی: غوندەر بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعبە بۆی گێڕاینەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەصبەهانییەوە گێڕاویەتەوە لە زەکوانەوە، ئەویش لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕاویەتەوە ئەویش ئەم فەرموودەی (پێشووی) لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە. عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەصبەهانی وتی: لە ئەبو حازیمم بیست لە**

---

[1] بڕوانە: ١٠١.

[2] بڕوانە: ١٢٥٠.

ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی): ((سێ منداڵ (ی بمرێ) کە باڵغ نەبووبن)).

## ٣٧- بابُ مَنْ سَمِعَ شَيْئًا فَرَاجَعَ حَتَّى يَعْرِفَهُ

١٠٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابن أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ - زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ لَا تَسْمَع شَيْئًا لَا تَعْرِفُهُ إِلَّا رَاجَعَتْ فِيهِ حَتَّى تَعْرِفَهُ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ». قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: أَوَ لَيْسَ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾﴾ الإنشقاق، قَالَتْ: فَقَالَ: «إِنَّمَا ذَلِكَ العَرْضُ، ولكن مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ يَهْلِكْ»[1].

## ٣٧- باسی کەسێک شتێک ببیستێ و پرسیار دەربارەی بکات تا بیزانێ

١٠٣- ئیبنو ئەبو مولەیکە دەڵێ: خێزانی پێغەمبەر ﷺ عائیشە ﷺ هەر شتێکی ببیستایە و نەیزانیبایە پرسیاری دەکرد لەبارەیەوە تا بیزانێ، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ سزا دەدرێ))، عائیشە دەڵێ: منیش بە پێغەمبەرم ﷺ وت: مەگەر خوای گەورە نافەرمووێ: جا دواتر لێپرسینەوەیەکی سووکی لەگەڵدا دەکەین؟ دەڵێ: فەرمووی: ((بێگومان ئەوە تەنها پیشاندانە[2]، چونکە هەر کەس لێپرسینەوەی وردی لەگەڵدا بکرێ تیا دەچێت)).

---

[1] بروانە: ٤٩٣٩، ٦٥٣٦، ٦٥٣٧.

[2] پیشاندانی کردەوەکانی مرۆڤە بۆنەوەی منەتی خوای گەورە بزانێت بەسەریەوە.

# ٣٨- بابٌ: لِيُبَلِّغِ العِلْمَ الشَّاهِدُ الغَائِبَ

قَالَهُ ابن عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٠٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدٌ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ وَهْوَ يَبْعَثُ البُعُوثَ إِلَى مَكَّةَ: ائْذَنْ لِي أَيُّهَا الأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلًا قَامَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ الغَدَ مِنْ يَوْمِ الفَتْحِ، سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ، وَوَعَاهُ قَلْبِي، وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ، حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ، وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ، فَلَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا، وَلَا يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً، فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ لِقِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِيهَا، فَقُولُوا: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذِنَ لِرَسُولِهِ، وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ. وَإِنَّمَا أَذِنَ لِي فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، ثُمَّ عَادَتْ حُرْمَتُهَا اليَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالأَمْسِ، وَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الغَائِبَ». فَقِيلَ لأَبِي شُرَيْحٍ مَا قَالَ عَمْرٌو؟ قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ مِنْكَ يا أَبَا شُرَيْحٍ، لَا يُعِيذُ عَاصِيًا، وَلَا فَارًّا بِدَمٍ، وَلَا فَارًّا بِخَرْبَةٍ[1].

## ٣٨- باسێک: با ئەوەی ئامادەیە و زانستێک دەبیستێ بیگەیەنێ بەوەی ئامادە نییە

**ئەم فەرموودەیە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە[2].**

**١٠٤- سەعید دەڵێ: لەئەبو شورەیحەوە ﷺ گێڕایەوە کە بە عەمری کوڕی سەعیدی وت: لە کاتێکدا لەشکری دەنارد بۆ مەککە وتی: ئەی ئەمیر و لێپرسراو مۆڵەتم بدە وتەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی دووەمی ئازادکردنی شاری مەککەدا، بە هەردوو گوێم بیستم، بە دڵ ئاگام لێ**

---

[1] بڕوانە: ١٨٣٢، ٤٢٩٥.

[2] بڕوانە: ١٧٣٩.

بوو، وه به چاوەكانیشم سەیرم دەكرد كاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەم وتەی فەرموو، سەرەتا سوپاس و ستاییشی خوای كرد، پاشان فەرمووی: ((بێگومان خوا خۆی مەككەی كردووه به حەرەم (شتانێكی تێدا حەرام كردووه نابێ بكرێن)، خەڵكی نەیانكردووه به حەرەم، بۆیه دروست نییه بۆ كەسێ باوەڕی به خوا و به ڕۆژی دوایی هەبێت خوێنی تێدا بڕێژێ، یان درەختی ببڕێت، ئەگەر كەسێ جەنگی پێغەمبەری خوای ﷺ كرده بەهانه بۆ ئەوه كه جەنگی تێدا بكات، ئەوه پێی بڵێن: بێگومان خوا مۆڵەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ داوه، بەڵام مۆڵەتی به ئێوه نەداوه، بەڵكوو بۆ منیش لەو ڕۆژەدا بۆ ماوەیەكی كەم ڕێگەی دام، پاشان ئەمڕۆ (ڕۆژی دووەمی ئازادكردنی مەككه) وەك دوێنێی لێ هاتووەتەوه، بوومەتەوه به حەرەم (بۆ كەس نییه جەنگی تێدا بكات)، دەی با ئەوەی ئامادەیه بیگەیەنێ بەوەی ئاماده نییه))، جا به ئەبو شورەیح وترا: عەمر چی وت: وتی: ئەبو شورەیح من له تۆ شارەزاترم، پەنای تاوانباری تیا نادرێ، یان كەسێ خوێنێكی لەسەره و هەڵهاتووه، یان بەهۆی دزییەوه ڕای كردووه.

١٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابن أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، ذُكِرَ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ -قَالَ مُحَمَّد: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَأَعْرَاضَكُمْ- عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هذا فِي شَهْرِكُمْ هذا، أَلَا لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الغَائِبَ». وَكَانَ مُحَمَّد يَقُولُ صَدَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ كَانَ ذَلِكَ «أَلا هَلْ بَلَّغْتُ؟» مَرَّتَيْنِ[١].

١٠٥- موحەممەد له كوڕی ئەبو بەكرەوه له ئەبو بەكرەوه رضي الله عنه گێڕاویەتەوه دەڵێ: باسی پێغەمبەر ﷺ كرا كه فەرمووی: ((بێگومان (دەستدرێژی) بۆ خوێن و ماڵ و سامانتان- موحەممەد وتی: وا بزانم فەرمووی: ناموسیشتان- لەیەكدی

---

[١] بڕوانه: ٦٧.

**حەڕامە، وەك حەڕامێتی تاوانكردن لەم ڕۆژەتاندا و لەم مانگەتاندا، با ئامادەبووانتان ئەم ئامۆژگارییە ڕابگەیەنن بە ئامادەنەبووانتان)). وە موحەممەد دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرموو، ئەوەش: ((ئایا ڕامگەیاند؟)) دووجار دووبارەی كردەوە.**

## ٣٩- بابُ إِثْمِ مَنْ كَذَبَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

١٠٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الجَعْدِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْصُورٌ قَالَ: سَمِعْتُ رِبْعِيَّ بْنَ حِرَاشٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَلِيًّا يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَكْذِبُوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَلِجِ النَّارَ».

## ٣٩-باسی تاوانی ئەو كەسەی درۆ بكات بە دەم پێغەمبەرەوە ﷺ

**١٠٦- عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((درۆ مەكەن بەدەم منەوە، چونكە بەڕاستی ئەوەی درۆ بكات بەدەم منەوە، ئەوە بێگومان دەڕواتە ئاگری دۆزەخەوە)).**

١٠٧- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ جَامِعِ بْنِ شَدَّادٍ عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ لِلزُّبَيْرِ: إِنِّي لَا أَسْمَعُكَ تُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَمَا يُحَدِّثُ فُلَانٌ وَفُلَانٌ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أُفَارِقْهُ ولكن سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

**١٠٧- عەبدوڵای كوڕی زوبەیر دەڵێ: بە زوبەیری باوكمم ﷺ وت: من نابیستم تۆ فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگێڕیتەوە، وەك ئەوەی فلان كەس و فلان كەس دەیگێڕنەوە؟ وتی: لەڕاستیدا من هەمیشە لەگەڵیدا بووم و لێی جیا**

**نەبوومەتەوە، بەڵام لێم بیستووە دەیفەرموو: ((هەرکەس بەدەم منەوە درۆ بکات، با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا دابنێ)).**

١٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ، قَالَ أَنَسٌ: إِنَّهُ لَيَمْنَعُنِي أَنْ أُحَدِّثَكُمْ حَدِيثًا كَثِيرًا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قالَ: «مَنْ تَعَمَّدَ عَلَى كَذِبًا فَلْيَتبوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

**١٠٨- عەبدولعەزیز وتی: ئەنەس ﷺ دەیوت: بەڕاستی ئەوەی ڕێگریم دەکات لەوەی فەرموودەی زۆرتان لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ بگێڕمەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس بەئەنقەست بەدەم منەوە درۆ بکات، ئەوە با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا دابنێ)).**

١٠٩- حَدَّثَنَا مَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يقُولُ: «مَنْ يَقُلْ عَلَيَّ مَا لَمْ أَقُلْ فَلْيَتبوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

**١٠٩- سەلەمە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەو کەسەی شتێك بەدەم منەوە بڵێت کە نەموتووە، ئەوە با جێگای خۆی لە دۆزەخدا دابنێ)).**

١١٠- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَسَمَّوْ ا بِاسْمِي، وَلَا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي، وَمَنْ رَآنِي فِي المَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ فِي صُورَتِي، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٣٥٣٩، ٦١٨٨، ٦١٩٧، ٦٩٩٣.

**١١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((بە ناوی منەوە خۆتان ناو بنێن، بەڵام نازناوی من مەکەن بە نازناو بۆ خۆتان، هەر کەسێکیش لە خەویدا من ببینێ، ئەوە بەڕاستی منی دیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ لە شێوەی مندا خۆی پیشان (ی خەڵك) بدات، وە هەر کەسێکیش بەئەنقەست درۆ بەدەم منەوە بکات، ئەوە با لە دۆزەخدا شوێنی خۆی دابنێ)).**

## ٤٠- بابُ كِتَابَةِ الْعِلْمِ

١١١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ: هَلْ عِنْدَكُمْ كِتَابٌ؟ قَالَ: لَا، إِلَّا كِتَابُ اللَّهِ، أَوْ فَهْمٌ أُعْطِيَهُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ، أَوْ مَا فِي هذِه الصَّحِيفَةِ. قَالَ: قُلْتُ: فَمَا فِي هذِه الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: العَقْلُ، وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وَلَا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ[1].

## ٤٠- باسی نووسینەوەی زانست و زانیاری

**١١١- ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: بە عەلیم ﷺ وت: ئایا ئێوە نووسراوێکی تایبەتتان لایە، عەلیش وتی: نەخێر، جگە لە قورئانەکەی خوا یان تێگەیشتنێك کە کەسێکی موسوڵمان پێی درابێت، یان ئەوەی لەم لاپەڕەیەدایە، دەڵێ: وتم: چی لەو لاپەڕەیەدایە؟ وتی: خوێنی کوژراو و ئازادکردنی دیل، وە موسوڵمان لەبەرانبەر کوشتنی کافردا ناکوژرێتەوە.**

١١٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ الفَضْلُ بْنُ دُكَيْنٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ خُزَاعَةَ قَتَلُوا رَجُلًا مِنْ بَنِي لَيْثٍ عَامَ فَتْحِ مَكَّةَ بِقَتِيلٍ مِنْهُمْ قَتَلُوهُ، فَأُخْبِرَ

---

[1] بڕوانە: ١٨٧٠، ٣٠٤٧، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٦٩٠٣، ٦٩١٥، ٧٣٠٠.

بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَكِبَ رَاحِلَتَهُ، فَخَطَبَ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْقَتْلَ -أَوِ الْفِيلَ شَكَّ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ- وَسَلَّطَ عَلَيْهِمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَالْمُؤْمِنِينَ، أَلَا وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَلَم تَحِلَّ لِأَحَدٍ بَعْدِي، أَلَا وَإِنَّهَا حَلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، أَلَا وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ، لَا يُخْتَلَى شَوْكُهَا، وَلَا يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلَا تُلْتَقَطُ سَاقِطَتُهَا إِلَّا لِمُنْشِدٍ، فَمَنْ قُتِلَ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يُعْقَلَ، وَإِمَّا أَنْ يُقَادَ أَهْلُ الْقَتِيلِ». فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ فَقَالَ: اكْتُبْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: «اكْتُبُوا لِأَبِي فُلَانٍ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلَّا الْإِذْخِرَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِلَّا الْإِذْخِرَ، إِلَّا الْإِذْخِرَ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: يُقَالُ: يُقَادُ بِالْقَافِ. فَقِيلَ لِأَبِي عَبْدِ اللَّهِ: أَيُّ شَيْءٍ كَتَبَ لَهُ؟ قَالَ: كَتَبَ لَهُ هذِه الْخُطْبَةَ[1].

**١١٢- ئەبو هوڕەیرە ﷛ دەڵێ: ساڵی ئازادکردنی مەککە (هۆزی) خوزاعە پیاوێکیان لە بەنو لەیس کوشت لە بەرانبەر کوژراوێکیاندا کە بەنو لەیس کوشتبوویان، جا ئەو هەواڵە درا بەپێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ سواری وشترەکەی بوو وتارێکی دا و فەرمووی: ((خوا ڕێگری کوشتاری کرد لە مەککە - یان (خاوەن) فیلەکانی[2]، ئەبو عەبدوڵا گومانی بردووە-، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیماندارانی زاڵ کرد بەسەریاندا، ئەوسا بزانن بۆ هیچ کەس پێش من حەڵاڵ نەبووە (بجەنگێ تێیدا)، لەدوای منیش بۆ کەس حەڵاڵ نابێ، بەڵام لە ساتێکی ڕۆژدا جەنگان بۆ من حەڵاڵ بوو، بێداریش بن لەم ساتەوە حەڕامە جەنگکردن تێیدا، دڕکی هەڵناکەنرێ و درەختی نابڕدرێتەوە، شتی کەوتوو (لە**

---

[1] بڕوانە: ٢٤٣٤، ٦٨٨٠.

[2] کە بەنیاز بوون کەعبە بڕوخێنن، مەبەست سوپای ئەبرەهەیە.

خەڵك) هەڵناگیرێتەوە، مەگەر جاڕی بۆ بدات، ئینجا هەر کەس کوژرا ئەوە کەسوکارەکەی سەرپشکە لەم دوو بڕیارە: یان لە بری خوێنی دەدرێت، یان کەسوکاری کوژراوەکە (بکوژەکە) دەکوژنەوە))، جا پیاوێکی یەمەنی هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو فەرموودەی خۆتم بۆ بنووسەرەوە ئەویش فەرمووی: ((ئەو فەرمووده بنووسنەوە بۆ ئەبو فلان))، پیاوێکی قوڕەیشیش کە (عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە ئیزخیر (جۆرێکە لە گژوگیا)، چونکە ئێمە بۆ ماڵ و گۆڕەکانمان بەکاری دەهێنین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((جگە لە ئیزخیر، جگە لە ئیزخیر)). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: دەوترێت (یُقَادُ) بە قاف دوو نوقتە، بە ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) وترا: چی بۆ ئەو کابرا یەمەنییە نووسی؟ بوخاری وتی: ئەو وتارەی پێغەمبەری ﷺ بۆ نووسی.

١١٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرٌو قَالَ: أَخْبَرَنِي وَهْبُ بْنُ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَخِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلَا أَكْتُبُ. تَابَعَهُ مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

١١٣- وەهبی کوڕی مونەببیه لە براکەیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ئەبو هوڕەیرەم ﷺ بیست دەیوت: لە هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ کەسیان بەئەندازەی من فەرموودەی پێغەمبەریان ﷺ لەلا نییە، عەبدوڵای کوڕی عەمر نەبێ، چونکە ئەو فەرموودەکانی دەنووسییەوە، بەڵام من نەمدەنووسییەوە. ئەم فەرموودەیە

**بە ڕێگەیەکی دیکەش لە مەعمەڕەوە، ئەویش لە هەمامەوە، لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پاڵپشتی فەرموودەی پێشوو دەکات.**

١١٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْن سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابن وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا اشْتَدَّ بِالنَّبِيِّ ﷺ وَجَعُهُ قَالَ: «ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبُ لَكُمْ كِتَابًا لَا تَضِلُّوا بَعْدَهُ». قَالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ غَلَبَهُ الوَجَعُ وَعِنْدَنَا كِتَابُ اللَّهِ حَسْبُنَا. فَاخْتَلَفُوا وَكَثُرَ اللَّغَط. قَالَ: «قُومُوا عَنِّي، وَلَا يَنْبَغِي عِنْدِي التَّنَازُعُ». فَخَرَجَ ابن عَبَّاسٍ يَقُولُ: إِنَّ الرَّزِيَّةَ كلَّ الرَّزِيَّةِ مَا حَالَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ كِتَابِهِ[1].

**١١٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشییەکەی نارەحەتی کرد (لە نەخۆشی سەرەمەرگدا) فەرمووی: ((قەڵەم و کاغەز بێنن تا نووسراوێکتان بۆ بنووسم کە دوای ئەو نووسراوە گومڕا نەبن و سەرتان لێ نەشێوێ))، عومەر(ی کوڕی خەتاب) وتی: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هێناوە، کتێبەکەی خوا کە لەبەردەستماندایە بەسمانە، (ئەگەر ئیشی پێ بکەین). جا هاوەڵان جیاوازییان تێدا دروست بوو، دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی زۆر پەیدا بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەستن لەلام، لەلای مندا جیاوازی و دەنگەدەنگ دروست نییە و نابێ)). جا عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ هاتە دەرەوە و دەیوت: بێگومان کارەساتێ لە هەموو کارەساتێ گەورەتر ئەوە بوو کە بۆیە ڕێگر لەوەی پێغەمبەر ﷺ وەسییەتێك بنووسێت (تا دوای مردنی گومڕا نەبن).**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٥٣، ٣١٦٨، ٤٤٣١، ٤٤٣٢، ٥٦٦٩، ٧٣٦٦.

## ٤١- بابُ العِلْمِ وَالْعِظَةِ بِاللَّيْلِ

١١٥- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَخْبَرَنَا ابن عُيَيْنَةَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ هِنْدٍ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. وَعَمْرٍو، وَيَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ هِنْدٍ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتِ: اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللهِ! مَاذَا أنزِلَ اللَّيْلَةَ مِنَ الفِتَنِ؟ وَمَاذَا فُتِحَ مِنَ الخَزَائِنِ؟ أَيْقِظُوا صَوَاحِبَاتِ الحُجَرِ، فَرُبَّ كاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الآخِرَةِ»[1].

## ٤١- باسی زانیاری و ئامۆژگاری بە شەو

**١١٥-ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەوێك لە خەو هەستا و فەرمووی: ((پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەمشەو چ ئاشوب و فیتنەیەك داباری؟! وە چەند گەنجینە و خەزێنە دەستی موسوڵمانان کەوت؟ ئافرەتانی ئەم ماڵانە[2] خەبەر بکەنەوە (بۆ شەونوێژکردن)، چونکە زۆر کەس لە دونیادا پۆشتەیە، بەڵام لەدوارۆژدا ڕووتوقووتە)).**

## ٤٢- بابُ السَّمَرِ فِي العلم

١١٦- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ وَأَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ العِشَاءَ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: «أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هذِه؟ فَإِن رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ»[3].

---

[1] بڕوانە: ١١٢٦، ٣٥٩٩، ٥٨٤٤، ٦٢١٨، ٧٠٦٩.

[2] مەبەستی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ خۆیەتی.

[3] بڕوانە: ٥٦٤، ٦٠١.

## ٤٢- باسی قسه كردن به شەودا سەبارەت به عیلم و زانست

**١١٦- عەبدوڵای كوڕی عومەر[1] ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ له كۆتایی تەمەنیدا (مانگێگ پێش وەفاتی) پێشنوێژی نوێژی عیشای بۆ كردین، جا كاتێ سەلامی دایەوه هەستایەوه و فەرمووی: ((پێم بڵێن ئەم شەوه چ شەوێكه؟ چونكه تا سەری سەد ساڵی دیكه ئەوەی ئێستا لەسەر زەویدایه (و دەژی) كەسی نامێنێ)).**

١١٧- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا الحَكَمُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ فِي بَيتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ بِنْتِ الحارِثِ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَهَا فِي لَيْلَتِهَا، فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ العِشَاءَ، ثُمَّ جَاءَ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ، ثُمَّ قَالَ: «نَامَ الغُلَيِّمُ». أَوْ كَلِمَةً تُشْبِهُهَا، ثُمَّ قَامَ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَصَلَّى خَمْسَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ نَامَ حَتَّى سَمِعْتُ غَطِيطَهُ -أَوْ خَطِيطَهُ- ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ[2].

**١١٧- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: شەوێك مامەوه له ماڵی پوورم، كه مەیمونەی كچی حاریسەی -خێزانی پێغەمبەره ﷺ-، ئەو شەوه سەرەی مەیمونەی پوورم بوو پێغەمبەر ﷺ لەلای بێت، پێغەمبەر ﷺ (له مزگەوت) نوێژی عیشای كرد، پاشان هاتەوه بۆ ماڵەوه و چوار ڕكات نوێژی سوننەتی كرد، ئینجا خەوت، پاشان هەستا و شەونوێژی كرد، پاشان فەرمووی: ((كوڕەكه خەوتووه))، یان وشەیەكی لەو جۆرەی فەرموو، پاشان هەستا (بۆ شەونوێژ)، منیش لەلای چەپیەوه نوێژم دابەست، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بردمیه لای**

---

[1] سەرنج: ئەم فەرموودەیه یەكێكه لەو فەرموودانەی وەک موعجیزەی پێغەمبەری خودا ﷺ ناوزەند دەكرێ، چونكه مێژوونووسان ئەوەیان چەسپاندووه كه كۆتا هاوەڵی پێغەمبەری خودا ﷺ له ساڵی ١١٠ كۆچی وەفاتی كردووه.

[2] بڕوانه: ١٣٨، ١٨٣، ٦٩٧، ٦٩٨، ٦٩٩، ٧٢٦، ٧٢٨، ٨٥٩، ٩٩٢، ١١٩٨، ٤٥٦٩، ٤٥٧٠، ٤٥٧١، ٤٥٧٢، ٥٩١٩، ٦٢١٥، ٦٣١٦، ٧٤٥٢.

**ڕاستییەوە و پێنج ڕکات شەونوێژی کرد، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، ئینجا خەوتەوە هەتا گوێم لە پرخ و هوڕ -یان پرخەی- بوو (پاشان لە خەو هەستا و) ڕۆیشت بۆ نوێژی بەیانی.**

## ٤٣- بابُ حِفْظِ العِلْمِ

١١٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنِ الأعرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّ النَّاسَ يَقُولُونَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ، وَلَوْلَا آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللهِ مَا حَدَّثْتُ حَدِيثًا، ثُمَّ يَتْلُو: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾[1] البقرة، إِنَّ إِخْوَانَنَا مِنَ المُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأسوَاقِ، وإِنَّ إِخْوَانَنَا مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمُ العَمَلُ فِي أَمْوَالِهِمْ، وَإِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يَلْزَمُ رَسُولَ اللهِ ﷺ بِشِبَعِ بَطْنِهِ وَيَحْضُرُ مَا لَا يَحْضرُونَ، وَيحْفَظُ مَا لَا يَحْفَظُونَ[2].

## ٤٣- باسی لەبەرکردنی فەرموودە و زانست

**١١٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: بێگومان خەڵکی دەڵێن: ئەبو هورەیرە (فەرموودەگێڕانەوەی) زۆرە، ئەگەر دوو ئایەتی قورئان نەبووایە (کە هەڕەشە**

---

[1] واتە: (بێگومان ئەوانەی ئەوەی ناردوومانەتە خوارەوە لە ئایەتانی ڕۆشن و ڕێنموونی دەیشارنەوە دوا ئەوەی لە کتێب (ی تەورات و ئینجیل)دا ڕووماں کردۆتەوە بۆ خەڵکی، ئەوانە خودا نەفرەتیان لێ دەکات، نەفرەتکارانیش نەفرەتیان لێ دەکەن جگە لەوانەی کە پەشیمان بوونەوە و کردەوەی باشیان کردبێ و (ئەوەی شاردبوویانەوە) ئاشکرایان کردبێ، ئا ئەوانە پەشیمانییان لێ گیرا دەکەم، وە هەر منم گیراکەری میهرەبان).

[2] بڕوانە: ١١٩، ٢٠٤٧، ٢٣٥٠، ٣٦٤٨، ٧٣٥٤.

**له شاردنەوەی زانست دەکەن) هیچ فەرموودەیەکم نەدەگێڕایەوە، پاشان ئەمەی خوێند:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾ البقرة. **واته: (بێگومان ئەوانەی ئەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە لە ئایەتانی ڕۆشن و ڕێنمایی دەیشارنەوە دوای ئەوەی کە ڕوونمان کردۆتەوە بۆ خەڵکی لە نامە (ی تەوڕات و ئینجیل)دا، ئەوانە خودا نەفرەتیان لێ دەکات و نەفرەتکەرانیش نەفرەتیان لێ دەکەن جگە لەوانەی کە پەشیمان بووبنەوە و کردەوەی باشیان کردبێ و (ئەوەی شاردبوویانەوە) ئاشکرایان کردبێ ئا ئەوانە پەشیمانییان لێ گیرا دەکەم، وە هەر منم گیراکەری میهرەبان). چونکە بەڕاستی برا کۆچەرییەکانمان کڕین و فرۆیشتنی نێو بازاڕ خەریکی کردبوون، وە بێگومان برا پشتیوانەکانیشمان کارکردن لە باخ و مەزراکانیان سەرقاڵی کردبوون، بەڵام ئەبو هوڕەیرە بەنانەسکی لەگەڵ پێغەمبەردا بوو ﷺ، ئەو کاتانەی ئەوان ئامادە نەدەبوون، ئەو ئامادە دەبوو، وە ئەو فەرموودانەی ئەوان لەبەریان نەدەکرد، ئەو لەبەری دەکرد.**

١١٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ أَبُو مُصْعَبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابن أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الَمقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَسْمَعُ مِنْكَ حَدِيثًا كَثِيرًا أَنْسَاهُ. قَالَ: «ابْسُطْ رِدَاءَكَ» فَبَسَطْتُهُ. قَالَ: فَغَرَفَ بِيَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «ضُمُّهُ» فَضَمَمْتُهُ فَمَا نَسِيتُ شَيْئًا بَعْدَهُ . حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الُمنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن أَبِي فُدَيْكٍ بهذا، أَوْ قَالَ: غَرَفَ بِيَدِهِ فِيهِ.

**١١٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی من فەرموودەی زۆر لە جەنابت دەبیستم لەبیرم دەچنەوە، فەرمووی: ((عەباکەت ڕابخە))، منیش ڕامخست، ئەویش بە هەردوو دەستی بە ئاماژە مشتێکی کردە نێو پۆشاکەکەوە پاشان فەرمووی: ((دەی کۆی بکەرەوە))، منیش کۆم کردەوە، ئیدی لەوە بە دواوە هیچ فەرموودەیەکی ئەوم لەبیر نەچووەتەوە. (فەرموودەکەی پێشوو بوخاری بەم ڕێگەیەش گێڕاویەتەوە) ئیبڕاهیمی کوڕی مونزیر بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبنو ئەبو فودەیك ئەو فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە، یان وتی: بە دەستێکی ئاماژەی کرد وەك شتێك بکاتە عەباکەی ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ.**

١٢٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنِ ابن أَبِي ذِئْبٍ، عَن سَعِيدٍ الَمقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وِعَاءَيْنِ، فَأَمَّا فَبَثَثْتُهُ وَأَمَّا الْآخَرُ فَلَوْ بَثَثْتُهُ قُطِعَ هَذَا الْبُلْعُومُ.

**١٢٠- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پڕ بە دوو تورەکە فەرموودەی پێغەمبەرم ﷺ لەبەر کردووە، جا یەکێکیانم بڵاو کردۆتەوە بەنێو خەڵکیدا، بەڵام ئەوی دیکەیان ئەگەر بڵاوی بکەمەوە ئەم گەردنەم دەقرتێنرێ.**

## ٤٤- بَابُ الإِنْصَاتِ لِلْعُلَمَاءِ

١٢١- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ مُدْرِكٍ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ جَرِيرٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ: «اسْتَنْصِتِ النَّاسَ» فقال: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٤٤٠٥، ٦٨٦٩، ٧٠٨٠.

## ٤٤- باسی بێدەنگکردن و گوێگرتن بۆ زانایان

**١٢١- جەریر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا پێی فەرموو: ((خەڵك بێدەنگ بکە))، جا فەرمووی: ((دوای (مردنی) من کافر مەبنەوە بەجۆرێك لە گەردنی یەکدی بدەن)).**

## ٤٥- بابُ مَا يُسْتَحَبُّ لِلْعَالِمِ إِذَا سُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَيَكِلُ الْعِلْمَ إِلَى اللَّهِ

١٢٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرٌو قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفًا الْبَكَّالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى لَيْسَ بِمُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ، إِنَّمَا هُوَ مُوسَى آخَرُ. فَقَالَ: كَذَبَ عَدُوُّ اللهِ، حَدَّثَنَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: قَامَ مُوسَى النَّبِيُّ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا أَعْلَمُ. فَعَتَبَ اللهُ عَلَيْهِ، إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَأَوْحَى اللهُ إِلَيْهِ: أَنَّ عَبْدًا مِنْ عِبَادِي بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ. قَالَ: يَا رَبِّ، وَكَيْفَ بِهِ؟ فَقِيلَ لَهُ: احْمِلْ حُوتًا فِي مِكْتَلٍ، فَإِذَا فَقَدْتَهُ فَهُوَ ثَمَّ، فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقَ بِفَتَاهُ يُوشَعَ بْنِ نُونٍ، وَحَمَلَا حُوتًا فِي مِكْتَلٍ، حَتَّى كَانَا عِنْدَ الصَّخْرَةِ وَضَعَا رُءُوسَهُمَا وَنَامَا، فَانْسَلَّ الْحُوتُ مِنَ الْمِكْتَلِ فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا، وَكَانَ لِمُوسَى وَفَتَاهُ عَجَبًا، فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ لَيْلَتِهِمَا وَيَوْمَهُمَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ: آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا، وَلَمْ يَجِدْ مُوسَى مَسًّا مِنَ النَّصَبِ حَتَّى جَاوَزَ الْمَكَانَ الَّذِي أُمِرَ بِهِ، فَقَالَ لَهُ فَتَاهُ: أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ، قَالَ مُوسَى: ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا، فَلَمَّا انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ، إِذَا رَجُلٌ مُسَجًّى بِثَوْبٍ - أَوْ قَالَ تَسَجَّى بِثَوْبِهِ - فَسَلَّمَ مُوسَى. فَقَالَ الْخَضِرُ: وَأَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلَامُ؟ فَقَالَ: أَنَا مُوسَى. فَقَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا؟ قَالَ: إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا يَا مُوسَى، إِنِّي عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللهِ عَلَّمَنِيهِ لَا تَعْلَمُهُ أَنْتَ، وَأَنْتَ عَلَى عِلْمٍ عَلَّمَكَهُ لَا أَعْلَمُهُ. قَالَ: سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللهُ صَابِرًا وَلا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا،

فَانْطَلَقَا يَمْشِيَانِ عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ لَيْسَ لَهُمَا سَفِينَةٌ، فَمَرَّتْ بِهِمَا سَفِينَةٌ، فَكَلَّمُوهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمَا، فَعُرِفَ الْخَضِرُ، فَحَمَلُوهُمَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، فَجَاءَ عُصْفُورٌ فَوَقَعَ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ، فَنَقَرَ نَقْرَةً أَوْ نَقْرَتَيْنِ فِي الْبَحْرِ، فَقَالَ الْخَضِرُ: يَا مُوسَى، مَا نَقَصَ عِلْمِي وَعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللهِ إِلَّا كَنَقْرَةِ هَذَا الْعُصْفُورِ فِي الْبَحْرِ، فَعَمَدَ الْخَضِرُ إِلَى لَوْحٍ مِنْ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ فَنَزَعَهُ، فَقَالَ مُوسَى: قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا؟ قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا؟ قَالَ: لا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ، فَكَانَتِ الْأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا فَانْطَلَقَا، فَإِذَا غُلَامٌ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، فَأَخَذَ الْخَضِرُ بِرَأْسِهِ مِنْ أَعْلَاهُ فَاقْتَلَعَ رَأْسَهُ بِيَدِهِ، فَقَالَ مُوسَى: أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ؟ قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا؟ - قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: وَهَذَا أَوْكَدُ - فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ، قَالَ الْخَضِرُ بِيَدِهِ فَأَقَامَهُ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى: لَوْ شِئْتَ لاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا، قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَرْحَمُ اللهُ مُوسَى، لَوَدِدْنَا لَوْ صَبَرَ حَتَّى يُقَصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَمْرِهِمَا»[1].

## ٤٥- باسی ئەوەی کە سوننەتە بۆ زانا، کاتێ پرسیاری لێ کرا کێ زاناترە؟ زانینی وەڵامی ئەو پرسیارە بگێڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە

**١٢٢- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە عەبدوڵای کوڕی عەباسم ﷺ وت: نەوفی بیکالی دەڵێ: ئەو مووسایەی خوا باسی دەکات[2] مووسای گەلی جوولەکە نییە، بەڵکوو مووسایەکی دیکەیە؟! عەبدوڵاش وتی: ئەو دوژمنی خوایە درۆ دەکات، ئینجا عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆی گێڕاینەوە، کە فەرمووی: ((پێغەمبەر مووسا ﷺ لەنێو**

---

[1] بڕوانە: ٧٤.

[2] لە سوورەتی (کهف)دا، مووسای هۆزی جوولەکە نییە.

بەنو ئیسرائیلدا هەستا وتارێکی دا، ئینجا پرسیاری لێ کرا چ کەسێك زاناترە؟ فەرمووی: من زاناترین کەسم، خوای گەورەش گلەیی لێ کرد، کە زانیاری ئەو پرسیارەی نەگێڕایەوە بۆ لای خوا، بۆیە خوا نیگای بۆ نارد کە بەندەیەك لە بەندەکانم لەو شوێنەدایە کە دوو دەریاکە بەیەك دەگەن لە تۆ زاناترە، مووساش ﷺ وتی: ئەی پەروەردگار چۆن بیدۆزمەوە؟ پێی وترا: ماسییەك لە زەمیلەیەکدا هەلگرە، جا لە کوێدا ونت کرد لەو شوێنەدایە، ئینجا مووسا ﷺ ڕۆیشت، بەردەستەکەی کە یوشەعی کوڕی نوون بوو لەگەڵ خۆیدا برد، ماسییەکیان لە زەمبیلەیەکدا هەلگرت و ڕۆیشتن، تا گەشتنە لای گابەردێك ڕاکشان و سەریان نایە سەر زەوی، هەردووکیان خەوتن، ماسییەکەش بەهێواشی لە زەمبیلەکە هاتە دەرەوە، چووە نێو دەریاکەوە (و خەتێکی لە دەریاکەدا دروست کرد)، کە جێگەی سەرسووڕمانی مووسا ﷺ و بەردەستەکەی بوو، جا ئەوەی کات مابوو لە شەو و ڕۆژەکەیان ڕۆیشتن، جا کە ڕۆژ بۆیەوە مووسا ﷺ بە بەردەستەکەی وت: خواردنەکەمان (ماسییەکەمان) بۆ بێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا تووشی ماندوویێتی هاتین، مووسا ﷺ ماندوویێتی هەست پێ نەکرد هەتا لەو شوێنە تێ پەڕی کە فەرمانی پێ کرابوو (پیاوە زاناکە لەوێدایە)، کوڕە بەردەستەکەی پێی وت: دەزانیت کاتێ لای گابەردەکەدا لاماندا، بێگومان ماسییەکەم لەبیر چوو، مووسا ﷺ وتی: ئەوە ئەومیە ئێمە بە شوێنیدا دەگەڕاین، جا بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە، ئینجا کە گەشتنەوە لای گابەردەکە لەوێدا پیاوێکیان بینی، بە پارچەقوماشێك داپۆشرابوو، یان وتی: بە پۆشاکەکەی خۆی داپۆشیبوو (مووسا ﷺ) سەلامی کرد، خەزیریش وتی: لەکوێ لە وڵاتی تۆ ئەم سەلامکردنە هەیە؟ ئەویش وتی: من مووسام، خەزیر وتی: مووسای نەوەی ئیسرائیلیت؟ مووسا ﷺ وتی: بەڵێ، ئینجا وتی: ڕێگە دەدەیت شوێنت بکەوم تا فێری ئەو زانست و زانیارییەم بکەیت کە لەلایەن خوداوە فێر

كراويت بۆئەوەی سوودی لێ ببینم بۆ كارەكانم؟ خەزیر وتی: بێگومان تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا ئارام بگری، ئەی مووسا! بێگومان من زانیارییەكم لە زانیاری خوا هەیە، خوا فێری كردووم تۆ نایزانیت، وە تۆش جۆرە زانیارییەكت هەیە، خوا فێری كردوویت من نایزانم، مووسا ﷺ فەرمووی: بێگومان دەمبینی إن شاء الله خۆڕاگر دەبم و لە هیچ كارێكدا سەرپێچیت ناكەم، ئینجا هەردووكیان بە كەناری دەریادا ڕۆیشتن بەلەمیان نەبوو، بەلەمێك بەلایاندا تێ پەڕی قسەیان لەگەڵ خاوەنەكەی كرد، كە هەردووكیان سوار بكەن، جا خەزیریان ناسی بۆیە بەبێ كرێ سواریان كرد، چۆلەكەیەك هات لەسەر قەراغی بەلەمەكە نیشتەوە جارێ یان دووجار دەنووكی كرد بە ئاوی دەریاكەدا، جا خەزیر وتی: ئەی مووسا زانیاری من و زانیاری تۆ لە زانستی خوای كەم نەكردۆتەوە، مەگەر بەئەندازەی ئەو ئاوەی ئەو چۆلەكە لە دەریادا بە دەنووكی خواردیەوە، جا خەزیر تەختەیەك لە تەختەكانی بەلەمەكەی دەرهێنا و لێی كردەوە، مووساش ﷺ وتی: ئەم كەسانە بەبێ كرێ ئێمەیان سوار كرد، كەچی تۆ بەلەمەكەی ئەوانت كوون تێ كرد، تا سەرنشینەكانی بخنكێن لە دەریادا؟! خەزیر وتی: مەگەر پێم نەوتی: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا ئارام بگری، مووسا ﷺ فەرمووی: لێم مەگرە بەهۆی ئەوەی لەبیرم چوو، (پرسیاركردنی) یەكەم لەلایەن مووساوە ﷺ بە لەبیرچوونەوە بوو، ئینجا هەردووكیان بەڕێ كەوتن، بینییان كوڕێكی مندالْكار لەگەڵ چەند مندالْێكدا یاری دەكات، خەزیر سەری گرت، بەدەستی هەڵیكێشا و لە لاشەی جیا كردەوە، مووساش ﷺ فەرمووی: تۆ كەسێكی بێتاوانت كوشت، كە كەسی نەكوشتووە؟! خەزیر وتی: مەگەر پێم نەوتی: ناتوانی لەگەڵ مندا ئارام بگری؟ ئیبنو عویەینە دەڵێ: ئەم ڕەخنەگرتنەی خەزیر لەوەی پێشووتر توندتر بوو، ئینجا هەردووكیان بەڕێ كەوتن هەتا چوونە شارێكەوە داوای خواردنیان لە خەڵكی شارەكە كرد، بەلأم ئەوان

**میوانداریيان لێ نەکردن، جا مووسا ﷺ و خەزیر دیوارێکیان بینی خەریك بوو دەڕوخا، خەزیر دیوارەکەی ڕاست کردەوە، دەڵێ: خەزیر بە دەستی ئاوا ڕاستی کردەوە، مووساش ﷺ پێی وت: ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەسەری وەردەگرت، خەزیر وتی: ئەمە ئیدی جیابوونەوەی من و تۆیە لەیەکدی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە مووسا ﷺ، ئاواتەخواز بووین ئارامی بگرتایە، تا زیاتر بەسەرهاتی ئەو دووانە (مووسا ﷺ و خەزیر)ی بۆ باس بکردینایە)).**

## ٤٦- بَابُ مَنْ سَأَلَ وَهُوَ قَائِمٌ عَالِمًا جَالِسًا

١٢٣- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ، قَالَ: أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا القِتَالُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَإِنَّ أَحَدَنَا يُقَاتِلُ غَضَبًا، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً. فَرَفَعَ إِلَيْهِ رَأْسَهُ قَالَ: وَمَا رَفَعَ إِلَيهِ رَأْسَهُ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ قَائِمًا -فَقَالَ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ العُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ»[1].

## ٤٦- باسی ئەوەی بەپێوە ڕاوەستاوە پرسیار دەکات لە زانایەک کە دانیشتووە

**١٢٣- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگ لەپێناوی خودا کامەیە؟ چونکە بێگومان هەمانە لەبەر توڕەیی دەجەنگێ، وە لەبەر دەمارگیری دەجەنگێ، پێغەمبەریش ﷺ سەری بەرز کردەوە فەرمووی: تەنها لەبەر ئەوە سەری بەرز کردەوە بۆی ئەو**

[1] بڕوانە: ٢٨١٠، ٣١٢٦، ٧٤٥٨.

کەسەی بەپێوە ڕاوەستا بوو، جا فەرمووی: ((هەر کەسێك جەنگ بکات بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرزتر بێت، ئەوە ئەو جەنگە لەڕێی خوادایە ﷻ)).

## ٤٧- بَابُ الْفُتْيَا عَلَى الدَّابَّةِ عِنْدَ الْجَمْرَةِ

١٢٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ عِنْدَ الجَمْرَةِ وَهُوَ يُسْأَلُ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: «ارْمِ، وَلَا حَرَجَ». قَالَ آخَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَنْحَرَ؟ قَالَ: «انْحَرْ، وَلَا حَرَجَ». فَمَا سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلَا أُخِّرَ إِلَّا قَالَ: «افْعَلْ وَلَا حَرَجَ»[1].

## ٤٧- باسی پرسیار و وەڵامدانەوە لە کاتی ڕەجمی شەیتاندا

١٢٤- عەبدوڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: لەلای میلی شەیتان ڕەجمکردندا پێغەمبەرم ﷺ بینی پرسیاری لێ دەکرا، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من سەربڕینم کرد پێش ئەوەی ڕەجمی شەیتان بکەم؟ فەرمووی: ((ڕەجم بکە قەیناکات))، پیاوێکی دیکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرم تاشی پێش ئەوەی سەربڕین بکەم؟ فەرمووی: ((ئاژەڵەکەت سەر ببڕە و قەیناکات))، جا پرسیاری هەر شتێکی لێ بکرایە کە پێش خرابوو، یان دوا خرابوو، دەیفەرموو: ((بیکە و هیچت لەسەر نییە، قەیناکات)).

---

[1] بڕوانە: ٨٣.

## ٤٨- بابُ قوْلِ اللّهِ تعَالى: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء

١٢٥- حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ سُلَيْمَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَينَا أَنَا أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي خَرِبِ المَدِينَةِ، وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ مَعَهُ، فَمَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ اليَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا تَسْأَلوهُ، لَا يَجِيءُ فِيهِ بِشَيْءٍ تَكرَهُونَهُ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَنَسْأَلَنَّهُ. فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَالَ:يا أَبَا القَاسِمِ، مَا الرُّوحُ؟ فَسَكَتَ. فَقُلْتُ: إِنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ. فَقُمْتُ، فَلَمَّا انْجَلَى عَنْهُ فقَالَ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء. قَالَ الأَعْمَشُ: هَكَذَا فِي قِرَاءَتِنَا[١].

## ٤٨-باسی ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند:
## (ئێوە تەنها کەمێک زانیاریتان پێ دراوە)

**١٢٥- عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەلای وێرانەیەکی مەدینەدا[٢] دەڕۆیشتم، پێغەمبەر ﷺ پەلی دارخورمایەکی پێ بوو لە کاتی ڕۆیشتندا خۆی دەدا بەسەریدا، ئیدی تێ پەڕی بەلای چەند کەسێکی جوولەکەدا لەنێو خۆیاندا بەیەکدییان وت: پرسیاری لێ بکەن دەربارەی ڕووح؟ هەندێکیان وتیان: پرسیاری لێ مەکەن نەوەك نیگای بۆ بێت بە شتێك کە**

---

[١] بڕوانە: ٤٧٢١، ٧٢٩٧، ٧٤٥٦، ٧٤٦٢.

[٢] سەرنج: ئەم فەرموودەیە ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم ڕوودواوە لە مەدینە ڕووی داوە، لە سوننەی تیرمیزیدا هاتووە لە باسی (ومن سورة بني إسرائيل ) ژمارە (٣١٤٠) کە ئەم ڕوودواوە لە مەککە ڕووی داوە و قوڕەیش ئەم پرسیارەیان لە پێغەمبەر ﷺ کردووە، هەندێک لە ڕاڤەکەرانی قورئان ڕیوایەتەکەی بوخارییان تەرجیح داوە، هەندێکیش ڕیوایەتەکەی تیرمیزی، ئیبنو کەسیر لەتەفسیرەکەیدا (١١٤/٥) ڕای وایە ئەم ئایەتە دوو جار دابەزیوە، بەمەش هیچ تێکگیرانێک نامێنێت لە نێوان ڕیوایەتەکەی بوخاری و ڕیوایەتەکەی تیرمیزیدا.

پێتان ناخۆشە، هەندێکی دیکەیان وتیان: سوێند بێ پرسیاری لێ دەکەین، جا پیاوێك لەنێویاندا هەستا و وتی: ئەی ئەبولقاسم ڕووح چییە؟ پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو، ئیدی وتم: نیگای بۆ دێت، جا هەستام، ئینجا کە نیگا بۆ هاتنەکەی تەواو بوو فەرمووی: (پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕووح، تۆش بڵێ: ڕووح لە کاروباری تایبەت بە پەروەردگارمە، وە ئێوە لە زانست و زانیاری پێتان نەبەخشراوە کەمێك نەبێ). ئەعمەش دەڵێ: شێوەی خوێندنەوەی ئایەتەکە لای ئێمە ئاوایە: (أوتوا)[١].

## ٤٩- بابُ مَنْ تَرَكَ بَعْضَ الاخْتِيَارِ مَخَافَةَ أَنْ يَقْصُرَ فَهْمُ بَعْضِ النَّاسِ عَنْهُ، فَيَقَعُوا فِي أَشَدَّ مِنْهُ

١٢٦- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْن مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأسوَدِ قَالَ: قَالَ لِي ابن الزُّبَيْرِ: كَانَتْ عَائِشَةُ ﵂ تسرُ إِلَيْكَ كَثِيرًا، فَمَا حَدَّثَتْكَ فِي الكعْبَةِ؟ قُلْتُ: قَالَتْ لِي: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ، لَوْلَا قَوْمُكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ -قَالَ ابن الزُّبَيْرِ: بِكُفْرٍ- لَنَقَضْتُ الكَعْبَةَ، فَجَعَلْتُ لَهَا بَابَيْنِ: بَابٌ يَدْخُلُ النَّاسُ، وَبَابٌ يَخْرُجُونَ». فَفَعَلَهُ ابن الزُّبَيْرِ[٢].

---

[١] واتە: ئەو وشە لە ئایەتەکە لە شێوەی خوێندنەوەی ئەعمەشدا بە (أوتُوا) خوێنراوەتەوە، بەڵام ئەوانی دیکە بە (أوتِيتُم) خوێندوویانەتەوە.

[٢] بڕوانە: ١٥٨٣، ١٥٨٤، ١٥٨٥، ١٥٨٦، ٣٣٦٨، ٤٤٨٤، ٧٢٤٣.

## ٤٩- باسی ئەوەی هەندێ لەو شتانەی تێیدا سەرپشکە نایکات لە ترسی ئەوەی نەوەک هەندێ کەس تێی نەگەن، ئینجا بە هۆیەوە بکەونە هەڵەیەکی خراپترەوە

١٢٦- ئەسوەد دەڵێ: ئیبنو زوبەیر پێی وتم: عائیشە ﵂ زۆر جار بەپەنهانی شتت پێ دەڵێ، جا لە کەعبەدا چ فەرموودەیەکی بۆ گێڕایتەوە؟ ئەسوەد دەڵێ: منیش وتم: پێی وتم: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە! ئەگەر هۆزەکەت نێوانیان و پەیوەندیان تازە نەبووایە -ئیبنو زوبەیر وتی: بە کوفرەوە- کەعبەم دەڕوخاند و دوو دەرگام بۆ دادەنا: دەرگایەك خەڵك لێیەوە بێنە ژوورەوە، دەرگایەکیش لێیەوە بڕۆنە دەرەوە)). جا دواتر عەبدوڵای کوڕی زوبەیر وای لێ کرد.

## ٥٠- بابُ مَنْ خَصَّ بِالْعِلْمِ قَوْمًا دُونَ قَوْمٍ كَرَاهِيَةَ أَنْ لاَ يَفْهَمُوا

وَقَالَ عَلِيٌّ: حَدِّثُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ، أَتُحِبُّونَ أَنْ يُكَذَّبَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ ﷺ؟

١٢٧- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ مَعْرُوفِ بْنِ خَرَّبُوذٍ، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، عَنْ عَلِيٍّ بِذَلِكَ.

## ٥٠- باسی ئەوەی زانیاری بە هەندێک دەدا و بە هەندێکی دیکەی نادات لە ترسی ئەوەی لێی تێ نەگەن

عەلی ﵁ دەڵێ: قسەیەك بۆ خەڵك بکەن بیزانن و لێی تێ بگەن، ئایا پێتان خۆشە باوەڕ بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ نەکرێت و قسەکانیان بەدرۆ بزانرێ.

**١٢٧- (ئەم وتەی عەلی بەم ڕێگە گێڕدراوەتەوە، ئیمام بوخاری دەڵێ:) عوبەیدوڵای کوڕی مووسا لە مەعڕووفی کوڕی خەڕەبوزەوە، لە ئەبو توفەیلەوە، ئەویش لە عەلییەوە گێڕاویەتەوە.**

١٢٨- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَمُعَاذٌ رَدِيفُهُ عَلَى الرَّحْلِ، قَالَ: «يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ». قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: «يَا مُعَاذُ». قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. ثَلَاثًا، قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إله إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ، إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا أُخْبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا؟ قَالَ: «إِذًا يَتَّكِلُوا». وَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّمًا[1].

**١٢٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و موعازیش ﷺ لە پاشکۆیدا سواری وڵاخێك بوون، فەرمووی: ((ئەی موعازی کوڕی جەبەل))، موعاز وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە خزمەتتام و گوێڕایەڵتم، فەرمووی: ((ئەی موعاز))، وتی: لە خزمەتتام و گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا، سێ جار (ئاوا بانگی کردم، منیش ئاوا وەڵامم دایەوە)، پاشان فەرمووی: ((هیچ کەسێك نییە شایەتی بدات بەوەی هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، وە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، لە دڵیەوە بەڕاستی، ئیللا خوا چوونە دۆزەخی لێ قەدەغە دەکات))، موعاز وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا موژدە بدەم بە خەڵکی بەمە تا**

---

[1] بڕوانە: ١٢٩.

**خەڵكی خۆشنوود بن؟ فەرمووی: ((ئەگەر وا بكەی) كەواتە پشت بەوە دەبەستن و پاڵ دەدەنەوە (بەندايەتی ناكەن)))، جا موعاز لە كاتی سەرەمەرگدا ئەم فەرموودەی گێڕایەوە تا گوناهبار نەبێت بە شاردنەوەی عيلم.**

١٢٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: ذُكِرَ لِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِمُعَاذٍ: «مَنْ لَقِيَ اللَّهَ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ الجَنَّةَ». قَالَ: أَلَا أُبَشِّرُ النَّاسَ؟ قَالَ: «لَا، إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَّكِلُوا»[1].

**١٢٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: بۆيان باس كردم كە پێغەمبەر ﷺ بە موعازی فەرمووە: ((هەر كەس بە خزمەتی خوای گەورە بگات، هيچ شتێكی نەكردبێتە هاوبەشی خودا، دەڕواتە بەهەشتەوە)) موعاز وتی: ئايا موژدە بدەم بە خەڵكی؟ فەرمووی: ((نەخێر، چونكە من دەترسم ئێوە كردەوە نەكەن و پشت بەو موژدەيە ببەستن)).**

## ٥١- بابُ الحَيَاءِ فِي العِلْمِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: لَا يَتَعَلَّمُ العِلْمَ مُسْتَحْيٍ وَلَا مُسْتَكْبِرٌ. وَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ، لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ.

١٣٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ ابنةِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الحَقِّ، فَهَلْ عَلَى المَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا احْتَلَمَتْ؟ قَالَ

---

[1] بڕوانە: ١٢٨.

النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا رَأَتِ المَاءَ». فَغَطَّتْ أُمُّ سَلَمَةَ -تَعْنِي وَجْهَهَا- وَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَتَحْتَلِمُ المَرْأَةُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فَبِمَ يُشْبِهُهَا وَلَدُهَا»[1].

## ٥١- باسی حوکمی شەرمکردن لە فێربوونی زانستدا

**موجاهید دەڵێ: کەسی شەرمن و لوتبەرز فێری زانست نابن، عائیشە ﷺ دەڵێ: باشترین ئافرەتان ئافرەتانی ئەنصارییەکانن، شەرمکردن ڕێگری لێ نەدەکردن لەوەی شارەزا ببن لە ئایینەکەیان.**

**١٣٠- ئومو سەلەمە ﷺ دەڵێ: ئوم سولەیم ﷺ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە لە بەرامبەر ڕاستیدا شەرم ناکات، دەی ئایا ئەگەر ئافرەت لەشگران بوو خۆشۆردنی لەسەرە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر هەستا لە خەو ئاو و شەهوەتی بینی (بە لەشییەوە یان بەپۆشاکەکەیەوە) خۆشۆردن پێویست دەبێت))، جا ئومو سەلەمە بەسەرپۆشەکەی (لە شەرماندا) دەموچاوی داپۆشی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتیش لەشگران دەبێ لە خەویدا؟ فەرمووی: ((بەڵێ هەژارۆکە، (ئەگەر ئاوی نەیەتەوە) ئەی بە چی منداڵەکە لەو دەچێ؟)).**

١٣١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِك، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لَا يَسْقُطُ وَرَقُهَا، وَهِيَ مَثَلُ المُسْلِمِ، حَدِّثُونِي مَا هِيَ؟». فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ البَادِيَةِ، وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ:

---

[1] بڕوانە: ٢٨٢، ٣٣٢٨، ٦٠٩١، ٦١٢١.

فَاسْتَحْيَيْتُ. فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنَا بِهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هِيَ النَّخْلَةُ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ فَحَدَّثْتُ أَبِي بِمَا وَقَعَ فِي نَفْسِي، فَقَالَ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي كَذَا وَكَذَا[1].

**١٣١- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە درەختەکاندا درەختێك هەیە گەڵای ناوەرێ، وەك موسوڵمان وایە (لە بەردەوامی و زۆر خێرداریدا)، دەی پێم بڵێن کام درەختەیە؟)) خەڵکەکەش دەستیان کرد بە ناوهێنانی دەرختەکانی دەرودەشت، هات بەدڵمدا کە ئەو درەختە دارخورمایە، عەبدوڵا دەڵێ: بەڵام شەرمم کرد (بیڵێم)، پاشان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان بڵێ ئەو درەختە چییە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دارخورمایە)). عەبدوڵا دەڵێ: ئینجا من ئەوەی هات بە دڵمدا (لە وەڵامی پرسیارەکەدا) بۆ باوکم گێڕایەوە، باوکم وتی: ئەگەر لەوێدا ئەو قسەیەت بکردایە، لام خۆشتر بوو لەوەی ئەوە و ئەوەم هەبووایە.**

## ٥٢- بابُ مَنِ اسْتَحْيَا فَأَمَرَ غَيْرَهُ بِالسُّؤَالِ

١٣٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن دَاوُدَ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ مُنْذِرٍ الثَّوْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدٍ بنِ الحنَفِيَّةِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً، فَأَمَرْتُ المِقْدَادَ أَنْ يَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: «فِيهِ الوُضوءُ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٦١.

[2] بڕوانە: ١٧٨، ٢٦٩.

## ٥٢- باسی کەسێک شەرم بکات لەبەرئەوە بە کەسێکی دیکە بڵێ پرسیاری بۆ بکات لە زانایەک

**١٣٢- عەلی ﷺ دەڵێ: من پیاوێك بووم مەزیم[١] زۆر بوو، فەرمانم کرد و وتم بە میقداد کە پرسیار بکات لە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تەنها دەستنوێژگرتن پێویست دەکات)).**

## ٥٣- بابُ ذِكْرِ الْعِلْمِ وَالْفُتْيَا فِي الْمَسْجِدِ

١٣٣- حَدَّثَنِي قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا نَافِعٌ - مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَجُلًا قَامَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مِنْ أَيْنَ تَأْمُرُنَا أَنْ نُهِلَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ الشَّأْمِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ». وَقَالَ ابن عُمَرَ: وَيَزْعُمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ». وَكَانَ ابن عُمَرَ يَقُولُ: لَمْ أَفْقَهْ هذِه مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٢].

## ٥٣- باسی زانیاری و فەتوادان لە مزگەوتدا

**١٣٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك لە مزگەوتدا هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەکوێوە فەرمانمان پێ دەکەیت**

---

[١] مەزی ئاوێکی سپی ڕوونە، لە کاتی ئارەزووی زۆر، یان دەستبازی و یاریکردنی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا لە دامێنی پیاو دێتە خوارێ.

[٢] بڕوانە: ١٥٢٢، ١٥٢٥، ١٥٢٧، ١٥٢٨، ٧٣٤٤.

**ئیحرام ببەستین؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((خەڵکی مەدینە لە (ذو الحُلَيفَة)وە[١] ئیحرام ببەستن، خەڵکی شامیش لە (جوحفەوە)[٢] ئیحرام ببەستن، خەڵکی نەجدیش لە (قەرنەوە)[٣] ئیحرام ببەستن)). عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ وتی: دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خەڵکی یەمەنیش لە یەلەملەمەوە[٤] ئیحرام دەبەستن)). وە عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێ: من خۆم ئەو بەشەی فەرموودەکەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبیست و لێی تێ نەگەیشتم.**

## ٥٤- بابُ مَنْ أَجَابَ السَّائِلَ بِأَكْثَرَ مِمَّا سَأَلَهُ

**١٣٤-** حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَعَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ[٥]، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَهُ: مَا يَلْبَسُ الُمحْرِمُ؟ فَقَالَ: «لَا يَلْبَسِ القَمِيصَ، وَلَا العِمَامَةَ، وَلَا السَّرَاوِيلَ، وَلَا البُرْنُسَ، وَلَا ثَوْبًا مَسَّهُ الوَرْسُ أَوِ الزَّعْفَرَانُ، فَإِنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا تَحْتَ الكَعْبَيْنِ»[٦].

---

[١] ذو الحُلَيفَة: شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی مەدینەیە، شەش میل لە مەدینەوە دوورە و سەد و نەوەد و هەشت میل لە مەککەوە دوورە.

[٢] جوحفە: شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی شامە، گوندێکی وێرانەیە، پێنج، یان شەش قۆناغ ڕێگا لە مەککەوە دوورە.

[٣] قەرن: شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی نەجدە، شاخێکە دوو قۆناغ ڕێگا لە ڕۆژهەڵاتی مەککەوە دوورە.

[٤] یەلەملەم: شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی یەمەنە، سی میل لە مەککەوە دوورە.

[٥] ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕشتە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

[٦] بڕوانە: ٣٦٦، ١٥٤٢، ١٨٣٨، ١٨٤٢، ٥٧٩٤، ٥٨٠٣، ٥٨٠٥، ٥٨٠٦، ٥٨٤٧، ٥٨٥٢.

# ٥٤- باسی ئەوەی وەڵامی پرسیارکەرەکە به زیاتر له پرسیارەکەی وەڵام بداتەوە

١٣٤- نافیع و سالیم له عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە که عەبدوڵا وتی: پیاوێك پرسیاری له پێغەمبەر ﷺ کرد و وتی: مرۆڤ لەکاتی ئیحڕامدا چی لەبەر بکات؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نابێ کراس و مێزەر و شەڕواڵ و کڵاو و پۆشاکێك بۆنی وەرس[1] و زەعفەرانی لێ درابێ لەبەر بکات، جا ئەگەر جووتێ نەعلی دەست نەکەوت، ئەوە با جووتێ خوف لەپێ بکات له خواری قاپارەکانیەوە خوفەکانی ببڕێت)).

---

[1] وەرس: ڕووەکێکی زەردە له یەمەن دەڕوێ، سەر و ڕیشی پێ ڕەنگ (بۆیە) دەکرێ.

# ٤- كِتابُ الوضوء

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٤- پەڕاوی دەستنوێژ

## ١- بابُ ما جاء في الوُضُوء

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ﴿٦﴾﴾ المائدة. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ :وَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ فَرْضَ الوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً، وَتَوَضَّأَ أَيْضًا مَرَّتَيْنِ وَثَلَاثًا، وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ثَلَاثٍ، وَكَرِهَ أَهْلُ العِلْمِ الإِسْرَافَ فِيهِ، وَأَنْ يُجَاوِزُوا فِعْلَ النَّبِيِّ ﷺ.

## ١- باسی ئەوەی دەربارەی دەستنوێژ هاتووە

**وە باسی ئەم فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر هەستان بۆ نوێژكردن، ئەوە ڕوخسار و دەستەكانتان تا ئانیشكەكان بشۆن، وە دەستی تەڕ بێنن بەسەرتاندا و قاچەكانتان تا قاپارەكان بشۆن). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەكرداری ڕوونی كردۆتەوە كە ئەوەی پێویستە لە دەستنوێژدا شۆردنی ئەندامەكانە یەكجار یەكجار، وە دوو جار و سێ جاریش ئەندامەكانی شۆردووە لە دەستنوێژدا، بەڵام لە سێ جار زیاتری نەكردووە، وە زانایان زیادەڕەوی تیایدا بەلایانەوە ناپەسندە، هەروەها زیاد لەوەی پێغەمبەر ﷺ كردوویەتی بەلایانەوە ناپەسندە.**

## ٢- بابٌ: لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ

١٣٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاق بْن إِبْرَاهِيمَ الحَنْظَلِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَا تُقْبَلُ صَلَاةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ». قَالَ رَجلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ: مَا الحَدَثُ يا أَبَا هرَيْرَةَ؟ قَالَ: فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ[1].

## ٢- باسێک: نوێژکردن بەبێ دەستنوێژ دروست نییە

**١٣٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نوێژی کەسێك وەرناگیرێ کە دەستنوێژی نەبێت، هەتا دەستنوێژ دەگرێت))، پیاوێکی خەڵکی حەزرەمەوت وتی: ئەی ئەبو هورەیرە بێدەستنوێژی چییە؟ ئەبو هورەیرەش وتی: تسلێدانێکە یان ترلێدانێك)).**

## ٣- بابُ فَضْلِ الوُضُوءِ، وَالْغُرِّ المُحجلِينَ مِنْ آثَارِ الوُضُوءِ

١٣٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلَالٍ، عَنْ نُعَيْمِ المُجْمِرِ قَالَ: رَقِيتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ عَلَى ظَهْرِ المَسْجِدِ، فَتَوَضَّأَ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أُمَّتي يُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ».

---

[1] بڕوانە: ٦٩٥٤.

## ٣- باسی گەورەیی دەستنوێژ و چوار پەل سپییەتی بەهۆی دەستنوێژگرتنەوە

**١٣٦- نوعەیمی موجمیر[١] دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا ﷺ ڕۆیشتینە سەربانی مزگەوت، ئینجا ئەبو هورەیرە دەستنوێژی گرت و وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان ئومەتی من لە ڕۆژی دواییدا بە مارۆ و چوارپەل سپی بانگ دەکرێن، بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژگرتنەوە دەناسرێنەوە، جا هەرکەستان توانی زیاتر نێوچاوانی (و چوارپەلی) بشوات، با بیکات)).**

## ٤- بابٌ: لَا يَتَوَضَّأُ مِنَ الشَّكِّ حَتَّى يَسْتَيْقِنَ

١٣٧- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ وعَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: الرَّجُلُ الذِي يخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيء فِي الصَّلَاةِ. فَقَالَ: «لَا يَنْفَتِلْ -أَوْ لَا يَنْصَرِف- حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا»[٢].

## ٤- باسێک: کەسێک بەگومان بوو لە شکانی دەستنوێژەکەی، دەستنوێژ نەگرێ تا دڵنیا دەبێ لە شکانی دەستنوێژەکەی

**١٣٧- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامیەوە دەگێڕێتەوە کە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای کرد کە مرۆڤ لە نوێژدا وا هەست دەکات دەستنوێژی شکابێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((با واز نەهێنێ - یان دەست هەڵنەگرێت - (لە نوێژەکەی)، تاوەکوو گوێی لە دەنگێك دەبێ، یان هەست بە بۆنێك دەکات)).**

---

١ موجمیر واتە: ئەوەی بوغورد و عود دادەگیرسێنێ، نوعەیمیش بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە، مزگەوتی بۆنخۆش دەکرد بە داگیرساندنی بوغورد.

٢ بڕوانە: ١٧٧، ٢٠٥٦.

## ٥- بابُ التَّخْفِيفِ فِي الوُضُوءِ

١٣٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: أَخْبَرَنِي كُرَيْبٌ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَامَ حَتَّى نَفَخَ ثُمَّ صَلَّى- وَرُبَّمَا قَالَ: اضْطَجَعَ حَتَّى نَفَخَ ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى. ثُمَّ حَدَّثَنَا بِهِ سُفْيَانُ مَرَّةً بَعْدَ مَرَّةٍ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ لَيْلَةً، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا كَانَ فِي بَعْضِ اللَّيْلِ، قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَتَوَضَّأَ مِنْ شَنٍّ مُعَلَّقٍ وُضُوءًا خَفِيفًا -يُخَفِّفُهُ عَمْرٌو وَيُقَلِّلُهُ- وَقَامَ يُصَلِّي، فَتَوَضَّأْتُ نَحْوًا مِمَّا تَوَضَّأَ، ثُمَّ جِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ -وَرُبَّمَا قَالَ شفْيَانُ: عَنْ شِمَالِهِ- فَحَوَّلَنِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ صَلَّى مَا شَاءَ الله، ثُمَّ اضْطَجَعَ، فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، ثم أَتَاهُ الْمنَادِي فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ، فَقَامَ مَعَهُ إِلَى الصَّلَاةِ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قلْنَا لِعَمرٍو: إِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تنَامُ عَيْنُهُ، وَلَا يَنَام قَلْبُهُ. قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ عمَيْرٍ يَقولُ: رُؤيَا الأنبِيَاءِ وَحْيٌ، ثمَّ قَرَأَ: ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ ﴿١٠٢﴾﴾ الصّافّات[1].

## ٥- باسی دەستنوێژگرتنی سووکەڵە

**١٣٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ خەوت تا پرخەی هات، پاشان هەستا نوێژی کرد، وە هەندێ جار دەیوت: پاڵ کەوت تا پرخەی هات، پاشان هەستا و نوێژی کرد. (عەلی کوڕی عەبدوڵای مەدینی دەڵێ:) پاشان سوفیان جار لەدوای جار لە عەمری کوڕی کوڕەیبەوە بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ وتی: شەوێك لە ماڵی مەیمونەی پوورم مامەوە، جا پێغەمبەر ﷺ لە شەودا هەستا بۆ شەونوێژ، ئینجا کە هەندێك لە شەو تێپەڕ بوو، پێغەمبەر ﷺ هەستا و لە کوندەیەك کە هەڵواسرابوو دەستنوێژێکی سووکەڵەی گرت - عەمر بە سووکەڵە و کەم باسی**

---

[1] بڕوانە: ١١٧.

کرد-، وە هەستاو دەستی کرد بە نوێژکردن، (عەبدوڵا دەڵێ:) جا منیش دەستنوێژێکی وەك دەستنوێژەکەی ئەوم گرت، پاشان ڕۆیشتم لەلای چەپیەوە نوێژم دابەست - هەندێ جار سوفیان دەیوت: (عن شماله)- (لەجیاتی (عن یساره) کە ماناکانیان یەکە)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هێنامیە لای ڕاستیەوە، پاشان ئەوەندەی خوا ویستی نوێژی کرد، پاشان ڕاکشا و خەوت تا پرخەی هات، پاشان بانگبێژ هات ئاگاداری کرد کە کاتی نوێژکردنی بەیانییە، عەبدوڵاش لەگەڵی هەستا بۆ نوێژی بەیانی، جا پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە، (سوفیان دەڵێ:) بە عەمرمان وت: بێگومان خەڵکانێك دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی دەخەوێ، بەڵام دڵی ناخەوێ!! عەمرٍ وتی: لە عوبەیدی کوڕی عومەیرم بیست دەیوت: خەوبینینی پێغەمبەران ﷺ نیگا و وەحییە، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: (ئیبراهیم بە ئیسماعیلی کوڕی وت: بێگومان من لە خەومدا بینیم کە تۆ سەر دەبڕم).

## ٦- بابُ إِسْبَاغِ الوُضُوءِ

وَقَالَ ابن عُمَرَ: إِسْبَاغُ الوُضُوءِ: الإِنْقَاءُ

١٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابن عَبَّاسٍ- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيدٍ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالشِّعْبِ نَزَلَ فَبَالَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وَلم يُسبغِ الوُضُوءَ. فَقُلْتُ: الصَّلَاةَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: «الصَّلَاةُ أَمَامَكَ». فَرَكِبَ، فَلَمَّا جَاءَ الْمزْدَلِفَةَ نَزَلَ فَتَوَضَّأَ، فَأَسْبَغَ الوُضُوءَ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَصَلَّى المَغْرِبَ، ثُمُّ أَنَاخَ كُلُّ إِنْسَانٍ بَعِيرَهُ فِي مَنْزِلِهِ، ثمَّ أُقِيمَتِ العِشَاءُ فَصَلَّى، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا[1].

---

[1] بڕوانە: ١٨١، ١٦٦٧، ١٦٦٩، ١٦٧٢.

## ٦- باسی دەستنوێژگرتن بەچاكی و تەواوەتی

**عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: (إِسْبَاغُ الوُضُوءِ) یانی: خۆپاككردنەوە.**

**١٣٩- كوڕەیب - كە كۆیلەی ئازادكراوی ئیبنو عەباسە ﷺ - لە ئوسامەی كوڕی زەیدەوە ﷺ گێڕاویەتەوە و لێی بیستووە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە دەرچوو (بەرەو موزدەلیفە) هەتا گەشتە دەربەندەكە، جا لایدا و میزی كرد، پاشان دەستنوێژی گرت بەدەستنوێژگرتنێكی سووكەڵە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ بكەین، ئەویش فەرمووی: ((نوێژ لە بەردەمتایە))[1]، جا سواری وڵاخەكەی بوو، ئینجا گەشتە موزدەلیفە، لایدا و دەستنوێژی گرت بەچاكی و تەواوەتی، پاشان قامەت كرا بۆ نوێژ، ئەوسا نوێژی ئێوارەی كرد، پاشان هەر كەسە و وشترەكەی لە شوێنی خۆیدا یەخ دا، دواتر قامەت كرا بۆ نوێژی عیشا و نوێژی كرد، وە لە نێوان ئەو دوو نوێژەدا نوێژی (سوننەتی) نەكرد.**

## ٧- بابُ غَسْلِ الوَجهِ بِالْيَدَيْنِ مِن غَرفَةٍ وَاحِدَةٍ

١٤٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو سَلَمَةَ الْخزَاعِيُّ مَنصُورُ بْنُ سَلَمَةَ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابن بِلَالٍ -يَعْنِي سُلَيْمَانَ- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ، أَنَّهُ تَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ، أَخَذَ غَرفَةً مِنْ مَاءٍ، فَمَضْمَضَ بِهَا وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ، فَجَعَلَ بِهَا هَكَذَا، أَضَافَهَا إِلَى يَدِهِ الأُخْرى، فَغَسَلَ بِهِمَا وَجْهَهُ، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَة مِنْ مَاءٍ، فَغَسَلَ بِهَا يَدَهُ اليُمْنَى، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ، فَغَسَلَ بِهَا يَدَهُ اليُسْرى، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَرَشَّ عَلَى رِجْلِهِ اليُمْنَى حَتَّى غَسَلَهَا، ثُمَّ أَخَذَ غَرفَةً أُخْرى، فَغَسَلَ بِهَا رِجْلَهُ -يَعْنِي: اليُسْرى- ثُمَ قَالَ هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يتَوَضَّأُ.

---

[1] واتە: لە موزدەلیفە نوێژ دەكەین كە نزیكە و لە بەردەمتایە.

## ٧- باسی شۆردنی ڕوخسار بە هەردوو دەست بە یەک مشت ئاو

١٤٠- عەتای کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﵄ کە دەستنوێژی گرت، جا ڕوخساری (یەك جار) شۆرد، پاشان مشتێك ئاوی هەڵگرت و لە دەم و لووتی ڕادا، پاشان لوێچێکی دیکە ئاوی هەڵگرت، ئاوای لێ کرد کردیە هەردوو دەستیەوە و دەموچاوی پێ شۆرد، پاشان لوێچێك ئاوی هەڵگرت و باڵی ڕاستی پێ شۆرد، پاشان لوێچێکی دیکە ئاوی هەڵگرت باڵی چەپی پێ شۆرد، پاشان دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا، پاشان لوێچێك ئاوی هەڵگرت پرژاندی بەسەر قاچی ڕاستیدا تا شۆردی، ئینجا لوێچێکی دیکەی هەڵگرت و قاچی -واتە: چەپی- پێ شۆرد، دواتر عەبدوڵا وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئاوا دەستنوێژی دەگرت.

## ٨- بَابُ التَّسمِيَةِ عَلَى كُلِّ حَالٍ وَعِنْدَ الوِقَاعِ

١٤١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، يَبْلُغُ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا. فَقُضِيَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ، لَمْ يَضُرَّهُ»[1].

## ٨- باسی (بسم الله الرحمن الرحيم) کردن لە هەموو حاڵەتێکدا، وە لە کاتی جووتبوونی پیاو و ئافرەتدا

١٤١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە[1] کە فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێك لە ئێوە کاتێ جووت دەبێ لەگەڵ خێزانیدا بڵێ:

[1] بڕوانە: ٣٢٧١، ٣٢٨٣، ٥١٦٥، ٦٣٨٨، ٧٣٩٦.

به ناوی خواوه، خوایه شەیتانمان لێ دوور خەرەوه، وه شەیتان دوور خەرەوه لەو منداڵەی پێمان دەبەخشی، ئینجا (ئەگەر) پاش ئەوه منداڵێکیان بوو، شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێ)).

## ٩- بابُ مَا يَقُولُ عِنْدَ الخَلَاءِ؟

١٤٢- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ الخَلَاءَ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ». تَابَعَهُ ابْنُ عَرْعَرَةَ، عَنْ شُعْبَةَ. وَقَالَ غُنْدَرٌ، عَنْ شُعْبَةَ: إِذَا أَتَى الخَلَاءَ. وَقَالَ مُوسَى، عَنْ حَمَّادٍ: إِذَا دَخَلَ. وَقَالَ سَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ: إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْخُلَ[٢].

## ٩- باسی کاتی ڕۆیشتنە سەر ئاو (موسوڵمان) چی دەڵێ؟

١٤٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە دەڕۆیشتە سەر ئاو دەیفەرموو: ((خوایە! من پەنا دەگرم بە تۆ لە شەیتانەکانی نێرو مێ)). ئیبنو عەرعەرە هەمان فەرموودەی لە شوعبەوە گێڕاوەتەوە. وە غوندەر لە شوعبەوە دەگێڕێتەوە کە ئەنەس وتی: (کاتێ دەچووە سەر ئاو). وە مووسا لە حەمادەوە بەم شێوەیە گێڕاویەتەوە: (إِذَا دَخَلَ)، واتە: کاتێ بڕۆیشتایەتە جێگای سەرئاوەکە، وە سەعیدی کوڕی زەید دەڵێ: عەبدولعەزیز بەم شێوەیە بۆی گێڕاینەوە: کاتێ بیویستایە بڕواتە سەر ئاو.

---

[١] عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەیگەیێنێتەوە بە پێغەمبەر ﷺ، واتە: بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە.

[٢] بڕوانە: ٦٣٢٢.

## ١٠- بابُ وَضْعِ المَاءِ عِنْدَ الخَلَاءِ

١٤٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ محمد قَالَ: حَدَّثَنَا هَاشِمُ بْنُ القَاسِمِ قَالَ: حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ، عَنْ عُبَيدِ اللَّهِ بنِ أَبِي يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺدخَلَ الخَلَاءَ، فَوَضَعتُ لَهُ وَضُوءًا، قَالَ: «مَنْ وَضَعَ هذا؟». فَأُخْبِرَ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»[1].

## ١٠- باسی دانانی ئاو لە شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن

**١٤٣- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە سەر ئاو منیش ئاوی دەستنوێژم بۆ دانا[2]، فەرمووی: ((کێ ئەم ئاوەی داناوە؟)) پێی وترا:[3] (عەبدوڵا دایناوە)، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوایە! زۆر شارەزای بکە لە ئایینی ئیسلام)).**

## ١١- بابُ لَا تُسْتَقْبَلُ القِبْلَةُ بِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ إِلَّا عِنْدَ البِنَاءِ جِدَارٍ أَوْ نَحْوِهِ

١٤٤- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الغَائِطَ فَلَا يَسْتَقْبِلِ القِبْلَةَ وَلَا يُوَلِّهَا ظَهْرَهُ، شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا»[4].

---

[1] بڕوانە: ٧٥.

[2] لەوانەیە نزیکی ئەو شوێنە دایناب‌ێ کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا دەستی بە ئاو گەیاندووە، تا بتوانێ خۆی پێ پاک بکاتەوە (ئەم ڕایە بەهێزە لەلای ئبن حەجەر).

[3] مەیمونەی پووری عەبدوڵا پێی گوت.

[4] بڕوانە: ٣٩٤.

## ١١- باسی بۆ پیسایی و میزکردن ڕوو له قیبله ناکرێ، مەگەر له خانوودا وەك دیوار و شتی وا

**١٤٤- ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان ڕۆیشت بۆ سەر ئاو ئەوا با ڕوو نەکاتە قیبله و پشتیشی تێ نەکات، بەڵکوو ڕوو له خۆرهەڵات یاخود خۆرئاوا بکەن)).**

## ١٢- بَابُ مَنْ تَبَرَّزَ عَلَى لَبِنَتَيْنِ

١٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يحيى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يحيى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَمِّهِ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ: إِذَا قَعَدْتَ عَلَى حَاجَتِكَ، فَلَا تَسْتَقْبِلِ القِبْلَةَ وَلَا بَيْتَ المَقْدِسِ. فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: لَقَدِ ارْتَقَيتُ يَوْمًا عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَنَا، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى لَبِنَتَيْنِ مُسْتَقْبِلًا بَيْتَ المَقْدِسِ لِحَاجَتِهِ. وَقَالَ: لَعَلَّكَ مِنَ الذِينَ يُصَلُّونَ عَلَى أَوْرَاكِهِمْ. فَقُلْتُ: لَا أَدْرِي والله. قَالَ مَالِكٌ: يَعْنِي الذِي يُصَلِّي وَلَا يَرْتَفِعُ عَنِ الأَرْضِ، يَسْجدُ وَهُوَ لَاصِقٌ بِالأَرْضِ[1] .

## ١٢- باسی ئەو کەسەی لەسەر دوو خشتی قوڕ دەست بە ئاو بگەیەنێ

**١٤٥- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: خەڵکانێك دەڵێن: کاتێ دانیشتی بۆ دەست بە ئاو گەیاندن ڕوو لە قیبلە و بەیتولمەقدیس مەکە، ئینجا عەبدوڵای کوڕی عومەر وتی: بێگومان ڕۆژێك ڕۆیشتمە سەربانی ماڵی خۆمان، جا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر دوو خشتی قوڕ دانیشتبوو،**

---

[1] بڕوانە: ١٤٨، ١٤٩، ٣١٠٢.

ڕوو لە بەیتولمەقدیس دەستی بەئاو دەگەیاند، عەبدوڵا وتی: (بە واسیع) لەوانەیە تۆ لەو کەسانە بیت کە نوێژ دەکەن سنگیان دەلکێنن بە ڕانیانەوە (لەکاتی سوژدەدا)؟ واسیع وتی: منیش وتم: سوێند بە خوا نازانم. ئیمام مالیك دەڵێ: مەبەستی عەبدوڵا (لەو قسەیەی کە بە واسیعی وت) ئەو کەسەیە کە نوێژ دەکات، لە زەوی خۆی بەرز ناکاتەوە، کە سوژدە دەبات خۆی نووساندووە بە زەوییەوە.

## ١٣- بابُ خُرُوجِ النِّسَاءِ إِلَى البَرَازِ

١٤٦- حَدَّثَنَا يحيى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ إِذَا تَبَرَّزْنَ إِلَى المَنَاصِعِ -وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ- فَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: احْجُبْ نِسَاءَكَ. فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ، فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ -زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي عِشَاءً، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ: أَلَا قَدْ عَرَفْنَاكِ يا سَوْدَةُ. حِرْصًا عَلَى أَنْ يَنْزِلَ الحِجَابُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ الحِجَابِ[1].

## ١٣- باسی ڕۆیشتنەدەرەوەی ئافرەتان لە ماڵ بۆ دەست بە ئاو گەیاندن

١٤٦- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بەشەو دەرۆیشتن بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، دەچوونە مەناصیع[2]-کە چۆڵاییەکی فراوانە-، جا عومەر هەمیشە بە پێغەمبەری خوای ﷺ دەوت:

---

[1] بڕوانە: ١٤٧، ٤٧٩٥، ٥٢٣٧، ٦٢٤٠.

[2] چۆڵاییەکی فراوانە لەپاڵ مەدینەدا.

**مەهێڵە خێزانەکانت لە ماڵ دەربچن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وای نەدەکرد، شەوێك لە شەوانی عیشادا سەودەی کچی زەمعەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە (بۆ دەست بە ئاو گەیاندن)، سەودە ئافرەتێکی درێژ بوو، جا عومەر بانگی کرد وتی: ئاگادار بە بێگومان سەودە دەزانین تۆی (عومەر بۆیە وای دەکرد)، پەرۆشی بوو فەرمانی حیجاب دابەزێ، ئیدی خوای گەورە ئایەتی حیجاب و خۆداپۆشینی دابەزاند.**

١٤٧- حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَام بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَدْ أُذِنَ أَنْ تَخْرُجْنَ فِي حَاجَتِكُنَّ». قَالَ هِشَامٌ: يَعْنِي: البَرَازَ[1].

**١٤٧- عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان مۆڵەتتان پێ دراوە بۆ پێویستی خۆتان لە ماڵ دەرچن))، هیشام دەڵێ: چوڵەوانی (واتە: بۆ دەست بە ئاو گەیاندن).**

## ١٤- بابُ التَّبرزِ فِي البُيُوتِ

١٤٨- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيم بْنُ الْمنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: ارْتَقَيْتُ فَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِ حَفْصَةَ لِبَعْضِ حَاجَتِي، فَرَأَيْتُ رَسولَ اللَّهِ ﷺ يَقْضِي حَاجَتَهُ مُسْتَدْبِرَ القِبْلَةِ، مُسْتَقْبِلَ الشَّأْمِ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٤٦.

[2] بڕوانە: ١٤٥.

## ١٤- باسی دەست بەئاو گەیاندن لەنێو ماڵ و خانوودا

**١٤٨- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: ڕۆژێك ڕۆیشتمە سەربانی ماڵی حەفصە ﵂ بۆ پێویستییەكی خۆم، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دانیشتبوو دەستی بە ئاو دەگەیاند، پشتی لە قیبلە بوو ڕووی لە شام بوو.**

## ١٤- بابٌ

١٤٩- حَدَّثَنَا يعقوب بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيد بْن هَارُونَ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يحْيَى بْنِ حَبَّانَ، أَنَّ عَمَّهُ وَاسِعَ بْنَ حَبَّانَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ قَالَ: لَقَدْ ظَهَرْتُ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى ظَهْرِ بَيْتِنَا، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَاعِدًا عَلَى لَبِنَتَيْنِ، مُسْتَقْبِلَ بَيْتِ المَقْدِسِ[١].

## ١٤- باسێک

**١٤٩- موحەممەدی كوڕی یەحیای كوڕی حەبان گێڕایەوە، كە واسیعی كوڕی حەبانی مامی بۆی گێڕایەوە، كە عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ بۆی گێڕایەوە و وتی: ڕۆژێكیان ڕۆیشتمە سەربانی ماڵی خۆمان، جا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر دوو خشتی قوڕ دانیشتبوو، ڕوو بە بەیتولمەقدیس (دەستی بە ئاو دەگەیاند).**

---

[١] بڕوانە: ١٤٥.

## ١٥- بابُ الاِسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ

١٥٠- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ المَلِكِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي مُعَاذٍ -وَاسْمُهُ عطَاءُ بْنُ أَبِي مَيْمونَةَ- قَالَ: سَمِعْت أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُول: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا خَرَجَ لَحِاجَتِهِ أَجِيءُ أَنَا وَغُلَام مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ. يَعْنِي: يَسْتَنْجِي بِهِ[1].

## ١٥- باسی خۆپاككردنەوە بە ئاو لەسەر ئاودا

**١٥٠- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ بڕۆیشتایە بۆ سەرئاو، من و لاوێك[2] دەڕۆیشتین جەوەنەیەكی بچووك ئاومان دەبرد. واتە: بۆ ئەوەی خۆی پێ پاك بكاتەوە.**

## ١٦- بابُ مَنْ حُمِلَ مَعَهُ المَاءُ لِطُهُورِهِ

وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: أَلَيْسَ فِيكمْ صَاحِب النَّعْلَيْنِ وَالطَّهُورِ وَالْوِسَادِ؟

١٥١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْب قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي مُعَاذٍ -هُوَ عَطَاءُ بْنُ أَبِي مَيْمُونَةَ- قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ لِحاجَتِهِ، تَبِعْتُهُ أَنَا وَغُلَامٌ مِنَّا مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ[3].

---

[1] بڕوانە: ١٥١، ١٥٢، ٢١٧، ٥٠٠.

[2] مەبەست بەو لاوە عەبدوڵا كوڕی مەسعودە ﷺ وەک لە فەرموودەی ژمارە (١٥١)دا هاتووە، یان مەبەست پێی غوڵامێكی ئەنصارییە، وەک لە ڕیوایەتی ئیسماعیلیدا هاتووە، بەڵام وتەی یەكەم ڕاسترە كە عەبدوڵای كوڕی مەسعوود بووبێت ﷺ. بڕوانە: إرشاد الساري:١/٣٦١ .

[3] بڕوانە: ١٥٠.

## ١٦- باسی ئەو کەسەی لەگەڵیدا ئاوی بۆ هەڵگیراوە تا دەستنوێژی پێ بگرێ

ئەبو دەردا ﷺ دەڵێ (بە عەلقەمەی کوڕی قەیس): ئایا ئەو کەسەی جووتە نەعلەکە و ئاوی دەستنوێژ و پشتییەکەی پێغەمبەری ﷺ هەڵدەگرت و پێی بوو لەنێوتاندا نییە؟ (کە عەبدوڵای کوڕی مەسعودە ﷺ).

١٥١- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بڕۆیشتایە بۆ سەرئاو من و غوڵامێك لە ئێمە (ی هاوەڵانی کە عەبدوڵای کوڕی مەسعودە ﷺ) شوێنی دەکەوتین جەوەنەیەکی بچووك ئاومان دەبرد (بۆ ئەوەی خۆی پێ پاك بکاتەوە).

## ١٧- بابُ حَملِ العَنَزَةِ مَعَ المَاءِ فِي الاِسْتِنْجَاءِ

١٥٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مَيمُونَةَ، سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُ الخَلاَءَ، فَأَحمِلُ أَنَا وَغُلَامٌ إِدَاوَةً مِنْ مَاءٍ وَعَنَزَةً، يَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ. تَابَعَهُ النَّضْرُ وَشَاذَانُ، عَنْ شُعْبَةَ. العَنَزَةُ عَصَا عَلَيْهِ زُجٌّ[1].

## ١٧- باسی هەڵگرتنی داردەست لەگەڵ ئاودا لە کاتی خۆپاککردنەوەدا

١٥٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەچووە سەرئاو، جا من و غوڵامێك جەوەنەیەکی بچووك و دارەدەستەکەمان بۆ هەڵدەگرت، بە ئاوەکە

---

[1] بڕوانە: ١٥٠.

خۆی پاك دەكردەوە. (ئیمام بوخاری دەڵێ:) نەزر و شازان ئەو فەرموودەیەیان لە شوعبەوە گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی فەرموودەكەی پێشوو دەكات، وە وشەی (العَنَزَةُ) دارێكە ئاسنێكی تیژی پێوەیە.

## ١٨- بابُ النَّهْيِ عَنْ الاسْتِنْجَاءِ بِالْيَمِينِ

١٥٣- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ -هُوَ الدَسْتَوَائِيُّ- عَنْ يحيى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ، وَإِذَاَ أَتَى الخَلَاءَ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ»[1].

## ١٨- باسی ڕێگریكردن لە خۆپاككردنەوە بە دەستی ڕاست

١٥٣- عەبدوڵای كوڕی ئەبو قەتادە لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر كەسێكتان ئاوی خواردەوە با هەناسە نەدات لەنێو دەفرەكەدا، وە كاتێ ڕۆیشتە سەرئاو با دەستی ڕاستی نەدات لە عەورەتی، هەروەها بە دەستی ڕاستی خۆی پاك نەكاتەوە، وە نەیهێنێ بە خۆیدا بۆ پاككردنەوە)).

## ١٩- بابٌ: لَا يُمْسِكُ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ إِذَا بَالَ

١٥٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَأْخُذَنَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَسْتَنْجِي بِيَمِينِهِ، وَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الانَاءِ»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٥٤، ٥٦٣٠.

## ١٩- باسێک: کاتێ میزی کرد بە دەستی ڕاستی داوێنی نەگرێ

١٥٤- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان میزی کرد، با بە دەستی ڕاستی داوێنی نەگرێ، وە با بە دەستی ڕاستی خۆی پاك نەکاتەوە، وە با هەناسە نەدات لەنێو دەفرەکەدا (کە ئاوی پێ دەخواتەوە)))[1].

## ٢٠- بابُ الاسْتِنْجَاءِ بِالْحِجَارَةِ

١٥٥- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ المَكِّيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يحيى بْنِ سَعِيدِ بْنِ عَمْرُو المَكِّيُّ، عَنْ جدِّهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اتَّبَعْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَخَرَجَ لَحِاجَتِهِ، فَكَانَ لَا يَلْتَفِتُ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ، فَقَالَ: «ابْغني أَحْجَارًا أَسْتَنْفِضْ بِهَا -أَوْ نَحْوَهُ- وَلَا تَأْتِنِي بِعَظْمٍ وَلَا رَوْثٍ». فَأَتَيْتُهُ بِأَحْجَارٍ بِطَرَفِ ثِيَابِي، فَوَضَعْتُهَا إِلَى جَنْبِهِ وَأَعْرَضْتُ عَنْهُ، فَلَمَّا قَضَى أَتْبَعَهُ بِهِنَّ[2].

## ٢٠- باسی خۆپاككردنەوە بە بەرد

١٥٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە دەرەوە بۆ سەرئاو، منیش شوێنی کەوتم، جا پێغەمبەر ﷺ لای نەدەکردەوە، (ئاوڕی نەدایەوە) بۆیە منیش لێی نزیك بوومەوە جا فەرمووی: ((چەند بەردێکم بۆ بێنە، خۆمی پێ پاك بکەمەوە، -یان وتەیەك لەو جۆرەی فەرموو-، بەڵام ئێسك و شیاکە و تەرسم بۆ مەهێنە))، منیش لە کۆشمدا چەند بەردێکم بۆ هێنا و لە تەنیشتیەوە دامنا، ڕووم وەرچەرخاند و پشتم تێ کرد، جا کاتێ لێ بۆیەوە لە سەرئاوەکەی، خۆی پێیان پاك کردەوە.

---

[1] بڕوانە: ١٥٣.

[2] بڕوانە: ٣٨٦٠.

## ٢١- بابُ لاَ يُسْتَنْجَى بِرَوْثٍ

١٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالِ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: لَيْسَ أَبُو عُبَيْدَةَ ذَكَرَهُ، ولكن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ يَقُولُ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ الغَائِطَ، فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ، فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ، وَالْتَمَسْتُ الثَّالِثَ فَلَمْ أَجِدهُ، فَأَخَذْتُ رَوْثَةً، فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَأَخَذَ الحَجَرَيْنِ وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ، وَقَالَ: «هذا رِكْسٌ». وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ.

## ٢١- باسى نابێ بە تەرس و شیاکە خۆ پاک بکرێتەوە

**١٥٦-عەبدولاّ (ی کوڕی مەسعود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە سەرئاو، جا فەرمانی پێ کردم کە سێ بەردی بۆ بێنم، منیش دوو بەردم پەیدا کرد گەڕام بۆ سێیەم، بەڵام دەستم نەکەوت، بۆیە شیاکەیەکم بۆ هێنا، پێغەمبەر ﷺ دوو بەردەکەی وەرگرت و شیاکەکەی فڕێ دا و فەرمووی: ((ئەمە پیسە)). ئیبراهیمی کوڕی یوسف لە باوکیەوە گێڕایەوە، ئەویش لە ئەبو ئیسحاقەوە وتی: عەبدوڕەحمان بۆی گێڕامەوە.**

## ٢٢- بابُ الوُضوءِ مَرَّةً مَرَّةً

١٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ مَرَّةً مَرَّةً.

## ٢٢- باسی دەستنوێژگرتن بە شۆردنی ئەندامەکان یەک جار یەک جار

**١٥٧-عەتائی کوڕی یەسار لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت، یەك جار یەك جار ئەندامەکانی دەشۆرد.**

## ٢٣- بَابُ الوُضُوءِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ

١٥٨- حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ عِيسَى قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ ابْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ.

## ٢٣- باسی دەستنوێژگرتن بە شۆردنی ئەندامەکان دوو جار دوو جار

**١٥٨- عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت، دوو جار دوو جار ئەندامەکانی دەشۆرد.**

## ٢٤- بَابُ الوُضُوءِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا

١٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأُوَيْسِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَزِيدَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ حُمْرَانَ -مَوْلَى عُثْمَانَ- أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ دَعَا بِإِنَاءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَيَدَيْهِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ ثَلَاثَ مِرَارٍ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ

غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ إِلَى الكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هذا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[1].

## ٢٤- باسى دەستنوێژگرتن بە شۆردنى ئەندامەكان سێ جار سێ جار

**١٥٩- حومران -خزمەتكارى عوسمان- دەگێڕێتەوە كە عوسمانى كوڕى عەففانى ﷺ بينى، داواى تەشتێ ئاوى كرد، ئينجا سێ جار ئاوى كرد بە دەستيدا و دەستەكانى شۆرد، پاشان دەستى ڕاستى كرد بە ئاوەكەدا و (مشتێ ئاوى هەڵگرت و) ئاوى لە دەم و لووتى ڕادا، پاشان سێ جار ڕوخسارى شۆرد، وە سێ جار هەردوو دەستى تا ئانيشكەكانى شۆرد، پاشان دەستى تەڕى هێنا بەسەريدا، دواتر سێ جار هەردوو قاچى تا قاپارەكانى شۆرد، ئينجا وتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((هەر كەس وەك ئەم دەستنوێژەى من دەستنوێژ بگرێ، پاشان دوو ڕكات نوێژ (ى سوننەت) بكات، هيچ شتێك (ى دونيايى)[2] نەيەت بە دڵيدا، (خوا) لە گوناهەكانى ڕابردووى خۆش دەبێ)).**

١٦٠- وَعَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قَالَ صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ: قَالَ ابْنِ شِهَابٍ: ولكن عُرْوَةُ يُحَدِّثُ، عَنْ حُمْرَانَ، فَلَمَّا تَوَضَّأَ عُثْمَانُ قَالَ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا لَوْلَا آيَةٌ مَا حَدَّثْتُكُمُوهُ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَتَوَضَّأُ رَجُلٌ يُحْسِنُ وُضُوءَهُ، وَيُصَلِّي الصَّلَاةَ إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الصَّلَاةِ حَتَّى يُصَلِّيَهَا». قَالَ عُرْوَةُ: الآيَةُ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّـٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَـٰبِ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّـٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾﴾ البقرة[3].

---

[1] بڕوانە: ١٦٠، ١٦٤، ١٩٣٤، ٦٤٣٣.

[2] وەک لە ڕیوایەتی (حكيم الترمذي)دا هاتووە، بڕوانە: إرشاد الساري:١/ ٣٧٢ .

[3] بڕوانە: ١٥٩.

١٦٠- حومڕان دەڵێ: جا كاتێ عوسمان ﷺ دەستنوێژی گرت، وتی: ئایا فەرموودەیەكتان بۆ بگێڕمەوە؟ ئەگەر ئایەتێك نەبووایە لە قورئاندا بۆم نەدەگێڕانەوە، لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هیچ پیاوێك نییە بەجوانی دەستنوێژ بگرێت و نوێژێكی پێوە بكات، ئیللا (خوا) لە گوناهی نێوان ئەو نوێژە و نوێژەكەی دیكەی خۆش دەبێت كە دەیكات)). عوروە دەڵێ: ئەو ئایەتەی عوسمان ئاماژەی بۆ كرد: (بێگومان ئەو كەسانەی ئەوەی كە ناردوومانەتە خوارەوە لە ئایەتانی ڕۆشن و ڕێنموونی، دوای ئەوەی ڕوونمان كردۆتەوە بۆ خەڵكی دەیشارنەوە، ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەكات و نەفرەتكارانیش نەفرینیان لێ دەكەن).

## ٢٥- بابُ الاِسْتِنْثَارِ فِي الوُضُوءِ

ذَكَرَهُ عُثْمَانُ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ، وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٦١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ، وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ»[1].

## ٢٥- باسی ئاو لە لووت ڕادان لە كاتی دەستنوێژگرتندا

ئەم فەرموودەیە هەریەك لە عوسمان و عەبدوڵای كوڕی زەید و عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە.

---

[1] بڕوانە: ١٦٢.

١٦١- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس دەستنوێژی گرت، با فم بکات لەدوای ئاو لە لووت وەردان، هەر کەسیش بە بەرد خۆی پاک کردەوە، با بەردەکان تاک بن (کە خۆی پێ پاك دەکاتەوە))).

## ٢٦- بَابُ الاسْتِجْمَارِ وِتْرًا

١٦٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأعرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ ثُمَّ لِيَنْثُرْ، وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهَا فِي وَضُوئِهِ، فَإِن أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ»[1].

## ٢٦- باسی ژمارەی بەردی خۆپێپاککردنەوە سوننەتە تاک بێت

١٦٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان دەستنوێژی گرت، با ئاو بکاتە لووتیەوە پاشان فم بکات، وە هەر کەسێکیش بە بەرد خۆی پاك کردەوە با بەردەکان تاك بن، وە ئەگەر کەسێکتان لە خەو هەستا ئەوە با دەستەکانی بشوات، پێش ئەوەی بیخاتە ئاوی دەستنوێژەکەیەوە، چونکە بێگومان کەستان نازانێ شەو دەستی لەکوێدا بووە)).

## ٢٧- بَابُ غَسْلِ الرِّجْلَين، وَلَا يَمسَحُ عَلَى القَدَمَينْ

١٦٣- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: تَخَلَّفَ النَّبِيُّ ﷺ عَنَّا فِي سَفرَةٍ سَافَرْنَاهَا، فَأَدرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقْنَا العَصْرَ، فَجَعَلْنَا نَتَوَضَّأُ وَنَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا، فَنَادى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ». مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا[2].

---

[1] بڕوانە: ١٦١.

[2] بڕوانە: ٦٠.

## ٢٧- باسی شۆردنی هەردوو پێیەکان، وە دەستی تەڕ نەهێنێ بە پێیەکانیدا

**١٦٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: لە سەفەرێکدا کردمان پێغەمبەر ﷺ بەجێ ما لە ئێمە، کاتێ گەشتەوە پێمان پەلەی نوێژی عەسرمان بوو (خەریك بوو کاتی نوێژ نەدەما)، بۆیە دەستنوێژمان دەگرت و دەستی تەڕمان دەهێنا بە قاچماندا، پێغەمبەریش ﷺ دوو یان سێ جار بەدەنگی بەرز فەرمووی: ((سزای سەخت لە ئاگردا بۆ ئەو کەسەی پاژنەی پێی بەچاکی ناشوات)).**

## ٢٨- بابُ المَضْمَضَةِ فِي الوُضُوءِ

قَالَهُ ابنُ عَبَّاسٍ[1]، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ زيدٍ ﵄[2]، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٦٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ حُمْرَانَ -مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ- أَنَهُ رَأَى عُثْمَانَ دَعَا بِوَضُوءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ مِنْ إِنَائِهِ، فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الوَضُوءِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ، وَاسْتَنْشَقَ، وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا وَيَدَيْهِ إِلَى المِرفَقَيْنِ ثَلَاثًا، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ كُلَّ رِجْلٍ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ نَحْوَ وُضُوئِي هذا، وَقَالَ: «مَنْ تَوَضأَ نَحْوَ وُضُوئِي هذا، ثُمَّ صلَّى رَكعَتَيْنِ، لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[3].

---

[1] بڕوانە: ١٤٠.

[2] بڕوانە: ١٨٥.

[3] بڕوانە: ١٥٩.

## ٢٨- باسی ئاو لە دەم وەردان لە کاتی دەستنوێژگرتندا

**ئەم فەرموودەیە عەبدوڵای کوڕی عەباس و عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە.**

**١٦٤- حومڕان - مەولای عوسمانی کوڕی عەففان - دەگێڕێتەوە کە عوسمانی کوڕی عەففانی ﷺ بینی داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، ئینجا لە دەفرەکە ئاوی کرد بە هەردوو دەستیدا و سێ جار دەستەکانی شۆرد، پاشان دەستی ڕاستی کرد بە ئاوەکەدا و (مشتێ ئاوی هەڵگرت و) ئاوی لە دەم و لووتی وەردا و فمی کردەوە، پاشان سێ جار ڕوخساری شۆرد، وە سێ جار هەردوو دەستی تا ئانیشکەکانی شۆرد، پاشان دەستی تەڕی هێنا بە سەریدا، دواتر سێ جار هەریەك لە پێیەکانی شۆرد، پاشان وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستنوێژی گرت بە وێنەی ئەم دەستنوێژەی من، وە فەرمووی: ((هەر کەس وەك ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژ بگرێ، پاشان دوو ڕکات نوێژ (ی سوننەت) بکات، هیچ شتێکی دونیایی نەیەت بە دڵیدا، (خوا) لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ)).**

## ٢٩- بابُ غَسْلِ الأعْقابِ

وَكَانَ ابن سِيرِينَ يَغْسِلُ مَوْضِعَ الخَاتَمِ إِذَا تَوَضَّأَ.

١٦٥- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ -وَكَانَ يَمُرُّ بِنَا وَالنَّاسُ يَتَوَضَّئُونَ مِنَ المِطْهَرَةِ- قَالَ: أَسْبِغُوا الوُضُوءَ، فَإِنَّ أَبَا القَاسِمِ ﷺ قَالَ: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ».

## ٢٩- باسی شۆردنی قاپارەکان (پاژنەپێیەکان)

ئیبن سیرین کاتێ دەستنوێژی بگرتایە، شوێن ئەنگوستیلەکەی دەشۆری (ئەنگوستیلەکەی دەجولاند، تا شوێنەکەی تەڕ بێ).

١٦٥- موحەممەدی کوڕی زیاد دەڵێ: گوێم لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بوو -بەلاماندا تێ پەڕی خەڵکی لە ئاوی دەفردا دەستنوێژیان دەگرت- وتی: بەجوانی و بەچاکی دەستنوێژ بگرن، چونکە بێگومان ئەبولقاسم ﷺ فەرموویەتی: ((سزای سەخت لە ئاگردا بۆ ئەو کەسەی پاژنەی پێی بەچاکی ناشوات)).

## ٣٠- باب غَسْلِ الرِّجْلَيْنِ فِي النَّعْلَيْنِ، وَلَا يَمْسَحُ عَلَى النَّعْلَيْنِ

١٦٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ، أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ:يا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا. قَالَ: وَمَا هِيَ يا ابن جُرَيْجٍ؟ قَالَ: رَأَيْتُكَ لَا تَمَسُّ مِنَ الأَرْكَانِ إِلَّا اليَمَانِيَيْنِ، وَرَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، وَرَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ، وَرَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَلَّ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الهِلَالَ، وَلَمْ تُهِلَّ أَنْتَ حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَمَّا الأَرْكَانُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمَسُّ إِلَّا اليَمَانِيَيْنِ، وَأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُ النَّعْلَ التِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا، وَأَمَّا الصُّفْرَةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْبُغُ بِهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا، وَأَمَّا الإِهْلَالُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٥١٤، ١٥٥٢، ١٦٠٩، ٢٨٦٥، ٥٨٥١، ١٥٥٤.

## ٣٠- باسی شۆردنی پێیەکان گەر نەعلی لەپێدا بوو، وە نابێ دەستی تەڕ بێنێ بەسەر نەعلەکاندا

١٦٦- عوبەیدی کوڕی جورەیج دەگێڕێتەوە کە بە عەبدوڵای کوڕی عومەری ﷺ وت: ئەی ئەبو عەبدوڕەحمان دەتبینم چوار شت دەکەیت کە نەمبینیوە کەسێك لە هاوەڵەکانت بیانکات؟ عەبدوڵاش وتی: ئەی ئیبنو جورەیج ئەو چوار شتە چین؟ ئیبنو جورەیج وتی: تۆ دەبینم لە چوار گۆشەکەی کەعبە تەنها دەست لە دوو گۆشە یەمانییەکە دەدەیت، وە دەتبینم نەعلی سیبتییە[1] لەپێ دەکەیت، وە دەتبینم بە ڕەنگی زەرد سەر و ڕیشت بۆیە دەکەی، وە دەتبینم ئەگەر لە مەککەدا بیت، خەڵکی کە مانگی (زیلحیجە)یان بینی دەنگیان بەرز دەکردەوە بە تەلبیە، بەڵام تۆ دەنگ بەرز ناکەیتەوە تا ڕۆژی تەڕوییە[2]، عەبدوڵا وتی: سەبارەت بە گۆشەکانی کەعبە چونکە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە تەنها دەستی لە دوو گۆشە یەمانییەکە دەدا، دەربارەی لەپێکردنی نەعلی سبتییەش، چونکە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ئەو نەعلەی لەپێ دەکرد و دەست نوێژی پێوە دەگرت کە مووی پێوە نییە، بۆیە منیش پێم خۆشە ئەو جۆرە نەعلە لەپێ بکەم، ڕەنگی زەردیش چونکە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە ڕەنگی زەرد سەر و ڕیشی ڕەنگ دەکرد، بۆیە پێم خۆشە بە ڕەنگی زەرد سەر و ڕیشم ڕەنگ بکەم، ئیحرامبەستنیش لەو ڕۆژەدا چونکە من نەمبینیوە پێغەمبەر ﷺ تەلبییە بکات، لەو کاتەدا نەبێ کە وشترەکەی هەڵدەستایەوە و دەکەوتە ڕێ (بۆ مینا کە ڕۆژی هەشتەمی زیلحیجەیە).

---

[1] نەعلێکە لە چەرم دروست کراوە و سافە و مووی پێوە نییە.

[2] کە ڕۆژی هەشتی مانگە بە ئیحرامبەستن و تەلبییەکردن.

## ٣١- بابُ التَّيَمُّنِ فِي الوُضُوءِ وَالْغَسْلِ

١٦٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لَهُنَّ فِي غَسْلِ ابنتِهِ: «ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الوُضُوءِ مِنْهَا»[1].

## ٣١- باسی پێشخستنی لای ڕاست لە دەستنوێژگرتن و خۆشۆردندا

**١٦٧- ئومو عەتییە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە كاتی شۆردنی زەینەبی كچیدا بە ئافرەتەكانی فەرموو: ((بەلای ڕاستی و بە ئەندامانی دەستنوێژی دەست بە شۆردنی بكەن)).**

١٦٨- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَشْعَثُ بْنُ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَطُهُورِهِ، فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ[2].

**١٦٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە بە ڕاست دەستپێكردنی لا خۆشەویست بوو لە نەعل لەپێكردن و قژداهێنان و دەستنوێژگرتن، وە لە هەموو كاروبارێكیدا (كە بۆ ڕێز بێت).**

---

[1] بڕوانە: ١٢٥٣، ١٢٥٤، ١٢٥٥، ١٢٥٦، ١٢٥٧، ١٢٥٨، ١٢٥٩، ١٢٦٠، ١٢٦١، ١٢٦٢، ١٢٦٣.

[2] بڕوانە: ٤٢٦، ٥٣٨٠، ٥٨٥٤، ٥٩٢٦.

## ٣٢- بابُ التِمَاسِ الوَضُوءِ إِذَا حَانَتِ الصَّلَاةُ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ: حَضَرَتِ الصُّبْحُ فَالْتُمِسَ المَاءُ، فَلَمْ يُوجَدْ، فَنَزَلَ التيمُّمُ.

١٦٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أنهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَحَانَتْ صَلَاةُ العَصْرِ، فَالْتَمَسَ النَّاسُ الوَضُوءَ فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِوَضُوءٍ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ذَلِكَ الإِنَاءِ يَدَهُ، وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّئُوا مِنْهُ. قَالَ: فَرَأَيْتُ المَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ، حَتَّى تَوَضَّئُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ[1].

## ٣٢- باسی گەڕان بە شوێن ئاوی دەستنوێژدا لە كاتێكدا نوێژ بووبێ

**عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: نوێژی بەیانی بووبوو، خەڵك گەڕان بۆ ئاو بەڵام دەستیان نەكەوت، ئیدی ئایەتی تەیەموم دابەزی.**

**١٦٩- ئەنەسی كوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: چاوم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو كاتی نوێژی عەسر بوو، خەڵكی بە شوێن ئاودا گەڕان بۆ دەستنوێژگرتن، بەڵام دەستیان نەكەوت، ئینجا ئاوی دەستنوێژ هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی خستە نێو ئەو دەفرەی (ئاوەكەی تێدا بوو)، وە فەرمانی كرد بە خەڵكەكە كە دەستنوێژی لێ بگرن، ئەنەس دەڵێ: دەمبینی ئاو لەژێر پەنجەكانیەوە هەڵدەقوڵا، هەتا هەموویان دەستنوێژیان گرت هەتا كۆتا كەسیان.**

---

[1] بڕوانە: ١٩٥، ٢٠٠، ٣٥٧٣، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥.

## ٣٣- بابُ الماءِ الذي يُغْسَلُ بِهِ شَعَرُ الإِنْسَانِ

وَكَانَ عَطَاءٌ لَا يَرى بِهِ بَأْسًا أَنْ يُتَّخَذَ مِنْهَا الخُيُوطُ وَالْحِبَالُ. وَسُؤْرِ الكِلَابِ وَمَمَرِّهَا فِي المَسْجِدِ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: إِذَا وَلَغَ فِي إِنَاءٍ لَيْسَ لَهُ وَضُوءٌ غَيْرُهُ يَتَوَضَّأُ بِهِ. وَقَالَ سُفْيَانُ: هذا الفِقْهُ بِعَيْنِهِ، يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ ﴿٦﴾ ﴾ المائدة، وهذا مَاءٌ، وَفِي النّفسِ مِنْهُ شَئٌ، يَتَوَضَّأُ بِهِ وَيتَيَمَّمُ.

## ٣٣- باسی ئەو ئاوەی مووی مرۆڤی پێ بشۆردرێت

**بەلای عەتائەوە هیچ خراپەیەکی تیا نییە مووی مرۆڤ دەزووی گوریسی لێ دروست بکرێ، وە باسی حوکمی پاشماوەی سەگ و ئەو شوێنەی سەگ پێیدا تێپەڕ دەبێ لە مزگەوتدا[١]. زوهری دەڵێ: ئەگەر سەگ دەمی خستە نێو دەفرێکەوە، خاوەنەکەی جگە لە ئاوی ئەو دەفرە ئاوی دەستنوێژی نەبوو، دەستنوێژی لێ بگرێ دروستە. سوفیان دەڵێ: ئا ئەمەیە تێگەیشتن و شارەزایی (لە قورئان). خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (جا ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت، ئەوە بە خۆڵ تەیەموم بکەن)، ئەوەی زوهری باسی دەکات ئاو هەیە، بەڵام لەم بۆچوونەشدا گومانێك هەیە (چونکە ڕوون نییە کە خودا ئاوی پاکی مەبەستە، یان هەموو جۆرە ئاوێك)، بۆیە دەستنوێژ دەگرێت بە ئاوەکە، تەیەمومیش دەکات لەگەڵیدا[٢].**

١٧٠- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنِ ابن سِيرِينَ قَالَ: قُلْتُ لِعَبِيدَةَ: عِنْدَنَا مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّ ﷺ أَصَبْنَاهُ مِنْ قِبَلِ أَنسٍ أَوْ مِنْ قِبَلِ أَهْلِ أَنَسٍ. فَقَالَ: لأَنْ تَكُونَ عِنْدِي شَعَرَةٌ مِنْهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا[٣].

---

[١] وا دیارە ئیمام بوخاری پاشماوەی سەگ یان شوێنەواری تێپەڕینی لە مزگەوتدا بەلاوە پاکن.

[٢] تەیەموم دەکات، چونکە ئەو ئاوەی دەستنوێژی پێ گرتووە، زانایان یەکدەنگ نین لەسەر دروستی دەستنوێژپێگرتنی.

[٣] بڕوانە: ١٧١.

١٧٠- ئیبنو سیرین دەڵێ: بە عەبیدەم وت: چەند تاڵەموویەکی پێغەمبەرمان ﷺ لایە لە ئەنەسەوە دەستمان کەوتووە، یان لە کەسوکاری ئەنەسەوە دەستمان کەوتووە، ئەویش وتی: من ئەگەر یەك تاڵەمووی پێغەمبەرم ﷺ لەلا بێت لە دونیا و هەرچی تێیدایە لام خۆشەویستترە.

١٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادٌ، عَنِ ابن عَوْنٍ، عَنِ ابن سِيرِينَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا حَلَقَ رَأْسَهُ، كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَوَّلَ مَنْ أَخَذَ مِنْ شَعَرِهِ[1].

١٧١- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەری تاشی، ئەبو تەلحە یەکەم کەس بوو کە مووی پێغەمبەری ﷺ هەڵگرت (بۆ پیرۆزی لای خۆی هێڵایەوە).

## ٣٤- بَابٌ: إِذَا شَرِبَ الكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعًا

١٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا شَرِبَ الكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ؛ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعًا».

## ٣٤- باسێک: ئەگەر سەگ لە دەفری کەسێکتاندا ئاوی خواردەوە ئەوە با حەوت جار بیشوات

١٧٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر سەگ لە دەفری یەکێك لە ئێوەدا ئاوی خواردەوە، ئەوە با حەوت جار بیشوات)).

---

[1] بڕوانە: ١٧٠.

١٧٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاق، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ دِينَارٍ، سَمِعْتُ أَبِي، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَن أَبِي هُرَيرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَن رَجُلًا رَأَى كَلْبًا يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ العَطَشِ، فَأَخَذَ الرَّجُلُ خُفَّهُ، فَجَعَلَ يَغْرِفُ لَهُ بِهِ حَتَّى أَرْوَاهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَأَدْخَلَهُ الجَنَّةَ»[1].

**١٧٣- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پیاوێك سەگێکی بینی، لە تینووواندا خۆڵی دەخوارد، ئینجا پیاوەکە خوفەکەی هەڵگرت بەو خوفە ئاوی بۆ هێنا و پێی دا تا تێرئاوی کرد، ئیدی خواش سوپاسی کرد، جا بەوهۆیەوە بردیە بەهەشتەوە)).**

١٧٤- وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبٍ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابن شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَتِ الكِلَابُ تَبُولُ وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ فِي المَسْجِدِ فِي زَمَانِ رَسُولِ الله ﷺ، فَلَمْ يَكُونُوا يَرُشُّونَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ.

**١٧٤- حەمزەی کوڕی عەبدوڵا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مزگەوتدا سەگ میزی دەکرد و دەهاتن و دەچوون، هاوەڵان ئاویان نەدەپرژاند لە هیچ یەك لەو شوێنانە.**

١٧٥- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ ابن أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ المُعَلَّمَ فَقَتَلَ فَكُلْ، وَإِذَا أَكَلَ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَى نَفْسِهِ». قُلْتُ: أُرْسِلُ كَلْبِي فَأَجِدُ مَعَهُ كَلْبًا آخَرَ؟ قَالَ: «فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى كَلْبٍ آخَرَ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٣٦٣، ٢٤٦٦، ٦٠٠٩.

[2] بڕوانە: ٢٠٥٤، ٥٤٧٥، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، ٥٤٨٧، ٧٣٩٧.

**١٧٥- عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد (دەربارەی ڕاوکردن) فەرمووی: ((ئەگەر سەگێکی فێرمڕاوکراوت بەرەڵا کردە نێچیرێك و نێچیرەکەی کوشت، ئەوە گۆشتەکەی بخۆ، بەڵام ئەگەر لە نێچیرەکەی خوارد ئەوە گۆشتەکەی مەخۆ، چونکە بەڕاستی نێچیرەکەی بۆ خۆی گرتووە))، عەدی دەڵێ وتم: من سەگەکەم بەرەڵا دەکەم، دواتر سەگێکی دیکەی لەگەڵدا دەبینم؟ فەرمووی: ((ئەوە نێچرەکە مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لە سەگەکەی خۆت هێناوە، وە ناوی خوات لەسەر سەگێکی دیکە نەهێناوە)).**

## ٣٥- بابُ مَنْ لَمْ يَرَ الوُضُوءَ إِلَّا مِنَ المَخْرَجَيْنِ، مِنَ القُبُلِ وَالدُّبُرِ، لِقَوْلِهِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ ⁦٦⁩﴾ المائدة

وَقَالَ عَطَاءٌ: فِيمَنْ يَخْرُجُ مِنْ دُبُرِهِ الدُّودُ، أَوْ مِنْ ذَكَرِهِ نَحْوُ القَمْلَةِ يُعِيدُ الوُضُوءَ. وَقَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: إِذَا ضَحِكَ فِي الصَّلَاةِ أَعَادَ الصَّلَاةَ، وَلَمْ يُعِدِ الوُضُوءَ. وَقَالَ الحَسَنُ: إِنْ أَخَذَ مِنْ شَعَرِهِ وَأَظْفَارِهِ أَوْ خَلَعَ خُفَّيْهِ؛ فَلَا وُضُوءَ عَلَيْهِ . وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لَا وُضُوءَ إِلَّا مِنْ حَدَثٍ. وَيُذْكَرُ عَنْ جَابِرٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ الرِّقَاعِ، فَرُمِيَ رَجُلٌ بِسَهْمٍ، فَنَزَفَهُ الدَّمُ، فَرَكَعَ وَسَجَدَ، وَمَضَى فِي صَلَاتِهِ. وَقَالَ الحَسَنُ: مَا زَالَ المُسْلِمُونَ يُصَلُّونَ فِي جِرَاحَاتِهِمْ. وَقَالَ طَاوُسٌ وَمُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ وَعَطَاءٌ وَأَهْلُ الحِجَازِ: لَيْسَ فِي الدَّمِ وُضُوءٌ. وَعَصَرَ ابن عُمَرَ بَثْرَةً فَخَرَجَ مِنْهَا الدَّمُ، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. وَبَزَقَ ابن أَبِي أَوْفَى دَمًا فَمَضَى فِي صَلَاتِهِ. وَقَالَ ابن عُمَرَ وَالْحَسَنُ، فِيمَنْ يَحْتَجِمُ: لَيْسَ عَلَيْهِ إِلَّا غَسْلُ مَحَاجِمِهِ.

## ٣٥- باسی ئەوەی کە ڕای وایە دەستنوێژگرتن واجب نابێ بە دەرچوونی هیچ شتێک، تەنها بەوە نەبێ لە پێش و پاشەوە دەردەچێ، بە بەڵگەی[1] ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: (یان کەسێکتان لە سەرئاوەوە هاتنەوە)

عەتا دەڵێ: دەربارەی کەسێك کە لە پاشیەوە کرم بێتە دەرەوە، یان شتێکی وەك ئەسپێ لە داوێنیەوە بێتە دەرەوە، دەبێ دەستنوێژەکەی بگرێتەوە، وە جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئەگەر لەنێو نوێژدا پێ بکەنێت دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە، بەڵام دەستنوێژەکەی نەگرێتەوە، وە حەسەن دەڵێ: ئەگەر لە قژی سەری کورت بکاتەوە، یان نینۆکی بکات یاخود خوفەکانی داکەنێت، دەستنوێژگرتنەوەی لەسەر نییە. وە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: دەستنوێژ پێویست نییە مەگەر بە هۆی دەستنوێژشکاندنەوە نەبێ، وە لە جابیرەوە گێڕدراوەتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (ذات الرقاع)دا بوو، جا پیاوێك تیرێکی لێ درا بەهۆیەوە خوێنی لێ ڕۆیشت، جا کڕنووش و سوژدەی دەبرد بەردەوام بوو لە نوێژەکەیدا، وە حەسەن دەڵێ: بەردەوام موسوڵمانان بە برین و خوێنەوە نوێژیان دەکرد، وە تاوس و موحەممەدی کوڕی عەلی و عەتاو و زانایانی حیجاز دەڵێن: خوێنهاتن لە لەش دەستنوێژگرتنەوەی ناوێ، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ زیپکەیەکی گوشی خوێنی لێ هات و دەستنوێژی نەگرتەوە. ئیبنو ئەبو ئەوفا تفی کرد هەر خوێن بوو، کەچی هەر بەردەوام بوو لە نوێژەکەیدا. وە عەبدوڵای کوڕی عومەر و حەسەن ﷺ دەربارەی کەسێك کە کەڵەشاخ بگرێ دەڵێن: تەنها شۆردنی ئەو شوێنانەی لەسەرە کە کەڵەشاخەکەی لێ گیراوە.

---

[1] لە گێڕانەوەیەکی دیکەی صەحیحی بوخاریدا بەم جۆرە هاتووە: (وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى)، واتە: وە باسی ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند.

١٧٦- حَدَّثَنَا آدَمُ بْن أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الَمقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ((لَا يَزَالُ العَبْدُ فِي صلَاةٍ مَا كَانَ فِي المَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ، مَا لَمْ يُحْدِثْ)). فَقَالَ رَجُلٌ أَعْجَمِيٌّ: مَا الَحدَثُ يا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: الصَّوْتُ. يَعْنِي: الضَّرْطَةَ.

**١٧٦- سەعیدی مەقبوری لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەردەوام بەندەی موسوڵمان لە نوێژدایە هەتا لە مزگەوتدا بێت و چاوەڕوانی نوێژ بکات، بە مەرجێ دەستنوێژی نەشکێت)). پیاوێك کە عەرەب نەبوو بە ئەبو هوڕەیرەی وت: ئەی ئەبو هوڕەیرە دەستنوێژشکان چییە؟ ئەبو هوڕەیرەش وتی: دەنگلێوەهاتنە، مەبەستی تڕلێدان بوو.**

١٧٧- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ،عَنْ عَمِّهِ، عَنِ النَّبيِّ، قَالَ: «لَا يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا»[1].

**١٧٧- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (((نوێژکەر) نوێژەکەی نەبڕێت و وازی لێ نەهێنێ، هەتا گوێی لە دەنگێك دەبێ، یان هەست بە بۆنێك دەکات)).**

١٧٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُنْذِرٍ أَبِي يَعْلَى الثَّوْرِيِّ، عَنْ مُحَمَدٍ ابن الَحنَفِيَّةِ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً، فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فأَمَرْتُ المِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: «فِيهِ الوُضُوءُ». وَرَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٣٧.

[2] بڕوانە: ١٣٢.

**١٧٨- عەلی ﷺ دەڵێ: من پیاوێك بووم مەزیم[1] زۆر بوو، وە شەرمم كرد كە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكەم، بۆیە فەرمانم كرد بە میقدادی كوڕی ئەسوەد ئەویش پرسیاری لێ كرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لەو حاڵەتەدا دەستنوێژگرتن پێویستە)). وە شوعبە ئەم فەرموودەیەی لە ئەعمەشەوە گێڕاوەتەوە.**

١٧٩- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَأَلَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِذَا جَامَعَ فَلَمْ يُمْنِ؟ قَالَ عُثْمَانُ: يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، وَيَغْسِلُ ذَكَرَهُ. قَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ عَلِيًّا، وَالزُّبَيْرَ، وَطَلْحَةَ، وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ، فَأَمَرُوهُ بِذَلِكَ[2].

**١٧٩- زەیدی كوڕی خالید دەگێڕێتەوە كە ئەو پرسیاری لە عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ كرد، (دەڵێ:) وتم: پێم بڵێ ئەگەر پیاو لەگەڵ خێزانیدا جووت بوو، بەڵام ئاوی نەهاتەوە (حوكمی چییە)؟ عوسمان وتی: دەستنوێژ دەگرێ وەك دەستنوێژگرتن بۆ نوێژ و داوێنی دەشوات. عوسمان وتی: ئەمەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە، (زەید دەڵێ:) جا پرسیارم لە عەلی و زوبەیر و تەلحە و ئوبەی كوڕی كەعب ﷺ كرد، هەموویان فەرمانیان پێ كرد بەوەی كە عوسمان وتی، (دەستنوێژ بگرێ و داوێنی بشوات)[3].**

---

[1] مەزی ئاوێكی سپی ڕوونە لە كاتی ئارەزووی زۆردا، یان دەستبازی و یاریكردنی پیاو لەگەڵ خێزانیدا لە داوێنی پیاو دێتە خوارێ.

[2] بروانە: ٢٩٢.

[3] ئەم حوكمە نەسخ بۆتەوە پێویستە خۆی بشوات ئاوی بێتەوە، یان نەیەتەوە. بروانە: إرشاد الساري: ١/ ٣٩٨.

١٨٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: أَخْبَرَنَا النَّضْرُ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ ذَكْوَانَ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيد الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَرْسَلَ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَجَاءَ وَرَأْسهُ يَقْطُرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَعَلَّنَا أَعْجَلْنَاكَ؟». فَقَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُعْجِلْتَ أَوْ قُحِطْتَ فَعَلَيْكَ الوُضُوءُ». تَابَعَهُ وَهْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ . قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَلَمْ يَقُلْ غُنْدَرٌ وَيَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ: «الْوُضُوءُ».

**١٨٠- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوای پیاوێکی ئەنصارپیدا، پیاوەکەش هات و سەری ئاوی لێ دەتکا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لەوانەیە پەلەمان پێ کردبی؟)). پیاوەکەش وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر (لە کاتی جووتبوونتدا) پەلەت لێ کرا، یان ئاوت نەهاتەوە، ئەوە تەنها دەستنوێژگرتنت لەسەرە)). وەهب هەمان فەرموودەی لە شوعبەوە گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی فەرموودەکەی نەزری کوڕی شومەیل دەکات، ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: غوندەر و یەحیا کە ئەم فەرموودەیان لە شوعبەوە گێڕاوەتەوە، باسی دەستنوێژگرتنیان نەکردووە، (بەڵکوو لە گێڕانەوەکەیاندا دەفەرمووێ: ((خۆشۆردنت لەسەر نییە[1])).**

## ٣٦- بابُ الرَّجُلِ يُوَضِّئُ صَاحِبَهُ

١٨١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابن عَبَّاسٍ- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا أَفَاضَ مِنْ

[1] بروانە: إرشاد الساري: ١/٤٠٠.

عَرَفَةَ عَدَلَ إِلَى الشِّعْبِ، فَقَضَى حَاجَتَهُ. قَالَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ: فَجَعَلْتُ أَصُبُّ عَلَيهِ وَيَتَوَضَّأُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أتصَلِّي؟ فَقَالَ: «الْمُصَلَّى أَمَامَكَ»[1].

## ٣٦- باسی پیاوێ ئاوی دەستنوێژ بکات بە دەستی هاوڕێکەیدا

**١٨١- کوڕەیب دەڵێ: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە گەڕایەوە لای دا بۆ شیوەکە و دەستی بە ئاو گەیاند، ئوسامەی کوڕی زەید وتی: جا من ئاوم دەکرد بە دەستیدا ﷺ ئەو دەستنوێژی دەگرت، وە عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ دەکەیت؟ فەرمووی: ((شوێنی نوێژ لە پێشتەوەیە)).**

١٨٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبدُ الوَهَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعْدُ بْنُ إبْرَاهِيمَ، أَنَّ نَافعَ بْنَ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ أخبَرَهُ، أنهُ سَمِعَ عُرْوَةَ بْنَ الْمغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ يُحَدِّثُ، عَنِ الْمغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، وَأَنَّهُ ذَهَبَ لِحاجَةٍ لَهُ، وَأَنَّ مُغِيرَةَ جَعَلَ يَصُبُّ الَماءَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَمَسَحَ عَلَى الْخفَّيْنِ[2].

**١٨٢- موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت و دەستی بە ئاو گەیاند، (کە هاتەوە) موغیرە ئاوی دەکرد بە دەستیدا، ئەویش دەستنوێژی دەگرت، ئینجا ڕوخسار و هەردوو باڵی شۆرد، دەستی تەڕی هێنا بە سەریدا، وە دەستی تەڕی هێنا بەسەر خوفەکانیدا.**

---

[1] بڕوانە: ١٣٩.

[2] بڕوانە: ٢٠٣، ٢٠٦، ٣٦٣، ٣٨٨، ٢٩١٨، ٤٤٢١، ٥٧٩٨، ٥٧٩٩.

## ٣٧- بابُ قِرَاءَةِ القُرْآنِ بَعْدَ الحَدَثِ وَغَيْرِهِ

وَقَالَ مَنْصُورٌ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ: لَا بَأْسَ بِالْقِرَاءَةِ فِي الحَمَّامِ، وَبِكَتْبِ الرِّسَالَةِ على غَيْرِ وُضُوءٍ. وَقَالَ حَمَّادٌ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ: إِنْ كَانَ عَلَيْهِمْ إِزَارٌ فَسَلِّمْ، وَإِلَّا فَلَا تُسَلِّمْ.

## ٣٧- باسی قوڕئانخوێندن لەدوای دەستنوێژشکان و شتی دیکە

**مەنصور لە ئیبڕاهیمەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: قوڕئانخوێندن لە گەرماودا هیچ خراپەیەکی تێدا نییە و قەیناکات، وە نامەنووسین (با ناوی خواشی تێدا بێ) بەبێدەستنوێژی قەیناکات و گوناه نییە، وە حەماد لە ئیبڕاهیمەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەگەر لە گەرماودا خەڵکەکە پشتەماڵیان پێوە بوو سەلامیان لێ بکە، ئەگەرنا سەلامیان لێ مەکە.**

١٨٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيل قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابن عَبَّاسٍ- أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَهُ بَاتَ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، -وَهِيَ خَالَتُهُ- فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ، أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ العَشْرَ الآيَاتِ الخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلى شَنٍّ مُعَلَقَةٍ، فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي اليُمْنَى يَفْتِلُهَا، فَصَلَّى رَكعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضطَجَعَ، حَتَّى أَتَاهُ المُؤَذِّنُ، فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ[١].

---

[١] بڕوانە: ١١٧.

١٨٣- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە شەوێك لە ماڵی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ مایەوە -کە پووری عەبدوڵا بوو- دەڵێ: جا من ڕاکشام و لەسەر باری پانی ڕاخەرەکە پێغەمبەری خوا ﷺ و خێزانی ڕاکشان، وە سەریان خستە سەر سەرینەکە لەسەر باری درێژی، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت تا نیوەی شەو، یان کەمێ پێش یان دوای نیوەی شەو، ئینجا لەخەو هەستا و دانیشت و دەستی هێنا بە ڕوخساریدا، خەوی لە چاوەکانی دەزڕاند، پاشان دە ئایەتەکەی کۆتایی سووڕەتی ئالی عیمرانی خوێند، پاشان هەستا و ڕۆیشت بۆ لای جەوەنەیەکی هەڵواسراو (ئاوی تیا بوو)، ئینجا دەستنوێژێکی جوانی گرت لە ئاوی ئەو جەوەنەیە، پاشان هەستاو دەستی کرد بە نوێژکردن، عەبدوڵای کوڕی عەباس دەڵێ: منیش هەستام وەك ئەوم کرد، پاشان لە تەنیشتیدا وەستام (و نوێژم دابەست)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاستی نایە سەر سەرم و گوێی ڕاستی گرتم و بایدا (و هێنایمە لای ڕاستیەوە)[1]، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکاتی دیکەی کرد، پاشان دووانی دیکەی کرد، ئینجا دوو ڕکاتی دیکەی کرد، پاشان دوو ڕکاتی دیکەی کرد، پاشان دوو ڕکاتی دیکەی کرد، ئینجا یەك ڕکاتی ویتری کرد، پاشان ڕاکشا هەتا بانگبێژەکە هات بۆ خزمەتی (ئاگاداری کرد)، جا هەستا و دوو ڕکات نوێژی (سوننەتی) سووکەڵەی کرد، ئینجا لە ماڵ دەرچوو بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی کرد (بە پێشنوێژ بۆ موسوڵمانان).

---

[1] ئەم بەشەی فەرموودەکە لە فەرموودەی ژمارە (١١٧) دا هاتووە.

## ٣٨- بابُ مَنْ لمْ يَتَوَضَّأْ إلَّا مِنَ الغَشيِ المُثقِلِ

١٨٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيل قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنِ امْرَأَتِهِ فَاطِمَةَ، عَنْ جَدَّتِهَا أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَإِذَا النَّاسُ قِيَامٌ يُصَلُّونَ، وإِذَا هِيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي، فَقُلْتُ: مَا لِلنَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ بِيَدِهَا نَحْوَ السَّمَاءِ وَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللهِ! فَقُلْتُ: آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ: أَيْ نَعَمْ. فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلاَّنِي الغَشْيُ، وَجَعَلْتُ أَصُبُّ فَوْقَ رَأْسِي مَاءً، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ كُنْتُ لَمْ أَرَهُ إِلَّا قَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هذا حَتَّى الجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي القُبُورِ مِثْلَ -أَوْ- قَرِيب مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ- لَا أَدْرِي أَيَ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ- يُؤْتَى أَحَدُكُمْ فَيُقَالُ: مَا عِلْمُكَ بهذا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا المُؤْمِنُ- أَوِ المُوقِنُ. لَا أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ- فَيَقُولُ: هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدى، فَأَجَبْنَا وَآمَنَّا وَاتَّبَعْنَا. فَيُقَالُ: نَمْ صَالِحًا، فَقَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُؤْمِنًا. وَأَمَّا المُنَافِقُ -أَوِ المُرْتَابُ. لَا أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ- فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ»[1].

## ٣٨- باسی ئەوەی دەستنوێژ نەگرێت (بە لەهۆشخۆچوون) مەگەر لە هۆشخۆچوونەکە زۆر و قورس بێت

**١٨٤- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشەی ﵄ -خێزانی پێغەمبەر ﷺ- لە کاتێکدا خۆر گیرابوو، جا دەبینم خەڵکی وەستاون نوێژ دەکەن، عائیشەش وەستاوە و نوێژ دەکات، وتم: ئەوە خەڵکی چیانە (شڵەژاون)؟ عائیشەش بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان (واتە: خۆر گیراوە)، وە وتی: سُبْحَانَ اللهِ، وتم: ئەم خۆرگیرانە نیشانەیەکە (خوا بەندەکانی پێ دەترسێنێ)، ئەویش بەسەر ئاماژەی**

[1] بڕوانە: ٨٦.

کرد: بەڵێ وایە، ئیدی منیش نوێژم دابەست (نوێژەکە زۆری پێ چوو)، وام لێ هات نزیك بوو لەهۆش خۆم بچم[1]، بۆیە دەستم کرد بە ئاوکردن بەسەر دەموچاومدا (دوای تەواوبوونی نوێژەکە)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکە بۆیەوە، سوپاس و ستاییشی خوای گەورەی کرد، پاشان فەرمووی: ((ئەوەی کە نیشانم نەدرابوو لەم شوێنەدا کە ڕاوەستاوم نیشانم درا و بینیم، هەتا بەهەشت و دۆزەخیش، وە سوێند بە خوا نیگام بۆ هات بێگومان ئێوە لە گۆڕەکانتاندا تاقی دەکرێنەوە وەك -یان نزیك لە- تاقیکردنەوەی دەجال -نازانم ئەسماو کام لەو وشانەی وت-، دێنە لای کەسێکتان و پێی دەوترێ: (بەوکەسەی خراوەتە گۆڕەوە) چ زانیارییەکت هەیە دەربارەی ئەو پیاوە (کە موحەممەدە ﷺ)؟ جا ئەوەی کە باوەڕدارە - یان خاوەن دڵنیایی بێت، نازانم ئەسماو کام لەو وشانەی وت- جا دەڵێ: ئەو پیاوە موحەممەدە و پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئایینی ڕۆشن و ڕێنمایی بۆ هێنابووین، ئێمەش وەڵاممان دایەوە و باوەڕمان پێ هێنا و شوێنی کەوتین، جا پێی دەوترێت: بخەوە بەخۆشی، بێگومان ئێمە دەمانزانی کە تۆ باوەڕداری، بەڵام دوڕووو -یان دوودڵ و بەگومان، نازانم ئەسماو کام لەو وشانەی وت- ئەوە دەڵێ: نازانم گوێم لێ بوو، خەڵکی شتێکیان دەوت، منیش دەموت.

## ٣٩- بابُ مَسْحِ الرَّأْسِ كُلِّهِ لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ ۝٦﴾ المائدة

وَقَالَ ابن المُسَيَّب: المَرْأَةُ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ تَمْسَحُ على رَأسِهَا. وَسئِلَ مَالِكٌ: أَيُجْزِئُ أَنْ يَمْسَحَ بَعْضَ الرَّأْسِ؟ فَاحْتَجَّ بِحَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زيدٍ.

---

[1] یان سووکە لەهۆشچوونێکم بەسەردا هات، بەڵام لەهۆشچوونی قورس و تەواو نەبوو، چونکە ئاگای لە خۆی ماوە. إرشاد الساري: ١/٤٠٦.

١٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عن عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَن رَجُلًا قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بنِ زَيْدٍ -وَهُوَ جَدُّ عَمْرِو بنِ يَحْيَى-: أَتَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ: نَعَمْ. فَدَعَا بِمَاءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ، فَغَسَلَ يَدَهُ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرتَينِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى الْمَكَانِ الذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيهِ[١].

## ٣٩- باسی دەستی تەڕ هێنان بە هەموو سەردا بە بەڵگەی ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە دەستی تەڕ بێنن بە سەرتاندا)

**سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: ئافرەتیش وەك پیاو وایە، دەستی تەڕ دێنێ بە سەریدا. وە پرسیار لە ئیمام مالیك کرا: ئایا دروستە بەشێکی سەر دەستی تەڕی پێدا بهێنرێ؟ ئیمام مالیك لە وەڵامدا فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی زەیدی کردە بەڵگە و خوێندیەوە[٢].**

**١٨٥- عەمری کوڕی یەحیای مازینی لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: کە پیاوێك -کە باپیرەی عەمری کوڕی یەحیا بوو- بە عەبدوڵای کوڕی زەیدی وت: ئایا دەتوانی نیشانم بدەیت کە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەستنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵای کوڕی زەیدیش وتی: بەڵێ دەتوانم، وتی: جا داوای ئاوی کرد (بۆیان هێنا)، وە ئاوی کرد بە هەردوو دەستیدا و دوو جار دەستی شۆرد، پاشان سێ جار ئاوی لە دەم و لووتی وەردا و فمی کردەوە، پاشان سێ جار ڕوخساری شۆرد، پاشان دوو**

---

[١] ١٨٦، ١٩١، ١٩٢، ١٩٧، ١٩٩.

[٢] کەوا دەگەیەنێ کە دەبێ هەموو سەر مەسح بکرێ، ئەو فەرموودە بەدوای ئەو وەڵامەدا هاتووە بە ژمارە: ١٨٥.

جار هەردوو دەستی تا هەردوو ئانیشکی شۆرد، پاشان هەردوو دەستی بەتەڕی هێنا بە سەریدا، لە پێشی سەریەوە دەستی پێ کرد و هەردووکیانی برد بۆ پشتی سەری، پاشان هەردوو دەستی هێنایەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە دەستی پێ کردبوو، پاشان هەردوو قاچی شۆرد.

## ٤٠- بابُ غَسْلِ الرِّجْلَيْنِ إِلَى الكَعْبَيْنِ

١٨٦- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَبِيهِ، شَهِدْتُ عَمْرَو بْنَ أَبِي حَسَنٍ سَأَلَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ، عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ، فَتَوَضَّأَ لَهُمْ وُضُوءَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَكْفَأَ عَلَى يَدِهِ مِنَ التَّوْرِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي التَّوْرِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثَ غَرَفَاتٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَمَسَحَ رَأْسَهُ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ مَرَّةً وَاحِدَةً، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الكَعْبَيْنِ[1].

## ٤٠- باسی شۆردنی هەردوو پێیەکان تا هەردوو قاپارەکان (گوێزینگ)

١٨٦- عەمری کوڕی ئەبو حەسەن دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ کرد دەربارەی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر ﷺ، عەبدوڵاش داوای دەفرێ ئاوی کرد، ئینجا دەستنوێژی گرت بەبەرچاویانەوە وەك دەستنوێژی پێغەمبەر ﷺ، لە دەفرەکە ئاوی کرد بە دەستیدا و سێ جار هەردوو دەستی شۆرد، پاشان دەستی خستە دەفرەکە و بەسێ مشت ئاو سێ جار ئاوی لە دەم

[1] بڕوانە: ١٨٥.

و لووتی وەردا و فمی كردەوە، پاشان دەستی كردەوە بە دەفرەكەدا و سێ جار ڕوخساری شۆرد، پاشان دوو جار هەردوو دەستی شۆرد تا ئانیشكەكانی، پاشان دەستی كردەوە بەنێو دەفرەكەدا و دەستی تەڕی هێنا بە سەریدا، جا بەیەك جار هەردوو دەستی هێنا بۆ پێشی سەری و بردیەوە بۆ پشتەوە، پاشان هەردوو پێی شۆرد تا قاپارەكانی.

## ٤١- بابُ اسْتِعْمَالِ فَضْلِ وَضُوءِ النَّاسِ

وَأَمَرَ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ أَهْلَهُ أَنْ يَتَوَضَّئُوا بِفَضْلِ سِوَاكِهِ.

١٨٧- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا الحَكَمُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جُحَيْفَةَ يَقُول: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْهَاجِرَةِ، فَأُتِيَ بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَأْخُذُونَ مِنْ فَضْلِ وَضُوئِهِ فَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ، فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ[1].

## ٤١- باسی بەكارهێنانی پاشماوەی ئەو ئاوەی لە دەستنوێژگرتنی خەڵك ماوەتەوە

جەریری كوڕی عەبدوڵا ﷺ فەرمانی كرد بە ماڵ و منداڵەكانی كە دەستنوێژ بگرن بەو ئاوەی كە سیواكەكەی پێ شۆردووە.

١٨٧- ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: لە گەرمای نیوەڕۆدا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، ئینجا ئاوی دەستنوێژیان بۆ هێنا و دەستنوێژی گرت، جا خەڵكی

[1] بڕوانە: ٣٧٦، ٤٩٥، ٤٩٩، ٥٠١، ٦٣٣، ٦٣٤، ٣٥٥٣، ٣٥٦٦، ٥٧٨٦، ٥٨٥٩.

**پاشماوەی ئاوی دەستنوێژەکەیان دەبرد و دەیانسوی لە دەموچاو و دەستیان (بۆ تەبەڕوك)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد (بەکورتکراوەیی)، هەروەها دوو ڕکات نوێژی عەسریشی کرد و نێزەیەك[١] لە پێشیەوە بوو (داچەقێنرابوو تا خەڵك نەڕۆن بەبەردەمیدا).**

١٨٨- وَقَالَ أَبُو مُوسَى: دَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ، وَمَجَّ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُمَا: «اشْرَبَا مِنْهُ، وَأَفْرِغَا عَلَى وُجُوهِكُمَا وَنُحُورِكُمَا»[٢].

**١٨٨- وە ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای دەفرێکی کرد کە ئاوی تێدا بوو، ئینجا هەردوو دەست و ڕوخساری لێ شۆرد، وە ئاوی دەمی کردەوە دەفرەکە، پاشان بە ئەبو مووسا و بیلالی فەرموو: ((هەردووکتان لێی بخۆنەوە و بیکەن بە دەموچاو و سنگتاندا)).**

١٨٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ. قَالَ: وَهُوَ الذِي مَجَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي وَجْهِهِ، وَهْوَ غُلَامٌ مِنْ بِئْرِهِمْ. وَقَالَ عُرْوَةُ، عَنِ المِسْوَرِ وَغَيْرِهِ، يُصَدِّقُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ: وَإِذَا تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ على وَضُوئِهِ[٣].

**١٨٩- ئیبنو شیهاب دەڵێ: مەحموودی کوڕی ڕەبیع بۆی گێڕامەوە وتی: ئەو بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی کردە دەمی لە ئاوی بیرەکەیان و پرژاندی بە دەموچاویدا، لە**

---

[١] یان نەقیزە کە داردەستێکە بزمارێك بە خواریەوەیە. ئەلمونجید بە کوردی: ٤٦٣/٣.

[٢] بڕوانە: ١٩٦، ٤٣٢٨.

[٣] بڕوانە: ٧٧.

**کاتێکدا کە منداڵێکی (پێنج ساڵان) بوو. وە عوروە لە میسوەر و خەڵکانی دیکەوە دەیگێڕێتەوە، هەر یەکەیان وتەی هاوڕێکەی پشت ڕاست دەکاتەوە: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی بگرتایە نزیك بوو ببێتە شەڕیان لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی پێغەمبەر ﷺ (کە بۆ تەبەڕوك دەیانهێنا بەدەموچاو و سنگ و بەرۆکیاندا).**

## ٤٢- بابٌ

١٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْن إسماعيل، عَنِ الجَعْدِ قَالَ: سَمِعْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ يَقُولُ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يا رسول الله، إِنَّ ابن أُخْتِي وَجِعٌ. فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلِ زِرِّ الحَجَلَةِ[1].

## ٤٢- باسێک

**١٩٠- سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: پوورم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم خوشکەزایەم نەخۆشە و ئازاری هەیە، پێغەمبەریش ﷺ دەستی پیرۆزی هێنا بە سەرمدا و دوعای خێری بۆ کردم، پاشان دەستنوێژی گرت و لە ئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، پاشان لە پشتیەوە وەستام و سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد لە نێوان شانەکانیدا، وەك هێلکەی کەو وابوو.**

[1] بڕوانە: ٣٥٤٠، ٣٥٤١، ٥٦٧٠، ٦٣٥٢.

## ٤٣- بابُ مَنْ تمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ غَرْفَةٍ وَاحِدَةٍ

١٩١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّهُ أَفْرَغَ مِنَ الإِنَاءِ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ غَسَلَ -أَوْ مَضْمَضَ- وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفَّةٍ وَاحِدَةٍ، فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثًا، فَغَسَلَ يَدَيْهِ الَى الِمرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ مَا أَقْبَلَ وَمَا أَدْبَرَ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا وُضوءُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

## ٤٣- باسی ئەوەی ئاوی لە دەم و لووتی وەردا بەیەک مشت

**١٩١- عەمری کوڕی یەحیا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ لە دەفرێك ئاوی کرد بە هەردوو دەستیدا و شۆردنی، پاشان دەمی شۆرد - یان ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا- بە یەك لوێچ، سێ جار ئەم ئاو لە دەم و لووت ڕادانەی کرد، جا دەستەکانی تا ئانیشکەکانی دوو جار دوو جار شۆرد، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بە سەریدا پێش و دواوەی سەری مەسح کرد، هەردوو قاچی تا قاپارەی شۆرد، پاشان وتی: دەستنوێژگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بوو.**

## ٤٤- بابُ مَسْحِ الرَّأْسِ مَرَّةً واحدة

١٩٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: شَهِدْتُ عَمْرَو بْنَ أَبِي حَسَنٍ، سَأَلَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ، فَتَوَضَّأَ لَهُمْ، فَكَفَأَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثًا بِثَلَاثِ غَرَفَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ

---

[1] بڕوانە: ١٨٥.

ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ بِهِمَا، ثمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ.ثم قَالَ: وَحَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: مَسَحَ رَأْسَهُ مَرَّةً[1].

## ٤٤- باسی یەک جار دەستی تەڕهێنان بە سەردا

**١٩٢- عەمری کوڕی یەحیا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەمری کوڕی حەسەنم بینی پرسیاری لە عەبدوڵای کوڕی زەیدی کرد دەربارەی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر ﷺ، عەبدوڵاش داوای دەفرێ ئاوی کرد (بۆیان هێنا)، جا دەستنوێژی گرت بۆیان (بە ئاوی دەفرەکە)، ئاوی کرد بە هەردوو دەستیدا و سێ جار هەردوو دەستی شۆرد، پاشان دەستی کرد بەنێو دەفرەکەدا بە سێ لوێچ ئاو سێ جار ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا و فمی کردەوە، پاشان دەستی کرد بەنێو دەفرەکەدا و سێ جار دەم و چاوی شۆرد، پاشان دەستی کردەوە بەنێو دەفرەکەدا، دوو جار دوو جار هەردوو دەستی تا هەردوو ئانیشکی شۆرد، پاشان دەستی کردەوە بەنێو دەفرەکەدا، جا هەردوو دەستی بەتەڕی هێنا بە سەریدا لە پشتی سەریەوە هێنانی بۆ پێشەوە و بردنیەوە بۆ پشتی سەری، پاشان دەستی کردووە بەنێو دەفرەکەدا و هەردوو پێیەکانی شۆرد. پاشان (ئیمام بوخاری) وتی: مووسا بۆی گێڕاینەوە وتی: وهەیب وتی: (بە ڕێگەی پێشوو عەبدوڵای کوڕی زەید) وتی: یەك جار دەستی تەڕی هێنا بە سەریدا.**

---

[1] بروانە: ١٨٥.

## ٤٥- بابُ وُضُوءِ الرَّجُلِ مَعَ امْرَأَتِهِ، وَفَضْلِ وَضُوءِ المَرْأَةِ. وَتَوَضَّأَ عُمَرُ بِالْحَمِيمِ مِنْ بَيْتِ نَصْرَانِيَّةٍ

١٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَتَوَضَّئُونَ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَمِيعًا.

## ٤٥- باسی دەستنوێژگرتنی پیاو لەگەڵ خێزانی و پاشماوەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەت. عومەر ﷺ بە ئاوی گەرم دەستنوێژی گرت لە ماڵی ئافرەتێکی مەسیحیدا.

**١٩٣- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوان و ئافرەتان پێكەوە دەستنوێژیان دەگرت.**

## ٤٦- بابُ صَبِّ النَّبِيِّ ﷺ وَضُوءَهُ عَلَى المُغْمَى عَلَيْهِ

١٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عن مُحَمَّدِ بْنِ الْمنكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا يَقُول: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ لَا أَعْقِلُ، فَتَوَضَّأَ وَصَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ، فَعَقَلْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَمِنِ المِيرَاثُ؟ إِنَّمَا يَرِثُنِي كَلَالَةٌ[١]. فَنَزَلَتْ آيَةُ الفَرَائِضِ[٢].

---

[١] كَلَالَةٌ: بە كەسێک دەڵێن بمرێ نە دایک و باوک و باپیری هەبێ، نە منداڵ و نەوە، بەڵكوو تەنها برای هەبێ، یان تەنها خوشكی هەبێ، یان خوشک و برای هەبێ پێكەوە.

[٢] بڕوانە: ٤٥٧٧، ٥٦٥١، ٥٦٦٤، ٥٦٧٦، ٦٧٢٣، ٦٧٤٣، ٧٣٠٩.

## ٤٦- باسی ئاوی دەستنوێژ پڕژاندنی پێغەمبەر ﷺ بەسەر كەسێكدا كە لە هۆش خۆی چووبوو

**١٩٤- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی كردم لە كاتێكدا كە نەخۆش بووم و هۆشم بە خۆمەوە نەبوو، جا دەستنوێژی گرت و لە ئاوی دەستنوێژەكەی پڕژاند بە سەرمدا، ئیدی هۆشم هاتەوە بە خۆمدا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ میراتی من بۆ كێ دەبێت؟ بێگومان من تەنها چەند میراتگرێكم هەیە میراتم لێ دەبەن (دایك و باوك و باپیر و منداڵم نییە)، ئیدی بەم هۆیەوە ئایەتی دابەشكردنی میرات دابەزی.**

## ٤٧- بابُ الغُسْلِ وَالْوُضُوءِ فِي المِخْضَبِ وَالْقَدَحِ وَالْخَشَبِ وَالْحِجَارَةِ

١٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُنِيرٍ، سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: حَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَقَامَ مَنْ كَانَ قَرِيبَ الدَّارِ إِلَى أَهْلِهِ، وَبَقِيَ قَوْمٌ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِخْضَبٍ مِنْ حِجَارَةٍ فِيهِ مَاءٌ، فَصَغُرَ المِخْضَبُ أَنْ يَبْسُطَ فِيهِ كَفَّهُ، فَتَوَضَّأَ القَوْمُ كُلُّهُمْ. قُلْنَا: كَمْ كُنْتُمْ؟ قَالَ: ثَمَانِينَ وَزِيَادَةً[1].

## ٤٧- باسی خۆشۆردن و دەستنوێژگرتن لە تەشت و دەفری دروستكراو لە تەختە و دار و بەرد

**١٩٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: نوێژی (عەسر) بووبوو، ئەو كەسانەی ماڵیان نزیك بوو هەستان ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵی خۆیان (بۆ دەستنوێژگرتن)، كەسانێكیش مانەوە، لە دەفرێكی بەردیندا كەمێ ئاو هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، دەفرەكە ئەوەندە**

---

[1] بڕوانە: ١٦٩.

بچووك بوو پێغەمبەر ﷺ نەیدەتوانی دەستی تێدا بڵاو بکاتەوە، ئینجا خەڵکەکە هەموویان (لەو ئاوە) دەستنوێژیان گرت، (حومەید دەڵێ) وتمان بە ئەنەس: ئێوە چەند کەس دەبوون؟ وتی: لە هەشتا کەس زیاتر بووین.

١٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلَاءِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَن بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ، وَمَجَّ فِيهِ[1].

**١٩٦- ئەبو مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ داوای جامێ ئاوی کرد، ئینجا هەردوو دەستی و دەموچاوی لێ شۆرد، ئاوەکەی دەمی فڕێ دایەوە نێو جامەکە.**

١٩٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَخْرَجْنَا لَهُ مَاءً فِي تَوْرٍ مِنْ صُفْرٍ فَتَوَضَّأَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا وَيَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَقْبَلَ بِهِ وَأَدْبَرَ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ[2].

**١٩٧- عەمری کوڕی یەحیا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای کوڕی زەیدەوە ﷺ کە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات، جا ئاومان بۆ هێنا لە تەشتێکی زەرددا و دەستنوێژی گرت، جا سێ جار دەموچاوی شۆرد، وە دوو جار هەردوو دەستی (تا هەردوو ئانیشکی) شۆرد، وە دەستی بەتەڕی هێنا بە سەریدا، دەستی لەپێشی سەریەوە برد بۆ پشتەوە و لەپشتی سەریەوە هێنایەوە بۆ پێشەوە، وە هەردوو قاچی شۆرد.**

---

[1] بڕوانە: ١٨٨.

[2] بڕوانە: ١٨٥.

١٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ ﷺ واشْتَدَّ بِهِ وَجَعُهُ، اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ فِي أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي، فَأَذِنَّ لَهُ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُطُّ رِجْلَاهُ فِي الأَرْضِ بَيْنَ عَبَّاسٍ وَرَجُلٍ آخَرَ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَأَخْبَرْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: أَتَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الآخَرُ؟ قُلْتُ: لَا. قَالَ: هُوَ عَلِيٌّ. وَكَانَتْ عَائِشَةُ ﵂ تُحَدِّثُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ بَعْدَ مَا دَخَلَ بَيْتَهُ وَاشْتَدَّ وَجَعُهُ: «هَرِيقُوا عَلَيَّ مِنْ سَبْعِ قِرَبٍ، لَمْ تُحْلَلْ أَوْكِيَتُهُنَّ، لَعَلِّي أَعْهَدُ إِلَى النَّاسِ». وَأُجْلِسَ فِي مِخْضَبٍ لِحَفْصَةَ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ طَفِقْنَا نَصُبُّ عَلَيْهِ تِلْكَ حَتَّى طَفِقَ يُشِيرُ إِلَيْنَا أَنْ قَدْ فَعَلْتُنَّ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى النَّاسِ[1].

**١٩٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ نەخۆشییەکەی پێغەمبەر ﷺ قورس بوو و تینی بۆ هێنا، مۆڵەتی خواست لە خێزانەکانی کە لە ماڵی مندا چاودێری نەخۆشییەکەی بکرێت، ئەوانیش مۆڵەتیان دا و ڕازی بوون، جا پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ هاتە دەرەوە و دوو پیاو چوونە ژێر باڵی، قاچەکانی بە زەویدا دەخشان لە نێوان عەباس و پیاوێکی دیکەدا بوو، عوبەیدوڵا وتی: ئەو هەواڵەم دا بە عەبدوڵای کوڕی عەباس ئەویش وتی: دەزانی پیاوەکەی دیکە کێ بووە؟ وتم: نەخێر، وتی: عەلی ﵁ بوو، عائیشە ﵂ هەمیشە دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی ڕۆیشتە ماڵەوە و ئازارەکەی تینی بۆ هێنا، فەرمووی: ((لە ئاوی حەوت کوندەم پیا کەن کە دەمەکانیان نەکرابێتەوە (بەڵکوو چاك ببمەوە و) وەسییەت بکەم بۆ خەڵکی)). جا پێغەمبەر ﷺ لە تەشتێکی حەفصەی خێزانیدا دانیشێنرا، پاشان دەستمان کرد بە ئاوپێداکردنی لە ئاوی ئەو حەوت کوندەیە، هەتا دەستی کرد بە ئاماژەکردن بۆمان: کە ئەوەی پێویست بوو کردتان، پاشان (باشتر بوو) ڕۆیشتە دەرەوە بۆ نێو خەڵکی.**

---

[1] بروانە: ٦٦٤، ٦٦٥، ٦٧٩، ٦٨٣، ٦٨٧، ٧١٢، ٧١٣، ٧١٦، ٢٥٨٨، ٣٠٩٩، ٣٣٨٤، ٤٤٤٢، ٤٤٤٥، ٥٧١٤، ٧٣٠٣.

# ٤٨- بابُ الوُضُوءِ مِنَ التَّوْرِ

١٩٩- حَدَّثَنَا خَالِدُ بن مَخْلَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بن يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ عَمِّي يُكْثِرُ مِنَ الوُضُوءِ، قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ: أَخْبِرْنِي كَيْفَ رَأَيْتَ النَّبِيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ، فَكَفَأَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثَ مِرَارٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي التَّوْرِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ مِنْ غَرْفَةٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاغْتَرَفَ بِهَا فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً، فَمَسَحَ رَأْسَهُ فَأَدْبَرَ بِهِ وَأَقْبَلَ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ، فَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ[1].

## ٤٨-باسی دەستنوێژگرتن لە تەشتدا[2]

١٩٩- سولەیمان دەڵێ: عەمری کوڕی یەحیا بۆی گێڕامەوە لە باوکیەوە وتی: مامم زۆر دەستنوێژی دەگرت، بە عەبدوڵای کوڕی زەیدی وت: پێم بڵێ پێغەمبەری خوات ﷺ دیوە چۆن دەستنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵاش داوای تەشتێك ئاوی کرد (بۆیان هێنا)، جا ئاوی کرد بە هەردوو دەستیدا و سێ جار هەردوو دەستی شۆرد، پاشان دەستی کرد بەنێو تەشتەکەدا و بە یەك لوێچ ئاو سێ جار ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا و فمی کردەوە، پاشان دەستی کرد بەنێو تەشتەکەدا و لوێچێ ئاوی دەرهێنا، سێ جار دەم و چاوی شۆرد، پاشان هەردوو دەستی تا هەردوو ئانیشکی دوو جار دوو جار شۆرد، پاشان بە دەستی ئاوی هەڵگرت و هێنای بە سەریدا و بردی بۆ پشتی سەری و هێنایەوە بۆ پێشی سەری، پاشان هەردوو قاچی شۆرد، ئینجا وتی: پێغەمبەرم ﷺ دی ئاوەها دەستنوێژی دەگرت.

---

[1] بڕوانە: ١٨٥.

[2] کە ئاوی تێدا بێت.

٢٠٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَن أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ مَاءٍ، فَأُتِيَ بِقَدَحٍ رَحْرَاحٍ فِيهِ شَيْءٌ مِنْ مَاءٍ، فَوَضَعَ أَصَابِعَهُ فِيهِ. قَالَ أَنَسٌ: فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى المَاءِ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ. قَالَ أَنَسٌ: فَحَزَرْتُ مَنْ تَوَضَّأَ مَا بَيْنَ السَّبْعِينَ إِلَى الثَّمَانِينَ[1].

**٢٠٠- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ داوای دەفرێ ئاوی کرد، جا تەشتێکی فراوانمان بۆ هێنا، کەمێ ئاوی تێدا بوو، جا پەنجەکانی تێ خست. ئەنەس دەڵێ: جا من سەیری ئاوەکەم دەکرد لە نێوان پەنجەکانیەوە هەڵدەقولا، ئەنەس دەڵێ: ئەوانەی دەستنوێژیان گرت (لەو ئاوە) لە نێوان حەفتا بۆ هەشتا کەس مەزەندەم کردن.**

## ٤٩- بابُ الوُضُوءِ بِالمُدِّ

٢٠١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ قَالَ: حَدَّثَنِي ابن جَبْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَغْسِلُ -أَوْ كَانَ يَغْتَسِلُ[2]- بِالصَّاعِ إِلَى خَمسَةِ أَمْدَادٍ، وَيَتَوَضأُ بِالُمْدِّ.

## ٤٩- باسی دەستنوێژگرتن بە مشتێ ئاو

**٢٠١- ئیبنو جەبر دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ بە ڕبەیەك ئاو تا پێنج مشت خۆی دەشۆرد، وە بە مشتێك ئاو دەستنوێژی دەگرت.**

---

[1] بڕوانە: ١٦٩.

[2] (يَغْسِلُ) و (يَغْتَسِلُ) هەردوو وشەکە بە مانای خۆشۆردنە، هەندێك دەڵێن: (يَغْسِلُ) بۆ سەرشۆردنە، و (يَغْتَسِلُ) بۆ لاشەیە، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە هەردووکیان بە یەك مانا دێن.

## ٥٠- بابُ المَسْحِ عَلَى الخُفَّيْنِ

٢٠٢- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ بْنُ الفَرَجِ المِصْرِيُّ، عَنِ ابن وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرٌو، حَدَّثَنِي أَبُو النُّضْرِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ مَسَحَ عَلَى الخُفَّيْنِ، وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ سَأَلَ عُمَرَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: نَعَمْ، إِذَا حَدَّثَكَ شَيْئًا سَعْدٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَلَا تَسْأَلْ عَنْهُ غَيْرَهُ. وَقَالَ مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ: أَخْبَرَنِي أَبُو النَّضْرِ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ سَعْدًا ... فَقَالَ عُمَرُ لِعَبْدِ اللَّهِ نَحْوَهُ

## ٥٠- باسی دەستی تەڕ هێنان بەسەر خوفدا

**٢٠٢- سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، ئەویش لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەو (پێغەمبەر ﷺ) دەستی تەڕی هێناوە بەسەر هەردوو خوفەکەیدا، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر پرسیاری لە عومەر کرد لەو بارەیەوە، ئەویش وتی: ئەگەر سەعد هەر شتێکی بۆ گێڕایتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پرسیار لە کەسی دیکە مەکە لە بارەیەوە، مووسای کوڕی عوقبە دەڵێ: ئەبو نەزڕ پێی وتم کە ئەبو سەلەمە بۆی گێڕاوەتەوە کە سەعد (ئەم فەرموودەی) بۆ گێڕاوەتەوە. وە عومەریش وێنەی ئەم فەرموودەی بە عەبدوڵا وتووە.**

٢٠٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ الحرَّانُِي قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الُمغِيرَةِ، عن أَبِيهِ الُمغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ خَرَجَ لِحَاجَتِهِ، فَاتَّبَعَهُ الُمغِيرَةُ بِإِدَاوَةٍ فِيهَا مَاءٌ، فَصَبَّ عَلَيْهِ حِينَ فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ، فَتَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الُخفَّيْنِ.

**٢٠٣- عوروەی کوڕی موغیرە لە موغیرەی کوڕی شوعبەی باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە ڕۆیشت تا دەست بە ئاو بگەیەنێت، جا**

موغیرە شوێنی کەوت بە مەسینەیەك ئاوەوە، ئینجا کە لە سەرئاوەکەی بۆیەوە، موغیرە ئاوی کرد بە دەستیدا و دەستنوێژی گرت و دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو خوفەکەیدا.

٢٠٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَعْفَرِ ابْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى الخُفَّيْنِ. وَتَابَعَهُ حَرْبُ بْنُ شَدَّادٍ، وَأَبَانُ، عَنْ يَحْيَى.

٢٠٤- جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەیەی زەمری دەگێڕیتەوە کە باوکی ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەری ﷺ بینیوە دەستی تەڕی دەهێنا بەسەر هەردوو خوفەکەیدا. حەربی کوڕی شەداد و ئابانیش ئەم فەرموودەیان لە یەحیاوە گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شەیبان دەکەن.

٢٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِي، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى عِمَامَتِهِ وَخُفَّيْهِ. وَتَابَعَهُ مَعْمَرٌ، عن يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ[1].

٢٠٥- ئەوزاعی لە یەحیاوە لە ئەبو سەلەمەوە لە جەعفەری کوڕی عەمرەوە لە عەمری باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی دەستی تەڕی دەهێنا بە مێزەر و هەردوو خوفەکەیدا. ئەم فەرموودەیە مەعمەر گێڕاویەتەوە لە یەحیاوە لە ئەبو سەلەمەوە لە عەمرەوە دەڵێ: پیغەمبەرم ﷺ بینی (دەستی تەڕی هێنا بە مێزەر و هەردوو خوفەکەیدا). پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەوزاعی دەکات.

---

[1] بڕوانە: ٢٠٤.

## ٥١- بابُ إِذَا أَدْخَلَ رِجْلَيْهِ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ

٢٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: «دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ». فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا[1].

## ٥١- باسی ئەگەر بە دەستنوێژەوە خوف بکاتە پێیەکانیەوە

**٢٠٦- عورووەی کوڕی موغیرە لە موغیرەی باوکیەوە گێڕاویەتەوە و دەڵێ: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم دانەویمەوە تا خوفەکانی داکەنم لە پێیدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وازیان لێ بێنە، چونکە بە دەستنوێژەوە لەپێم کردوون))، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بە سەر هەردوو خوفەکەدا.**

## ٥٢- بابُ مَنْ لَمْ يَتَوَضَّأْ مِنْ لَحْمِ الشَّاةِ وَالسَّوِيقِ

## وَأَكَلَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ رضي الله عنهم لَحْمًا، فَلَمْ يَتَوَضَّئُوا

٢٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٨٢.

[2] بڕوانە: ٥٤٠٤، ٥٤٠٥.

## ٥٢- باسی کەسێ دەستنوێژ نەگرێتەوە لەبەر خواردنی گۆشتی مەڕومالآت و قاوتی، وە ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان ﷺ گۆشتیان[١] خواردووە و دەستنوێژیان نەگرتۆتەوە.

**٢٠٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ گۆشتی شانی مەڕێکی خوارد، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.**

٢٠٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْن بكيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَحْتَزُّ مِن كَتِفِ شَاةٍ، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَأَلْقَى السِّكِّينَ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٢].

**٢٠٨- جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییە دەڵێ: باوکی بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە لە گۆشتی شانی مەڕێکی دەبڕی، جا بانگی نوێژ بێژرا، پێغەمبەریش ﷺ چەقۆکەی فڕێ دا و نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.**

## ٥٣- بابُ مَنْ مَضْمَضَ مِنَ السَّوِيقِ وَلَم يَتَوَضَّأْ

٢٠٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ -مَوْلَى بَنِي حَارِثَةَ- أَنَّ سُوَيْدَ بْنَ النُّعْمَانِ أَخْبَرَهُ أَنَهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عامَ خَيْبَرَ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالصَّهْبَاءِ -وَهِيَ أَدْنَى خَيْبَرَ- فَصَلَّى العَصْرَ، ثُمَّ دَعَا بِالأَزْوَادِ، فَلَمْ يُؤْتَ إِلَّا بِالسَّوِيقِ، فَأَمَرَ بِهِ فَثُرِّيَ، فَأَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَكَلْنَا، ثُمَّ قَامَ إِلَى المَغْرِبِ، فَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا، ثُمَّ صَلَّى وَلَم يَتَوَضَّأْ[٣].

---

[١] لە گێڕانەوەی تەبەڕانیدا هاتووە: سەلیمی کوڕی عامیر دەڵێ: ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانم بینیوە گۆشتی برژاویان خواردووە و دەستنوێژیان نەگرتۆتەوە.

[٢] بڕوانە: ٦٧٥، ٢٩٢٣، ٥٤٠٨، ٥٤٢٢، ٥٤٦٢.

[٣] بڕوانە: ٢١٥، ٢٩٨١، ٤١٧٥، ٤١٩٥، ٥٣٨٤، ٥٣٩٠، ٥٤٥٤، ٥٤٥٥.

## ٥٣- باسی ئەوەی قاوتی خواردبێ و ئاو لە دەمی ڕادا و دەستنوێژ نەگرێتەوە

**٢٠٩- سوەیدی کوڕی نوعمان دەگێڕێتەوە: کە ئەو ساڵەی جەنگی خەیبەر ڕووی دا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆیشت هەتا گەیشتنە صەهبا -کە نزیکی خەیبەرە -، جا نوێژی عەسری کرد، پاشان داوای کرد توێشووەکانیان بێنن، تەنها قاوتیان هێنا، وە فەرمانی کرد و تەڕ کرا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئێمەش خواردمان، پاشان هەستا بۆ نوێژی ئێوارە و ئاوی لە دەمی ڕادا، ئێمەش ئاومان لە دەممان ڕادا، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.**

٢١٠- وَحَدَّثَنَا أَصْبَغُ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابن وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَكَلَ عِنْدَهَا كَتِفًا، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

**٢١٠- کوڕەیب لە مەیمونەوە گێڕاویەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لە لای ئەو گۆشتی شانی مەڕێکی خوارد، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.**

## ٥٤- بَابٌ: هَلْ يُمَضْمِضُ مِنَ اللَّبَنِ؟

٢١١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بن بُكَيْرٍ وَقُتَيْبَةُ قَالَا: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ شَرِبَ لَبَنًا، فَمَضْمَضَ وَقَالَ: «إِنَّ لَهُ دَسَمًا». تَابَعَهُ يُونُسُ وَصَالِحُ بن كَيْسَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[1].

---

[1] بڕوانە: ٥٦٠٩.

## ٥٤- باسێک: ئایا بەهۆی شیرخواردنەوەوە ئاو لە دەم ڕادەدرێت؟

٢١١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ شیری خواردەوە، جا ئاوی لە دەمی ڕادا و فەرمووی: ((بێگومان شیر چەوری هەیە)). یونس و صالیحی کوڕی کەیسان ئەم فەرموودەیان لە زوهرییەوە گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عوقەیل دەکەن.

## ٥٥- بابُ الوُضُوءِ مِنَ النَّوْمِ، وَمَن لَمْ يَرَ مِنَ النَّعْسَةِ وَالنَّعْسَتَيْنِ أَوِ الخَفْقَةِ وُضُوءًا

٢١٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي، فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَا يَدْرِي لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ، فَيَسُبَّ نَفْسَهُ».

## ٥٥- باسی دەستنوێژگرتن لەبەر خەوتن، وە ئەوەی دەستنوێژگرتن بە پێویست نازانێ بۆ وەنەوزێک و دووان یان مل لاربوونەوە

٢١٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان وەنەوزی دا لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، با ڕاکشێ و بخەوێ تا خەو هاتنەکەی دەڕوات، چونکە کەسێ لە ئێوە ئەگەر نوێژ بکات و خەوی بێت، نازانێ لەوانەیە لەجیاتی ئەوەی داوای لێخۆشبوون بکات، جنێو بە خۆی بدات)).

٢١٣- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَنَمْ حَتَّى يَعْلَمَ مَا يَقْرَأُ».

**٢١٣- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان لە نوێژدا خەوی هات، با بخەوێ (و نوێژەکەی نەکات)، تا دەزانێ چی دەخوێنێ)).**

## ٥٦- بابُ الوُضُوءِ مِنْ غَيْرِ حَدَثٍ

٢١٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعتُ أَنَسًا ح. قَالَ: وَحَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَامِرٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ. قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قَالَ: يُجْزِئُ أَحَدَنَا الوُضُوءُ مَا لَمْ يُحْدِثْ.

## ٥٦- باسی دەستنوێژگرتن بێ دەستنوێژشکان

**٢١٤- عەمری کوڕی عامر گێڕاویەتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ[1] کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی هەموو نوێژێکدا دەستنوێژی دەگرت، عەمر دەڵێ وتم: ئەی ئێوە چۆنتان دەکرد؟ ئەنەس وتی: هەر کام لە ئێمە یەك دەستنوێژی بەس بوو، مادام دەستنوێژی نەشکایە.**

٢١٥- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ قَالَ: أخبَرَنِي سُوَيْدُ بْنُ النُّعْمَانِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ خَيْبَرَ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ، صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ العَصْرَ، فَلَمَّا صَلَّى دَعَا بِالأَطْعِمَةِ، فَلَمْ يُؤْتَ إِلَّا بِالسَّوِيقِ، فَأَكَلْنَا وَشَرِبْنَا، ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى المَغْرِبِ فَمَضْمَضَ، ثُمَّ صَلَّى لَنَا المَغْرِبَ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[2].

---

[1] ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕشتە ڕیوایەت کراوە.

[2] بڕوانە: ٢٠٩.

٢١٥- سوەیدی کوڕی نوعمان ﷺ دەڵێ: ساڵی (جەنگی) خەیبەر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆیشتین هەتا گەشتینە صەهبا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی نوێژی عەسری بۆ کردین، جا کە نوێژەکەی کرد، داوای خواردنەکانی کرد، تەنها قاوتیان هێنا، جا خواردن و خواردنەوەمان خوارد، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستا نوێژی ئێوارە بکات، ئاوی لە دەمی ڕادا، پاشان پێشنوێژی نوێژی ئێوارەی بۆ کردین و دەستنوێژی نەگرتەوە.

## ٥٧- بابٌ: مِنَ الكَبَائِرِ أَنْ لَا يَسْتَتِرَ مِنْ بَوْلِهِ

٢١٦- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِحَائِطٍ مِنْ حِيطَانِ المَدِينَةِ -أَوْ مَكَّةَ- فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ». ثُمَّ قَالَ: «بَلَى، كَانَ أَحَدُهُمَا لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ، وَكَانَ الآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ». ثُمَّ دَعَا بِجَرِيدَةٍ، فَكَسَرَهَا كِسْرَتَيْنِ، فَوَضَعَ عَلَى كُلِّ قَبْرٍ مِنْهُمَا كِسرَةً، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ فَعَلْتَ هذا؟ قَالَ: «لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ تَيْبَسَا» أَوْ «إِلى أَنْ يَيْبَسَا»[1].

## ٥٧- باسێک: گوناهی گەورەیە خۆنەپاراستن لە پرژی میزی خۆی

٢١٦- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێ پەڕێ بەلای باخێك لە باخەکانی مەدینە -یان مەککە-دا، گوێی لە دەنگی دوو کەس بوو لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدران، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم دووانە سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن))، پاشان فەرمووی: ((بەڵێ لەسەر شتێکی

---

[1] بڕوانە: ٢١٨، ١٣٦١، ١٣٧٨، ٦٠٥٢، ٦٠٥٥.

گەورەیە یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە پرژی میزەکەی، ئەوەی دیکەیان لەنێو خەڵکیدا دووزمانی دەکرد))، پاشان داوای پەلێکی دارخورمای کرد (هێنایان)، کردی بە دوو لەتەوە لەسەر هەر گۆڕێکیان لەتێکیانی دانا (ناشتی)، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ئەمەت کرد؟ فەرمووی: ((بەڵکوو لە سزاکەیان سووک بکەن مادام وشک نەبن))، یان ((تا وشک دەبن)).

## ٥٨- بابُ مَا جَاءَ فِي غَسْلِ البَوْلِ

وَقَالَ النَّبِيِّ ﷺ لِصَاحِبِ القَبْرِ: ((كَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ))[١]. وَلَمْ يَذْكُرْ سِوى بَوْلِ النَّاسِ.

٢١٧- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيل بْن إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي رَوْحُ بْن القَاسِمِ قَالَ: حَدَّثَنِي عطَاءُ بْنُ أَبِي مَيْمُونَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا تَبَرَّزَ لَحِاجَتِهِ أَتَيتُهُ بِمَاءٍ فَيَغْسِلُ بِهِ[٢].

## ٥٨- باسی ئەوەی دەربارەی شۆردنی میز هاتووە

وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی لە گۆڕەکەیدا (سزا دەدرا) فەرمووی: ((ئەو خۆی نەدەپاراست لە پرژی میزەکەی)) تەنها میزی ئادەمیزادی باس کردووە.

٢١٧- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشت بۆ سەرئاو، ئاوم بۆ دەبرد خۆی پێ دەشۆرد (و پاك دەکردەوە).

---

[١] بڕوانە: ٢١٦، ٢١٨.

[٢] بڕوانە: ١٥٠.

## ٥٩- بابٌ

٢١٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَازِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ-: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِقَبْرَيْنِ فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنَ الْبَوْلِ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ». ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً، فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ، فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ فَعَلْتَ هذا؟ قَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا». قَالَ ابن الْمُثَنَّى: وَحَدَّثَنَا وَكِيعٌ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ مُجَاهِدًا مِثْلَهُ[1].

## ٥٩- باسێک

**٢١٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێ پەڕی بەلای دوو گۆڕدا، فەرمووی: ((بێگومان ئەم دوو (مردووە) سزا دەدرێن، وە لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن، جا یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە پرژی میزەکەی، ئەوی دیکەشیان دووزمانی دەکرد لەنێو خەڵکیدا)). پاشان پەلە دارخورمایەکی تەڕی هەڵگرت و کردی بە دوو لەتەوە، لەسەر هەر گۆڕێکیان دانەیەکیانی داچەقاند، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ئەمەت کرد؟ فەرمووی: ((بەڵکوو سزایان لێ سووك بکرێ مادام وشك نەبن)). موحەممەدی کوڕی موسەنا دەڵێ: وەکیع گێڕاویەتەوە و دەڵێ: ئەعمەش بۆی گێڕاینەوە و وتی: لە موجاهید وێنەی ئەم فەرمودەیەم بیست.**

---

[1] بڕوانە: ٢١٦.

## ٦٠- بابُ تَرْكِ النَّبِيِّ ﷺ وَالنَّاسِ الأَعْرَابِيَّ حَتَّى فَرَغَ مِنْ بَوْلِهِ فِي المَسْجِدِ

٢١٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ، عَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى أَعْرَابِيًّا يَبُولُ فِي المَسْجِدِ، فَقَالَ: «دَعُوهُ». حَتَّى إِذَا فَرَغَ دَعَا بِمَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَيْهِ[1].

## ٦٠- باسی وازهێنانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان لەو عەرەبە دەشتەکییەی میزی لەنێو مزگەوتدا کرد تا لە میزەکەی بۆیەوە

**٢١٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عەرەبێکی دەشتەکی بینی لە مزگەوتدا میزی دەکرد، فەرمووی: ((وازی لێ بێنن))، هەتا لە میزەکەی بۆیەوە، داوای کرد ئاوی بۆ بێنن، جا ئاوەکەی کرد بە شوێنەکەیدا.**

## ٦١- بابُ صَبِّ المَاءِ عَلَى البَوْلِ فِي المَسْجِدِ

٢٢٠- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيرَةَ قَالَ: قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي المَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَهُ النَّاسُ، فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعُوهُ، وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلًا مِنْ مَاءٍ -أَوْ ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ- فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٢١، ٦٠٢٥.

[2] بڕوانە: ٦١٢٨.

## ٦١- باسی ئاوكردن بە شوێنی میزدا لە مزگەوتدا

**٢٢٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: عەرەبێكی دەشتەكی هەستا و لەنێو مزگەوتدا میزی كرد، جا خەڵكیش پەلاماریان دا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێیان: ((وازی لێ بێنن و دۆڵكەیەك ئاو بكەن بە شوێن میزەكەیدا -یان سەتڵێك ئاو-، چونكە بێگومان ئێوە بە ئاسانكار نێردراون و بە گرانكار نەنێردراون)).**

حَدَّثَنَا عَبدَانُ قَالَ: أَخبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**یەحیای كوڕی سەعید دەڵێ: لە ئەنەسی كوڕی مالیكم ﷺ بیست: (ئەم فەرموودەی) لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە.**

## ٦٢- بابٌ: يُهَرِيقُ المَاءَ عَلَى البَوْلِ

٢٢١- حَدَّثَنَا خَالِدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيمَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَ أَعرَابِيٌّ فَبَالَ فِي طَائِفَةِ المَسْجِدِ، فَزَجَرَهُ النَّاسُ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا قَضَى بَولَهُ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِذَنُوبٍ مِنْ مَاءٍ، فَأُهْرِيقَ عَلَيهِ[1].

## ٦٢- باسێک: ئاو دەكرێ بەو شوێنەدا میزی پێدا كراوە

**٢٢١- یەحیای كوڕی سەعید دەڵێ: لە ئەنەسی كوڕی مالیكم ﷺ بیست، وتی: عەرەبێكی دەشتەكی هات لە بەشێكی مزگەوتدا میزی كرد، جا خەڵك تێیان خوڕی (كە میز نەكات)، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگری لە خەڵكەكە كرد، جا كە**

---

[1] بڕوانە: ٢١٩.

میزەکەی تەواو کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دۆڵچەیەك ئاو بێنن و ڕژێنرا بە شوێنی میزەکەدا.

## ٦٣- بابُ بَوْلِ الصِّبْيَانِ

٢٢٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَبِيٍّ[1]، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ إِيَّاهُ[2].

## ٦٣- باسی میزی کوڕان (منداڵان) حوکمی چییە؟

**٢٢٢- عائیشە دایکی باوەڕداران ؓ دەڵێ: کوڕێکی منداڵ هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کوڕەکە میزی کرد بە پۆشاکەکەی پێغەمبەردا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ داوای کرد ئاوی بۆ بێنن، جا کردی بە شوێنی میزەکەدا.**

٢٢٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ، أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ، لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَجْلَسَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجْرِهِ، فَبَالَ على ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ[3].

**٢٢٣- ئومو قەیسی کچی میحصەن ؓ دەڵێ: کوڕێکی بچکۆلەی خۆی کە خواردنی نەدەخوار (شیرەخۆر بوو) هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە**

---

[1] (صَبِي) بە منداڵێکی کوڕ دەوترێت کە شیرەخۆر بێت و هێشتا لە شیر نەبڕدرابێتەوە. إرشاد الساري: ٤٤٩/١.

[2] تخریج: ٥٤٦٨، ٦٠٠٢، ٦٣٥٥.

[3] بڕوانە: ٥٦٩٣.

شیرەخۆر بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ لە کۆشیدا داینا، ئینجا کوڕەکە میزی کرد بە جلەکانی پێغەمبەردا ﷺ، ئەویش داوای ئاوی کرد و هێنایان و پرژاندی لە جێگای میزەکە و نەیشۆرد.

## ٦٤- بابُ البَولِ قائِمًا وَقاعِدًا

٢٢٤- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَجِئْتُهُ بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ[١].

## ٦٤- باسی میزکردن بەپێوە و بەدانیشتنەوە

٢٢٤- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە لای سەنێرگە (زبڵدان)ی هۆزێك و بەپێوە میزی کرد، پاشان داوای ئاوی کرد منیش ئاوم بۆ برد و دەستنوێژی پێ گرت.

## ٦٥- بابُ البَوْلِ عِنْدَ صَاحِبِهِ وَالتَّسَتُّرِ بِالْحَائِطِ

٢٢٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: رَأَيْتُنِي أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ نَتَمَاشَى، فأَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ خَلْفَ حَائِطٍ، فَقَامَ كَمَا يَقُومُ أَحَدُكُمْ فَبَالَ، فَانْتَبَذْتُ مِنْهُ، فَأَشَارَ إِلَيَّ فَجِئْتُهُ، فَقُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ حَتَّى فَرَغَ[٢].

---

[١] بڕوانە: ٢٢٥، ٢٢٦، ٢٤٧١.

[٢] بڕوانە: ٢٢٤.

## ٦٥- باسی (حوكمی) میزكردنی كەسێك لای هاوڕێكەیدا وە (حوكمی) خۆپەنادان لەپەنا دیواردا[1]

**٢٢٥- حوزەیفە ﵁ دەڵێ: لە بیرمە من و پێغەمبەر ﷺ پێكەوە دەڕۆشیتن بە ڕێگادا، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە لای زبڵدانی هۆزێك كە لە پشت دیوارێكەوە بوو، بەپێوە وەستا وەك وەستانی هەر كەسێكتان بەپێوە و میزی كرد، منیش لێی دوور كەوتمەوە، جا ئاماژەی بۆ كردم منیش چوومە خزمەتی و لە پشتەوە وەستام تا لە میزەكەی بووەوە. (واتە: پشتم تێ كرد و لەدوایەوە وەستام بۆ ئەوەی خەڵك نەیبینێ).**

## ٦٦- بابُ البَوْلِ عِنْدَ سُبَاطَةِ قَوْمٍ

٢٢٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ يُشَدِّدُ فِي البَوْلِ، وَيَقُولُ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَ إِذَا أَصَابَ ثَوْبَ أَحَدِهِمْ قَرَضَهُ. فَقَالَ حُذَيْفَةُ: لَيْتَهُ أَمْسَكَ، أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا[2].

## ٦٦- باسی (حوكمی) میزكردن لای زبڵدان (سەنێرگە)ی هۆزێكدا

**٢٢٦- ئەبو وائیل دەڵێ: ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁ لە خۆپاراستن لە پرژی میز زۆر توند بوو و دەیوت: بێگومان جوولەكەكان جلی كەسێكیان میزی بەر بكەوتایە، ئەو بەشەی لە جلەكانی دەبڕی، حوزەیفەش وتی: خۆزگە ئەبو مووسا وازی لەو توندیە بهێنایە، چونكە پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە لای سەنێرگەی هۆزێك و بەپێوە میزی كرد.**

---

[1] بۆ میزكردن.

[2] بڕوانە: ٢٢٤.

## ٦٧- بابُ غَسْلِ الدَّمِ

٢٢٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَتْنِي فَاطِمَةُ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا تَحِيضُ فِي الثَّوْبِ، كَيْفَ تَصْنَعُ؟ قَالَ: «تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ وَتَنْضَحُهُ، وَتُصَلِّي فِيهِ»[1].

## ٦٧- باسی (حوکمی) شۆردنی خوێن

**٢٢٧-ئەسما ﵂ دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: پێم بڵێ کەسێك لە ئێمەی ئافرەتان کەوتە بێنوێژی لە جلوبەرگێکدا[2] (خوێنی بەرکەوت) چی بکات؟ فەرمووی: ((بیپڕوێنە، (بە سەری نینۆکت) بیکرێنە و ئاوی پیا کە و لە ئاوی هەڵکێشە و بیشۆرە و نوێژی پێوە بکە)).**

٢٢٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ ابنةُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا، إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِحَيْضٍ، فَإِذَا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ، ثُمَّ صَلِّي». قَالَ: وَقَالَ أَبِي: «ثُمَّ تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلَاةٍ حَتَّى يَجِيءَ ذَلِكَ الوَقْتُ»[3].

**٢٢٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئافرەتێکم هەمیشە خوێنم لەبەر دەڕوا و**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٧.

[2] واتە: کاتێ کەوتە حەیزەوە ئەو جلوبەرگەی لەبەریدایە و پۆشیوەتی خوێنی حەیزی بەرکەوت چی بکات؟

[3] بڕوانە: ٣٠٦، ٣٢٠، ٣٢٥، ٣٣١.

**پاك نابمەوە، ئایا واز لە نوێژکردن بێنم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((نەخێر بێگومان ئەوە دەمارێکە و خوێنی بێنوێژی نییە، جا کاتێ سەرەتای بێنوێژییەکەی جارانت دەستی پێ کرد، ئیدی نوێژ مەکە تا کاتێ بێنوێژییەکەی جارانت دەڕوا، جا ئەو خوێنەی پێتەوەیە بیشۆرە (و خۆت بشۆرە و) پاشان نوێژ بکە))، (هیشام کە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیەیە)، دەڵێ: باوکم وتی: (پێغەمبەر ﷺ فەمووی): ((پاشان بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژێکی تازە بگرە، هەتا کاتی بێنوێژییەکەی جاران دێتەوە)).**

## ٦٨- بابُ غَسْلِ المَنِيِّ وَفَرْكِهِ، وَغَسْلِ مَا يُصِيبُ مِنَ المَرْأَةِ

٢٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ مَيْمُونٍ الجَزَرِيُّ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْسِلُ الجَنَابَةَ مِنْ ثَوْبِ النَّبِيِّ ﷺ، فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلَاةِ، وإِنَّ بُقَعَ المَاءِ فِي ثَوْبِهِ[1].

## ٦٨- باسی شۆردنی مەنی و پڕواندنی، وە شۆردنی مەنی گەر بەر پۆشاکی ئافرەت کەوت

**٢٢٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: من پاشماوەی لەشگرانیم دەشۆرد بە جلی پێغەمبەرەوە ﷺ، جا دەچوو بۆ نوێژ (بۆ مزگەوت)، پەڵەی ئاوی (شۆردنەکە) بە جلەکەیەوە دیار بوو.**

٢٣٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ح. وَحَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مَيْمُونٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ

[1] بڕوانە: ٢٣٠، ٢٣١، ٢٣٢.

يَسَارٍ قَالَ: سَألتُ عَائِشَةَ عَنِ المَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ، فَقَالَتْ: كنْتُ أَغْسِلُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلَاةِ وَأثَرُ الغَسْلِ فِي ثَوْبِهِ بُقَعُ المَاءِ[1].

**٢٣٠- سولەیمانی کوڕی یەسار دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد ﵂ دەربارەی ئەو مەنییەی کە بەر جلوبەرگ دەکەوێت؟ ئەویش وتی: من بە جلەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەمشۆرد، ئینجا دەرۆیشت بۆ نوێژ شوێنەواری شۆردنەکە بە جلەکانیەوە وەك پەڵەی ئاو دیار بوو.**

## ٦٩- بابٌ: إِذَا غَسَلَ الجَنَابَةَ أَوْ غَيْرَهَا فَلَم يَذْهَبْ أَثَرُهُ

**٢٣١-** حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدُّثَنَا عَمْرُو بْن مَيْمُونٍ قَالَ: سَأَلْتُ سلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ فِي الثَّوبِ تُصِيبُهُ الجَنَابَة؟ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: كنْتُ أَغسِلُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يَخرج إِلَى الصَّلَاةِ وَأَثَرُ الغَسْلِ فِيهِ بقَعُ المَاءِ.

## ٦٩- باسێک: ئەگەر مەنی یان هەر شتێکی دیکە شۆرا و شوێنەوار مایەوە و لانەچوو

**٢٣١- عەمری کوڕی مەیمون دەڵی: پرسیارم لە سولەیمانی کوڕی یەسار کرد، دەربارەی جل و پۆشاکێ مەنی بەربکەوێ، سولەیمان وتی: عائیشە ﵂ وتی: من مەنیم دەشۆرد بە جلەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ، پاشان دەچوو بۆ نوێژ، شوێنەواری شۆردنەکەی پێوە بووکە پەڵە ئاو بوو.**

**٢٣٢-** حَدَّثَنَا عَمْرُو بن خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بن مَيمُونِ بْنِ مِهْرَانَ، عن سُلَيمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عن عَائِشَةَ، أَنَّهَا كَانَتْ تَغسِلُ المَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ أَرَاهُ فِيهِ بُقعَةَ أَوْ بُقَعًا[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٢٩.

**٢٣٢- سولەیمانی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﷺ کە مەنی بە جلی پێغەمبەرەوە ﷺ دەشۆرد، پاشان پەڵەیەك، یان چەند پەڵەیەکم دەبینی بە جلەکەیەوە.**

## ٧٠- بابُ أَبْوَالِ الإِبِلِ وَالدَّوَابِّ وَالْغَنَمِ وَمَرَابِضِهَا

وَصَلَّى أَبُو مُوسَى فِي دَارِ البَرِيدِ وَالسِّرْقِينِ وَالْبَرِّيَّةُ إلى جَنْبِهِ، فَقَالَ: هَا هُنَا وَثَمَّ سَوَاءٌ.

**٢٣٣-** حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ أُنَاسٌ مِن عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ، فَاجْتَوَوُا المدِينَةَ، فَأَمَرَهُم النَّبِيُّ ﷺ بِلِقَاحٍ، وَأَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وأَلْبَانِهَا، فَانْطَلَقُوا، فَلَمَّا صَحُّوا قَتَلُوا رَاعِيَ النَّبِيِّ ﷺ وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ، فجاءَ الخَبَرُ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ، فَلَمَّا ارتَفَعَ النَّهَارُ جِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسُمِرَتْ أَعْيُنُهُمْ، وَأُلْقُوا فِي الحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ فَلَا يُسْقَوْنَ. قَالَ أَبُو قِلابَةَ: فهؤلاء سَرَقُوا وَقَتَلُوا وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ، وَحَارَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ[٢].

## ٧٠- باسی (حوکمی) میزی وشتر و وڵاخ و مەڕ و (حوکمی) پەچەی ئاژەڵ

**ئەبو مووسا ﷺ لە شوێنێکدا کە پێی دەڵێن** (دار البريد)[٣] **نوێژی کرد، کە زبڵدان و دەشت و چۆڵییەکیش لە تەنیشتیدا بوو، ئینجا وتی: ئێرە و ئەوێ وەك یەك وان و یەکسانن[٤].**

---

[١] بڕوانە: ٢٢٩.

[٢] بڕوانە: ١٥٠١، ٣٠١٨، ٤١٩٢، ٤١٩٣، ٤٦١٠، ٥٦٨٥، ٥٦٨٦، ٥٧٢٧، ٦٨٠٢، ٦٨٠٣، ٦٨٠٤، ٦٨٠٥، ٦٨٩٩.

[٣] دار البريد: شوێنێکە لە کوفە نێردراو لەلایەن خەلیفەوە بۆلای ئەمیر و کاربەدەستان کە دەهات لەوێ لای دەدا و دەمایەوە.

[٤] واتە: ئەو شوێنەی ئەو نوێژی تێدا کرد لەگەڵ سەنێرگە و چۆڵییەکە یەکسانن، ئەمە ڕای ئەبو مووسایە پێچەوانەی ڕای هاوەڵانە.

**٢٣٣- ئەنەس ﷺ دەڵێ: چەند کەسێك لە هۆزی عوكل -یان عورەینە- هاتن (بۆ مەدینە و موسوڵمان بوون)، خواردن و ئاووهەوای مەدینەیان پێ نەکەوت[1]، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن (بڕۆنە دەرەوەی مەدینە) بۆ نێو وشترەکانی زەکات، وە لە میز و شیریان بخۆنەوە، ئەوانیش ڕۆیشتن. جا کە چاك بوونەوە شوانەکەی پێغەمبەریان ﷺ کوشت، وشترەکانیان دایە بەر. ئینجا لە سەرەتای ڕۆژەوە هەواڵەکە گەشت (بە پێغەمبەر ﷺ)، ئەویش چەند چەکدارێکی نارد بە شوێنیاندا، کە خۆر بەرز بۆیەوە هێنایاننەوە (بۆ مەدینە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەست و قاچیان بڕین، جا بە بزماری سوورەوەکراو چاویان ڕشتن (یان چاویان هەڵکۆڵین)، وە توڕیان دانە[2] بەردەڵانە ڕەشەکەی دەرەوەی مەدینە، داوای ئاویان دەکرد پێیان نەدەدرا، ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەوانە دزییان کرد و خەڵکیان کوشت و پاشگەز بوونەوە، دوای باوەڕهێنانیان دژی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ وەستان و جەنگیان کرد.**

٢٣٤- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو التَّيَّاحِ يَزِيدُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي قَبْلَ أَنْ يُبْنَى المَسْجِدُ فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ[3].

**٢٣٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێش ئەوەی مزگەوت دروست بکرێت، پێغەمبەر ﷺ لە پەچە (مۆڵگە)ی مەڕ و بزندا نوێژی دەکرد.**

---

[1] حەزیان بە ئاووهەوای مەدینە نەکرد، ورگیان ئاوسا (سینەیان تەنگ بوو).

[2] توڕیان دان: فڕێیان دان.

[3] بڕوانە: ٤٢٨، ٤٢٩، ١٨٦٨، ٢١٠٦، ٢٧٧١، ٢٧٧٤، ٢٧٧٩، ٣٩٣٢.

## ٧١- بابُ مَا يَقَعُ مِنَ النَّجَاسَاتِ فِي السَّمْنِ وَالْمَاءِ

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: لَا بَأْسَ بِالْمَاءِ مَا لَمْ يُغَيِّرْهُ طَعْمٌ أَوْ رِيحٌ أَوْ لَوْنٌ. وَقَالَ حَمَّادٌ: لَا بَأْسَ بِرِيشِ المَيْتَةِ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ فِي عِظَامِ المَوْتَى نَحْوَ الفِيلِ وَغَيْرِهِ: أَدْرَكْتُ نَاسًا مِنْ سَلَفِ العُلَمَاءِ يَمْتَشِطُونَ بِهَا، وَيَدَّهِنُونَ فِيهَا، لَا يَرَوْنَ بِهِ بَأْسًا. وقَالَ ابن سِيرِينَ وَإِبْرَاهِيمُ: وَلَا بَأْسَ بِتِجَارَةِ العَاجِ.

## ٧١- باسی (حوکمی) ئەو پیسییانەی دەکەونە ڕۆن و ئاوەوە

**زوهری دەڵێ: ئاو ئەگەر تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕێ قەیناکات هەرچی تێ بکەوێ. وە حەماد دەڵێ: پەڕی مردارەوەبوو هیچ قەیدی نییە (بکەوێتە ئاوەوە). وە زوهری دەربارەی ئێسکی مردارەوەبوو وەك فیل و شتی دیکە دەڵێ: بە چەند کەس لە زانایانی پێشوو گەیشتووم قژیان پێ داهێناوە، وەك شانە چەوریان تێ کردووە و بەلایانەوە ئاسایی بوو. ئیبنو سیرین و ئیبراهیم دەڵێن: بازرگانیکردن بە عاجەوە (دوو کەڵبە درێژەکەی فیل) ئاساییە.**

٢٣٥- حَدَّثَنَا اِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: «أَلْقُوهَا، وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ، وَكُلُوا سَمْنَكُمْ»[1].

**٢٣٥- مەیمونە ﵂ گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی مشك بکەوێتە ڕۆنەوە، ئەویش فەرمووی: ((مشکەکە (تور دەن) و ئەو (ڕۆنە)ش کە بەدەوریایە فڕێی بدەن و ڕۆنەکەتان بخۆن)).**

[1] بڕوانە: ٢٣٦، ٥٥٣٨، ٥٥٣٩، ٥٥٤٠.

٢٣٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: «خذُوهَا، وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ». قَالَ مَعْنٌ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ مَا لَا أُحْصِيهِ يَقُولُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ[1].

**٢٣٦- مەیمونە ﵂ گێڕاویەتەوە: کە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی مشك بکەوێتە نێو ڕۆنەوە، ئەویش فەرمووی: ((مشکەکە و ئەو ڕۆنەی بە دەوریدایە هەڵگرن و فڕێی دەن))، مەعن دەڵێ: مالیك ئەوەندەی ئەم فەرموودە بۆ گێڕاوینەوە کە لە ژمارە نایەت، دەیوت: لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ئەویش لە مەیمونەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە.**

٢٣٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ محَمَّدٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عن هَمَّامِ ابْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ كَلْمٍ يُكْلَمُهُ المُسْلِمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَكُونُ يَوْمَ القِيَامَةِ كَهَيْئَتِهَا إِذْ طُعِنَتْ، تَفَجَّرُ دَمًا، اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ، وَالْعَرْفُ عَرْفُ المِسْكِ»[2].

**٢٣٧-ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر برینداربیەك موسوڵمان پێی بریندار ببێ لە ڕێی خوادا، لە ڕۆژی دوایی برینەکەی وەك ئەو شێوەیە کە کاتێ بریندار کراوە، خوێنی لێ دەڕوا، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەی بۆنی میسکە)).**

---

[1] بڕوانە: ٢٣٥.

[2] بڕوانە: ٢٨٠٣، ٥٥٢٣.

## ٧٢- بَابُ البَوْلِ فِي المَاءِ الدَّائِمِ

٢٣٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: أَخبَرَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ هُرْمُزَ الأَعْرَجَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ»[1].

## ٧٢- باسی میزکردنە نێو ئاوی ڕاوەستاو

**٢٣٨- ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتەوە کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئێمەین کۆتاهەمینی پێشکەوتووان)) (واتە: کۆتاهەمین ئومەتین لە دونیادا، لە ڕۆژی دواییشدا یەکەمینین لە ڕووی پلە و پایەوە).**

٢٣٩- وَبِإِسْنَادِهِ قَالَ: «لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي المَاءِ الدَّائِمِ الذِي لَا يَجْرِي، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ».

**٢٣٩- بە هەمان ڕشتەی پێشوو ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ کەسێکتان میز نەکاتە ئاوی ڕاوەستاو کە ناڕوات پاشان خۆشی تێدا بشۆرێ)).**

## ٧٣- بَابٌ: إِذَا أُلْقِيَ عَلَى ظَهْرِ المُصَلِّي قَذَرٌ أَوْ جِيفَةٌ لَمْ تَفْسُدْ عَلَيْهِ صَلَاتُهُ

وَكَانَ ابن عُمَرَ إِذَا رَأَى فِي ثَوْبِهِ دَمًا وَهُوَ يُصَلِّي وَضَعَهُ وَمَضَى فِي صَلَاتِهِ. وَقَالَ ابن المُسَيَّبِ وَالشَّعْبِيُّ: إِذَا صَلَّى وَفِي ثَوْبِهِ دَمٌ أَوْ جَنَابَةٌ أَوْ لِغَيْرِ القِبْلَةِ أَوْ تَيَمَّمَ، فَصَلَّى ثُمَّ أَدْرَكَ المَاءَ فِي وَقْتِهِ، لَا يُعِيدُ.

---

[1] بڕوانە: ٨٧٦، ٨١٦، ٢٩٥٦، ٣٤٨٦، ٦٦٢٤، ٦٨٨٧، ٧٠٣٦، ٧٤٩٥.

# ٧٣- باسێک: ئەگەر شتێکی پیس یان مردارەوەبوویەک فڕێبدرێتە سەر پێستی نوێژکەر نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ نوێژی بکردایە ئەگەر خوێنی بە جلەکانییەوە ببینیایە، جلەکەی دادەنا و بەردەوام دەبوو لەسەر نوێژەکەی. وە ئیبنو موسەیەب و شەعبی دەڵێن: ئەگەر کەسێ نوێژی کرد و جلەکانی خوێن یان شوێنەواری لەشگرانی پێوە بوو، یان ڕووی لە قیبلە نەبوو، یان تەیەمومی کرد و نوێژی کرد، پاشان گەشت بە ئاو و کاتی نوێژەکە مابوو، (لە هەموو ئەمانەدا) نوێژەکەی ناکاتەوە.**

٢٤٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَاجِدٌ ح. قَالَ: وَحَدَّثَنِي أَحمَدُ بْنُ عُثْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُرَيْحُ بْنُ مَسلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبرَاهِيمُ بن يُوسُفَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مَيمُونٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عِنْدَ البَيْتِ، وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ، إِذْ قَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَيُّكُمْ يَجِيءُ بِسَلَى جَزُورِ بَنِي فُلَانٍ فَيَضَعُهُ عَلَى ظَهْرِ مُحَمَّدٍ إِذَا سَجَدَ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَى القَوْمِ فَجَاءَ بِهِ، فَنَظَرَ حَتَّى إِذَا سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ وضَعَهُ على ظَهْرِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، وَأَنَا أَنْظُرُ، لَا أُغَيِّرُ شَيْئًا، لَوْ كَانَ لِي مَنْعَةٌ. قَالَ: فَجَعَلُوا يَضْحَكُونَ، وَيُحِيلُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَاجِدٌ لَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ، حَتَّى جَاءَتْهُ فَاطِمَةُ، فَطَرَحَتْ عَنْ ظَهْرِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَشَقَّ عَلَيْهِمْ إِذْ دَعَا عَلَيْهِمْ- قَالَ: وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الدَّعْوَةَ فِي ذَلِكَ البَلَدِ مُسْتَجَابَةٌ -ثُمَّ سَمَّى: «اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ، وَعَلَيْكَ بِعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ» وَعَدَّ السَّابعَ فَلَمْ يحْفَظْهُ، قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ الذِينَ عَدَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَرْعَى فِي القَلِيبِ، قَلِيبِ بَدْرٍ[1].

---

[1] بروانە: ٥٢٠، ٢١٣٤، ٣١٨٥، ٣٨٥٤، ٣٩٦٠.

٢٤٠- عەمری كوڕی مەیمون لە عەبدوڵاوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوژدەدا بوو، وە عەمری كوڕی مەیمون گێڕاویەتەوە كە عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە[1]: كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پەنا كەعبەدا نوێژی دەكرد، ئەبو جەهل و چەند هاوڕێیەكیشی دانیشتبوون، بە یەكدییان وت: كام لە ئێوە ورگ و ڕیخۆڵەی ئەو وشترەی كوڕانی فڵان كەس سەریان بڕیوە دێنێ، وە كاتێ موحەممەد چووە سوژدە دەیخاتە سەر پشتی؟ خراپترى نێو ئەو كەسانە ڕۆیشت و هێنای، چاوەڕوانی كرد تا پێغەمبەر ﷺ چووە سوژدە، وە خستیە سەر پشتی لە نێوان هەردوو شانیدا داینا، (عەبدوڵا دەڵێ:) منیش سەیرم كرد نەمدەتوانی هیچ بكەم، ئەگەر پشت و پەنام هەبووایە (نەمدەهێڵا كاری وا بكەن)، جا دەستیان كرد بە پێكەنین و دەكەوتن بەسەر یەكدیدا (لەبەر زۆر پێكەنین و لاقرتێیان)، پێغەمبەریش ﷺ هەر لە سوژدەدا بوو سەری بەرز نەدەكردەوە، هەتا فاتیمەی كچی هات پیساییەكەی لابرد بەسەر پشتیەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز كردەوە پاشان فەرمووی: ((خوایە قوڕەیش لەنێو ببەیت)) سێ جار ئەمەی فەرموو، ئەوانیش دوعاكردنی پێغەمبەر ﷺ لێیان سەخت بوو بەلایانەوە، عەبدوڵا دەڵێ: قوڕەیشییەكان دەیانزانی دوعا لەو شارەدا گیرا دەبێت، پاشان پێغەمبەر ﷺ ناوی ئەوانی برد (و دوعای لێ دەكردن)، فەرمووی: ((خوایە تۆڵە بسەنی لە ئەبو جەهل و عوتبەی كوڕی ڕەبیعە و شەیبەی كوڕی ڕەبیعە و وەلیدی كوڕی عوتبە و ئومەییەی كوڕی خەلەف و عوقبەی كوڕی ئەبو موعەیت))، كەسی حەوتەمیشی ژمارد (ناو هێنا)، بەڵام لەبیرمان نەماوە. عەبدوڵا دەڵێ: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بێگومان ئەو كەسانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی هێنان، هەموویانم دی (بە كوژراوی) كەوتبوون لە كۆنە بیرێك لە بیرەكانی بەدردا.

---

[1] ئیمام بوخاری ئەم فەرموودەیەی بە دوو سەنەد گێڕاوەتەوە لە عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە ﷺ.

## ٧٤- بابُ البُزَاقِ وَالْمُخَاطِ وَنَحْوِهِ فِي الثَّوْبِ

قَالَ عُرْوَةُ، عَنِ المِسْوَرِ وَمَرْوَانَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ زَمَنَ حُدَيْبِيَةَ. فَذَكَرَ الحَدِيثَ. وَمَا تَنَخَّمَ النَّبِيُّ ﷺ نُخَامَةً إِلَّا وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ[١].

## ٧٤- باسی تف و چڵم و هاوشێوەی بکرێتە جل و پۆشاکەوە

**عوروە گێڕاویەتەوە لە میسوەر و مەڕوانەوە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ئەو ساڵەی ڕێکەوتنی حودەیبییەی تێدا بوو لە مەدینە دەرچوو، جا فەرموودەیەکی باس کرد، (کە ئەمە بەشێکیەتی:) پێغەمبەر ﷺ هەر تفێکی دەکرد دەکەوتە نێو دەستی پیاوێکیانەوە، ئەو کەسەش دەیهێنا بە دەموچاو و پێستیدا.**

٢٤١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حُمَيدٍ، عن أَنَسٍ قَالَ: بَزَقَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ثَوْبِهِ. طَوَّلَهُ ابن أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

**٢٤١- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تفی کردە دوو توێی پۆشاکەکەیەوە. (لە کاتی نوێژکردنیدا) ئیبنو مەریەم ئەم فەرموودەیە بە ڕشتە (سەنەد)ێکی درێژتر دەگێڕێتەوە بەم شێوە و دەڵێ: یەحیای کوڕی ئەیوب بۆی گێڕاینەوە دەڵێ: حومەید بۆی گێڕامەوە و وتی: لە ئەنەسم بیست ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ...**

---

[١] بڕوانە: ١٦٩٤، ١٦٩٥.

[٢] بڕوانە: ٤٠٥، ٤١٢، ٤١٧، ٥٣١، ٥٣٢، ١٢١٤.

## ٧٥- بابٌ: لَا يَجُوزُ الوُضُوءُ بِالنَّبِيذِ وَلَا المُسْكِرِ

وَكَرِهَهُ الحَسَنُ وَأَبُو العَالِيَةِ. وَقَالَ عَطَاءٌ: التَّيَمُّمُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الوُضُوءِ بِالنَّبِيذِ وَاللَّبَنِ.

٢٤٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ»[1].

## ٧٥- باسێک: دەستنوێژگرتن بە خۆشاو[2] و سەرخۆشکەر دروست نییە

**حەسەن و ئەبولعالیە دەستنوێژگرتن بە خۆشاویان بە مەکروھ داناوە، عەتائیش دەڵێ: تەیەمومم لا چاکترە لە دەستنوێژگرتن بە خۆشاو و شیر.**

**٢٤٢- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش (بێهۆش) بکات، ئەوە حەرامە)).**

## ٧٦- بابُ غَسْلِ المَرْأَةِ أَبَاهَا الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ

وَقَالَ أَبُو العَالِيَةِ: امْسَحُوا عَلَى رِجْلِي فَإِنَّهَا مَرِيضَةٌ.

٢٤٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، سَمِعَ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ، وَسَأَلَهُ النَّاسُ -وَمَا بَيْنِي وَبَيْنَهُ أَحَدٌ-: بِأَيِّ شَيْءٍ دُووِيَ جُرْحُ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَ: مَا بَقِيَ أَحَدٌ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، كَانَ عَلِيٌّ يَجِيءُ بِتُرْسِهِ فِيهِ مَاءٌ، وَفَاطِمَةُ تَغْسِلُ عَنْ وَجْهِهِ الدَّمَ، فَأُخِذَ حَصِيرٌ فَأُحْرِقَ، فَحُشِيَ بِهِ جُرْحُهُ[3].

---

[1] بڕوانە: ٥٥٨٥، ٥٥٨٦.

[2] خۆشاو: ئاوێکە خورما و هاوشێوەی خورمای تێ دەکرێت تا شیرینی خورماکە تێکەڵی ئاوەکە بێت و خۆش و شیرین بێت، بە مەرجێ نەگاتە ڕادەی بوون بە عارەق و سەرخۆشکەر. إرشاد الساري: ٤٧٦/١.

[3] بڕوانە: ٢٩٠٣، ٢٩١١، ٣٠٣٧، ٤٠٧٥، ٥٢٤٨، ٥٧٢٢.

## ٧٦- باسی ئافرەت خوێن لە دەموچاوی باوکی بشوات

**ئەبولعالیە وتی: دەستی تەڕ بێنن بە قاچمدا، چونکە قاچم نەخۆشە.**

**٢٤٣- ئەبو حازیم دەڵێ: گوێم لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ بوو -لە کاتێکدا لە نێوان من و سەهلدا کەس نەبوو- کە خەڵکی پرسیاریان لێ دەکرد: بە چ شتێك برینەکەی پێغەمبەر ﷺ دەرمان کرا؟ سەهلیش وتی: کەس نەماوە لە من شارەزاتر لەو بارەیەوە، عەلی لە قەڵغانەکەیدا ئاوی دەهێنا و فاتیمەش ئەو خوێنەی کە بە دەموچاوی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو دەیشۆرد، (جا لە لایەن فاتیمەوە) پارچە حەسیرێك هێنرا و سوتێنرا، خۆڵەمێشەکەی خرایە سەر برینەکەی پێغەمبەر ﷺ.**

## ٧٧- بابُ السِّوَاكِ[1]

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: بِتُّ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَاسْتَنَّ.

٢٤٤- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ غَيْلَانَ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَوَجَدْتُهُ يَسْتَنُّ بِسِوَاكٍ بِيَدِهِ، يَقُولُ: «أُعْ أُعْ». وَالسِّوَاكُ فِي فِيهِ، كَأَنَّهُ يَتَهَوَّعُ.

## ٧٧- باسی سیواککردن

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: شەو لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ مامەوە، جا ئەو سیواکی بەکار هێنا (بۆ دەم و ددانی).**

---

[1] (السواك) بە سیواککردن دەوترێت، وە بە داری سیواکەکەش دەوترێت. إرشاد الساري: ٤٧٩/١.

**٢٤٤- ئەبو بوردە لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە وتی: ڕۆیشتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، بینیم سیواكێكی بە دەستەوە بوو، سیواكی پێ دەكرد و دەیفەرموو: ((ئوع ئوع))، سیواكەكە لە دەمیدا بوو وەك ئەوەی بڕشێتەوە وا بوو.**

٢٤٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ[1].

**٢٤٥- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێ شەو هەڵدەسا بۆ شەونوێژ سیواكی دەهێنا بە دەم و ددانیدا (و پاكی دەكردەوە).**

## ٧٨- بابُ دَفعِ السِّوَاكِ إلى الأكبَرَ

٢٤٦- وَقَالَ عَفَّانُ: حَدَّثَنَا صَخْرُ بْنُ جُوَيْرِيَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: .أَرَانِي أَتَسَوَّكُ بِسِوَاك، فَجَاءَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ مِنْهُمَا، فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ. فَدَفَعْتُهُ إِلَى أَكبَرُ مِنْهُمَا. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: اخْتَصَرَهُ نُعَيْمٌ، عَنِ ابن الْمبَارَكِ، عَنْ أُسَامَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

## ٧٨- باسی سیواكدان بەو كەسەی گەورەترە

**٢٤٦- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لە خەومدا خۆم دی بە دارسیواكێ سیواك دەكەم، جا دوو پیاو هاتن بۆ لام یەكێكیان لەوی دیكەیان گەورەتر بوو، منیش سیواكەكەم دا بە بچووكەكەیان، پێم وترا: گەورەكەیان پێش خە، بۆیە منیش سیواكەكەم دا بە گەورەكەیان))[2].**

---

[1] بڕوانە: ٨٨٩، ١١٣٦.

[2] سەرنج: لەم فەرموودەیەوە دەردەكەوێ كە پێشخستنی پیاوی بەتەمەن باشترە لە سیواكپێدان و كاری باشەدا، وەک خواردن و خواردنەوە و .... هتد .

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) وتی: نوعەیم ئەم فەرموودەیەی بە كورتتر هێناوە، بۆی گێڕاوینەتەوە لە عەبدوڵای كوڕی موبارەكەوە، ئەویش لە ئوسامەوە، ئەویش لە نافیعەوە، ئەویش لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە ﭫ.**

## ٧٩- بابُ فَضْلِ مَنْ بَاتَ عَلَى الوُضُوءِ

٢٤٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلِ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الذِي أَرْسَلْتَ. فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ فَأَنْتَ عَلَى الفِطْرَةِ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ». قَالَ: فَرَدَّدْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَلَمَّا بَلَغْتُ: «اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الذِي أَنْزَلْتَ». قُلْتُ: وَرَسُولِكَ. قَالَ: «لَا، وَنَبِيِّكَ الذِي أَرْسَلْتَ»[1].

## ٧٩- باسی گەورەیی ئەو كەسەی شەو بەدەستنوێژەوە بخەوێ

**٢٤٧- بەرائی كوڕی عازیب ﭬ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەو كاتەی دەچیتە سەر جێگای نوستنەكەت، چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ دەگری دەستنوێژ بگرە، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕاكشێ، پاشان بڵێ: خوایە خۆم دایە دەستی تۆ و كاروباری خۆم بە تۆ سپارد، تەنها پشتم بە تۆ بەستووە، ئومێدم هەر بە تۆیە**

[1] بڕوانە: ٦٣١١، ٦٣١٣، ٦٣١٥، ٧٤٨٨.

**ترسیشم هەر لە تۆیە، هیچ پەناگە و پارێزەرێك نییە لە بەرانبەر تۆدا، مەگەر لای خۆت، خوایە باوەڕم هەیە بەو پەڕاوەی داتبەزاندووە، وە بەو پێغەمبەرەی ناردووتە، جا ئەگەر لەو شەوەتدا مردیت، ئەوە لەسەر ئیمان دەمریت، وە ئەم نزایە بکەرە کۆتاهەمینی قسەکانت)). بەڕاو دەڵێ: منیش ئەم نزایەم بۆ پێغەمبەر ﷺ وتەوە جا کە گەشتمە** (اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الذِي أَنْزَلْتَ، **وتم:** (وَرَسُولِكَ)، **فەرمووی: ((نەخێر،** وَنَبِيِّكَ الذِي أَرْسَلْتَ**))**[1]

---

[1] واتە: بەڕاء لەجیاتی (وَنَبِيِّكَ) وتی: (وَرَسُولِكَ)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆی ڕاست کردەوە. دەربارەی (نبی) و (رسول) زۆربەی زانایان دەڵێن: هەردووکیان وەحیان بۆ هاتووە لە خوداوە، جیاوازییان ئەوەیە (نبی) فەرمانی پێ نەکراوە بەگەیاندنی بە خەڵکی، بەڵام (رسول) فەرمانی پێ کراوە بە گەیاندنی بەخەڵکی. بڕوانە: فتح الباري: ١١٢/١١، المعين على تفهم الأربعين لابن الملقن: ص٣٩. بەڵام الشنقيطي لە (أضواء البيان: ٢٩٠/٥) دا دەڵێ: (نبي) و (رسول) جیاوازییان نییە .

# ٥- كِتَابُ الغُسْلِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥- پەڕاوی خۆشۆردن

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَـٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾ ﴾ المائدة. وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ ﴾ النساء.

**وە باسی ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەگەر لەشتان گران بوو ئەوە (خۆتان خاوێن بکەنەوە)، وە ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون، یان کەسێکتان لە سەرئاو گەڕایەوە، یان لەگەڵ خێزانەکانتاندا جووت بوون و ئاوتان دەست نەکەوت، ئەوە بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن، جا دەستی تۆزاوی بهێنن بەدەموچاو و دەستەکانتاندا، خوا نایەوێ هیچ ناڕەحەتییەك لەسەر ئێوە**

دانێ، بەڵكوو دەیەوێ پاك و خاوێنتان بكاتەوە، وە بەهرە (بەخشش)ی خۆی بەتەواوی بڕژێ بەسەرتاندا، تا شوكرانەبژێری خوا بكەن)، وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، نزیكی نوێژ (مزگەوت) مەبنەوە لە كاتێكدا ئێوە سەرخۆشن، هەتا بزانن چی دەڵێن، بەلەشگرانیش نزیكی (مزگەوت) مەبنەوە، مەگەر پێیدا تێ پەڕن هەتا ئەو كاتەی خۆتان دەشۆرن، وە ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان كەسێكتان لە سەرئاو گەڕایەوە، یان لەگەڵ هاوسەرەكانتاندا جووت بوون و ئاوتان دەست نەكەوت، ئەوە بە خۆڵێكی پاك تەیەموم بكەن، ئینجا دەستی تۆزاوی بهێنن بە ڕوخسار و دەستەكانتاندا، بەڕاستی خوا هەمیشە چاوپۆشیكەری لێخۆشبووە).

## ١- بابُ الوُضُوءِ قَبْلَ الغُسْلِ

٢٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامٍ، عن أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الجنَابَةِ بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي المَاءِ، فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ يُفِيضُ المَاءَ على جِلْدِهِ كُلِه[1].

## ١- باسی دەستنوێژگرتن پێش خۆشۆردن (سوننەتە)

٢٤٨- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەر ﷺ كاتێك خۆی دەشۆری لەبەر لەشگرانی، بە شۆردنی دەستەكانی دەستی پێ دەكرد، پاشان دەستنوێژی دەگرت وەك چۆن دەستنوێژی دەگرت بۆ نوێژ، پاشان پەنجەكانی

---

[1] بڕوانە: ٢٦٢، ٢٧٢.

**دەكرد بەنێو ئاوەكەدا و دەیكرد بە بنی مووەكانی سەریدا (بۆ ئەوەی بەجوانی تەڕ ببێ)، پاشان بە هەردوو دەستی سێ مشت ئاوی دەكرد بەسەریدا، پاشان ئاوی دەكرد بە هەموو لاشەیدا.**

٢٤٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيمُونَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ غَيْرَ رِجْلَيهِ، وَغَسَلَ فَرْجَهُ، وَمَا أَصَابَهُ مِنَ الأذَى، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَيْهِ المَاءَ، ثمَّ نَحَّى رِجْلَيْهِ فَغَسَلَهُمَا، هذِهِ غُسْلُهُ مِنَ الجَنَابَةِ[1].

**٢٤٩- مەیمونەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت وەك دەستنوێژ بۆ نوێژ جگە لە هەردوو پێكانی، وە عەورەتی و ئەو ئاوەشی پێیوە بوو شۆردی، پاشان ئاوی كرد بە هەموو لاشەیدا، پاشان پێیەكانی گواستەوە شوێنێكی دیكە و شۆردنی، ئەوە خۆشۆردنی پێغەمبەر ﷺ بوو لە لەشگرانیدا.**

## ٢- باب: غُسْلِ الرَّجُلِ مَعَ امْرَأَتِه

٢٥٠- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ قَدَحٍ، يُقَالُ لَهُ: الفَرَقُ[2].

## ٢- باسی خۆشۆردنی پیاو لەگەڵ خێزانیدا[3]

**٢٥٠- عائیشە ﷺ دەڵێ: من و پێغەمبەر ﷺ لە یەك دەفردا خۆمان دەشۆرد، كە پێیان دەوت: فەرەق[1].**

[1] بڕوانە: ٢٥٧، ٢٥٩، ٢٦٠، ٢٦٥، ٢٦٦، ٢٧٤، ٢٧٦، ٢٨١.

[2] بڕوانە: ٢٦١، ٢٦٣، ٢٧٣، ٢٩٩، ٥٩٥٦، ٧٣٣٩.

[3] بە ئاوی یەك تەشت و دەفر.

## ٣- بابُ الغُسْلِ بِالصَّاعِ وَنَحْوِهِ

٢٥١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ: حَدَّثَنِي شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ يَقُولُ: دَخَلْتُ أَنَا وَأَخُو عَائِشَةَ عَلَى عَائِشَةَ، فَسَأَلَهَا أَخُوهَا عَنْ غَسْلِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَتْ بِإِنَاءٍ نَحْوًا مِنْ صَاعٍ، فَاغْتَسَلَتْ وَأَفَاضَتْ عَلَى رَأْسِهَا، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا حِجَابٌ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ يَزِيد بْنُ هَارُونَ وَبَهْزٌ وَالْجُدِّيُّ، عَنْ شُعْبَةَ: قَدْرِ صَاعٍ.

## ٣- باسی خۆشۆردن بە صاعێک و نزیکی صاعێک ئاو

**٢٥١- ئەبو سەلەمە دەڵێ: من و برایەکی عائیشە ﵂ ڕۆیشتین بۆ ماڵی عائیشە، براکەی پرسیاری لە عائیشە کرد دەربارەی شێوەی خۆشۆردنی پێغەمبەر ﷺ (لە لەشگرانی)، عائیشەش ﵂ داوای دەفرێك ئاوی کرد نزیکی صاعێك دەبوو، ئینجا خۆی پێ شۆری و ئاوی کرد بە سەریدا و لە نێوان ئێمە و ئەودا پەردەیەك هەبوو. ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: یەزیدی کوڕی هارون و بەهز و جودی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لە شوعبەوە بەم شێوەیە: دەفرێك ئەندازەی صاعێك بوو.**

٢٥٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ هُوَ وَأَبُوهُ، وَعِنْدَهُ قَوْمٌ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الغُسْلِ، فَقَالَ: يَكْفِيكَ صَاعٌ. فَقَالَ رَجُلٌ: مَا يَكْفِينِي. فَقَالَ جَابِرٌ: كَانَ يَكْفِي مَنْ هُوَ أَوْفَى مِنْكَ شَعَرًا، وَخَيْرٌ مِنْكَ، ثُمَّ أَمَّنَا فِي ثَوْبٍ[٢].

---

[١] فەرەق: دەفرێکە سێ صاع ئاو دەگرێت، صاعیش چوار مشتە کە دەکاتە: سێ لیتر ئاو، بڕوانە: دائرة المعارف الإسلامية: ١٠٥/١٤ .

[٢] بڕوانە: ٢٥٥، ٢٥٦.

**٢٥٢- ئەبو جەعفەر دەڵێ: خۆی و باوكی لای جابیری كوڕی عەبدوڵا ﷺ بوون، كەسانێكی لا بوو پرسیاریان لێ كرد دەربارەی خۆشۆردنی لەشگرانی، جابیریش وتی: صاعێك ئاو بەشت دەكات و بەسە، پیاوێك وتی: بەشم ناكات (بۆ خۆشۆردن)، جابیریش وتی: بەشی كەسێكی دەكرد كە مووی سەری لە تۆ زۆرتر بوو، لە تۆش چاكتر بوو (واتە: پێغەمبەر ﷺ)، پاشان جابیر بە یەك پۆشاكەوە پێشنوێژی بۆ كردین (هیچی دیكەی لەبەردا نەبوو).**

٢٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَمَيْمُونَةَ كَانَا يَغْتَسِلَانِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ وَقَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ وَبَهْز وَالجُدِّيُّ، عَنْ شُعْبَةَ: قَدْرِ صَاعٍ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: كَانَ ابن عُيَيْنَةَ يَقُولُ: أَخِيرًا عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمونَةَ، وَالصَّحِيحُ مَا رَوى أَبُو نُعَيْمٍ.

**٢٥٣- عەبدوڵای كوڕی عەبباس ﷺ دەیگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ و مەیمونە (ی خێزانی) لە یەك دەفردا پێكەوە خۆیان دەشۆرد. وە یەزیدی كوڕی هارون و بەهز و جودی لە شوعبەوە گێڕایانەوە (كە ئەو دەفرە) بەقەدەر صاعێك دەبوو. ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ئیبنو عویەینە لە دواجاردا بەم شێوەیە دەیگێڕایەوە: عەبدوڵای كوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە مەیمونەوە، بەڵام شێوەی گێڕانەوەی ئەبو نوعەیم ڕاستە (كە ئەم فەرموودەیە وتەی عەبدوڵای كوڕی عەبباس خۆیەتی ﷺ).**

## ٤- بابُ مَنْ أَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثًا

٢٥٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ ابْن صُرَدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا أَنَا فَأُفِيضُ عَلَى رَأْسِي ثَلَاثًا». وَأَشَارَ بِيَدَيْهِ كِلْتَيهِمَا.

# ٤- باسی ئەوەی سێ جار ئاوی کرد بە سەریدا

**٢٥٤- جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڵام من سێ جار ئاو دەکەم بە سەرمدا)). وە ئاماژەی کرد بۆ هەردوو دەستی (واتە: بە هەردوو دەستم).**

٢٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مِخْوَلِ بْنِ رَاشِدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُفْرِغُ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثًا[1].

**٢٥٥- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە سێ جار ئاوی دەکرد بە سەریدا (لە کاتی خۆشۆردنی لەشگرانیدا) .**

٢٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرُ بن يَحْيَى بْنِ سَامٍ، حَدَّثَنِي ابو جَعْفَرٍ قَالَ: قَالَ لِي جَابِرٌ: وَأَتَانِي ابن عَمِّكَ يُعَرِّضُ بِالْحَسَنِ بْنِ مُحَمَّدِ ابن الْحَنَفِيَّةِ، قَالَ: كَيْفَ الْغُسْلُ مِنَ الجَنَابَةِ؟ فَقُلْتُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْخُذُ ثَلَاثَةَ أَكُفٍّ وَيُفِيضُهَا على رَأْسِهِ، ثُمَّ يُفِيضُ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ. فَقَالَ لِي الحَسَنُ: إِنِّي رَجُلٌ كَثِيرُ الشَّعَرِ. فَقُلْتُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَكْثَرَ مِنْكَ شَعَرًا[2].

**٢٥٦- ئەبو جەعفەر دەڵێ: جابیر ﷺ پێی وتم: ئامۆزاکەت هات بۆ لام مەبەستی لەم ناونەبردنە حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنەفییە بوو، وتی: خۆشۆردنی لەشگرانی چۆنە؟ منیش وتم: پێغەمبەر ﷺ سێ مشت ئاوی هەڵدەگرت دەیکرد بە سەریدا، پاشان ئاوی دەکرد بە هەموو لاشەیدا، جا حەسەن (ی ئامۆزات) پێی وتم: من قژم زۆرە! منیش وتم: پێغەمبەر ﷺ قژی لە تۆ زۆرتر بوو.**

---

[1] بڕوانە: ٢٥٢.

[2] بڕوانە: ٢٥٢.

## ٥- بابُ الغُسْلِ مَرَّةً وَاحِدَةً

٢٥٧- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَتْ مَيْمُونَةُ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ مَاءً لِلْغسْلِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ -أَوْ ثَلَاثًا- ثمَّ أَفْرَغَ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ بِالأرضِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيدَيْهِ، ثُمَّ أفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَحَوَّلَ مِنْ مَكَانِهِ فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ[1].

## ٥- باسی خۆشۆردن بە یەک جار ئاوبەخۆداکردن

**٢٥٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: مەیمونە ﷺ وتی: هەندێ ئاوم دانا بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆشۆردنی لەشگرانی، دوو جار -یان سێ جار- هەردوو دەستی شۆرد، پاشان ئاوی کرد بە دەستی چەپیدا و داوێنی شۆرد، پاشان دەستی هێنا بە زەویدا، پاشان ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا و دەموچاو و هەردوو دەستی شۆرد، پاشان ئاوی کرد بە هەموو لاشەیدا، پاشان چووە شوێنێکی دیکە و هەردوو پێی شۆری.**

## ٦- بابُ مَنْ بَدَأَ بِالْحِلَابِ أَوِ الطِّيبِ عِنْدَ الغُسْلِ

٢٥٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عن حَنْظَلَةَ، عَنِ القَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الجَنَابَةِ دَعَا بِشَيْءٍ نَحْوَ الحِلَابِ، فَأَخَذ بِكَفِّهِ، فَبَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الأَيْمَنِ، ثُمَّ الأيسَرِ، فَقَالَ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ.

---

[1] بڕوانە: ٢٤٩.

## ٦- باسی ئەوەی لە کاتی خۆشۆردنی لەشگرانیدا بە دەفرێ ئاو یان بۆنی خۆش دەستی پێ کردووە

٢٥٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەبەر لەشگرانی خۆی دەشۆرد، شتێکی هاوشێوەی حیلابی[1] داوا دەکرد (پڕ لە ئاو)، جا مشتێ ئاوی لێ هەڵدەگرت و سەرەتا دەیکرد بە لای ڕاستی سەریدا، پاشان بە لای چەپی سەریدا، ئینجا بە هەردوو دەستی بە مشت ئاوی دەکرد بە سەریدا.

## ٧- بابُ المَضْمَضَةِ وَالاِسْتِنشَاقِ فِي الجَنَابَةِ

٢٥٩- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْن حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمٌ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدَّثَتْنَا مَيْمُونَةُ قَالَتْ: صَبَبْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ غُسْلًا، فَأَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى يَسَارِهِ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ غَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ الأرضَ فَمَسَحَهَا بِالتُّرَابِ، ثُمَّ غَسَلَهَا، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، وَأَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ، ثُمَّ أُتِيَ بِمِنْدِيل، فَلَمْ يَنْفُضْ بِهَا[2].

## ٧- باسی ئاو لە دەم و لووت ڕادان لە (خۆشۆردنی) لەشگرانیدا

٢٥٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: مەیمونە ﵂ بۆی گێڕاینەوە وتی: ئاوی خۆشۆردنم کردە دەفرێکەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا بە دەستی ڕاستی ئاوی کرد بە دەستی چەپیدا و هەردوو دەستی شۆرد، پاشان داوێنی شۆرد، پاشان دەستی دا بە

---

[1] حیلاب: دەفرێکە بەئەندازەی شیری وشترێک کاتێ دەدۆشرێ ئاو دەگرێ.

[2] بڕوانە: ٢٤٩.

زەویدا و بە خۆڵ سڕی و پاشان شۆردی، پاشان ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا، ئینجا دەموچاوی شۆرد و ئاوی کرد بە سەریدا، ئینجا دوور کەوتەوە، پاشان پێیەکانی شۆرد، پاشان خاولییەکی بۆ هێنرا، بەڵام خۆی پێ وشك نەکردەوە.

## ٨- بابُ مَسْحِ اليَدِين بِالتُّرَابِ لِيَكُونَ أنْقَى

٢٦٠- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عن سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عن كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اغْتَسَلَ مِنَ الجَنَابَةِ، فَغَسَلَ فَرْجَهُ بِيَدِهِ، ثُمَّ دَلَكَ بِهَا الحَائِطَ، ثُمَّ غَسَلَهَا، ثُمَّ تَوَضأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ غَسَلَ رِجْلَيْهِ[1].

## ٨- باسی دەستسڕین بە خاک تا پاکتر بێت

٢٦٠- مەیمونە ﵂ گێڕایەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لەشگران بوو خۆی شۆرد، بەدەستی داوێنی شۆرد، پاشان دەستی هێنا بە دیوارێکدا، پاشان دەستی شۆرد، دواتر دەستنوێژی گرت وەك دەستنوێژگرتنی نوێژ، جا کاتێ لە خۆشۆردنەکەی بۆیەوە، هەردوو پێی شۆری .

## ٩- بابٌ: هَلْ يُدْخِلُ الجُنُبُ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ قَبْلَ أن يَغْسِلَهَا إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَى يَدِهِ قَذَرٌ غَيْرُ الجَنَابَةِ؟

وَأَدْخَلَ ابن عُمَرَ وَالْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ يَدَهُ فِي الطَّهُورِ، وَلَمْ يَغْسِلْهَا ثُمَّ تَوَضَّأَ. وَلَمْ يَرَ ابن عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ بَأْسًا بِمَا يَنْتَضِحُ مِنْ غُسْلِ الجَنَابَةِ.

---

[1] بڕوانە: ٢٤٩.

٢٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن مَسْلَمَةَ، أَخْبَرَنَا أَفْلَحُ، عَنِ القَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ تَخْتَلِفُ أَيْدِينَا فِيهِ[1].

## ٩- باسێک: ئایا لەشگران دروستە دەستی بخاتە دەفری ئاوەکەوە پێش شۆردنی، ئەگەر دەستی جگە لە لەشگرانی هیچی دیکەی پێوە نەبوو؟

**عەبدوڵای کوڕی عومەر و بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەستیان خستە نێو ئاوی دەستنوێژەکەیان نەشیانشۆردبوو، پاشان دەستنوێژیان گرت، عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ بۆچوونیان وایە پرژی ئاوی خۆشۆردنی لەشگرانی هیچ زیانی نییە (و پیس نییە).**

**٢٦١- عائیشە ﷺ دەڵێ: من و پێغەمبەر ﷺ لە یەک دەفردا خۆمان دەشۆرد بەنۆرە دەستمان دەبرد بۆ ئاوەکە (و دەمانکرد بە خۆماندا).**

٢٦٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَهُ[2].

**٢٦٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کات بۆ لەشگرانی خۆی بشۆردایە، دەستی دەشۆرد.**

٢٦٣- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَفْصٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ جَنَابَةٍ. وَعَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ مِثْلَهُ[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٥٠.

[2] بڕوانە: ٢٤٨.

**٢٦٣- عوروه له عائیشەوه ﵂ دەگێڕێتەوه و دەڵێ: من و پێغەمبەر ﷺ له یەك دەفردا خۆمان دەشۆرد لەبەر لەشگرانی. عەبدوڕەحمانی كوڕی قاسم له باوكیەوه ئەویش له عائیشەوه ﵂ وێنەی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوه.**

٢٦٤- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَبْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَالْمَرْأَةُ مِنْ نِسَائِهِ يَغتَسِلَانِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ. زَادَ مُسْلِمٌ وَوَهْبٌ، عن شُعْبَةَ: مِنَ الجَنَابَةِ.

**٢٦٤- ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەیوت: پێغەمبەر ﷺ و ئافرەتێك له خێزانەكانی له یەك دەفردا پێكەوه خۆیان دەشۆرد. موسلیم و وەهب له شوعبەوه گێڕاویانەتەوه ئەم زیادەیان هێناوه: لەبەر لەشگرانی.**

## ١٠- بابُ تَفْرِيقِ الغُسْلِ وَالْوُضُوءِ

وَيُذْكَرُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَهُ غَسَلَ قَدَمَيْهِ بَعْدَ مَا جَفَّ وَضُوءُهُ.

٢٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَحْبُوبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابن عَبَّاسٍ- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَتْ مَيْمُونَةُ: وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَاءً يَغْتَسِل بِهِ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ، فَغَسَلَهُمَا مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ -أَوْ ثَلَاثًا- ثُمَّ أَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالأَرضِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَغَسَلَ رَأْسَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى مِنْ مَقَامِهِ فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ[٢].

---

[١] بڕوانه: ٢٥٠.

[٢] بڕوانه: ٢٤٩.

# ١٠- باسی خۆشۆردن و دەستنوێژگرتن کە ئەندامەکان بەدوای یەکدیدا نەشۆردرێن

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕدرێتەوە: کە دوای ئەوەی ئاوی دەستوێژگرتنەکەی وشك بۆیەوە ئینجا پێیەکانی شۆرد.**

**٢٦٥- لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەڵێ: مەیمونە ﷺ دەڵێ: ئاوم دانا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی پێ بشۆرێ، جا ئاوی کرد بە دەستەکانیدا و دوو جار دوو جار -یان سێ جار- شۆردنی، پاشان بە دەستی ڕاست ئاوی کرد بە دەستی چەپیدا، ئینجا داوێنی شۆرد، پاشان دەستی هێنا بە زەویدا، پاشان ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا، ئینجا دەموچاو و دەستەکانی شۆرد، سێ جار سەری شۆرد، پاشان ئاوی کرد بە لاشەیدا، پاشان لە شوێنەکەی لاچوو جا پێیەکانی شۆرد.**

## ١١- بابُ مَنْ أَفرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فِي الغُسْلِ

٢٦٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عن سَالِمِ بْنِ أَبِي الَجعْدِ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابن عَبَّاسٍ- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الَحارِثِ قَالَتْ: وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُسْلًا وَسَتَرْتُهُ، فَصَبَّ عَلَى يَدِهِ، فَغَسَلَهَا مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ -قَالَ سُلَيمَانُ: لَا أَدْرِي أَذَكَرَ الثَّالِثَةَ أَمْ لَا -ثُم أَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَغَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالأَرْضِ -أَوْ بِالَحائِطِ- ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَغَسَلَ رَأْسَهُ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ، فَنَاوَلْتُهُ خِرْقَةً، فَقَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَلَمْ يُرِدْهَا[١].

---

[١] بڕوانە: ٢٤٩.

## ١١- باسی ئەوەی بە دەستی ڕاستی ئاو بکات بە دەستی چەپیدا لە خۆشۆردندا

٢٦٦- مەیمونەی کچی حاریس ﷺ دەڵێ: ئاوی خۆشۆردنم دانا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و پەردەشم بۆ کرد، جا ئاوی کرد بە دەستیدا جارێ یان دوو جار شۆردی - سولەیمان دەڵێ: نازانم سێ جاری وت یان نا-، پاشان بە دەستی ڕاستی ئاوی کرد بە دەستی چەپیدا و داوێنی شۆرد، پاشان دەستی هێنا بە زەویدا -یان بە دیوارەکەدا-، پاشان ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا، وە دەموچاو و دەستەکانی شۆرد و سەری شۆرد، پاشان ئاوی کرد بە لاشەیدا، ئینجا جێگاکەی گۆڕی و پێیەکانی شۆرد و پارچەقوماشێکم بۆ برد، بە دەستی ئاوەها ئاماژەی کرد کە نایەوێت.

## ١٢- بابٌ: مَن جَامَعَ ثُمَّ عَادَ، وَمَنْ دَارَ عَلَى نِسَائِهِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ

٢٦٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْن بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن أَبِي عَدِيٍّ، وَيَحْيَى بن سَعِيدٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ذَكَرْتُهُ لِعَائِشَةَ، فَقَالَتْ: يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَيَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ، ثُمَّ يُصْبِحُ مُحْرِمًا يَنْضَخُ طِيبًا[1].

## ١٢- باسێک: ئەگەر پیاو لەگەڵ خێزانیدا جووت بوو پاشان دووبارەی کردەوە (حوکمەکەی چییە؟)، وە کەسێک بەسەر خێزانەکانیدا بگەڕێ (و جووت ببێ لەگەڵیاندا) یەک جار خۆی بشوات (حوکمەکەی چییە؟)

٢٦٧- ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی مونتەشیر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەو وتەیە (ی عەبدوڵای کوڕی عومەر)م[1] بۆ عائیشە ﷺ باس کرد،

---

[1] بڕوانە: ٢٧٠.

**ئەویش وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبو عەبدوڕەحمان (عەبدوڵا) بێت من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش دەکرد، جا دەگەڕا بەسەر خێزانەکانیدا و لەگەڵیان جووت دەبوو، پاشان ڕۆژ دەبۆیەوە و ئیحرامی دەبەست، بۆ نەخۆشەکەی هەر پێوە بوو.**

٢٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدُورُ عَلَى نِسَائِهِ فِي السَّاعَةِ الوَاحِدَةِ مِنَ اللَّيلِ وَالنَّهَارِ، وَهُنَّ إِحْدى عَشْرَةَ. قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: أَوَ كَانَ يُطِيقُهُ؟ قَالَ: كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّهُ أُعْطِيَ قُوَّةَ ثَلَاثِينَ. وَقَالَ سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ: إِنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ تِسْعُ نِسْوَةٍ[٢].

**٢٦٨- قەتادە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکی شەو یان ڕۆژدا دەچووە لای خێزانەکانی کە یانزە ئافرەت بوون، قەتادە دەڵێ وتم بە ئەنەس: جا ئایا ئەوەندەی توانای هەبوو؟ ئەنەس وتی: ئێمە لە نێو خۆمان قسەمان دەکرد و دەمانوت: پێغەمبەر ﷺ توانای سی پیاوی پێ دراوە. سەعید دەگێڕێتەوە لە قەتادەوە کە ئەنەس بۆی گێڕاوەتەوە و وتوویەتی: خێزانەکانی نۆ ئافرەت بوون.**

## ١٣- بابُ غَسْلِ المَذْيِ وَالْوُضُوءِ مِنْهُ

٢٦٩- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً، فَأَمَرْتُ رَجُلًا أَنْ يَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ لِمكَانِ ابنتِهِ، فَسَأَلَ، فَقَالَ: ((تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ))[٣].

---

[١] لە بابی (١٤)دا ئەم وتەیە دێت.

[٢] بڕوانە: ٢٨٤، ٥٠٦٨، ٥٢١٥.

[٣] بڕوانە: ١٣٢.

## ١٣- باسی شۆردنی مەزی[١] و دەستنوێژ گرتنەوەش لێی

٢٦٩- عەلی ﷺ دەڵێ: من کەسێك بووم مەزیم زۆر بوو بە پیاوێکم وت پرسیارم بۆ بکات لە پێغەمبەر ﷺ، (خۆم شەرمم کرد) چونکە کچەکەی هاوسەرم بوو، ئەو پیاوەش پرسیاری کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دامێنت بشۆرە و دەستنوێژ بگرە)).

## ١٤- بابُ مَنْ تَطيَّبَ، ثُمَّ اغْتَسَلَ وَبَقِيَ أَثَرُ الطِّيبِ

٢٧٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عن إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ عن أَبِيهِ قَالَ: سَأَلتُ عَائِشَةَ، فَذَكَرْتُ لَهَا قَوْلَ ابن عُمَرَ: مَا أُحِبُّ أَنْ أُصْبحَ مُحْرِمًا أَنْضَخُ طِيبًا. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَنَا طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، ثمَّ طَافَ فِي نِسَائِهِ، ثمَّ أَصْبَحَ مُحْرِمًا[٢].

## ١٤- باسی کەسێ بۆنی خۆشی لە خۆی دابێت، پاشان خۆی بشوات و بۆنەخۆشەکەی پێوە بمێنێت

٢٧٠- ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی مونتەشیر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد ﷺ، ئەم وتەی عەبدوڵای کوڕی عومەرم ﷺ بۆ باس کرد کە دەڵێ: پێم خۆش نییە ڕۆژ ببێتەوە ئیحرام بپۆشم و شوێنەواری بۆنخۆشیم پێوە بێت، عائیشەش ﷺ وتی: من بۆنی خۆشم دا لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان لەگەڵ خێزانەکانیدا جووت بوو، پاشان کە ڕۆژ بۆیەوە ئیحرامی بەست.

---

[١] مەزی: ئاوێکی سپی ڕوونی لینجە لە کاتی دەستبازی یان جووتبوونی پیاو لەگەل خێزانیدا دێتە دەر.

[٢] بڕوانە: ٢٦٧.

٢٧١- حَدَّثَنَا آدَمُ، قال: حدَّثَنَا شُعْبَةُ، قال: حدَّثَنَا الحَكَمُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عن عَائِشَةَ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي مَفْرِقِ النَّبِيِّ ﷺ وَهوَ مُحْرِمٌ[1].

**٢٧١- عائیشه ﵂ دەڵێ: دەڵێی بەپێش چاوەمەوەیە بریسکەی ئەو بۆنەی لە نێوەڕاستی سەری پێغەمبەردا ﷺ بوو لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو.**

## ١٥- بابُ تَخْلِيلِ الشَّعَرِ حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ أَفَاضَ عَلَيْهِ

٢٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَيْهِ، وَتَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، ثمَّ اغْتَسَلَ، ثُمَّ يُخَلِّلُ بِيَدِهِ شَعَرَهُ، حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنْ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ، أَفَاضَ عَلَيْهِ المَاءَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ[2].

## ١٥- باسی دەست خستنە نێو مووەکان هەتا دڵنیا ببێ کە پێستەکەی تەڕ بووە و ئاوی پێدا بکات

**٢٧٢- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کات بۆ لەشگرانی خۆی بشۆردایە دەستەکانی دەشۆری و دەستنوێژی دەگرت وەك دەستنوێژ بۆ نوێژ، پاشان خۆی دەشۆری، ئینجا دەستی دەخستە نێو مووەکانی سەری هەتا دڵنیا دەبوو پێستی سەری تەڕ بووە، سێ جار ئاوی پێدا دەکرد پاشان هەموو لاشەی دەشۆری.**

٢٧٣- وَقَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ نَغْرِفُ مِنْهُ جَمِيعًا[3].

---

[1] بڕوانە: ١٥٣٨، ٥٩١٨، ٥٩٢٣.

[2] بڕوانە: ٢٤٨.

[3] بڕوانە: ٢٥٠.

**٢٧٣- عائیشە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە لە یەك دەفرا خۆمان دەشۆرد، هەردووکمان لەو دەفرە ئاومان دەبرد (و دەمانکرد بە خۆماندا).**

## ١٦- بابُ مَنْ تَوَضَّأَ فِي الجَنَابَةِ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ، وَلَمْ يُعِدْ غَسْلَ مَوَاضِعِ الوُضُوءِ مَرَّةً أُخْرَى

٢٧٤- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابن عَبَّاسٍ- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: وَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَضُوءًا لِجَنَابَةٍ، فَأَكْفَأَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ ضَرَبَ يَدَهُ بِالأَرْضِ أَوِ الحَائِطِ مَرَّتَيْنِ -أَوْ ثَلاَثًا- ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ المَاءَ، ثُمَّ غَسَلَ جَسَدَهُ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ. قَالَتْ: فَأَتَيْتُهُ بِخِرْقَةٍ، فَلَمْ يُرِدْهَا، فَجَعَلَ يَنْفُضُ بِيَدِهِ[1].

## ١٦- باسی کەسێ بەلەشگرای دەستنوێژ بگرێ، پاشان هەموو لاشەی بشوات جارێکی دیکە ئەندامەکانی دەستنوێژەکەی نەشواتەوە

**٢٧٤- مەیمونە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی دانا بۆ خۆشۆردنی لەشگرانی، بە دەستی ڕاستی دوو جار یان سێ جار ئاوی کرد بە دەستی چەپیدا، پاشان داوێنی شۆرد، پاشان دوو جار -یان سێ جار- دەستی دا بە زەوی یان دیوارەکەدا، پاشان ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا، وە دەموچاو و هەردوو باڵی شۆرد، پاشان ئاوی کرد بە سەریدا، ئینجا لاشەی شۆرد، ئینجا جێگاکەی گۆڕی و پێیەکانی شۆرد، عائیشە دەڵێ: منیش پارچە قوماشێکم بۆ هێنا (بۆ خۆوشککردنەوە)، بەڵام نەیویست بە دەستی ئاوی لە خۆی دەکردەوە (خۆی وشك دەکردەوە).**

---

[1] بڕوانە: ٢٤٩.

## ١٧- بابٌ: إِذَا ذَكَرَ فِي المَسْجِدِ أَنَّهُ جُنُبٌ يَخرُجُ كَمَا هُوَ وَلَا يَتَيَمَّمُ

٢٧٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، وَعُدِّلَتِ الصُّفُوفُ قِيَامًا، فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا قَامَ فِي مُصَلَّاهُ ذَكَرَ أَنَّهُ جُنُبٌ، فَقَالَ لَنَا: «مَكَانَكُمْ». ثُمَّ رَجَعَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَينَا وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَكَبَّرَ فَصَلَّينَا مَعَهُ. تَابَعَهُ عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَرَوَاهُ الأَوزَاعِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[١].

## ١٧- باسێک: ئەگەر کەسێک لە مزگەوتدا بیری کەوتەوە لەشگرانە دەڕواتە دەرەوە و تەیەموم ناکات

**٢٧٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: قامەت کرا بۆ نوێژ، ڕیزەکان بەوەستاوی ڕێك کران، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان، جا کاتێ لە شوێن نوێژکردنەکەیدا وەستا بیری کەوتەوە کە لەشگرانە، جا پێی وتین: ((لە شوێنی خۆتان ڕاوەستن))، پاشان گەڕایەوە (بۆ ماڵەوە) خۆی شۆرد و هاتەوە بۆ لامان سەری ئاوی لێ دەتکا، جا الله أكبرى کرد و لەگەڵیدا نوێژمان کرد. عەبدولئەعلا لە مەعمەڕ و ئەویش لە زوهرییەوە گێڕاویەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عوسمانی کوڕی عومەر دەکات. وە ئەوزاعیش لە زوهرییەوە گێڕاویەتەوە.**

## ١٨- بابُ نَفْضِ اليَدِ مِن غسلِ الجَنَابَةِ

٢٧٦- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو حَمْزَةَ قَالَ: سَمِعْتُ الأَعْمَشَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَتْ مَيْمُونَةُ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ غُسْلًا، فَسَتَرْتُهُ بِثَوْبٍ،

---

[١] بروانە: ٦٣٩، ٦٤٠.

وَصَبَّ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ صَبَّ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَغَسَلَ فَرْجَهُ، فَضَرَبَ بِيَدِهِ الأرضَ فَمَسَحَهَا، ثُمَّ غَسَلَهَا، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، وَأَفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيهِ، فَنَاوَلْتُهُ ثَوْبًا فَلَمْ يَأْخُذهُ، فَانْطَلَقَ وَهْوَ يَنْفُضُ يَدَيْهِ[١].

## ١٨- باسی سڕین و وشككردنەوەی دەست لە ئاوی خۆشۆردنی لەشگرانی

**٢٧٦- مەیمونە ﵂ دەڵێ: ئاوی خۆشۆردنم دانا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و بە پۆشاكێك پەردەم بۆ كرد، ئاوی كرد بە دەستەكانیدا و شۆردنی، ئینجا بە دەستی ڕاستی ئاوی كرد بە دەستی چەپیدا، پاشان داوێنی شۆرد، جا دەستی هێنا بە زەویدا و پاشان شۆردی، ئینجا ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا، وە دەموچاو و باڵەكانی شۆرد، پاشان ئاوی كرد بە سەریدا، جا ئاوی كرد بە لاشەیدا، پاشان جێگاكەی گۆڕی و پێیەكانی شۆری، منیش پارچەقوماشێكم بۆ برد (بۆ خۆوشككردنەوە)، بەڵام وەرینەگرت، جا ڕۆیشت و دەستەكانی دەتەكاند ئاویان دەپرژاند.**

## ١٩- بابُ مَنْ بَدَأَ بِشِقِّ رأسِهِ الأَيْمَنِ فِي الغُسْلِ

٢٧٧- حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا إبرَاهِيمُ بن نَافِعٍ، عَنِ الَحسَنِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنَّا إِذَا أَصَابَتْ إِحْدَانَا جَنَابَةٌ، أَخَذَتْ بِيَدَيْهَا ثَلَاثًا فَوْقَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَأْخُذُ بِيَدِهَا عَلَى شِقهَا الأَيْمَنِ، وَبِيَدِهَا الأُخْرى عَلَى شِقِّهَا الأَيْسَرِ.

---

[١] بڕوانە: ٢٤٩.

## ١٩- باسی ئەو کەسەی خۆشۆردن لەلای ڕاستی سەریەوە دەست پێ دەکات

**٢٧٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: ئێمە ئەگەر یەكێكمان لەشگران بووایە، سێ مشت (ئاوی) بە دەستەكانی هەڵدەگرت و دەیكرد بەسەریدا، پاشان مشتێكی هەڵدەگرت و دەیكرد بەلای ڕاستی سەریدا، وە مشتێكی دیكەی دەكرد بەلای چەپی سەریدا.**

## ٢٠- بابُ مَنِ اغْتَسَلَ عُرْيَانًا وَحْدَهُ فِي الخَلْوَةِ، وَمَنْ تَسَتَّرَ فَالتَّسَتُّرُ أَفْضَلُ

وَقَالَ بَهْزٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ((اللَّهُ أَحَقُّ أَنْ يُسْتَحْيَا مِنْهُ مِنَ النَّاسِ)).

## ٢٠- باسی کەسێک بەتەنها لە چۆڵیدا بەڕووتی خۆی بشوات، کەسێک پەردە بگرێتەوە ئەوە چاکترە

**بەهز لە باوكیەوە و لە باپیریەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((خوای گەورە لە خەڵك شیاوترە كە شەرمی لێ بكرێ)).**

٢٧٨- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامِ بنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا: واللهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا إِلَّا أَنَّهُ آدَرُ. فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ، فَفَرَّ الحَجَرُ بِثَوْبِهِ، فَخَرَجَ مُوسَى فِي إِثْرِهِ يَقُولُ: ثَوْبِي يا حَجَرُ. حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى مُوسَى، فَقَالُوا: واللهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ. وَأَخَذَ ثَوْبَهُ، فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا». فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: واللهِ إِنَّهُ لَنَدَبٌ بِالَحْجَرِ سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ ضَربًا بِالَحْجَرِ[1].

---

[1] بڕوانە: ٣٤٠٤، ٤٧٩٩.

**٢٧٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((جوولەکەکانی بەنو ئیسڕائیل بەڕووتی خۆیان دەشۆرد، سەیری یەکدییان دەکرد، بەڵام مووسا ﷺ بەتەنیا خۆی دەشۆرد، جوولەکەکان وتیان: سوێند بە خوا تەنیا شتێك وای لە مووسا کردووە خۆی لەگەڵماندا نەشوات ئەوەیە کە قۆڕە! مووساش ﷺ جارێکیان ڕۆیشت خۆی بشوات پۆشاکەکەی لەسەر بەردێك دانا، بەردەکەش پۆشاکەکەی مووسای برد و ڕۆیشت، مووساش ﷺ کەوتە شوێنی و دەیفەرموو: پۆشاکەکەم ئەی بەردەکە، هەتا جوولەکەکان (مووسایان ﷺ بینی) و سەیریان کرد، وتیان: سوێند بە خوا مووسا ﷺ هیچی نییە و ساغە، جا پۆشاکەکەی هەڵگرت دەستی کرد بە لێدانی بەردەکە))، ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: سوێند بە خوا شەش یان حەوت شوێن لێدان بە بەردەکەوە دەرچوو.**

٢٧٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا فَخَرَّ عَلَيْهِ جَرَادٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ أَيُّوبُ يَحْتَثِي فِي ثَوْبِهِ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ:يا أَيُّوبُ، أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرى؟ قَالَ: بَلَى وَعِزَّتِكَ، ولكن لَا غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِكَ». وَرَوَاهُ إِبْرَاهِيمُ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ صَفْوَانَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عن أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا»[1].

**٢٧٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((لە کاتێکدا ئەیوب ﷺ بەڕووتی خۆی دەشۆرد، کوللەی ئاڵتونی بەسەردا داباری، ئەیوب ﷺ بە مشت دەیکردە نێو پۆشاکەکەیەوە، جا پەروەردگاری بانگی کرد: ئەی ئەیوب مەگەر بێنیازم نەکردوویت لەوەی دەیبینی؟ وتی: بەڕێ وەڵا سوێند**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٩١، ٧٤٩٣.

به گەورەیت، بەڵام بێنیاز نیم له فەڕ و بەرەکەتت)). وه ئەم فەرموودەیه ئیبڕاهیم گێڕاویەتەوه له مووسای کوڕی عوقبەوه، ئەویش له صەفوانەوه له عەتائی کوڕی یەسارەوه له ئەبو هورەیرەوه ﷺ[1] له پێغەمبەرەوه ﷺ فەرمووی: ((له کاتێکدا ئەیوب ﷺ بەڕووتی خۆی دەشۆری)).

## ٢١- بابُ التَّسَتّرِ فِي الغُسْلِ عِنْدَ النَّاسِ

٢٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ- أَنَّ أَبَا مُرَّةَ -مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ- أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ الفَتْحِ، فَوَجَدْتُهُ يَغتَسِلُ وَفَاطِمَةُ تَسْتُرُهُ، فَقَالَ: «مَنْ هذِه؟». فَقُلْتُ: أَنَا أُمُّ هَانِئٍ[2].

## ٢١- باسی خۆپەنادان له خەڵکی له کاتی خۆشۆردندا

٢٨٠-ئومو هانی کچی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: ساڵی ئازادکردنی مەککه ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وا ڕێك کەوت خۆی دەشۆرد و فاتیمەش پەردەی بۆ کردبوو، فەرمووی: ((ئەو ئافرەته کێیه؟)) منیش وتم: منم ئومو هانی.

٢٨١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخبَرَنَا عَبدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ كُرَيبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيمُونَةَ قَالَت: سَتَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَغْتَسِلُ مِنَ الجَنَابَةِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ صَبَّ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَغَسَلَ فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ، ثُمَّ مَسَحَ بِيَدِهِ عَلَى الحَائِطِ -أَوِ الأرَضِ- ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ غَيْرَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ المَاءَ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ. تَابَعَهُ أَبُو عَوَانَةَ وَابْنُ فُضَيْلٍ فِي السَّتْرِ[3].

---

[1] ئیمام بوخاری ئەم ڕشتەیەی دیکەی هێناوه بۆ فەرموودەکه تا بڵێ فەرموودەکه به ڕشتەیەکی دیکه هەیه.

[2] بڕوانه: ٣٥٧، ٣١٧١، ٦١٥٨.

[3] بڕوانه: ٢٤٩.

**۲۸۱- مەیمونە ﵂ دەڵێ: پەردەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گرتەوە لە کاتێکدا لەشگران بوو خۆی دەشۆرد، جا دەستەکانی شۆرد، پاشان بە دەستی ڕاستی ئاوی کرد بە دەستی چەپیدا، وە داوێن و ئەوەی بەریکەوتبوو شۆردی، پاشان دەستی سڕی بە دیوار -یان زەویدا -، پاشان دەست نوێژی گرت وەك دەستنوێژگرتن بۆ نوێژ جگە لە پێیەکانی، پاشان ئاوی کرد بە لاشەیدا، پاشان لە جێگاکەی جولا و پێیەکانی شۆری. هەر یەك لە ئەبو عەوانە و ئیبنو فوزەیل گێڕاویانەتەوە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سوفیانیان کردووە لە: پەردەکردنەکە.**

## ۲۲- بابٌ: إِذَا احْتَلَمَتِ المَرْأَةُ

۲۸۲- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ المُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيمٍ -امْرَأَةُ أَبِي طَلْحَةَ- إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الحَقِّ، هَلْ عَلَى المَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا هِيَ احْتَلَمَتْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ، إِذَا رَأَتِ المَاءَ»[1].

## ۲۲- باسێک: ئەگەر ئافرەت لە خەویدا لەشگران بوو[2]

**۲۸۲- ئومو سەلەمەی دایکی باوەڕداران ﵂ دەگێڕێتەوە: ئومو سولەیم - کە خێزانی ئەبو تەلحە بوو - ﵂ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا لە ئاست هەقدا شەرم ناکات، ئایا ئافرەت خۆشۆردنی لەسەرە ئەگەر شەیتانی بوو؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی (بە جلەکانیەوە، یان بە لەشیەوە))).**

---

[1] بڕوانە: ۱۳۰.

[2] (احتلام) بە کوردی پێی دەوترێت: شەیتانیبوون.

## ٢٣- بابُ عَرَقِ الجُنُبِ، وَأَنَّ المُسْلِم لَا يَنْجُسُ

٢٨٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا حمَيْدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرٌ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَقِيَهُ فِي بَعْضِ طَرِيقِ المَدِينَةِ وَهْوَ جُنُبٌ، فَانْخَنَسْتُ مِنْهُ، فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ جَاءَ، فَقَالَ: «أَيْنَ كنْتَ يا أَبَا هُرَيْرَةَ؟». قَالَ: كُنْتُ جُنُبًا، فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ وَأَنَا عَلَى غَيْرِ طَهَارَةٍ. فَقَالَ: «سُبحَانَ اللهِ! إِنَّ المؤمن لَا يَنْجُسُ»[1].

## ٢٣- باسی (حوكمی) عەرەقی لەشگران، وە باسی ئەوە كە موسوڵمان پیس نابێت

**٢٨٣- ئەبو ڕافیع لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە كاتێكدا لەشگران بوو لە ڕێگایەك لە ڕێگاكانی مەدینەدا پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشت، جا خۆم لێ شاردەوە، جا ڕۆیشت خۆی شۆرد، پاشان هاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەبو هورەیرە لەكوێ بوویت؟)) وتی: لەشگران بووم، پێشم ناخۆش بوو پاك نەبم لەگەڵتدا دانیشم، فەرمووی: ((پاك و بێگەردی بۆ خوا، دڵنیا بە باوەڕدار پیس نابێت)).**

## ٢٤- بابٌ: الجُنُبُ يَخْرُجُ وَيَمْشِي فِي السُّوقِ وَغَيرِهِ

وَقَالَ عَطَاءٌ: يَحْتَجِمُ الجُنُبُ، وَيُقَلِّمُ أَظْفَارَهُ، وَيحْلِقُ رَأسَهُ، وَإِنْ لَمْ يَتَوَضَّأْ.

٢٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُمْ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ ﷺ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي اللَّيلَةِ الوَاحِدَةِ، وَلَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعُ نِسْوَةٍ[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٨٥.

[2] بڕوانە: ٢٦٨.

## ٢٤- باسێک: کەسی لەشگران لە ماڵ دەردەچێ و بە بازاڕ و جێگای دیکەدا دەڕوات

**عەتاو دەڵێ: لەشگران دەتوانێ کەڵەشاخ بگرێ و نینۆکی بکات و سەری بتاشێ، با دەستنوێژیش نەگرێ.**

**٢٨٤- سەعید لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە کە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕانەوە کە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەك شەودا دەچوو بۆ لای هەموو خێزانەکانی، کە لەو کاتەدا نۆ خێزانی هەبوو.**

٢٨٥- حَدَّثَنَا عَيَّاشٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا حُمَيدٌ، عَنْ بَكْرٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وأَنَا جُنُبٌ، فَأَخَذَ بِيَدِي، فَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى قَعَدَ فَانْسَلَلْتُ، فَأَتَيتُ الرَّحْلَ فَاغْتَسَلتُ، ثُمَّ جِئْتُ وَهْوَ قَاعِدٌ، فَقَالَ: «أَيْنَ كُنْتَ يا أَبَا هِرٍّ؟». فَقُلْتُ لَهُ. فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ! يا أَبَا هِرٍّ إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَا يَنْجُسُ»[١].

**٢٨٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەشم گران بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە من گەیشت، جا دەستی گرتم و لەگەڵی ڕۆیشتم تا دانیشت، جا خۆم دزییەوە، ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە (شوێنی خۆم) و خۆم شۆرد، پاشان هاتمەوە پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، فەرمووی: ((ئەبو هیڕ تۆ لەکوێ بووی؟))، منیش عەرزم کرد کە لەکوێ بووم، فەرمووی: ((پاك و بێگەردی بۆ خوا، ئەبو هیڕ بێگومان ئیماندار پیس نابێت)).**

---

[١] بڕوانە: ٢٨٣.

## ٢٥- بابُ كَيْنُونَةِ الجُنُبِ فِي البَيْتِ إِذَا تَوَضَّأَ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ

٢٨٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ وَشَيبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلتُ عَائِشَةَ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يرْقُدُ وَهْوَ جُنُبٌ؟ قَالَت: نَعَمْ، وَيَتَوَضَّأُ[1].

## ٢٥- باسی (دروستە) لەشگران لە ماڵەوە بێ، ئەگەر دەستنوێژ بگرێت پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت

**٢٨٦- ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد ﷺ ئایا پێغەمبەر ﷺ لەشگران بووایە لە ماڵەوە دەخەوت؟ عائیشە وتی: بەڵێ، بەڵام دەستنوێژی دەگرت.**

## ٢٦- بابُ نَوْمِ الجُنُبِ

٢٨٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخطَّابِ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيَرْقدُ أَحَدُنَا وَهْوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرْقُدْ وَهُوَ جُنُبٌ»[2].

## ٢٦- باسی نووستنی کەسی لەشگران

**٢٨٧- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ: کەسێك لە ئێمە لەشگران بێت دروستە بخەوێ؟ فەرمووی: ((بەڵێ ئەگەر کەسێکتان دەستنوێژی گرت با بخەوێ، با لەشیشی گران بێت)).**

---

[1] بڕوانە: ٢٨٨.

[2] بڕوانە: ٢٨٩، ٢٩٠.

## ٢٧- بابُ الجُنُبِ يَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يَنَامُ

٢٨٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي جَعْفَرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَهْوَ جُنُبٌ غَسَلَ فَرْجَهُ وَتَوَضَّأَ لِلصَّلَاةِ[1].

## ٢٧- باسی لەشگران دەستنوێژ دەگرێ، پاشان دەخەوێ

**٢٨٨- عائیشه ﷺ دەڵێ: هەمیشه که پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەشی گران بووایه و بیویستایه بخەوێ، دامێنی دەشۆرد و دەستنوێژی دەگرت وەك دەستنوێژ بۆ نوێژکردن.**

٢٨٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: اسْتَفْتَى عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ: أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهْوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ»[2].

**٢٨٩- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: عومەر ﷺ پرسیاری له پێغەمبەر کرد ﷺ ئایا کەسێکمان (دروسته) بخەوێ که لەشگران بێ؟ فەرمووی: ((بەڵێ، ئەگەر دەستنوێژ بگرێ)).**

٢٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ بن الخطَّابِ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ تُصِيبُهُ الجَنَابَةُ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ، ثُمَّ نَمْ»[3].

---

[1] بڕوانه: ٢٨٦.

[2] بڕوانه: ٢٨٧.

[3] بڕوانه: ٢٨٧.

**٢٩٠- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ باسی ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لە شەودا تووشی لەشگرانی دەبێت، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ((داوێنت بشۆرە و دەستنوێژ بگرە، پاشان بخەوە)).**

## ٢٨- بابٌ: إِذَا التَقَى الخِتَانَانِ

٢٩١- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ ح. وَحَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرِيرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ الغَسْلُ». تَابَعَهُ عَمْرُو بْنُ مَرْزُوقٍ عَنْ شُعْبَةَ مِثْلَهُ. وَقَالَ مُوسَى: حَدَّثَنَا أَبَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَخْبَرَنَا الحَسَنُ مِثْلَهُ.

## ٢٨- باسێک: ئەگەر شوێن خەتەنەی پیاو و ئافرەت بەیەک گەیشت (خۆشۆردن لەسەر پیاو و ئافرەتەکە پێویست دەبێت)

**٢٩١- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر پیاو لەنێو چوارپەلی ئافرەتدا دانیشت، پاشان لەگەڵیدا جووت بوو، ئەوە بێگومان خۆشۆردن پێویست دەبێ (لەسەر پیاو و ئافرەتەکە))). عەمری کوڕی مەرزوق لە شوعبەوە وێنەی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی هیشامی کردووە. مووسا دەڵێ: ئەبان بۆی گێڕاینەوە، ئەویش دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە، ئەویش دەڵێ: حەسەن بۆی گێڕاینەوە وەك ئەم فەرموودەیەی کە باسمان کرد. (قەتادە ڕاستەوخۆ لە حەسەنی بیستووە).**

## ٢٩- بابُ غَسْلِ مَا يُصِيبُ مِنْ فَرْجِ المَرْأَةِ

٢٩٢- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنِ الحُسَيْنِ، قَالَ يَحْيَى: وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الجُهَنِيَّ أَخْبَرَهُ، أَنَهُ سَأَلَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَلَمْ يُمْنِ؟ قَالَ عُثْمَانُ: يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، وَيغْسِلُ ذَكَرَهُ. قَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَالزُّبَيْرَ بْنَ العَوَّامِ، وَطَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ، وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ رضي الله عنهم، فَأَمَرُوهُ بِذَلِكَ. قَالَ يَحْيَى: وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ أَخْبَرَهُ، أَنَهُ سَمِعَ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

## ٢٩- باسی شۆردنی ئەوەی تەڕایی نێو لەشی ئافرەتی بەرکەوێت

**٢٩٢- زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی دەڵێ: پرسیاری لە عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه کرد و وتی: پێم بڵێ ئەگەر پیاو چووە لای خێزانی و ئاوی نەهاتەوە؟ عوسمان وتی: دەستنوێژ دەگرێت چۆن بۆ نوێژ دەستنوێژ دەگرێت و (پێش دەستنوێژەکە) دامێنی دەشوات، عوسمان دەڵێ: ئەمەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیست، زەید دەڵێ: هەمان پرسیارم لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و زوبەیری کوڕی عەوام و تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و ئوبەی کوڕی کەعب رضي الله عنهم کرد، هەموویان هەر فەرمانی ئەوەیان پێ کرد (دامێنی بشۆرێ و دەستنوێژ بگرێ). یەحیا دەڵێ ئەبو سەلەمە پێی وتم: عوروەی کوڕی زوبەیر هەواڵی پێ داوە کە ئەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە.**

---

[1] بڕوانە: ١٧٩.

٢٩٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو أَيُّوبَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ فَلَمْ يُنْزِلْ؟ قَالَ: «يَغْسِلُ مَا مَسَّ الْمَرْأَةَ مِنْهُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّي». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: الغَسْلُ أَحْوَطُ، وَذَاكَ الآخِرُ، وَإِنَّمَا بَيَّنَّا لِاخْتِلَافِهِم.

**٢٩٣- ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە: کە وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر پیاو لەگەڵ ئافرەت جووت ببێ و ئاوی نەیەتەوە؟ فەرمووی: ((ئەوەی بەر ئافرەتەکە کەوتووە (داوێنی) بشوات، پاشان دەستنوێژ بگرێت و نوێژ بکات)). ئەبو عەبدولا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: خۆشۆردن باشترە ئەمەش کە لە فەرموودەکەدا هاتووە دواهەمینی بڕیارە[1]، بۆیە ئەمەم ڕوون کردەوە، چونکە زانایان ڕاجیان تێیدا.**

---

[1] مەبەستی ئەمە دوا بڕیارە ئەو فەرموودانەیە کە غوسڵ واجب نییە بەبێ ئاوهاتنەوە، واتە موسوڵمان ئەگەر لەگەڵ هاوسەری جووت بوو، ئاوی نەهاتەوە واجب نییە خۆی بشۆرێت، بەس باشتر وایە خۆی بشوات. فتح الباري: ٥٢٤/١، وإرشاد الساري: ٥٣٠/١.

# ٦- كِتَابُ الحَيْضِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٦- پەڕاوی حەیز

وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ ﴾ البقرة.

**وە باسی ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: ((ئەی موحەممەد ﷺ) دەربارەی سووڕی مانگانە پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: ئەوە ئازارێکە بۆیە لە ئافرەتان دوور کەونەوە (لەگەڵیان جووت مەبن) لە کاتی حەیزدا، نزیکیان مەکەونەوە تا پاك دەبنەوە، جا هەر کات خۆیان شۆرد، ئەوسا بچنە لایان لەو جێگاوە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون، بێگومان خوا تەوبەکارانی خۆش دەوێ، هەروەها خۆپاکڕاگرانیشی خۆش دەوێ).**

## ١- بابٌ: كَيْفَ كَانَ بَدْءُ الحَيْضِ؟

وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((هذا شَيْءٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ)) وقَالَ بَعْضُهُمْ: كَانَ أَوَّلُ مَا أُرْسِلَ الحَيْضُ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ. وَحَدِيثُ النَّبِيِّ ﷺ أَكْثَرُ

## ١- باسێک: پەیدابوونی حەیز سەرەتا چۆن بووە؟

وە باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمووێ: ((ئەم حەیزە شتێکە خوا لەسەر ئافرەتانی داناوە)). هەندێ دەڵێن: یەکەم جار حەیز نێردرا بۆ (ئافرەتانی) جوولەکە، بەڵام فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ماناکەی زیاترە (گشتگیرترە و هەموو ئافرەتان دەگرێتەوە).

## ٢- بَابُ الأَمْرِ بِالنُّفَسَاءِ إِذَا نُفِسْنَ

٢٩٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ القَاسِمِ، قَالَ: سَمِعْتُ القَاسِمَ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقُولُ: خَرَجْنَا لَا نَرَى إِلَّا الحَجَّ، فَلَمَّا كُنَّا بِسَرِفَ حِضْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَبْكِي، قَالَ: «مَا لَكِ أَنُفِسْتِ». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «إِنَّ هذا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاقْضِي مَا يَقْضِي الحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ». قَالَتْ: وَضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ[1].

## ٢- باسی فەرمانی (پەیوەست) بە ئافرەتان کاتێ کەوتنە حەیزەوە

٢٩٤- قاسیم دەڵێ: لە عائیشەم بیست ﵂ دەیوت: لە مەدینە دەرچووین لامان وا بوو بەس بۆ حەج دەڕۆین، جا کاتێ لە سەریفدا[2] بووین کەوتمە حەیزەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلام و من دەگریام، فەرمووی: ((ئەوە چیتە

[1] بڕوانە: ٣٠٥، ٣١٦، ٣١٧، ٣١٩، ٣٢٨، ١٥١٦، ١٥١٨، ١٥٥٦، ١٥٦٠، ١٥٦١، ١٥٦٢، ١٦٣٨، ١٦٥٠، ١٧٠٩، ١٧٢٠، ١٧٣٣، ١٧٥٧، ١٧٦٢، ١٧٧١، ١٧٧٢، ١٧٨٣، ١٧٨٦، ١٧٨٧، ١٧٨٨، ٢٩٥٢، ٢٩٨٤، ٤٣٩٥، ٤٤٠١، ٤٤٠٨، ٥٣٢٩، ٥٥٤٨، ٥٥٥٩، ٦١٥٧، ٧٢٢٩.

[2] سەریف: شوێنێکە دە میل لە مەککەوە دوورە. فتح الباري: ٢٥٨/١.

کەوتیتە حەیزەوە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەمە شتێکە خوا لەسەر ئافرەتانی نووسیوە، جا حاجی چی دەکات تۆش بیکە، تەنها سووڕانەوەی چواردەوری کەعبە (تەواف) مەکە (تا پاك دەبیتەوە)))، عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەشەوڵاخی کردە قوربانی بۆ خێزانەکانی.

## ٣- بابُ غَسْلِ الحَائِضِ رَأْسَ زَوْجِهَا وَتَرْجِيلِهِ

٢٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا حَائِضٌ[1].

## ٣- باسی ئافرەتی حەیزدار سەری مێردەکەی بشوات و قژی دابێنێت

**٢٩٥- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: من سەری پێغەمبەری خوام ﷺ دادەهێنا، لە کاتێکدا من لە حەیزدا بووم.**

٢٩٦- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيم بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْن يُوسُفَ، أَنَّ ابن جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي هِشَامٌ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّهُ سُئِلَ أَتَخْدُمُنِي الحَائِضُ أَوْ تَدْنُو مِنِّي المَرْأَةُ وَهِيَ جُنُبٌ؟ فَقَالَ عُرْوَة: كُلُّ ذَلِكَ عَلَيَّ هَيِّنٌ، وَكلُّ ذَلِكَ تَخْدُمُنِي، وَلَيْسَ عَلَى أَحَدٍ فِي ذَلِكَ بَأْسٌ، أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّهَا كَانَتْ ترَجِّلُ -تَعْنِي: رَأْسَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ- وَهِيَ حَائِضٌ، وَرَسُول اللَّهِ ﷺ حِينَئِذٍ مُجَاوِرٌ فِي المَسْجِدِ، يُدْنِي لَهَا رَأْسَهُ وَهِيَ فِي حُجْرَتِهَا، فَتُرَجِّلُهُ وَهِيَ حَائِضٌ[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٩٦، ٣٠١، ٢٠٢٨، ٢٠٢٩، ٢٠٣١، ٢٠٤٦، ٥٩٢٥.

[2] بڕوانە: ٢٩٥.

٢٩٦- هیشام له عورڕوەوه دەگێڕێتەوه كه پرسیاری لێ كرا: ئایا ئافرەتی حەیزدار خزمەتم بكات، یان ئافرەتی لەشگران لێم نزیك بێتەوه؟ عورڕوەش وتی: هەموو ئەوانه بەلامەوه ئاسانه و دروسته، هەموو ئەو جۆره ئافرەتانه خزمەتم دەكەن و كەس لەو بارەیەوه هیچ زیانێكی بۆ نییه، عائیشه پێی وتم: كه ئەو دایدەهێنا -مەبەستی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو- كه له حەیزیشدا بووه، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو كاتەدا له ئیعتیكافدا بووه له مزگەوتدا، سەری نزیكی عائیشه دەكردەوه و عائیشەش له ژوورەكەی خۆیدا بوو، سەری پێغەمبەری ﷺ دادەهێنا و له حەیزیشدا بوو.

## ٤- بابُ قِرَاءَةِ الرَّجُلِ فِي حَجْرِ امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ

وَكَانَ أَبُو وَائِلٍ يُرْسِلُ خَادِمَهُ وَهْيَ حَائِضٌ إِلَى أَبِي رَزِينٍ، فَتَأْتِيهِ بِالْمُصْحَفِ فَتُمْسِكُهُ بِعِلاَقَتِهِ

٢٩٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ الفَضْلُ بْنُ دُكَيْنٍ، سَمِعَ زُهَيْرًا، عَنْ مَنْصُورٍ ابن صَفِيَّةَ، أَنَّ أُمَّهُ حَدَّثَتْهُ، أَنَّ عَائِشَةَ حَدَّثَتْهَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَّكِئُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ يَقْرَأُ القُرْآنَ[١].

## ٤- باسی قوڕئانخوێندنی پیاو

## كه سەری له كۆشی خێزانیدا بێت له كاتێكدا حەیزداره

ئەبو وائیل خزمەتكارەكەی كه له حەیزدا بوو دەینارد بۆ لای ئەبو ڕەزین، قوڕئانەكەی بۆ دەهێنا و به پەتی كیسەكەی دەیگرت.

٢٩٧- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوه: كه پێغەمبەر ﷺ له باوەشمدا پاڵی دەدایەوه و منیش له حەیزدا بووم، پاشان قوڕئانی دەخوێند.

---

[١] بڕوانه: ٧٥٤٩.

## ٥- بابُ مَنْ سَمَّى النِّفَاسَ حَيْضًا

٢٩٨- حَدَّثَنَا الَمكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ زَيْنَبَ ابنةَ أُمِّ سَلَمَةَ حَدَّثَتْهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ حَدَّثَتْهَا قَالَتْ: بَيْنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مُضْطَجِعَةً فِي خَمِيصَةٍ إِذْ حِضْتُ، فَانْسَلَلْتُ فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي قَالَ: «أَنُفِسْتِ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. فَدَعَانِى فَاضْطَجَعْتُ مَعَهُ فِي الَخمِيلَةِ[1].

## ٥- باسی ئەو کەسەی نیفاسی بە حەیز نێو بردووە

**٢٩٨- ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: لەکاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕاکشابووم لەژێر جاجمێکی ڕەشی خەتخەتدا، لەو کاتەدا کەوتمە حەیزەوە، بۆیە (لەژێر جاجمەکە) هاتمە دەرەوە و پۆشاکی کاتی حەیزم هێنا (و لەبەرم کرد)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کەوتیتە حەیزەوە؟)) وتم: بەڵێ، جا بانگی کردم و لەگەڵیدا ڕاکشام لەژێر مەوجێکی ڕەشی ڕیشوودااردا.**

## ٦- بابُ مُبَاشَرَةِ الَحائِضِ

٢٩٩- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، كِلَانَا جُنُبٌ[2].

## ٦- باسی بەریەککەوتنی پێستی پیاو لەگەڵ پێستی ئافرەتی حەیزدار

**٢٩٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە خۆمان دەشۆرد لە یەك دەفردا (ئاومان دەکرد بە خۆماندا)، هەردووکمان لەشمان گران بوو.**

---

[1] بروانە: ٣٢٢، ٣٢٣، ١٩٢٩.

[2] بروانە: ٢٥٠.

٣٠٠- وَكَانَ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ، فَيُبَاشِرُنِي وَأَنَا حَائِضٌ[1].

**٣٠٠- وه (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانى پێ دەكردم ئيزارم[2] دەبەست، جا دەستبازى لەگەڵ دەكردم، لە كاتێكدا من لە حەيزدا بووم.**

٣٠١- وَكَانَ يُخْرِجُ رَأْسَهُ إِلَيَّ وَهُوَ مُعْتَكِفٌ، فَأَغْسِلُهُ وَأَنَا حَائِضٌ[3].

**٣٠١- وه (پێغەمبەر ﷺ) سەرى (لە مزگەوت) دەهێنايە دەرەوە بۆ لاى من لە كاتێكدا لە ئيعتيكافدا بوو، منيش سەريم دەشۆرى لە كاتێكدا لە حەيزدا بووم.**

٣٠٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ خَلِيلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْن مُسْهِرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو إِسْحَاقَ -هُوَ الشَّيْبَانِيُّ- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأسوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَتْ إِحْدَانَا إِذَا كَانَتْ حَائِضًا، فَأَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُبَاشِرَهَا، أَمَرَهَا أَنْ تَتَّزِرَ فِي فَوْرِ حَيْضَتِهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا. قَالَتْ: وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَمْلِكُ إِرْبَهُ؟. تَابَعَهُ خَالِدٌ وَجَرِيرٌ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ[4].

**٣٠٢- عائيشە ﵂ دەڵێ: ئەگەر يەكێكمان (لە خێزانەكانى پێغەمبەر ﷺ) لە حەيزدا بووايە و پێغەمبەرى خوا ﷺ بيويستايە يارى و دەستبازى لەگەڵدا بكردايە، فەرمانى پێ دەكرد ئيزار ببەستێ لەسەرەتاى (يان خوێن زۆرى) حەيزەكەيدا، پاشان پێستى بەر پێستى دەكەوت و يارى لەگەڵ دەكرد، عائيشە دەڵێ: كام لە ئێوە خۆى بۆ دەگيرێ وەك پێغەمبەر ﷺ خۆى بۆ دەگيرا؟ (واتە: بەسەر ئارەزوويدا زاڵ بێ). خاليد و جەريريش لە شەيبانييەوە ئەم فەرموودەيەيان گێڕاوەتەوە (و پاڵپشتى گێڕانەوەكەى عەلى كوڕى موسهير دەكەن).**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٢، ٢٠٣٠.

[2] ئيزار: پۆشاكێكە نێوقەد و خوارەوە دادەپۆشێ، توند دەكرێ و دەبەسترێ لە نێوقەد.

[3] بڕوانە: ٢٩٥.

[4] بڕوانە: ٣٠٠.

٣٠٣- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَدَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ مَيْمُونَةَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُبَاشِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ أَمَرَهَا، فَاتَّزَرَتْ وَهْيَ حَائِضٌ. وَرَوَاهُ سُفْيَانُ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ.

**٣٠٣- عەبدوڵای کوڕی شەداد دەڵێ: لە مەیمونەوە ﵂ بیستم دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کات بیویستایە تێکەڵی و یاری لەگەڵ ئافرەتێك لە خێزانەکانیدا بکات کە لە حەیزدا بووایە، فەرمانی پێ دەکرد ئیزار ببەستێ. سوفیانیش ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە لە شەیبانییەوە.**

## ٧- بابُ تَرْكِ الحَائِضِ الصَّوْمَ

٣٠٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بن جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي زَيْدٌ -هُوَ ابن أَسْلَمَ- عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَضْحَى-أَوْ فِطْرٍ- إِلَى الْمصَلَّى، فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ، فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ». فَقُلْنَ: وَبِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ العَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ». قُلْنَ: وَمَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَلَيْسَ شَهَادَةُ المَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ؟». قُلْنَ: بَلَى. قَالَ: «فَذَلِكِ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا، أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ؟». قُلْنَ: بَلَى. قَالَ: «فَذَلِكِ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا»[1].

## ٧- باسی ئافرەتی حەیزدار ڕۆژوو ناگرێت[2]

**٣٠٤- ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژنی قورباندا -یان لە جەژنی ڕەمەزاندا- بوو، لە مەدینە ڕۆیشتە دەرەوەی شار**

---

[1] بروانە: ١٤٦٢، ١٩٥١، ٢٦٥٨.

[2] لەو ڕۆژانەدا کە لە حەیزدایە و پاك نییە.

**بۆ نوێژگە[1]، بەلای ئافرەتاندا تێ پەڕی فەرمووی: ((ئەی کۆمەڵی ئافرەتان ماڵ ببەخشن، چونکە بەڕاستی ئێوەم نیشان درا زۆربەی خەڵکی دۆزەخ بوون))، ئەوانیش وتیان: بەهۆی چییەوە (ئێمە واین) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((نەفرین زۆر دەکەن و ناسوپاسگوزارن بەرامبەر مێردەکانتان، (کەسێکی) ئەقڵ و ئایینناتەواو (ی وەك ئێوە)م نەدیوە بەقەدەر کەسێکتان دڵ و ئەقڵی پیاوی هۆشمەند نەهێڵێ))، وتیان: ناتەواوی ئایین و ئەقڵی ئێمە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((ئایا شایەتیدانی ئافرەت وەك نیو شایەتیدانی پیاو نییە؟))، وتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی: ((دەی ئەوە ناتەواوی ئەقڵێتی، ئایا کاتێ کەوتە بێنوێژی واز لە نوێژ و ڕۆژوو ناهێنێ؟))، وتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی: ((ئەوەش ناتەواوی ئایینیەتی))[2].**

## ٨- بابٌ: تَقْضِي الحَائضُ المَنَاسِكَ كُلَّهَا إلَّا الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: لَا بَأْسَ أَنْ تَقْرَأَ الآيَةَ، وَلَمْ يَرَ ابن عَبَّاسٍ بِالْقِرَاءَةِ لِلْجُنُبِ بَأْسًا. وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ. وَقَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: كُنَّا نُؤْمَرُ أَنْ يَخْرُجَ الحُيَّضُ، فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ وَيَدْعُونَ[3]. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: أَخْبَرَنِي أَبُو سُفْيَانَ، أَنَّ هِرَقْلَ دَعَا بِكِتَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَرَأَ، فَإِذَا فِيهِ:

---

[1] نوێژگە شوێنێکی فراوان بوو لە دەرەوەی شاری مەدینە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنەکانی لەوێ دەکرد.

[2] باسکردنی ناتەواوی ئەقڵ و ئایین لە ئافرەتاندا مەبەست لێی بەکەمزانین و سەرزەنشتکردنیان نییە، چونکە ئەو دوو شتە لە سەرەتا و دروستبوونیاندا هەبووە، بەڵکوو وەک ئاگاداری بە موسوڵمانان دراوە بەهۆیانەوە تووشی هەڵە نەبن، بۆیە سزای بۆ ئەوانە داناوە سپڵەن و چاکەی مێردەکانیان لەبەرچاو نییە، نەک لەسەر ناتەواوی ئەقڵ و ئایین، وە شتێک یان کەسێک کامڵ و تەواو بێت بەراورد بەشتێک یان کەسێک لەو شتە یان لەو کەسە کامڵتر و تەواوتر بە ناتەواوە دادەنرێت، وەک ئافرەتی حەیزدار گوناهبار نابێت بە نەکردنی نوێژ کاتێ لە حەیزدایە، بەڵام ناتەواوترە لە کەسێک کە نوێژ دەکات. بڕوانە: إرشاد الساری: ٥٤٣/١-٥٤٤.

[3] لە ڕیوایەتی (کشمهيني) بە (وَيَدْعِين) هاتووە. إرشاد الساري: ٥٤٥/١.

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ ﴾ وَ ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ ﴿٦٤﴾ ﴾ آل عمران، الآيَةَ[١].

وَقَالَ عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرٍ: حَاضَتْ عَائِشَةُ فَنَسَكَتِ المَنَاسِكَ غَيْرَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ، وَلَا تُصَلِّي[٢] وَقَالَ الحَكَمُ: إِنِّي لأَذْبَحُ وَأَنَا جُنُبٌ. وَقَالَ اللَّهُ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴿١٢١﴾ ﴾ الأنعام.

## ٨- باسێک: ئافرەتی حەیزدار هەموو ڕێوڕەسمەکانی حەج دەکات جگە لە سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا

**ئیبراهیم (ی نەخەعی) دەڵێ: قەیناکات حەیزدار ئایەتێك بخوێنێ، عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ بەلایەوە قورئانخوێندن بۆ لەشگران هیچ زیانی نییە، وە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتەکانیدا زیکری خوای دەکرد، ئومو عەتییە ﷺ دەڵێ: ئێمە (لە جەژنەکاندا) فەرمانمان پێ دەکرا کە ئافرەتانی حەیزداریش بچنە دەرەوەی مەدینە (بۆ نوێژگە)، لەگەڵ الله أكبری پیاواندا الله أكبریان دەکرد و دووعایان دەکرد. وە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: ئەبو سوفیان بۆی گێڕامەوە کە هیرەقڵ داوای نامەکەی پێغەمبەری کرد ﷺ (کە بۆی نووسیبوو)، خوێندیەوە ئەمەی تێدا بوو: (بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان و ئەی خاوەن پەڕاوەئاسمانییەکان وەرن بۆلای وتەیەك .... تا کۆتایی ئایەتەکە)، عەتائیش لە جابیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عائیشە کەوتە نێو بێنوێژی، هەموو مەناسیکەکانی حەجی کرد، جگە لە سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا، وە نوێژیشی نەکرد، حەکەمیش دەڵێ من ئاژەڵ سەر دەبڕم و لەشیشم گرانە (و ناوی خواشی لەسەر دەهێنم)، خوای گەورە دەفەرمووێ: (گۆشتی ئەو ئاژەڵە (سەربڕاوە) مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە).**

---

[١] بڕوانە: ٧.

[٢] بڕوانە: ١٥٥٧.

٣٠٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ لَا نَذْكُرُ إِلَّا الحجَّ، فَلَمَّا جِئْنَا سَرِفَ طَمِثْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: «مَا يُبْكِيكِ؟». قُلْتُ: لَوَدِدْتُ واللهِ أَنِّي لَمْ أَحُجَّ العَامَ. قَالَ: «لَعَلَّكِ نُفِسْتِ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «فَإِنَّ ذَلِكِ شَيْءٌ كَتَبَهُ اللهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَافْعَلِي مَا يَفْعَلُ الحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَطْهُرِي»[1].

**٣٠٥- عائیشه ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺلە مەدینە دەرچووین تەنیا باسی حەجمان دەکرد، جا کاتێ گەیشتینە سەریف کەوتمە حەیزەوە و پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام، لەو کاتەدا دەگریام، فەرمووی: ((بۆچی دەگریت؟)) وتم: سوێند بە خوا ئاواتەخوازبووم ئەم ساڵ حەجم نەکردایە، فەرمووی: ((دەڵێی کەوتوویتە حەیزەوە؟))، وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((بێگومان ئەوە شتێکە خوای گەورە لەسەر کچانی ئادەمی نووسیوە، حاجی چی دەکات تۆش بیکە، تەنها ئەوە نەبێ سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا مەکە تا پاك دەبیتەوە)).**

## ٩- بابُ الاسْتِحَاضَةِ

٣٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِك، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيه، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَتْ فَاطِمَة بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي لَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِالْحَيْضةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلَاةَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصلِّي»[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٩٤.

[2] بڕوانە: ٢٢٨.

## ٩- باسی (حوکمی) خوێنی نەخۆشی

٣٠٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پاك نابمەوە لە خوێن ئایا واز بێنم لە نوێژکردن؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەوە خوێنی دەمارێکە و حەیز نییە، جا هەر کاتێ خوێنی حەیزی جارانت هات نوێژ مەکە، جا ئەگەر کاتەکەی حەیزی جارانت تەواو بوو، ئەگەر خوێنت هەبوو خوێنەکەت بشۆرە، (دوای خۆشۆردن[1] ئینجا نوێژ بکە. (واتە: غوسڵ بکە و ئەو خوێنە بشۆرە کە پێتەوەیە و بۆ هەموو نوێژێك خۆت پاك بکەرەوە لەو خوێنی نەخۆشییە).

## ١٠- بابُ غَسْلِ دَمِ المَحِيضِ

٣٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَنَّهَا قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَه رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا إِذَا أَصَابَ ثَوْبَهَا الدَّمُ مِنَ الحَيْضَةِ، كَيْفَ تَصْنَعُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَصَابَ ثَوْبَ إِحْدَاكُنَّ الدَّمُ مِنَ الحَيْضَةِ، فَلْتَقْرُصْهُ ثُمَّ لِتَنْضَحْهُ بِمَاءٍ، ثُمَّ لِتُصَلِّي فِيهِ»[2].

## ١٠- باسی شۆردنی خوێنی حەیز

٣٠٧- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئافرەتێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ: ئەگەر یەکێك لە ئێمەی ئافرەتان خوێنی حەیز بەر جلەکەی کەوت چی بکات؟ پێغەمبەری

---

[1] وەک لە فەرموودەی ژمارە (٣٢٥ و ٣٢٧)ی بوخاریدا هاتووە.

[2] بڕوانە: ٢٢٧.

**خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر خوێنی حەیز بەر جلی یەکێکتان کەوت، با بە نینۆکی لێی کاتەوە و بیکرێنێ، پاشان ئاو (بە شوێنەوارەکەیدا) بکات، ئینجا نوێژی پێوە بکات)).**

٣٠٨- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابن وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ الحارِثِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ حَدَّثَهُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ، ثُمَّ تَقْتَرِصُ الدَّمَ مِنْ ثَوْبِهَا عِنْدَ طُهْرِهَا فَتَغْسِلُهُ، وَتَنْضَحُ عَلَى سَائِرِهِ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ.

**٣٠٨- عائیشه ﵂ دەڵێ: یەکێ لە ئێمەی ئافرەتان دەکەوتە حەیزەوە، پاشان لە کاتی پاکبوونەوەیدا ئەو خوێنەی بە جلەکانیەوە بووایە، بە پەنجەکانی دەیپرواند[1] (و لێی دەکردەوە)، جا دەیشۆرد و ئاوی دەپرژاند بەوەی نەیشۆردووە لە جلەکانی، پاشان نوێژی پێوە دەکرد.**

## ١١- بابُ الاعْتِكَافِ لِلمُسْتَحَاضَةِ

٣٠٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاق قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اعْتَكَفَ مَعَهُ بَعْضُ نِسَائِهِ وَهْيَ مُسْتَحَاضَةٌ تَرى الدَّمَ، فَرُبَّمَا وَضَعَتِ الطَّسْتَ تَحْتَهَا مِنَ الدَّمِ. وَزَعَمَ أَنَّ عَائِشَةَ رَأَتْ مَاءَ العُصْفُرِ، فَقَالَتْ: كَأَنَّ هذا شَيء كَانَتْ فُلَانَةُ تَجِدُهُ[2].

---

[1] (تَقْتَرِص): واته: بە نینۆك بیکرێنێ و لێی بکاتەوە، یان بە پەنجەکانی بیپروێنێت و لێی بکاتەوە، هەردوو ماناکە ڕاستە. إرشاد الساري: ٥٤٨/١.

[2] بڕوانە: ٣١٠، ٣١١، ٢٠٣٧.

# ١١- باسی (حوكمی) ئیعتیكافكردنی ئافرەتێک خوێنی نەخۆشی هەبێت

**٣٠٩- عیكریمە دەڵێ عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: كە ئافرەتێك[1] لە خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ ئیعتیكافی دەكرد لەگەڵیدا لە كاتێكدا خوێنی نەخۆشی هەبوو، جا هەندێ جار تەشتی لەژێر خۆیدا دادەنا لەبەر زۆری خوێنەكەی، وە (عیكریمە) دەڵێ: عائیشە بینی زەرداوێكی (وەك ئاوی گوڵەگەزنەی) هەیە، جا وتی: ئەمە دەڵێی ئەو شتەیە فلانە ئافرەت هەیبوو.**

٣١٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيد بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتِ: اعْتَكَفَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ امْرَأَةٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ، فَكَانَتْ تَرى الدَّمَ وَالصُّفْرَةَ، وَالطَّسْتُ تَحْتَهَا وَهْيَ تُصَلِّي[2].

**٣١٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئافرەتێك لە خێزانەكانی ئیعتیكافی كرد، جا خوێن و زەردایی هەبوو، تەشتێكی لەژێردا بوو لە كاتێكدا نوێژی دەكرد.**

٣١١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ بَعْضَ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ اعْتَكَفَتْ وَهْيَ مُسْتَحَاضَةٌ[3].

**٣١١- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: كە یەكێك لە دایكی ئیمانداران ئیعتیكافی كرد و لە كاتێكدا خوێنی نەخۆشی هەبوو.**

---

[1] كە سەودەی كچی زەمعە بوو.

[2] بڕوانە: ٣٠٩.

[3] بڕوانە: ٣٠٩.

## ١٢- بابٌ: هَلْ تُصَلِّي المَرْأَةُ فِي ثَوْبٍ حَاضَتْ فِيهِ؟

٣١٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ نَافِعٍ، عَنِ ابن أَبِي نَجِيح، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: مَا كَانَ لإِحْدَانَا إِلَّا ثَوْبٌ وَاحِدٌ تَحِيضُ فِيهِ، فَإِذَا أَصَابَهُ شَيْءٌ مِنْ دَمٍ، قَالَتْ بِرِيقِهَا فَقَصَعَتْهُ بِظُفْرِهَا.

## ١٢- باسێك: ئایا ئافرەت دروستە نوێژ بكات بەو جلەوە كە لەبەریدا بووە كەوتووەتە حەیزەوە

**٣١٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: هیچ ئافرەتێكمان لە كراسێ زیاتری نەبوو كە دەكەوتە حەیزەوە لەبەریدا بوو، جا ئەگەر هەندێ خوێنی بەربكەوتایە، بە تفی تەڕی دەكرد و بە نینۆكی دەیكرِاند.**

## ١٣- بابُ الطِّيبِ لِلْمَرْأَةِ عِنْدَ غُسْلِهَا مِنَ المَحِيضِ

٣١٣- حَدَّثَنَا عَبْدِ اللَّهِ بْن عَبْدِ الوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حَفْصَةَ -قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: أَوْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ حَفْصَةَ- عَن أُمِّ عَطِيَّةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كنَّا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلَا نَكْتَحِلَ وَلَا نَتَطَيَّبَ وَلَا نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ، وَقَدْ رُخِّصَ لَنَا عِنْدَ الطُّهْرِ إِذَا اغْتَسَلَتْ إِحْدَانَا مِنْ مَحِيضِهَا فِي نُبْذَةٍ مِنْ كُسْتِ أَظْفَارٍ، وَكُنَّا نُنْهَى عَنِ اتِّبَاعِ الجنَائِزِ. قَالَ: رَوَاهُ هِشَامُ بْنُ حَسَّانَ، عَنْ حَفْصَةَ، عَنْ أُمِّ عَطِيةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٢٧٨، ١٢٧٩، ٥٣٤٠، ٥٣٤١، ٥٣٤٢، ٥٣٤٣.

## ١٣- باسی بەکارهێنانی بۆنی خۆش بۆ ئافرەت کاتێ خۆی دەشوات کە پاک دەبێتەوە لە حەیز

٣١٣- حەفصە لە ئومو عەتییەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمەی ئافرەتان قەدەغە دەکراین سێ ڕۆژ زیاتر تەعزیەبار بین بۆ مردوو، جگە لە مێرد کە چوار مانگ و دە ڕۆژ تەعزیەبار دەبووین، چاومان نەدەڕشت و بۆنی خۆشمان لە خۆمان نەدەدا وە جلی ڕەنگکراومان لەبەر نەدەکرد، مەگەر جۆرە پۆشاکێکی ڕەنگکراوی یەمەنی کە ناوی (عَصْب) بوو، وە بێگومان ڕێگە درابووین لە کاتی پاکبوونەوەدا ئەگەر یەکێکمان غوسڵی بێنوێژی کرد، هەندێ لە بۆنخۆشی (أَظْفَار)[1] بەکار بێنێ، وە ئێمە قەدەغە کرابووین لە شوێنکەوتنی جەنازەی مردووان. ئەبو عەبدولاّ (ئیمام بوخاری) دەڵێ: هەروەها ئەم فەرموودەیە هیشامی کوڕی حەسان لە حەفصەوە ئەویش لە ئومو عەتییەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە.

## ١٤- بابُ دَلْكِ المَرْأَةِ نَفْسَهَا إِذَا تَطَهَّرَتْ مِنَ المَحِيضِ، وَكَيْفَ تَغْتَسِلُ، وَتَأْخُذ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَتَّبِعُ بِهَا أَثَرَ الدَّمِ

٣١٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا ابن عُيَيْنَةَ، عَنْ مَنْصُورِ ابن صَفِيَّةَ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلتِ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ غُسْلِهَا مِنَ المَحِيضِ، فَأَمَرَهَا كَيْفَ تَغْتَسِلُ، قَالَ: «خُذِي فِرْصَةً مِنْ مِسْكٍ فَتَطَهَّرِي بِهَا». قَالَتْ: كَيْفَ أَتَطَهَّرُ؟ قَالَ: «تَطَهَّرِي بِهَا». قَالَتْ: كَيْفَ؟ قَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ! تَطَهَّرِي». فَاجْتَبَذْتُهَا إِلَيَّ فَقُلْتُ: تَتَبَّعِي بِهَا أَثَرَ الدَّمِ[2].

---

[1] أَظْفَار: شارێکە لە کەنارەکانی یەمەن، بۆنەخۆشەکە بە ناوی ئەو شارەوە ناو نراوە، چونکە لەوێوە دەهێنرا.

[2] بڕوانە: ٣١٥، ٧٣٥٣.

## ١٤- باسى ئافرەت دەست بخاتە لاشەى كاتى خۆشۆردنى بێنوێژى، وە چۆن خۆى بشوات، وە پارچەيەک لۆکەى میسکاوی بێنێت و بیخاتە نێو لەشیەوە تا بۆنی خوێنەکە نەهێڵێ

**٣١٤- صەفییە دەڵێ: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئافرەتێ دەربارەی غوسڵی بێنوێژی پرسیاری لە پێغەمبەر كرد ﷺ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێ كرد چۆن غوسڵ بكات و فەرمووی: ((پارچەیەك لۆكەی میسكاوی بێنە و خۆتی پێ پاك بكەرەوە))، ئافرەتەكە وتی: چۆن خۆمی پێ پاك بكەمەوە؟ فەرمووی: ((خۆتی پێ پاك بكەرەوە))، وتی: چۆن؟ فەرمووی: ((سبحان الله، خۆتی پێ پاك بكەرەوە))، عائیشە دەڵێ: ڕامكێشا بۆ لای خۆم و پێم وت: (لەدوای غوسڵەكەت ئەو پارچە لۆكە میسكاوییە بخەرە ئەو شوێنەی خوێنی لێ دەردەچێ (با بۆنی خوێنەكە نەهێڵێ)).**

## ١٥- بابُ غَسْلِ المَحِيضِ

٣١٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ قَالَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ: كَيْفَ أَغْتَسِلُ مِنَ المَحِيضِ؟ قَالَ: «خُذِي فِرْصَةً مُمَسَّكَةً، فَتَوَضَّئِي ثَلاَثًا». ثُمَّ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَحْيَا فَأَعْرَضَ بِوَجْهِهِ، أَوْ قَالَ: «تَوَضَّئِي بِهَا». فَأَخَذْتُهَا فَجَذَبْتُهَا فَأَخْبَرْتُهَا بِمَا يُرِيدُ النَّبِيُّ ﷺ[1].

## ١٥- باسى خۆشۆردنى (ئافرەت لە) بێنوێژى

**٣١٥- صەفییە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە: كە ئافرەتێكی ئەنصاڕی بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: چۆن خۆم بشۆرم لە بێنوێژی؟ فەرمووی:**

---

[1] بڕوانە: ٣١٤.

((پارچەیەك لۆكەی میسكاوی بێنە و سێ جار خۆتی پێ پاك بكەرەوە))[1]، جا پێغەمبەر ﷺ شەرمی كرد و ڕووی وەرچەرخاند، یان فەرمووی: ((خۆتی پێ پاك بكەرەوە))، عائیشە ﵂ دەڵێ: منیش قۆڵیم گرت و ڕامكێشا و پێم وت كە پێغەمبەر ﷺ چی مەبەستە.

## ١٦- بابُ امْتِشَاطِ المَرْأَةِ عِنْدَ غَسْلِهَا مِنَ المَحِيضِ

٣١٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، حَدَّثَنَا ابن شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَهْلَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ، فَكُنْتُ مِمَّن تَمَتَّعَ، وَلَمْ يَسُقِ الهَدْيَ. فَزَعَمَتْ أَنَّهَا حَاضَتْ، وَلَمْ تَطْهُرْ حَتَّى دَخَلَتْ لَيْلَةُ عَرَفَةَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هذِه لَيْلَةُ عَرَفَةَ، وإِنَّمَا كنْتُ تَمَتَّعْتُ بِعُمْرةٍ. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي، وَأَمْسِكِي عَنْ عُمْرَتِكِ». فَفَعَلْتُ، فَلَمَّا قَضَيْتُ الحجَّ أَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ لَيْلَةَ الحصْبَةِ فَأَعْمَرَنِي مِنَ التَّنْعِيمِ مَكَانَ عُمْرَتِي التِي نَسَكْتُ[2].

## ١٦- باسی قژداهێنانی ئافرەت لە كاتی خۆشۆردنی لە بێنوێژی

٣١٦- عورِوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە حەجیماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئیحرامم بەست، جا من لەو كەسانە بووم كە بە عومرە ئیحرامم بەستبوو، هەدیشم[3] نەهێنابوو، جا عائیشە هەستی كرد كەوتۆتە

---

[1] یان شوێنەكەی پێ بۆنخۆش بكە، بڕوانە: مرآة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح: ١٣٥/٢ .

[2] بڕوانە: ٢٩٤.

[3]) هەدی: ئەو ئاژەڵەیە حاجی لە گەڵ خۆی دەیهێنێ لە مەككە سەری دەبڕێ، وە (مِمَّن تَمَتَّعَ) واتە: لەو كەسانە بوو ئیحرامی بە تەمەتوع بەستبوو، ئەبووایە بیوتایە: (مِمَّن تَمَتَّعْتُ) هەروەها: (وَلَمْ يَسُقِ الهَدْيَ ) واتە: هەدی

بێنوێژییەوە و پاك نەبۆیەوە تا گەشتە شەوی عەرەفە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێستا شەوی عەرەفەیە و منیش ئیحرامم (بە عومرە) بەستووە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((قژی سەرت (پەلەکانت) بکەرەوە و قژت دابهێنە و واز لە عومرەکەت بێنە و مەیکە))، (عائیشە دەڵێ:) منیش وام کرد، جا کە حەجم تەواو کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە عەبدورەحمانی برام لە شەوی دەرچوونمان لە مینا عومرەی پێ کردم لە (مزگەوتی) تەنعیمەوە، (ئیحرامم بەست و ڕۆیشتم لە کەعبە عومرەکەم کرد) لەجیاتی ئەو عومرەیەی کە بۆم نەکرا.

## ١٧- بابُ نَقْضِ المَرْأَةِ شَعَرَهَا عِنْدَ غَسْلِ المَحِيضِ

٣١٧- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجْنَا مُوَافِينَ لِهِلَالِ ذِي الحِجَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهْلِلْ، فَإِنِّي لَوْلَا أَنِّي أَهْدَيْتُ لَأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ». فَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِحَجٍّ، وَكُنْتُ أَنَا مِمَّنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ. فَأَدْرَكَنِي يَوْمُ عَرَفَةَ وَأَنَا حَائِضٌ، فَشَكَوْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «دَعِي عُمْرَتَكِ، وَانْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِحَجٍّ». فَفَعَلْتُ، حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةُ الحَصْبَةِ أَرْسَلَ مَعِي أَخِي عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَخَرَجْتُ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ مَكَانَ عُمْرَتِي. قَالَ هِشَامٌ: وَلَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ هَدْيٌ وَلَا صَوْمٌ وَلَا صَدَقَةٌ[١].

---

نەهێنابوو، ئەبووایە بیوتایە: (وَلَمْ أَسُقِ الهَدْيَ) واتە: هەدیم نەهێنابوو . ئەمە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەڵێن: إلتفات من المتكلم الى الغائب، واتە: گۆڕینی وتە لە قسەکەرەوە بۆ قسەلەسەرکراو. بڕوانە: إرشاد الساری:١/٥٥٦.

[١] بڕوانە: ٢٩٤.

# ١٧- باسی ئافرەت قژ و پەلکەی بکاتەوە لە کاتی غوسلی بێنوێژیدا

**٣١٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: لە سەرەتای مانگی (ذي الحجة)وە لە مەدینە دەرچووین و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس دەیەوێ بە عومرە ئیحرام ببەستێ با بیبەستێ، جا بەڕاستی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە من هەدیم هێناوە، بە عومرە ئیحرامم دەبەست))، جا هەندێکیان ئیحرامیان بە عومرە بەست و هەندێکی دیکەیان بە حەج بەستیان، منیش لەوانە بووم بە عومرە ئیحرامم بەستبوو، کە گەشتمە ڕۆژی عەرەفە کەوتمە حەیزەوە، سکاڵام برد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((واز لە عومرەکەت بێنە، قژی سەرت (پەلکەکانت) بکەرەوە و شانەی بکە و ئیحرام بە حەج ببەستە))، منیش وام کرد، تا شەوی مینا (پێغەمبەر ﷺ) عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری برامی لەگەڵمدا نارد و لە مەککە ڕۆیشتمە دەرەوە بۆ (مزگەوتی) تەنعیم، ئیحرامم بە عومرە بەست (عومرەم کرد) لەباتی عومرەکەی پێشووم. هیشام دەڵێ: لە هیچ یەک لە مانەدا سەربڕینی ئاژەڵ (فیدیە) و ڕۆژووگرتن وماڵبەخشین پێویست نەبوو لەسەری.**

## ١٨- باب ﴿مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ ﴿٥﴾﴾ الحج

٣١٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكًا يَقُولُ:يا رَبِّ نُطْفَةٌ، يَارَبِّ عَلَقَةٌ،يا رَبِّ مُضْغَةٌ. فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهُ قَالَ: أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا الرِّزْقُ وَالأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ»[1].

[1] بڕوانە: ٣٣٣٣، ٦٥٩٥.

## ١٨- باسی ڕاڤەی: ﴿مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ ﴾ الحج

**٣١٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان خودا ﷻ منداڵدانی ئافرەتی سپاردووە بە فریشتەیەك، دەڵێ پەروەردگارم (ئێستا ئەمە) دڵۆپە ئاوێکە، پەروەردگارم خوێنپارەیە، پەروەردگارم گۆشتپارەیە، جا ئەگەر ویستی بڕیاری دروستکردنی بدات (فریشتەکە) دەڵێ: نێرە یان مێ؟ بەدبەختە یان بەختەوەرە؟ ڕۆزی چەندە و کاتی مردنی کەیە؟ (ئەمانە هەمووی) دەنووسرێ لە کاتێکدا لە سکی دایکیدایە.**

## ١٩- بابُ كَيْفَ تُهِلُّ الحَائِضُ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ؟

٣١٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، فَقَدِمْنَا مَكَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَلَمْ يُهْدِ فَلْيُحْلِلْ، وَمَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَأَهْدَى فَلَا يَحِلُّ حَتَّى يَحِلَّ بِنَحْرِ هَدْيِهِ، وَمَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ فَلْيُتِمَّ حَجَّهُ». قَالَتْ: فَحِضْتُ فَلَمْ أَزَلْ حَائِضًا حَتَّى كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ، وَلَمْ أُهْلِلْ إِلَّا بِعُمْرَةٍ، فَأَمَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ أَنْ أَنْقُضَ رَأْسِي وَأَمْتَشِطَ، وَأُهِلَّ بِحَجٍّ، وَأَتْرُكَ العُمْرَةَ، فَفَعَلْتُ ذَلِكَ حَتَّى قَضَيْتُ حَجِّي، فَبَعَثَ مَعِي عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، وَأَمَرَنِي أَنْ أَعْتَمِرَ مَكَانَ عُمْرَتِي مِنَ التَّنْعِيمِ[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٩٤.

## ١٩- باسی ئافرەتی حەیزدار چۆن ئیحرام دەبەستێ بە حج و عومرە؟

٣١٩- عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە حەجیماڵئاوایدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە دەرچووین، جا هەمان بوو ئیحرامی بە عومرە بەستبوو، هەشمان بوو ئیحرامی بە حەج بەستبوو، جا گەیشتینە مەککە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس ئیحرامی بە عومرە بەستووە و هەدی نەهێناوە، با ئیحرام بشکێنێ، هەر کەسیش ئیحرامی بە عومرە بەستووە و هەدی هێناوە، ئیحرام نەشکێنێ هەتا بە سەربڕینی هەدییەکەی دەیشکێنێ، هەر کەسیش ئیحرامی بە حەج بەستووە، ئەوە با حەجەکەی تەواو بکات))، عائیشە دەڵێ: من کەوتمە حەیزەوە بەردەوام لە حەیزدا بووم تا ڕۆژی عەرەفە و ئیحرامیشم تەنها بە عومرە بەستبوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردم قژی سەرم بکەمەوە و شانەی بکەم و ئیحرام بە حەج ببەستم و واز لە عومرەکەم بێنم، منیش ئەوەم کرد بەردەوام بووم تا کارەکانی حەجم تەواو کرد، جا پێغەمبەر ﷺ عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری (برامی) نارد لەگەڵمدا فەرمانی پێ کردم عومرەیەك بکەم، لە تەنعیمەوە (ئیحرامم بەست و عومرەم کرد) لەجیاتی عومرەکەی ڕابوورد.

## ٢٠- بابُ إِقْبَالِ المَحِيضِ وَإِدْبَارِهِ

وَكُنَّ نِسَاءٌ يَبْعَثْنَ إِلَى عَائِشَةَ بِالدُّرْجَةِ فِيهَا الكُرْسُفُ فِيهِ الصُّفْرَةُ، فَتَقُولُ: لَا تَعْجَلْنَ حَتَّى تَرَيْنَ القَصَّةَ البَيْضَاءَ. تُرِيدُ بِذَلِكَ الطُّهْرَ مِنَ الحَيْضَةِ. قَالَ البُخَارِيُّ: وَبَلَغَ ابنةَ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ نِسَاءً يَدْعُونَ بِالْمَصَابِيحِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ يَنْظُرْنَ إِلَى الطُّهْرِ، فَقَالَتْ: مَا كَانَ النسَاءُ يَصْنَعْنَ هذا. وَعَابَتْ عَلَيْهِنَّ.

## ٢٠- باسی سەرەتا و کۆتایی حەیز

**هەندێ لە ئافرەتان هەبوون پارچەپەڕۆیان دەنارد بۆ عائیشە ﵂، لۆکەی تێدا بوو، کە زەردایی پێوە بوو، عائیشەش دەیوت: پەلە مەکەن هەتا لۆکەکە بە سپێتی دەبینن، مەبەستی بەوە پاکبوونەوە بوو لە حەیز. بوخاری دەڵێ: هەواڵ درا بە کچی زەیدی کوڕی سابیت ﵄ کە هەندێ لە ئافرەتان داوای چرا دەکەن لە شەودا سەیر(ی پەڕۆکەیان) بکەن بۆ پاکبوونەوەیان لە حەیز، ئەویش وتی: ئافرەتان ئەوەیان نەدەکرد لە ڕابردوودا، ئەوەی بە ڕەخنە و عەیب لێ گرتن.**

٣٢٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ كَانَتْ تُسْتَحَاضُ فَسَأَلَتْ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ فَإِذَا أَقْبَلَتْ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلَاةَ وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْتَسِلِي وَصَلِّي[1].

**٣٢٠- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش خوێنی نەخۆشی (بەردەوامی) هەبوو، جا پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەوە خوێنی دەمارێکە و حەیز نییە، جا کاتێ حەیزەکە دەستی پێ کرد، (بەگوێرەی مانگەکانی پێشوو) واز لە نوێژکردن بێنە، وە کاتێ کاتی حەیزەکەت تێ پەڕی و تەواو بوو، خۆت بشۆرە و نوێژ بکە)).**

## ٢١- بابٌ: لَا تَقْضِي الحَائِضُ الصَّلَاةَ

وَقَالَ جَابِرٌ وَأَبُو سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ((تَدَعُ الصَّلَاةَ))[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٢٨.

٣٢١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: حَدَّثَتْنِي مُعَاذَةُ، أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ لِعَائِشَةَ: أَتَجْزِي إِحْدَانَا صَلَاتَهَا إِذَا طَهُرَتْ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ كُنَّا نَحِيضُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَا يَأْمُرُنَا بِهِ. أَوْ قَالَتْ: فَلَا نَفْعَلُهُ.

## ٢١- باسێك: ئافرەتی حەیزدار نوێژ ناگێڕێتەوە

**جابیر و ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((ئافرەتی حەیزدار نوێژ ناکات)).**

**٣٢١- موعازە دەڵێ: ئافرەتێك بە عائیشەی ﷺ وت: ئایا هەریەك لە ئێمە کاتێ پاك بۆیەوە نوێژەکانی (کاتی حەیزداری) بگێڕێتەوە؟ عائیشەش وتی: تۆ حەڕوریت[٢]، ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دەکەوتینە حەیزەوە فەرمانی پێ نەدەکردین بە گێڕانەوەی ئەو نوێژانە یان وتی: نەماندەگێڕانەوە.**

## ٢٢- بابُ النَّوْمِ مَعَ الحَائِضِ وَهْيَ فِي ثِيَابِهَا

٣٢٢- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ زَيْنَبَ ابنةِ أَبِي سَلَمَةَ حَدَّثَتْهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ قَالَتْ: حِضْتُ وَأَنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الخَمِيلَةِ، فَانْسَلَلْتُ فَخَرَجْتُ مِنْهَا، فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي فَلَبِسْتُهَا، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أنفِسْتِ؟». قُلْتُ: نَعَمْ، فَدَعَانِي فَأَدْخَلَنِي مَعَهُ فِي الخَمِيلَةِ. قَالَتْ: وَحَدَّثَتْنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ، وَكُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنَ الجَنَابَةِ[٣].

---

[١] بڕوانە: ٣٠٤، ١٥٥٧.

[٢] حەڕوری: واتە: خەواریج کە تەنها کار بەو حوکمانە دەکەن کە لە قورئاندا هاتووە، وە کار ناکەن بەو حوکمانەی لەفەرموودەکاندا هاتووە، حەڕوری شوێنێکە لەکوفە کە خەواریجەکانی لێ بوو، ئەوان پێیان وا بوو ئافرەت لەحەیزیشدا بێ، دەبێ نوێژ بکات.

[٣] بڕوانە: ٢٩٨.

## ٢٢- باسی خەوتنی پیاو لەگەڵ خێزانیدا لە کاتێکدا پۆشاکی حەیزەکەی لەبەردایە

٣٢٢- ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: کەوتمە حەیزەوە لە کاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لەژێر یەك جاجمدا بووین، ئینجا بەهێواشی خۆم کێشایەوە، جا ئەو جلوبەرگەی بۆ حەیز بوو هێنام و لەبەرم کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێم: ((کەوتیتە حەیزەوە؟))، وتم: بەڵێ، جا بانگی کردمەوە، کردمیەوە بەژێر جێگەکەدا لەگەڵ خۆیدا (ڕاکشامەوە)، کچەکەی ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: ئومو سەلەمە هەواڵی پێ دام کە پێغەمبەر ﷺ ماچی دەکرد لە کاتێکدا کە بەڕۆژوو بووە، وە (دەیوت:) من و پێغەمبەر ﷺ غوسڵی لەشگرانیمان کردووە لە یەك دەفردا.

## ٢٣- بابُ مَن أخذَ ثِيَابَ الحَيضِ سِوى ثِيَابِ الطُّهْرِ

٣٢٣- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ زَيْنَبَ ابنةِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: بَيَنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مُضْطَجِعَةً فِي خَمِيلَةٍ حِضْتُ، فَانْسَلَلْتُ فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي، فَقَالَ: «أَنُفِسْتِ؟». فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَدَعَانِي، فَاضْطَجَعْتُ مَعَهُ فِي الخَمِيلَةِ[1].

## ٢٣- باسی ئافرەت پۆشاکێکی هەبێ بۆ کاتی حەیز جگە لە پۆشاکی کاتی پاکێتی

٣٢٣- زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە لە ئومو سەلەمەوە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە کاتێکدا من لەژێر جاجمێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕاکشابووم کەوتمە

---

[1] بڕوانە: ٢٩٨.

**حەیزەوە، جا بەهێواشی لەژێر جاجمەکە هاتمە دەرەوە و جلوبەرگی حەیزەکەم هێنا و لەبەرم کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کەوتیتە حەیزەوە؟)) وتم: بەڵێ، جا بانگی کردم و لەژێر جاجمەکەدا لەگەڵی ڕاکشامەوە.**

## ٢٤- بابُ شُهُودِ الحَائِضِ العِيدَيْنِ، وَدَعْوَةَ المُسْلِمِينَ، وَيَعْتَزِلْنَ المُصَلَّى

٣٢٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ -هُوَ ابن سَلَامٍ- قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حَفْصَةَ قَالَتْ: كُنَّا نَمْنَعُ عَوَاتِقَنَا أَنْ يَخْرُجْنَ فِي العِيدَيْنِ، فَقَدِمَتِ امْرَأَة فَنَزَلَتْ قَصْرَ بَنِي خَلَفٍ، فَحَدَّثَتْ عَنْ أُخْتِهَا، وَكَانَ زَوْجُ أُخْتِهَا غَزَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ، وَكَانَتْ أُخْتِي مَعَهُ فِي سِتٍّ. قَالَتْ: كُنَّا نُدَاوِي الكَلْمَى، وَنَقُومُ عَلَى المَرْضَى، فَسَأَلَتْ أُخْتِي النَّبِيَّ ﷺ: أَعَلَى إِحْدَانَا بَأْسٌ إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهَا جِلْبَابٌ أَنْ لَا تَخْرجَ؟ قَالَ: «لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا[١]، وَلْتَشْهَدِ الخَيْرَ وَدَعْوَةَ المُسْلِمِينَ». فَلَمَّا قَدِمَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ سَأَلْتُهَا: أَسَمِعْتِ النَّبِيَّ ﷺ؟ قَالَتْ: بِأَبِي نَعَمْ -وَكَانَتْ لَا تَذْكُرُهُ إِلَّا قَالَتْ: بِأَبِي- سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «يَخْرُجُ العَوَاتِقُ وَذَوَاتُ الخُدُورِ -أَوِ العَوَاتِقُ ذَوَاتُ الخُدُورِ- وَالْحُيَّضُ وَلْيَشْهَدْنَ الخَيْرَ وَدَعْوَةَ المُؤْمِنِينَ، وَيَعْتَزِلُ الحُيَّضُ المُصَلَّى». قَالَتْ حَفْصَةُ: فَقُلْتُ: الحُيَّضُ! فَقَالَتْ: أَلَيسَ تَشْهَدُ عَرَفَةَ وَكَذَا وَكَذَا؟[٢]

## ٢٤- باسی ئافرەتانی حەیزدار ئامادەی جەژنەکان و دوعاکردنی موسوڵمانان دەبن و خۆیان دوور دەگرن لە نوێژگە

**٣٢٤- حەفصە دەڵێ: ئێمە کچانمان قەدەغە دەکرد بچنە دەرەوە بۆ جەژنەکان، ئینجا ئافرەتێك هات و لە کۆشکی بەنو خەلەف دابەزی، لە خوشکێکیەوە**

---

[١] جِلْبَابِ: لە زمانی عەرەبیدا بەم مانایانە هاتووە: کراس، سەرپۆش و لەچک، پۆشاکێک هەموو لاشە داپۆشێت، ئەوی بەسەر پۆشاکدا لەبەر دەکرێت وەک عەبا.

[٢] بڕوانە: ٣٥١، ٩٧١، ٩٧٤، ١٨٠، ١٨١، ١٦٥٢.

گێڕایەوە کە مێردی ئەو خوشکەی دوانزە غەزای لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردبوو، (وە وتی:) خوشکەکەم لە شەشیاندا لەگەڵیدا بووە و وتی: ئێمە برینداراەکانمان دەرمان دەکرد و سەرپەرشتی نەخۆشەکانمان دەکرد، جا خوشکەکەم پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد: ئایا یەکێك لە ئێمە هیچی لەسەرە نەچێتە دەرەوە بۆ جەژن ئەگەر پۆشاکی[1] نەبوو؟ فەرمووی: ((با خوشکێکی موسوڵمان پۆشاکێکی پێ بدات و ئامادەی چاکە و نزای موسوڵمانان ببێت))، ئینجا کاتێ ئومو عەتییە ﷺ هات پرسیارم لێ کرد: ئایا هیچت لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە لەم بارەیەوە، وتی: بەڵێ بە باوکەوە بەفیدای بم -ئومو عەتییە ﷺ هەرکات ناوی پێغەمبەری ﷺ بهێنایە دەیوت: باوکم بەفیدای بێت- دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((کچانی تازەپێگەیشتوو و کچانی کەیبانووی ماڵ - یان کچانی پێگەیشتووی ماڵەوە- و حەیزدارەکانیش بچن بۆ نوێژی جەژن و ئامادەی چاکە و نزای ئیمانداران بن، بەڵام حەیزدارەکان دوور بکەونەوە لە نوێژگە))، حەفصە دەڵێ: منیش وتم: حەیزدارەکانیش ئامادە بن؟! ئافرەتەکەش وتی: ئایا ئامادەی وەستانی عەرەفات نابێ؟! ئامادەی ئەوە و ئەوە نابێ؟!

## ٢٥- بابٌ: إِذَا حَاضَتْ فِي شَهْرٍ ثَلَاثَ حِيَضٍ

وَمَا يُصَدَّقُ النِّسَاءُ فِي الحَيْضِ وَالْحَمْلِ فِيمَا يُمْكِنُ مِنَ الحَيْضِ؛ لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى:

﴿ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴿٢٢٨﴾ ﴾ البقرة، وَيُذْكَرُ عَنْ عَلِيٍّ وَشُرَيْحٍ: إِنِ امْرَأَةٌ جَاءَتْ بِبَيِّنَةٍ مِنْ بِطَانَةِ أَهْلِهَا مِمَّنْ يُرْضَى دِينُهُ أَنَّهَا حَاضَتْ ثَلَاثًا فِي شَهْرٍ،

---

[1] جِلْبَابِ: بە پۆشاک مانامان کردووە، چونکە ئەو مانایە گونجاوترە بۆ وشەکە لەو فەرموودەدا، پێشتر مانان کرد کە بە چەند مانای دیکە هاتووە.

صُدِّقَتْ. وَقَالَ عَطَاءٌ: أَقْرَاؤُهَا مَا كَانَتْ. وَبِهِ قَالَ إِبْرَاهِيمُ. وَقَالَ عَطَاءٌ: الحَيْضُ يَوْمٌ إِلَى خَمْسَ عَشْرَةَ. وَقَالَ مُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ: سَأَلْتُ ابن سِيرِينَ عَنِ المَرْأَةِ تَرى الدَّمَ بَعْدَ قَرْئِهَا بِخَمْسَةِ أَيَّامٍ؟ قَالَ: النِّسَاءُ أَعْلَمُ بِذَلِكَ.

## ٢٥- باسێک: ئەگەر ئافرەت لە مانگێكدا سێ جار بکەوێتە حەیزەوە

**وە باسی ئەوەی ئافرەت باوەڕی پێ دەکرێ لەبارەی حەیز و سکەوە، ئەگەر بگونجێ و ڕێی تێ بچێت نەك نەگونجێ حەیزەکە (دووبارە بێتەوە لە مانگێکدا)، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دروست نییە بۆ ئافرەتان (ی تەڵاقدراو) ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا دروستی کردووە بیشارنەوە). لە عەلی و شورەیحەوە گێردراوەتەوە: ئەگەر ئافرەتێك لە کەسوکاری خۆی کە کەسی چاك بن و خەڵك لە دینیان ڕازی بن، شایەتی هێنا کە لە مانگێکدا سێ جار کەوتۆتە حەیزەوە باوەڕی پێ دەکرێت. عەتا دەڵێ: پاکییەکانی ئەوانەن کە لەپێش تەڵاقەکەیدا بووە، ئیبراهیم (ی نەخەعیش) هەمان قسەی عەتاو دەکات، وە عەتاو دەڵێ: حەیز لە یەك ڕۆژەوە تا پانزە ڕۆژە (لە چەند ڕێگاوە گێردراوەتەوە)، موعتەمیر لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو سیرین کرد دەربارەی ئافرەتێك پاش پێنج ڕۆژ لە عیدەی خوێن دەبینێ؟ وتی: ئافرەتان شارەزاترن بەوە (واتە: بڕوا بە ئافرەت دەکرێ لەو بارەیەوە).**

٣٢٥- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ سَأَلتِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ فَلَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ فَقَالَ: «لَا، إِنَّ ذَلِكِ عِرْقٌ، ولكن دَعِي الصَّلَاةَ قَدْرَ الأَيَّامِ التِي كُنْتِ تَحِيضِينَ فِيهَا، ثُمَّ اغْتَسِلِي وَصَلِّي»[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٢٨.

**٣٢٥- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش ﵂ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد وتی: من خوێنی بەردەوامم هەیە و پاك نابمەوە، ئایا واز لە نوێژکردن بێنم؟ فەرمووی: ((نەخێر بێگومان ئەوە خوێنی دەمارێکە، بەڵام واز لە نوێژکردن بێنە بەئەندازەی ئەو ڕۆژانەی کە پێشتر دەکەوتیتە حەیزەوە تیایدا، پاشان خۆت بشۆرەوە و نوێژ بکە)).**

## ٢٦- بابُ الصُّفْرَةِ وَالكُدْرَةِ فِي غَيرْ أيَّامِ الحَيْضِ

٣٢٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عن أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: كُنَّا لَا نَعُدُّ الكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ شَيئًا.

## ٢٦- باسی زەردایی و لێڵی (ئافرەت هەیبێت) لە کاتی حەیزدا نەبێت

**٣٢٦- ئومو عەتییە ﵂ دەڵێ: ((ئێمە لێڵی و زەردایی‌مان بە هیچ دانەدەنا)).**

## ٢٧- بابُ عِرْقِ الاسْتِحَاضَةِ

٣٢٧- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بن الُمنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ: حَدَّثَنِي ابن أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، وَعَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ اسْتُحِيضَت سَبْعَ سِنِينَ، فَسَأَلَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِك، فَأَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ فَقَالَ: «هذا عِرْقٌ». فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلَاةٍ.

## ٢٧- باسی دەماری خوێنی نەخۆشی

**٣٢٧- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئومو حەبیبە ﵂ حەوت ساڵ خوێنی بەردەوامی هەبوو، جا پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەو بارەیەوە، ئەویش فەرمانی پێ کرد خۆی بشوات و فەرمووی: ((ئەوە خوێنی دەمارێکە (و حەیز نییە)))، جا ئومو حەبیبە بۆ هەموو نوێژێ خۆی دەشۆری.**

## ٢٨- بَابُ الْمَرْأَةِ تَحِيضُ بَعْدَ الْإِفَاضَةِ

٣٢٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ قَدْ حَاضَتْ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَلَّهَا تَحْبِسُنَا، أَلَمْ تَكُنْ طَافَتْ مَعَكُنَّ؟». فَقَالُوا: بَلَى. قَالَ: «فَاخْرُجِي»[1].

## ٢٨- باسی (حوکمی) ئافرەت دوای تەوافی ئیفازە[2] بکەوێتە حەیزەوە

**٣٢٨- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی کچی حویەی کەوتۆتە حەیزەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((لەوانەیە دوامان بخات، ئایا لەگەڵ ئێوەدا**

---

[1] بڕوانە: ٢٩٤.

[2] تەوافی ئیفازە: بریتییە لەو تەوافەی حاجی دەیکات پاش ڕۆیشتنی لە میناوە بۆ مەککە پاش بەردبارانی شەیتان لە ڕۆژی یەکەمی چەژنی قوربانی. صحیح فقه السنة: ١٧٩/٢.

**تەواف نەکردووە؟))، عەرزیان کرد: بەڵێ (تەواف کردووە)، فەرمووی: ((دەی دەرچۆ))، (واتە بڕۆ تەوافی ماڵئاواییت لەسەر نییە).**

٣٢٩- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: رُخِّصَ لِلْحَائِضِ أَنْ تَنْفِرَ إِذَا حَاضَتْ[١].

**٣٢٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: ڕێگە بە ئافرەتی حەیزدار دراوە کە دەربچێ و بگەڕێتەوە، ئەگەر کەوتە حەیزەوە. (تەوافی ماڵئاوایی نەکات، ئەگەر تەوافی ئیفازەی کردبێ).**

٣٣٠- وَكَانَ ابن عُمَرَ يَقُولُ فِي أَوَّلِ أَمْرِهِ: إِنَّهَا لَا تَنْفِرُ. ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: تَنْفِرُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ لَهُنَّ[٢].

**٣٣٠- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە یەکەم جارەوە دەیوت: نابێ دەرچێ (تا تەوافی ماڵئاوایی نەکات)، پاشان لێم بیست دەیوت: دروستە دەربچێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داوە پێیان دەربچن.**

## ٢٩- بابٌ: إِذَا رَأَتِ الْمُسْتَحَاضَةُ الطُّهْرَ

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي وَلَوْ سَاعَةً، وَيَأْتِيهَا زَوْجُهَا إِذَا صَلَّتْ، الصَّلَاةُ أَعْظَمُ.

٣٣١- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ يُونُسَ، عَنْ زُهَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَقْبَلَتِ الحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي»[١]

---

[١] بڕوانە: ١٧٥٥، ١٧٦٠.

[٢] بڕوانە: ١٧٦١.

## ٢٩- باسێك: ئەگەر ئافرەتێ کە خوێنی بەردەوامی هەیە پاک بۆیەوە

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: خۆی دەشوات و نوێژ دەکات با پاکبوونەوەکەی ساتێکیش بێت، وە دروستە مێردەکەی بچێتە لای ئەگەر نوێژی کرد، چونکە نوێژکردن گەورەتر و قورسترە.**

**٣٣١- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کاتی حەیزەکەت هات واز لە نوێژکردن بێنە، وە کاتێ ماوەی حەیزەکەت ڕۆیشت، خوێنی (نەخۆشییەکەت) بشۆرە (خۆت بشۆ) و نوێژ بکە)).**

## ٣٠- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى النُّفَسَاءِ وَسُنَّتِهَا

٣٣٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي سُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا شَبَابَةُ قَالَ: أَخْبَرَنَا شعْبَةُ، عَنْ حُسَيْنٍ الْمعَلِّمِ، عَنِ ابن بُرِيدَةَ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، أَنَّ امْرَأَةً مَاتَتْ فِي بَطْنٍ، فَصَلَّى عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَامَ وَسَطَهَا[٢].

## ٣٠- باسی نوێژکردن لەسەر ئافرەتێک کە لە خوێنی منداڵبووندا بێت وە سوننەتی نوێژکردن لەسەری

**٣٣٢- سەمورەی کوڕی جوندوب ﵁ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێك بەسەر منداڵەوە مرد، جا پێغەمبەر ﷺ لە نێوەڕاستیدا وەستا و نوێژی لەسەر کرد.**

---

[١] بڕوانە: ٢٢٨.

[٢] بڕوانە: ١٣٣١، ١٣٣٢.

## ٣١- بابٌ

٣٣٣- حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُدْرِكٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو عَوَانَةَ -اسْمُهُ الوَضَّاحُ- مِنْ كِتَابِهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيمَانُ الشُّيْبَانِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ خَالَتِي مَيْمُونَةَ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا كَانَتْ تَكُونُ حَائِضًا لَا تُصَلِّي، وَهْيَ مُفْتَرِشَةٌ بِحِذَاءِ مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وهْوَ يُصَلِّي عَلَى خُمْرَتِهِ، إِذَا سَجَدَ أَصَابَنِي بَعْضُ ثَوْبِهِ[1].

## ٣١- باسێک

**٣٣٣- عەبدوڵای کوڕی شەداد دەڵێ: لە مەیمونەی پوورم ﵂ بیست -کە خێزانی پێغەمبەر بوو ﷺ- کە ئەو لە بێنوێژیدا بووە نوێژی نەدەکرد، لە کاتێکدا ڕاکشابوو لەسەر بەرماڵێکی ناسك (کە لە گەڵای دارخورما دروست کرابوو)، لە پاڵ جێگەنوێژ و سوژدەکەی پێغەمبەردا ﷺ بوو کە نوێژی دەکرد لەسەر قاڵیچەکەی (بەرماڵەکەی)، (لە کاتی سوژدەدا) هەندێ لە پۆشاکەکەی بەر من کەوت (کە لە حەیزدا بووم).**

---

[1] بڕوانە: ٣٧٩، ٣٨١، ٥١٧، ٥١٨.

# ٧- كِتَابُ التَّيَمُّمْ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧- پەڕاوی تەیەممووم

وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ﴿٦﴾ ﴾ المائدة.

**وە ئەو فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا ئەگەر ئاوتان دەست نەكەوت ئەوە تەيەممووم بكەن، بەخۆڵێكی پاك و دەست (ی تۆزاوی) بهێنن بەدەموچاو و دەستەكانتاندا).**

## ١- بابٌ

٣٣٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ -أَوْ بِذَاتِ الجَيْشِ- انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى التِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ فَقَالُوا: أَلا تَرى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسِ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ. فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي، قَدْ نَامَ، فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسَ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلَا يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلَّا مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى فَخِذِي، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ فَتَيَمَّمُوا. فَقَالَ أُسَيْدُ

بْنُ الحُضَيْرِ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يا آلَ أَبِي بَكْرٍ. قَالَتْ: فَبَعَثْنَا البَعِيرَ الذِي كُنْتُ عَلَيْهِ، فَأَصَبْنَا العِقْدَ تَحْتَهُ[1].

## ١- باسێک

**٣٣٤- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە سەفەرێکدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە بەیداو -یان** (ذات الجيش)-**، لەوێدا ملوانکەیەکم لێ وون بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا وەستا بۆ دۆزینەوەی، خەڵکیش وەستان لەگەڵیداو شوێنەکەیان ئاوی تێدا نەبوو و خۆشیان ئاویان پێ نەبوو، جا خەڵك هاتن بۆ لای ئەبوبەکری صدیق و وتیان: ئایا نابینی عائیشە چی کرد؟ پێغەمبەری خوا ﷺ و خەڵکی وەستاند و شوێنەکەیان ئاوی تێدا نییە و خۆشیان ئاویان پێ نییە، جا ئەبو بەکر هات لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەر ڕانی من بوو، خەوی لێ کەوتبوو، ئەبو بەکر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ و خەڵکت ڕاگرتووە لای ئاودا نین (ئاوی لێ نییە) و خۆشیان ئاویان پێ نییە، عائیشە وتی: ئەبو بەکر سەرزەنشتی کردم ئەوەی خوا ویستی لەسەر بوو وتی، زوو زووش بەدەستی دەیکوتایە کەلەکەم و لێی دەدام، منیش لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەر ڕانم بوو جووڵەم نەدەکرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا کاتی نوێژی بەیانی بوو ئاو نەبوو (بۆ دەستنوێژگرتن)، ئیدی خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی دابەزاند و تەیەمومیان کرد. جا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر وتی: ئەمە یەکەم فەڕ و بەرەکەتی ئێوە نییە خانەوادەی ئەبو بەکر (بەسەر موسوڵمانانەوە)، عائیشە دەڵێ: جا ئەو وشترەمان هەڵساندەوە کە من سواری بووبووم، ملوانکەکەمان دۆزییەوە کە لەژێریدا بوو.**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٦، ٣٦٧٢، ٣٧٧٣، ٤٥٨٣، ٤٦٠٧، ٤٦٠٨، ٥١٦٤، ٥٢٥٠، ٥٨٨٢، ٦٨٤٤، ٦٨٤٥.

٣٣٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ ح. قَالَ: وَحَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ النَّضْرِ قَالَ: أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا سَيَّارٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ -هُوَ ابن صُهَيبٍ الفَقِيرُ- قَالَ: أَخْبَرَنَا جَابِرُ بْن عَبْدِ اللهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قالَ: «أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِيَ المَغَانِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إلى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً»[1].

**٣٣٥- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە[2] کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((پێنج شت بە من دراوە لەپێش مندا بەکەس نەدراوە: بە ترس و بیم خستنە دڵی دوژمنانمەوە مانگەڕێیەك سەر خراوم[3]، هەموو زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و پاککەرەوە (خۆڵەکەی تەیەمومی پێ دەکرێ)، جا هەر کەس لە ئوممەتم هەر کاتێ نوێژ بوو، با نوێژ بکات (لە هەر شوێنێکدا بوو)، دەستکەوتی جەنگ و غەنیمەتەکان بۆ من حەڵاڵ کراوە، کە پێش من بۆ کەس حەڵاڵ نەکرابوو، وە تکا و شەفاعەتی گەورە (لە ڕۆژی دواییدا) بە من دراوە، وە هەر پێغەمبەرێك بەتایبەتی بۆ گەلەکەی دەنێردرا، بەڵام من بۆ هەموو خەڵك نێردراوم)).**

## ٢- بابُ إِذَا لَمْ يَجِدْ مَاءً وَلا تُرَابًا

٣٣٦- حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا اسْتَعَارَتْ مِنْ أَسْمَاءَ قِلَادَةً فَهَلَكَتْ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَجُلًا، فَوَجَدَهَا فَأَدْرَكَتْهُمُ الصَّلَاةُ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَصَلَّوْا، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَنْزَلَ

---

[1] بڕوانە: ٤٣٨، ٣١٢٢.

[2] ئەم فەرموودەیە بە دوو سەنەد گێردراوەتەوە.

[3] واتە: دوژمن مانگەڕێیەک دوورم لێیەوە، شکاوە لە ترسی من.

اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ. فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ لِعَائِشَةَ: جَزَاكِ اللَّهُ خَيْرًا، فَوَاللَّهِ مَا نَزَلَ بِكِ أَمْرٌ تَكْرَهِينَهُ إِلَّا جَعَلَ الله ذَلِكِ لَكِ وَلِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ خَيْرًا[1].

## ٢- باسی ئەگەر کەسێک نە ئاو نە خۆڵی دەست نەکەوت[2]

**٣٣٦- عائیشە ﵂ گێڕاویەتەوە: کە ملوانکەیەکی لە ئەسماو خواست و (ملوانکەکە) ون بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی نارد و دۆزییەوە، جا نوێژ بوو ئاویان پێ نەبوو نوێژیان کرد (بەبێ دەستنوێژ)، جا سکاڵای ئەوەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، خوای گەورەش ئایەتی تەیەمومی دابەزاند، جا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر بە عائیشەی وت: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، سوێند بە خوا هیچ شتێکت بەسەردا نەهاتووە پێت ناخۆش بووبێت، ئیللا خوا ئەو شتەی کردۆتە مایەی خێر و چاکە بۆ خۆت و موسوڵمانان.**

## ٣- بابُ التَّيَمُّمِ فِي الحَضَرِ إِذَا لَمْ يَجِدِ المَاءَ، وَخَافَ فَوْتَ الصَّلَاةِ

وَبِهِ قَالَ عَطَاءٌ، وَقَالَ الحَسَنُ فِي المَرِيضِ عِنْدَهُ المَاءُ وَلَا يَجِدُ مَنْ يُنَاوِلُهُ: يَتَيَمَّمُ. وَأَقْبَلَ ابن عُمَرَ مِنْ أَرْضِهِ بِالْجُرُفِ، فَحَضَرَتِ العَصْرُ بِمَرْبَدِ النَّعَمِ فَصَلَّى، ثُمَّ دَخَلَ المَدِينَةَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ فَلَمْ يُعِدْ.

## ٣- باسی تەیەمومکردن لە ئاوەدانیدا ئەگەر (کەسێك) ئاوی دەست نەکەوت و ترسی هەبوو کاتی نوێژەکە بڕوات

**عەتاو وا دەڵێ، حەسەنیش دەڵێ: دەربارەی نەخۆش ئاوی لابوو کەس نەبوو پێی بدات تەیەموم دەکات، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ لە زەوییەکەیەوە**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٤.

[2] وەك ئەوەی لە کەشتییەکەدا بێت نەتوانێ بگاتە ئاوەکە یان زیندان بێت، چی بکات؟ نوێژ بکات یان نا؟

**هاتەوە کە لە جوڕوف بوو، کاتێ گەشتە شوێنی بەستنەوەی ئاژەڵان کاتی عەسر بوو، جا نوێژی عەسری کرد، پاشان ڕۆیشتە مەدینەوە هێشتا خۆر بەرز بوو، نوێژەکەی دووبارە نەکردەوە.**

٣٣٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنِ الأعرَجِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَيْرًا -مَوْلَى ابن عَبَّاسٍ- قَالَ: أقبَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللهِ بْنُ يَسَارٍ -مَوْلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبِي جُهَيْمِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ أَبُو الجُهَيْمِ: أَقْبَلَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الجِدَارِ، فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ.

**٣٣٧- عومەیر -کە ئازادکراوی ئیبنو عەباس بوو ﷺ- دەڵێ: من و عەبدوڵای کوڕی یەسار- کە ئازادکراوی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو- ڕۆیشتین، هەتا چووینە ماڵی ئەبو جوهەیمی کوڕی حاریسی کوڕی صیمەی ئەنصاری ﷺ، جا ئەبو جوهەیم وتی: پێغەمبەر ﷺ لەلای بیری جەمەلەوە هاتەوە و پیاوێ پێی گەیشت و سەلامی لێ کرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە، هەتا ڕۆیشتە لای دیوارێك (بە تۆزی دیوارەکە) دەموچاو و دەستەکانی تەیەموم کرد، پاشان وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.**

## ٤- بابٌ: الْمُتَيَمِّمُ هَلْ يَنْفُخُ فِيهِمَا

٣٣٨- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الحَكَمُ، عَنْ ذَرٍّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزى، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ الخطَّابِ، فَقَالَ: إِنِّي أَجْنَبْتُ فَلَمْ أُصِبِ الماءَ. فَقَالَ عَمَّارُ بْن يَاسِرٍ لِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: أَمَا تَذْكُرُ أَنَا كُنَّا فِي سَفَرٍ أَنَا وَأَنْتَ فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ، وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فَصَلَّيْتُ، فَذَكَرْت ذلك لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ

النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ هَكَذَا». فَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بِكَفَّيْهِ الأرضَ، وَنَفَخَ فِيهِمَا، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ[1].

## ٤- باسێك: ئایا تەیەممومکەر فوو بکات لە دەستەکانی

**٣٣٨- سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پیاوێ هات بۆلای عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وتی: من لەشم گران بووە و ئاوم دەست نەکەوت (چی بکەم)؟ عەماری کوڕی یاسر وتی بە عومەری کوڕی خەتاب: لەبیرتە من و تۆ لە سەفەرێکدا بووین، تۆ نوێژت نەکرد، بەڵام من خۆمم لە خۆڵا گەوزاند و نوێژم کرد، جا ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تەنها ئاوەهات بەس بوو))، جا پێغەمبەر ﷺ هەردوو لەپی دا بەزەویدا و فووی لێ کردن (تا تۆزەکەی کەم بێتەوە)، ئینجا هەردوو نێولەپی هێنا بە دەموچاوی و هەردوو دەستیدا.**

## ٥- بابٌ: التَّيَمُّمُ لِلْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ

٣٣٩- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي الحَكَمُ، عَنْ ذَرٍّ، عَنْ سَعِيدِ ابْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزى، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ عَمَّارٌ بهذا. وَضَرَبَ شُعْبَة بِيَدَيْهِ الأرضَ، ثُمَّ أَدْنَاهُمَا مِنْ فِيهِ، ثُمَّ مَسَحَ وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ. وَقَالَ النَّضْرُ: أَخْبَرَنَا شعْبَة، عَنِ الحَكَمِ قَالَ: سَمِعْتُ ذَرًّ يَقُولُ: عَنِ ابن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزى قَالَ الحَكَمُ: وَقَدْ سَمِعْتُهُ مِنِ ابن عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ عَمَّارٌ[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٣٩، ٣٤٠، ٣٤٢، ٣٤٣، ٣٤٥، ٣٤٦، ٣٤٧.

[2] بڕوانە: ٣٣٨.

# ٥- باسێک: تەیەمموم تەنها دەموچاو و هەردوو دەستە تا مەچەک

**٣٣٩- سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەمار ﷺ وتوویەتی: تەیەمموم تەنها بۆ دەموچاو و دەستەکانە تا مەچەك. شوعبە هەردوو دەستی دا بەزەویدا، پاشان نزیکی کردنەوە لە دەمی (واتە: فووی لێ کردن) و پاشان هێنانی بەدەموچاو و هەردوو دەستیدا تا مەچەك. نەزر دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە لە حەکەمەوە وتی: لە زەڕم بیست گێڕایەوە و دەیوت: لە کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزاوە وتی: حەکەم دەڵێ: لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانم بیست، ئەویش لە باوکیەوە دەڵێ: عەمار دەڵێ: (واتە حەکەم بە دوو شێوە گێڕاویەتەوە، جارێك لە زەڕەوە ئەویش لە عەبدوڕەحمانەوە، جارێکیش لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە).**

٣٤٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الَحكَمِ، عَنْ ذَرٍّ، عَنِ ابن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزى، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ شَهِدَ عُمَرَ، وَقَالَ لَهُ عَمَّارٌ: كُنَّا فِي سَرِيَّةٍ فَأَجْنَبْنَا. وَقَالَ: تَفَلَ فِيهِمَا[١].

**٣٤٠- حەکەم دەگێڕێتەوە لە زەڕەوە لە سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزاوە لەباوکیەوە کە عومەری بینی و عەمار پێی وت: ئێمە لە سریەکدا بووین لەشمان گران بوو، وە وتی: فووی[٢] کرد بە هەردوو دەستیدا (کە تۆزیان پێوە بوو).**

---

[١] بڕوانە: ٣٣٨.

[٢] (تَفَلَ)، جەوهەری دەڵێ: (التَفْلُ) وەك تفکردن وایە، بەڵام لەو کەمتر و هێواشترە، بەمجۆرەی ڕیزبەندی کراون: (البزاق) تفکردن، پاشان (التفل) پاشان (النفث) پاشان (النفخ). إرشاد الساري: ٢/٥٨٥.

٣٤١- حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا شُعْبَة، عَنِ الحكَمِ، عَنْ ذَرٍّ، عَنِ ابن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزى، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: قَالَ عَمَّارٌ لِعُمَرَ: تَمَعَّكْتُ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «يَكْفِيكَ الوَجْهَ وَالْكَفينِ»[1].

**٣٤١- عەبدوڕەحمان دەڵێ: عەمار بە عومەری ﷺ وت: خۆم لە خۆڵدا گەوزاند، جا ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: ((تەنها تەیەمومی دەموچاو و دەستەکانت بەس بوو)).**

٣٤٢- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحكَمِ، عَنْ ذَرٍّ، عَنِ ابن عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: شَهِدْتُ عُمَرَ، فَقَالَ لَهُ عَمَّارٌ. وَسَاقَ الحدِيثَ[2].

**٣٤٢- عەبدوڕەحمان دەڵێ: عومەرم بینی عەمار پێی وت، جا فەرموودەکەی پێشووتری گێڕایەوە.**

٣٤٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحكَمِ، عَنْ ذَرٍّ، عَنِ ابن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزى، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ عَمَّارٌ: فَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ الأرْضَ، فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ[3].

**٣٤٣- عەبدوڕەحمان دەڵێ: عەمار وتی: جا پێغەمبەر ﷺ دەستی دا بە زەویدا و هێنانی بە دەموچاو و دەستەکانیدا.**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٨.

[2] بڕوانە: ٣٣٨.

[3] بڕوانە: ٣٣٨.

## ٦- بابٌ: الصَّعِيدُ الطَّيِّبُ وَضُوءُ المُسْلِمِ يَكْفِيهِ مِنَ المَاءِ

وَقَالَ الحَسَنُ: يُجْزِئُهُ التَّيَمُّمُ مَا لَمْ يُحْدِثْ، وَأَمَّ ابن عَبَّاسٍ وَهُوَ مُتَيَمِّمٌ. وَقَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: لَا بَأْسَ بِالصَّلَاةِ عَلَى السَّبَخَةِ وَالتَّيَمُّمِ بِهَا.

## ٦- باسێک: خۆڵی پاک هۆی پاکی یە بۆ موسوڵمان لە جیاتی ئاو

**حەسەن دەڵێ تەیەمموم دروستە تا تەیەمومی نەشکێت، وە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ پێشنوێژی کرد کە تەیەمومیشی کردبوو، یەحیای کوڕی سەعید دەڵێ: قەیناکات نوێژکردن لەسەر زەوییەك کە سوێر بێت و تەیەمومکردن پێی (بەو زەوییە سوێرە).**

٣٤٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، عَنْ عِمْرَانَ قَالَ: كُنَّا فِي سَفَرٍ مَعَ النَّبِيِّ ﷺوإِنَّا أَسْرَيْنَا، حَتَّى إِذَا كُنَّا فِي آخِرِ اللَّيْلِ، وَقَعْنَا وَقْعَةً وَلَا وَقْعَةَ أَحْلَى عِنْدَ الْمُسَافِرِ مِنْهَا، فَمَا أَيقَظَنَا إِلَّا حَرُّ الشَّمْسِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَنِ اسْتَيقَظَ فلَانٌ ثُمَّ فُلَانٌ ثُمَّ فُلَانٌ -يُسَمِّيهِمْ أَبُو رَجَاءٍ، فَنَسِيَ عَوْفٌ- ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الخطَّابِ الرَّابِعُ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا نَامَ لَمْ يُوقَظْ حَتَّى يَكونَ هُوَ يَسْتَيْقِظُ، لأَنَّا لَا نَدْرِي مَا يَحْدُثُ لَهُ فِي نَوْمِهِ، فَلَمَّا اسْتَيقَظَ عُمَرُ، وَرَأى مَا أَصَابَ النَّاسَ، وَكَانَ رَجُلًا جَلِيدًا، فَكَبر وَرَفَعَ صَوْتَهُ بِالتَّكبِيرِ، فَمَا زَالَ يكَبِّرُ وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالتَّكْبِيرِ حَتَّى اسْتَيْقَظَ لِصَوْتِهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا اسْتَيقَظَ شَكَوْا إِلَيْهِ الذِي أَصَابَهُمْ، قَالَ: «لَا ضَيْرَ -أَوْ لَا يَضِيرُ- ارْتَحِلُوا». فَارْتَحَلَ فَسَارَ غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ نَزَلَ فَدَعَا بِالْوَضوءِ فَتَوَضَّأَ، وَنُودِيَ بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا انْفَتَلَ مِنْ صَلَاتِهِ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ مُعْتَزِلٍ لَمْ يُصَلِّ مَعَ القَوْمِ، قَالَ: «مَا مَنَعَكَ يا فُلَانُ أَنْ تُصَلِّيَ مَعَ القَوْمِ؟». قَالَ: أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ وَلَا مَاءَ. قَالَ: «عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ، فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ». ثُمَّ سَارَ النَّبِيُّ ﷺ، فاشْتَكَى إِلَيهِ النَّاسُ مِنَ العَطَشِ، فَنَزَلَ فَدَعَا فلَانًا -كَانَ يُسَمِّيهِ أَبُو رَجَاءٍ، نَسِيَهُ عَوْفٌ- وَدَعَا عَلِيًّا فَقَالَ:

«اذْهَبَا فَابْتَغِيَا المَاءَ». فَانْطَلَقَا فَتَلَقَّيَا امْرَأَةً بَيْنَ مَزَادَتَيْنِ -أَوْ سَطِيحَتَيْنِ[1]- مِنْ مَاءٍ عَلَى بَعِيرٍ لَهَا، فَقَالَا لَهَا: أَيْنَ المَاءُ؟ قَالَتْ: عَهْدِي بِالْمَاءِ أَمْسِ هذه السَّاعَةَ، وَنَفَرُنَا خُلُوفًا. قَالَا لَهَا: انْطَلِقِي إِذًا. قَالَتْ: إِلَى أَيْنَ؟ قَالَا: إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ. قَالَتِ: الذِي يقَالُ لَهُ: الصَّابِئُ. قَالَا: هُوَ الذِي تَعْنِينَ فَانْطَلِقِي. فَجَاءَا بِهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَحَدَّثَاهُ الحديثَ، قَالَ: فَاسْتَنْزَلُوهَا عَنْ بَعِيرِهَا، وَدَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِإِنَاءٍ، فَفَرَّغَ فِيهِ مِنْ أفوَاهِ المزادَتَيْنِ -أَوِ السَّطِيحَتَيْنِ- وَأَوْكَأَ أفوَاهَهُمَا، وَأَطْلَقَ العَزَالِيَ، وَنُودِيَ فِي النَّاسِ اسْقُوا وَاسْتَقُوا. فَسَقَى مَنْ شَاءَ، وَاسْتَقَى مَنْ شَاءَ، وَكَانَ آخِرَ ذَاكَ أَنْ أَعْطى الذِي أَصَابَتْهُ الجَنَابَةُ إِنَاءً مِنْ مَاءٍ، قَالَ: «اذْهَبْ فَأَفرِغْهُ عَلَيْكَ». وَهْيَ قَائِمَةٌ تَنْظُرُ إِلَى مَا يُفْعَلُ بِمَائِهَا، وَايْمُ اللهِ لَقَدْ أُقْلِعَ عَنْهَا، وإِنَّهُ لَيُخَيَّلُ إِلَيْنَا أَنَّهَا أَشَدُّ مِلأَةً مِنْهَا حِينَ ابْتَدَأَ فِيهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اجْمَعُوا لَهَا». فَجَمَعُوا لَهَا مِنْ بَيْنِ عَجوَةٍ وَدَقِيقَةٍ وَسَوِيقَةٍ، حَتَّى جَمَعُوا لَهَا طَعَامًا، فَجَعَلُوهَا فِي ثَوْبٍ، وَحَمَلُوهَا عَلَى بَعِيرِهَا، وَوَضَعُوا الثَّوْبَ بَيْنَ يَدَيْها، قَالَ لَهَا: «تَعْلَمِينَ مَا رَزِئْنَا مِنْ مَائِكِ شَيْئًا، وَلَكِنَّ اللهَ هُوَ الذِي أَسْقَانَا». فَأَتَتْ أَهْلَهَا، وَقَدِ احْتَبَسَتْ عَنْهُمْ، قَالُوا: مَا حَبَسَكِ يا فُلَانَةُ؟ قَالَتِ: العَجَبُ، لَقِيَنِي رَجُلَانِ فَذَهَبَا بِي إِلَى هذا الذِي يُقَالُ لَهُ: الصَّابِئُ، فَفَعَلَ كَذَا وَكَذَا، فَوَاللهِ إِنَّهُ لأَسْحَرُ النَّاسِ مِنْ بَيْنِ هذِه وهذِه -وَقَالَتْ بِإِصْبَعَيْهَا الوُسْطَى وَالسَّبَّابَةِ، فَرَفَعَتْهُمَا إِلَى السَّمَاءِ، تَعْنِي السَّمَاءَ وَالأَرْضَ -أَوْ إِنَّهُ لَرَسُولُ اللهِ حَقًّا. فَكَانَ المُسْلِمُونَ بَعْدَ ذَلِك يُغِيرُونَ عَلَى مَنْ حَوْلَهَا مِنَ المُشْرِكِينَ، وَلَا يُصِيبُونَ الصِّرْمَ الذِي هِيَ مِنْهُ، فَقَالَتْ يَوْمًا لِقَوْمِهَا: مَا أُرى أَنَّ هؤلاء القَوْمَ يَدْعُونَكُمْ عَمْدًا، فَهَلْ لَكُمْ فِي الإِسْلَامِ؟ فَأَطَاعُوهَا فَدَخَلُوا فِي الإِسْلَامِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: صَبَأَ: خَرَجَ مِنْ دينٍ إِلَى غَيْرِه. وقال أَبُو العَالِيَة: الصَّابِئِينَ -وفِي نُسْخَةٍ: الصَّابِئُونَ- فِرقَةٌ مِن أهلِ الكِتَابِ يَقْرءُوْنَ الزَّبُورَ[2].

---

[1] (مزادتين) و (سطيحتين) هەردوو وشەکە بەمانای کوندەی گەورە دێن، ڕاوییەکە کە عەوفە گومانی بووە کە ئەبو ڕەجا کامیانی وتووە. إرشاد الساري: ٥٩١/٢.

[2] بڕوانە: ٣٤٨، ٣٥٧.

٣٤٤- عیمران ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەفەرێکدا بووین لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، بە شەو ڕۆیشتین هەتا دەمەوبەیان، جا (لە دەمەوبەیاندا) خەومان لێ کەوت چۆن خەولێکەوتنێك! کە لەو خەولێکەوتنە خۆشتر نییە بۆ کاروان، جا خەبەرمان نەبۆیەوە تا تینی خۆر خەبەری کردینەوە، وە یەکەم کەس کە خەبەری بۆیەوە فلان کەس بوو، پاشان فلان کەس پاشان فلان کەس -ئەبو ڕەجاو ناوی دەبردن، بەڵام عەوف لە بیری نەمابوو-، پاشان چوارەم کەس عومەری کوڕی خەتاب بوو. پێغەمبەریش ﷺ ئەگەر بخەوتایە خەبەریان نەدەکردەوە هەتا خۆی بەخەبەر دەهات، چونکە ئێمە نەماندەزانی لە کاتی خەوتنیدا چی لێی ڕوو دەدات، جاکاتێ عومەر خەبەری بۆیەوە، بینی چی لە هاوەڵان ڕووی داوە، وە عومەر پیاوێکی دەنگگەورەی بەهێز و قایم بوو، بەدەنگی بەرز دەستی کرد بە الله أکبر، جا هەر الله أکبری دەکرد و دەنگی بەرز دەکردەوە پێی، هەتا بە دەنگەکەی پێغەمبەر ﷺ خەبەری بۆیەوە، جا کە پێغەمبەر ﷺ خەبەری بۆیەوە خەڵکەکە سکاڵای ئەومیان لا کرد کە تووشیان بووە (کە نوێژی بەیانییان ڕۆیشتووە)، فەرمووی: ((قەینا -یان زیانی نابێ- زوو کەن بار کەن و بڕۆن))، جا باریان کرد و کەمێ ڕۆیشتن، پاشان لایدا و دابەزین، جا داوای ئاوی دەستنوێژی کرد و دەستنوێژی گرت، بانگدرا بۆ نوێژ و پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد، پیاوێکی بینی کەناری گرتبوو لەگەڵیاندا نوێژی نەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فلان کەس چی ڕێگری کرد کە نوێژ بکەی لەگەڵ خەڵکەکەدا؟)) وتی: لەشگرانیم تووش بووە و ئاویش نییە (غوسڵ بکەم)، فەرمووی: ((بە خۆڵ تەیەمموم بکە ئەومت بەسە))، پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت، جا خەڵکەکە لە تینوواندا سکاڵایان بۆ برد، ئەویش دابەزی و کەسێکی بانگ کرد -ئەبو ڕەجاو ناوی ئەو کەسەی هێنا، بەڵام عەوف لە بیری نەماوە-، عەلی

بانگ کرد و فەرمووی: ((هەردووکتان برۆن بۆ ئاو بگەڕێن))، جا هەردووکیان ڕۆیشتن تا گەیشتن بە ئافرەتێك سواری وشترێك بووبوو، دوو کوندەی گەورە ئاوی پێ بوو (لەبەر گەورەیی پێستی درابوومیە دەم)، پێیان وت: ئاو لەکوێ هەیە؟ ئافرەتەکە وتی: دوێنێ ئەم کاتە ئاوم دیوە، پیاوەکانی ئێمە بەشوێن ئاودا دەگەڕێن، پێیان وت: کەواتە وەرە لەگەڵمان وتی: بۆ کوێ؟ وتیان: بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئافرەتەکە وتی: ئەوەی لە ئایینی باب و باپیری لای داوە؟ وتیان: بەڵێ ئەومیە کە تۆ وای پێ دەڵێی، دەی با بڕۆین بۆلای، جا ئافرەتەکەیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، وە هەردووکیان دەنگ و باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، وە (عەلی و عیمران و ئەوانەی یارمەتییان دەدان) داوایان لێ کرد لە وشترەکەی دابەزێت، جا پێغەمبەر ﷺ داوای دەفرێکی کرد لە دەمی کوندەکان ئاوی تێ کرد و دەمی کوندەکانی بەستەوە و هەنگڵەکانی[1] بەرەڵا کردن، جاڕ درا بەنێو خەڵکەکەدا ئاو بخۆنەوە و ئاو هەڵگرن جا خەڵکی بە ئارەزووی خۆیان ئاویان خواردەوە و ئاویان هەڵگرت، وە لە کۆتاییدا دەفرێ ئاوی دا بەو پیاوەی لەشی گران بوو فەرمووی: ((بڕۆ بیکە بەسەر خۆتدا))، ئافرەتەکەش هەر وەستا بوو سەیری دەکرد ئاوەکەی چی لێ دەکرێ، سوێند بە خوا کە وازی لێ هێنرا، وامان دەزانی لە یەکەم جار پڕتر بوون لە ئاو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خۆراکی بۆ کۆ بکەنەوە))، جا هاوەڵانیش خورمای عەجوە و ئارد و قاوتیان بۆ کۆ کردەوە، تا ئەندازەیەك خۆراکیان بۆ کۆ کردەوە و کردیانە نێو پارچە قوماشێکەوە، ئافرەتەکەیان سواری وشترەکەی کرد و خۆراکەکەیان خستە بەردەمی پێغەمبەر

---

[1] هەنگڵ: بەو دوو شوێنە دەوترێت کە لە ڕاست و چەپی دەمی کوندەکەوەن یەکێکیان دەبەسرێت و یەکێکیان ئاوی کوندەکەی لێوە دادەکرێت.

ﷺ، فەرمووی پێی: ((چاك دەزانیت هیچمان لە ئاوەکەت کەم نەکردۆتەوە؟ بەڵکوو خوا ئاوی بە ئێمە دا))، ئینجا گەڕایەوە بۆ نێو هۆزەکەی و درەنگی پێ چوو، وتیان پێی: فلان کەس بۆ دوا کەوتی؟ وتی: شتێکی سەیرم دی، دوو پیاوم پێ گەیشت و بردمیان بۆلای ئەو پیاوەی کە دەڵێن لە ئایینی باب و باپیری لایداوە، جا ئەوە و ئەوەی کرد، جا سوێند بە خوا ئەو پیاوە، یان جادووبازترینە لەنێوان ئەمە و ئەمەدا -بە پەنجەی نێوەڕاست و شایەتومانی ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان، واتە: ئاسمان و زەوی-، یان بەڕاستی پێغەمبەرە، جا موسوڵمانان (کە دەچوون بۆ غەزا) دەیاندا بەسەر بتپەرستەکانی دەوروبەری ئەو شوێنەدا کە هۆزی ئافرەتەکەی لێ بوو، بەڵام دەستیان لە هۆزی ئەو نەدەدا، ئافرەتەکە ڕۆژێك بە خزمەکانی وت: من وا دەزانم ئەمانە بەئەنقەست وازیان لە ئێوە هێناوە (و نایەنە سەرتان)، دەی موسوڵمان بن، ئەوانیش هەموو بە گوێیان کرد و تێکڕا موسوڵمان بوون. ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری ) دەڵێ: (صَبَأ) لە ئایینێکەوە ڕۆیشت بۆ ئایینێکی دیکە. ئەبولعالییە دەڵێ: (الصَّابِئِينَ)، لە دەستنووسێکدا: (الصَّابِئُونَ)، دەستەیەکن لە نامەدارەکان (خاوەن پەڕتووکە ئاسمانییەکان) زەبوور دەخوێننەوە.

## ٧- بابٌ: إِذَا خَافَ الجُنُبُ عَلَى نَفْسِهِ المَرَضَ أَوِ المَوْتَ أَوْ خَافَ العَطَشَ، تَيَمَّمَ

وَيُذْكَرُ أَنَّ عَمْرَو بْنَ العَاصِ أَجْنَبَ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ فَتَيَمَّمَ وَتَلَا: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ النساء، فَذَكَرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يُعَنِّفْ.

## ٧- باسێک: ئەگەر لەشگران ترسا لە نەخۆشی یان مردن یان تینوویەتی، تەیەموم دەکات (و دروستە)

**دەگێڕنەوە کە عەمری کوڕی عاص لە شەوێکی سارددا لەشگران بوو، ئینجا تەیەمومی کرد و ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە ئەمە ماناکەیەتی: (خۆتان مەکوژن بێگومان خوا بەبەزەییە بە ئێوە)، جا ئەمەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش هیچ ڕەخنەی لێ نەگرت.**

٣٤٥- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ -هُوَ غُنْدَرٌ- عَنْ شعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ أَبُو مُوسَى لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ: إِذَا لَمْ يَجِدِ الَماءَ لَا يُصَلِّي. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ رَخَّصْتُ لَهُمْ فِي هذا، كَانَ إِذَا وَجَدَ أَحَدُهُمُ البَرْدَ قَالَ هَكَذَا -يَعْنِي تَيَمَّمَ وَصَلَّى- قَالَ: قُلْتُ: فَأَيْنَ قَوْلُ عَمَّارٍ لِعُمَرَ؟ قَالَ: إِنِّي لَمْ أَرَ عُمَرَ قَنِعَ بِقَوْلِ عَمَّارٍ[١].

**٣٤٥- ئەبو وائیل وتی: ئەبو مووسا بە عەبدوڵای کوڕی مەسعودی ﷺ وت: ئەگەر (لەشگران) ئاوی دەست نەکەوت نوێژ ناکات؟ عەبدوڵا وتی: ئەگەر ڕێگەی ئەمەیان پێ بدەم، ئەگەر کەسێکیان هەستی بە سەرما کرد ئاوا دەکات، واتە: تەیەموم دەکات و نوێژ دەکات، ئەبو مووسا وتی: وتم ئەی چی دەکەیت لە وتەکەی عەممار کە بە عومەری ﷺ وت؟ عەبدوڵا وتی: من وا نازانم عومەر بە وتەکەی عەممار ڕازیبووبێ.**

٣٤٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الأعمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ شَقِيقَ بْنَ سَلَمَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: أَرَأَيْتَ يا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ

---

[١] بڕوانە: ٣٣٨.

إِذَا أَجْنَبَ فَلَمْ يَجِدْ مَاءً كَيْفَ يَصْنَعُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَا يُصَلِّي حَتَّى يَجِدَ الْمَاءَ. فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَكَيْفَ تَصْنَعُ بِقَوْلِ عَمَّارٍ حِينَ قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «كَانَ يَكْفِيكَ»؟ قَالَ: أَلَمْ تَرَ عُمَرَ لَمْ يَقْنَعْ بِذَلِكَ؟ فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَدَعْنَا مِنْ قَوْلِ عَمَّارٍ، كَيْفَ تَصْنَعُ بِهَذِهِ الآيَةِ؟ فَمَا دَرَى عَبْدُ اللَّهِ مَا يَقُولُ، فَقَالَ: إِنَّا لَوْ رَخَّصْنَا لَهُمْ فِي هذا لأَوْشَكَ إِذَا بَرَدَ عَلَى أَحَدِهِمُ الْمَاءُ أَنْ يَدَعَهُ وَيَتَيَمَّمَ. فَقُلْتُ لِشَقِيقٍ: فَإِنَّمَا كَرِهَ عَبْدُ اللَّهِ لهذا؟ قَالَ: نَعَمْ[1].

**٣٤٦- شەقيقى كوڕى سەلەمە دەڵێ: من لای عەبدوڵا و ئەبو مووسا ﷺ بووم، ئەبو مووسا بە عەبدوڵای وت: ئەبو عەبدوڕەحمان پێم بڵێ ئەگەر كەسێ لەشگران بوو و ئاوی دەست نەكەوت چی بكات؟ عەبدوڵا وتی: نوێژ ناكات تا ئاوی دەست دەكەوێ، جا ئەبو مووسا وتی: ئەی وتەكەی عەممار چی لێ دەكەيت كاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((تەيەمومت بەس بوو))، عەبدوڵا وتی: ئەی نازانی عومەر بەوە ڕازی نەبوو، جا ئەبو مووسا پێی وت: با واز بێنين لە وتەكەی عەمار، ئەم ئايەتە[2] چی لێ دەكەيت؟ جا عەبدوڵا نەيزانی چی بڵێ، ئينجا وتی: ئەگەر ئێمە ڕێگەی ئەوميان بدەين، ئەوە نزيكە ئەگەر كەسێكيان ئاوەكەی لا سارد بوو، وازی بێنێ (لە دەستنوێژ) و تەيەموم بكات، (ئەعمەش دەڵێ:) بە شەقيقم وت: عەبدوڵا لەبەر ئەوە (تەيەمومی لەبەر نەخۆشی) پێ چاك نەبوو؟ شەقيق وتی: بەڵێ.**

## ٨- بابٌ: التَّيَمُّمُ ضَرْبَةٌ

**٣٤٧-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأعمَشِ، عن شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: لَوْ أَنَّ رَجُلًا أَجْنَبَ، فَلَمْ يَجِدِ

---

[1] بڕوانە: ٣٣٨.

[2] ئايەتی (٦) لە سورەتی (المائدة):

الَماءَ شَهْرًا، أَمَا كَانَ يَتَيَمَّمُ وَيُصَلِّي فَكَيْفَ تَصْنَعُونَ بهذه الآيَةِ فِي سُورَةِ الَمائِدَةِ ﴿ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ ﴿٦﴾ ﴾ المائدة، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ رُخِّصَ لَهُمْ فِي هذا لأَوْشَكُوا إِذَا بَرَدَ عَلَيْهِمُ الَماءُ أَنْ يَتَيَمَّمُوا الصَّعِيدَ. قُلْت: وِإِنَّمَا كَرِهْتُمْ هذا لِذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ لِعُمَرَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَاجَةٍ فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ الَماءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ الدَّابَّهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَصْنَعَ هَكَذَا». فَضَرَبَ بِكَفِّهِ ضَرْبَةً عَلَى الأرضِ، ثُمَّ نَفَضَهَا، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا ظَهْرَ كَفِّهِ بِشِمَالِهِ، أَوْ ظَهْرَ شِمَالِهِ بِكَفِّهِ، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَفَلَمْ تَرَ عُمَرَ لَمْ يَقْنَعْ بِقَوْلِ عَمَّارٍ؟ وَزَادَ يَعْلَى، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ لِعُمَرَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَنِي أَنَا وَأَنْتَ فَأَجْنَبْتُ فَتَمَعَّكْتُ بِالصَّعِيدِ، فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْنَاهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ هَكَذَا». وَمَسَحَ وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ وَاحِدَةً؟[1]

## ٨- باسێک: تەیەمموم یەک جار دەستدانە بە خۆڵەکەدا

**٣٤٧- شەقیق دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵا و ئەبو مووسای ئەشعەریدا ﷺ دانیشتبووم، ئەبو مووسا بە عەبدوڵای وت: ئەگەر پیاوێك لەشگران بێ و مانگێك ئاوی دەست نەكەوت نابێ تەیەمموم بكات و نوێژەكەی بكات؟ دەی ئەم ئایەتەی سوورەتی مائیدە چی لێ دەكەیت: (جا ئەگەر ئاوتان دەست نەكەوت ئەوە بە خۆڵێكی پاك تەیەمموم بكەن)؟ عەبدوڵاش وتی: ئەگەر ڕێگەی ئەومیان پێ بدرێت، نزیكە هەر كە ئاو سارد بوو بە خۆڵ تەیەمموم بكەن، (ئەعمەشیش**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٨.

دەڵێ) وتم: کەواتە لەبەر ئەوە ئەوەتان پێ پەسەند نییە؟ شەقیق وتی: بەڵێ، جا ئەبو مووسا وتی: ئایا وتەکەی عەمارت نەبیستووە کە بە عومەری وت: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ کارێ، جا لەشم گران بوو، ئاویشم دەست نەکەوت، جا لە خۆڵەکەدا خۆم گەوزاند ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەوەندەت بەس بوو کە ئاوا بکەیت، جا دەستی یەك جار دا بەزەویدا، پاشان خۆڵ و تۆزەکەی تۆزێ سووك کرد بە دەستییەوە، پاشان دەستی چەپی هێنا بە پشتەدەستی ڕاستیدا، یان دەستی ڕاستی هێنا بەپشتەدەستی چەپیدا، پاشان هێنانی بەدەموچاویدا))، عەبدوڵاش وتی: ئایا نەتبینی عومەر بە قسەکەی عەمار ڕازی نەبوو؟ یەعلا لە ئەعمەشەوە ئەویش لە شەقیقەوە ئەمەیان لە فەرموودەکە زیاد کردووە: من لەگەڵ عەبدوڵا و ئەبو مووسادا بووم، ئەبو مووسا وتی: ئایا تۆ وتەکەی عەمارت نەبیستووە کە بەعومەری وت: پێغەمبەر ﷺ من و تۆی نارد، جا من لەشگران بووم و لە خۆڵەکەدا خۆم گەوزاند، جا هاتینەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەمان پێ دا، ئەویش فەرمووی: ((تەنها ئەوەت بەس بوو))، دەموچاو و هەردوو دەستی تا مەچەك تەیەموم کرد بە یەك جار دەستدان بە زەویدا.

## ٩- بابٌ

٣٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَوْفٌ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ الْخزَاعِيُّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأى رَجُلًا مُعْتَزِلًا لَمْ يُصَلِّ فِي الْقَوْمِ، فَقَالَ: «يَا فُلَانُ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ فِي الْقَوْمِ؟». فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ وَلَا مَاءَ. قَالَ: «عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ، فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٣٤٤.

## ٩- باسێک

٣٤٨- عیمرانی کوڕی حوصەینی خوزاعی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی لە دوورەوە وەستابوو نوێژی نەکرد لەگەڵ خەڵکەکەدا، فەرمووی: ((فلان کەس چ شتێك ڕێگری لێ کردی کە نوێژ بکەی لەگەڵ خەڵکەکەدا؟))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەشگرانیم تووش بووە و ئاویش نییە، فەرمووی: ((بە خۆڵ تەیەموم بکە ئەوەت بەسە)).

# ٨- كِتَابُ الصَّلَاةِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨- پەڕاوی نوێـژ

## ١- بابُ كَيْفَ فُرِضَتِ الصَّلَوَاتُ فِي الإِسْرَاءِ

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: حَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ فِي حَدِيثِ هِرَقْلَ فَقَالَ: يَأْمُرُنَا -يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ بِالصَّلَاةِ وَالصِّدْقِ وَالْعَفَافِ[1].

## ١- باسی چۆن نوێژەكان فەرز كران لە شەوی ئیسرائدا

**عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: ئەبو سوفیان بۆی گێڕامەوە لە باسی وتووێژەكەی لەگەڵ هیرەقلدا و وتی: فەرمانمان پێ دەكات -مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو- بە نوێژ و ڕاستگۆیی و داوێنپاكی.**

٣٤٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بن بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ أَبُو ذَرٍّ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: .فُرِجَ عَنْ سَقْفِ بَيْتِي وَأَنَا بِمَكَّةَ، فَنَزَلَ جِبْرِيلُ فَفَرَجَ صَدْرِي، ثُمَّ غَسَلَهُ بِمَاءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ جَاءَ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ مُمْتَلِئٍ حِكْمَةً وَإِيمَانًا، فَأَفْرَغَهُ فِي صَدْرِي ثُمَّ أَطْبَقَهُ، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِي فَعَرَجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَلَمَّا جِئْتُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا قَالَ جِبْرِيلُ لِخَازِنِ السَّمَاءِ: افْتَحْ. قَالَ: مَنْ هذا؟ قَالَ: هذا جِبْرِيلُ. قَالَ: هَلْ مَعَكَ أَحَدٌ؟ قَالَ: نَعَمْ،

---

[1] بڕوانە: ٧.

مَعِي مُحَمَّدٌ ﷺ. فَقَالَ: أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَلَمَّا فَتَحَ عَلَوْنَا السَّمَاءَ الدُّنْيَا، فَإِذَا رَجُلٌ قَاعِدٌ عَلَى يَمِينِهِ أَسْوِدَةٌ وَعَلَى يَسَارِهِ أَسْوِدَةٌ، إِذَا نَظَرَ قِبَلَ يَمِينِهِ ضَحِكَ، وَإِذَا نَظَرَ قِبَلَ يَسَارِهِ بَكَى، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالابْنِ الصَّالِحِ. قُلْتُ لِجِبْرِيلَ: مَنْ هذا؟ قَالَ: هذا آدَمُ عليه السلام. وهذِه الأَسْوِدَةُ عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ نَسَمُ بَنِيهِ، فَأَهْلُ اليَمِينِ مِنْهُمْ أَهْلُ الجَنَّةِ، وَالأَسْوِدَةُ التي عَنْ شِمَالِهِ أَهْلُ النَّارِ، فَإِذَا نَظَرَ عَنْ يَمِينِهِ ضَحِكَ، وَإِذَا نَظَرَ قِبَلَ شِمَالِهِ بَكَى، حَتَّى عَرَجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ، فَقَالَ لِخَازِنِهَا: افْتَحْ. فَقَالَ لَهُ خَازِنُهَا مِثْلَ مَا قَالَ الأَوَّلُ فَفَتَحَ». قَالَ أَنَسٌ: فَذَكَرَ أَنَّهُ وَجَدَ فِي السَّمَوَاتِ آدَمَ وإِدْرِيسَ وَمُوسَى وَعِيسَى وَإِبْرَاهِيمَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ وَلَمْ يُثْبِتْ كَيْفَ مَنَازِلُهُمْ، غَيْرَ أَنَّهُ ذَكَرَ أَنَهُ وَجَدَ آدَمَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا، وإِبْرَاهِيمَ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ. قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا مَرَّ جِبْرِيلُ بِالنَّبِيِّ ﷺ بِإِدْرِيسَ قَالَ: «مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالأَخِ الصَّالِحِ. فَقُلْتُ: مَنْ هذا؟ قَالَ: هذا إِدْرِيسُ. ثُمَّ مَرَرْتُ بِمُوسَى فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالأَخِ الصَّالِحِ. قُلْتُ: مَنْ هذا؟ قَالَ: هذا مُوسَى. ثُمَّ مَرَرْتُ بِعِيسَى فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ. قُلْتُ: مَنْ هذا؟ قَالَ: هذا عِيسَى. ثُمَّ مَرَرْتُ بِإِبْرَاهِيمَ فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالابْنِ الصَّالِحِ. قُلْتُ: مَنْ هذا؟ قَالَ: هذا إِبْرَاهِيمُ ﷺ». قَالَ ابن شِهَاب: فَأَخْبَرَنِي ابن حَزْمٍ، أَنَّ ابن عَبَّاسٍ وَأَبَا حَبَّةَ الأنصَارِيَّ كَانَا يَقُولَانِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ثُمَّ عُرِجَ بِي حَتَّى ظَهَرْتُ لِمُسْتَوى أَسْمَعُ فِيهِ صَرِيفَ الأَقْلَامِ». قَالَ ابن حَزْمٍ وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَفَرَضَ اللَّهُ عَلَى أُمَّتِي خَمْسِينَ صَلَاةً، فَرَجَعْتُ بِذَلِكَ حَتَّى مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى، فَقَالَ: مَا فَرَضَ اللَّهُ لَكَ عَلَى أُمَّتِكَ؟ قُلْتُ: فَرَضَ خَمْسِينَ صَلَاةً. قَالَ: فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ. فَرَاجَعَنِي فَوَضَعَ شَطْرَهَا، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى، قُلْتُ: وَضَعَ شَطْرَهَا. فَقَالَ: رَاجِعْ رَبَّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ، فَرَاجَعْتُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ، فَرَاجَعْتُهُ. فَقَالَ: هِيَ خَمْسٌ وَهْيَ خَمْسُونَ، لَا يُبَدَّلُ القَوْلُ لَدَيَّ. فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى، فَقَالَ: رَاجِعْ رَبَّكَ. فَقُلْتُ: اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي. ثُمَّ انْطَلَقَ بِي حَتَّى انْتَهَى بِي إِلَى سِدْرَةِ المُنْتَهَى، وَغَشِيَهَا أَلْوَانٌ لَا أَدْرِي مَا هِيَ، ثُمَّ أُدْخِلْتُ الجَنَّةَ، فَإِذَا فِيهَا حَبَايِلُ اللُّؤْلُؤِ، وَإِذَا تُرَابُهَا المِسْكُ»[1].

---

[1] بروانه: ١٦٣٦، ٣٣٤٢.

٣٤٩- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەبو زەڕ دەیگێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سەربانی خانووەكەم كرایەوە لە كاتێكدا من لە مەككە بووم، ئینجا جیبریل ﷺ هاتە خوارەوە سنگمی لەت كرد، پاشان بە ئاوی زەمزەم شۆردی، پاشان تەشتێكی ئاڵتوونی هێنا پڕ لە دانایی و باوەڕ بوو، كردیە نێو سنگمەوە، پاشان (لەتكردنەكەی سنگی) نایەوە بەیەكدا، ئینجا دەستی گرتم و بەرزی كردمەوە بۆ ئاسمانی یەكەم، جا كاتێ گەشتمە ئاسمانی یەكەم جیبریل ﷺ بە دەرگاوانەكەی فەرمووی بیكەرەوە، ئەویش وتی: كێیە؟ وتی ئەمە جیبریلە، وتی: كەست لەگەڵدایە؟ وتی: بەڵێ موحەممەدم ﷺ لەگەڵدایە، وتی: نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، جا كە دەرگاكەی كردەوە و سەركەوتین بۆ ئاسمانی یەكەم، لەوكاتەدا پیاوێكمان بینی دانیشتبوو، لەلای ڕاستییەوە قەرەباڵغییەكی زۆرم بینی، هەروەها لەلای چەپیشیەوە (بەهەمان شێوە)، كاتێ سەیری لای ڕاستی بكردایە پێ دەكەنی، وە كاتێ سەیری لای چەپی بكردایە دەگریا، فەرمووی: سڵاو و لە پێغەمبەری چاك و كوڕی چاكم، بەجیبریلم وت: ئەمە كێیە؟ فەرمووی: ئەوە ئادەمە ئەو قەرەباڵغییەی لای ڕاستی و چەپی گیانی نەوەكانیەتی، جا ئەوانەی لای ڕاستی بەهەشتییەكانیانن، قەرەباڵغییەكەی لای چەپیشی دۆزەخییەكانن، جا كاتێ سەیری لای ڕاستی دەكات پێ دەكەنێ، وە كاتێ سەیری لای چەپی دەكات دەگری، ئینجا بەرزی كردمەوە بۆ ئاسمانی دووەم، بە دەرگاوانەكەی فەرموو: بیكەرەوە، دەرگاوانەكەش وتەی یەكەم جاری پێ وتەوە، جا دەرگاكەی كردەوە))، ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ئاسمانەكاندا ئادەم و ئیدریس و مووسا و عیسا و ئیبڕاهیمی ﷺ بینیوە، وە ئەبو زەڕ لەبارەی شوێن و پلەیان هیچی باس نەكرد، تەنها ئەوەندە نەبێ كە وتوویەتی: ئادەمی بینیوە لە ئاسمانی یەكەمدا، ئیبڕاهیمیش لەئاسمانی

شەشەمدا، ئەنەس دەڵێ: جا کاتێ جیبریل ﷺ پێغەمبەری ﷺ برد بەلای ئیدریسدا ﷺ، ئیدریس ﷺ فەرمووی: سڵاو لە پێغەمبەری چاك و برای چاك و ساڵح، پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: وتم ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە ئیدریسە ﷺ، پاشان تێ پەڕیم بەلای مووسادا ﷺ، ئەویش فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری چاك و برای چاك و ساڵح، پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: وتم ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە مووسایە ﷺ. پاشان تێپەڕیم بەلای عیسادا ﷺ، ئەویش فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری ساڵح و برای ساڵح. پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: وتم ئەمە کێیە؟ جیبریل فەرمووی: ئەوە عیسایە ﷺ. پاشان تێپەڕیم بەلای ئیبراهیمدا و فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری ساڵح و کوڕی ساڵح، وتم ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەوە ئیبراهیمە ﷺ. ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئیبنو حەزم پێی وتم: کە عەبدوڵای کوڕی عەباس و ئەبو حەبەی ئەنصاری هەردووکیان دەیانوت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پاشان بەرز کرامەوە هەتا گەشتمە ئاستێ جیرەی قەڵەمەکانم دەبیست))، ئیبنو حەزم و ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جا خوای گەورە پەنجا نوێژی فەرز کرد لەسەر ئوممەتەکەم، جا بەوەوە گەڕامەوە تا تێ پەڕیم بەلای مووسادا ﷺ، فەرمووی: خوا چی فەرز کردووە بۆت لەسەر ئوممەتەکەت؟ وتم: پەنجا نوێژی فەرز کردووە، فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، چونکە بێگومان ئوممەتەکەت ئەوە ناتوانێت، جا گەڕاندمیەوە و خوا نیوەی لابرد و سووکی کرد، جا گەڕامەوە بۆ لای مووسا ﷺ وتم: خوا نیوەی لابرد، وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، چونکە ئوممەتەکەت ئەوە ناتوانێت، جا گەڕامەوە و نیوەی لابرد، جا گەڕامەوە بۆ لای مووسا ﷺ. وتی: بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت، چونکە ئوممەتەکەت توانای ئەوەی نییە، منیش گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگار فەرمووی:

**نوێژەكان پێنجن، بەڵام لە پاداشتدا پەنجان، وتەی من گۆڕانی بۆ نییە. جا گەڕامەوە بۆ لای مووسا ﷺ، فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، منیش وتم: ئیدی شەرم دەكەم لە پەروەردگارم، پاشان جیبریل بردمی هەتا گەیاندمیە سیدرەتولمونتەها، ئەوەندە ڕەنگی جۆراوجۆر دایپۆشیبوو، كە نازانم چۆن چۆنی بوو، پاشان برامە بەهەشتەوە، كە سەیرم كرد پڕ لە گومەزی مرواری بوو، خاكەكەشی میسك بوو)).**

٣٥٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ -أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ- قَالَتْ: فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ حِينَ فَرَضَهَا رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ، وَزِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضَرِ[1].

**٣٥٠- عوروەی كوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە لە عائیشە ﵂ -دایكی ئیماندارانەوە- دەڵێ: ((كاتێك خوا نوێژی فەرز كرد، دوو ڕكات دوو ڕكات فەرزی كرد لە نیشتەجێیی و لە گەشتدا، جا نوێژی گەشت (بە دوو ڕكات) هێڵرایەوە، بەڵام نوێژی نیشتەجێی لێی زیاد كرا)).**

## ٢- بابُ وُجُوبِ الصَّلَاةِ فِي الثِّيَابِ وقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى:

﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف، **وَمَنْ صَلَّى مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ**

وَيُذْكَرُ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: ((يَزُرُّهُ وَلَوْ بِشَوْكَةٍ)). فِي إِسْنَادِهِ نَظَرٌ، وَمَنْ صَلَّى فِي الثَّوْبِ الذِي يُجَامِعُ فِيهِ مَا لَمْ يَرَ أَذًى، وَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ لَا يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ.

---

[1] بڕوانە: ١٠٩٠، ٣٩٣٥.

## ٢- باسی پێویستە نوێژ بە جلوبەرگەوە بێت، وە باسی (مانای) ئەم فەرماییشتەی خوای بەرز و بڵند: (لە کاتی هەموو نوێژێکدا خۆتان داپۆشن و جلوبەرگ لەبەر کەن) و کەسێ بە یەک پۆشاکەوە نوێژ بکات کە پێچابێتی بە خۆیەوە

**لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (((ئەگەر کەسێك بە پۆشاکێکەوە نوێژی کرد)، گرێی دا و بیبەستێ با بە دڕکێکیش بێ))، سەنەدەکەی قسەی لەسەرە و دروست نییە، وە (باسی) کەسێك نوێژ بکات بە پۆشاکێکەوە کە پێوەی جووت بووبێ لەگەڵ خێزانیدا ئەگەر پیسی پێوە نەبینێ، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە کەس بەڕووتی تەوافی کەعبە نەکات.**

٣٥١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ الْحُيَّضَ يَوْمَ الْعِيدَيْنِ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَيَشْهَدْنَ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَدَعْوَتَهُمْ، وَيَعْتَزِلُ الْحُيَّضُ عَنْ مُصَلاَّهُنَّ. قَالَتِ امْرَأَةٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِحْدَانَا لَيْسَ لَهَا جِلْبَابٌ. قَالَ «لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا». وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَجَاءٍ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ، حَدَّثَتْنَا أُمُّ عَطِيَّةَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِهَذَا[1].

**٣٥١- ئومو عەتییە ﷺ دەڵێ: فەرمانمان پێ کرا ئافرەتانی حەیزدار و کچانی ماڵەوە بێنینە دەرەوە لە هەردوو جەژنەکاندا، تا ئامادەی کۆڕی موسوڵمانان و نزایان ببن، بەڵام حەیزدارەکان کەناریان دەگرت لە نوێژگەی ئافرەتان (کە پاك بوون)، ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئافرەتێکمان پۆشاکی نەبوو (چی بکات)؟ فەرمووی: ((با ئافرەتێکی هاوڕێی پۆشاکێکی خۆی پێ بدات**

---

[1] بڕوانە: ٣٢٤.

لەبەری کات)). عەبدوڵای کوڕی ڕەجاو دەڵێ: عیمڕان بۆی گێڕاینەوە لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە ئەویش دەڵێ: ئومو عەتییە ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕاینەوە و وتی: ئەمەم لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە.

## ٣- بابُ عَقْدِ الإِزَارِ عَلَى القفا في الصَّلَاةِ

وَقَالَ أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ: صَلَّوْا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عاقِدِي أُزْرِهِمْ عَلَى عَوَاتِقِهِمْ.

٣٥٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ حَدَّثَنِى وَاقِدُ بْنُ مُحَمَّدٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: صَلَّى جَابِرٌ فِي إِزَارٍ قَدْ عَقَدَهُ مِنْ قِبَلِ قَفَاهُ، وَثِيَابُهُ مَوْضُوعَةٌ عَلَى الْمِشْجَبِ قَالَ لَهُ قَائِلٌ: تُصَلِّى فِي إِزَارٍ وَاحِدٍ؟! فَقَالَ: إِنَّمَا صَنَعْتُ ذَلِكَ لِيَرَانِي أَحْمَقُ مِثْلُكَ، وَأَيُّنَا كَانَ لَهُ ثَوْبَانِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٣- باسی بەستنی کراس (پشتەماڵ) لەپشت ملەوە لە نوێژدا

ئەبو حازیم لە سەهلەوە ﵁ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان کرد، کراسەکانیان بەستبوو بە ملیانەوە.

٣٥٢- موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: جابیر ﵁ بە پشتەماڵێکەوە نوێژی کرد لەپشت ملیەوە بەستبووی، چونکە جلەکانی (شۆردبوو) درابوو بە داردا، کەسێك بە جابیری وت: بەتەنیا پشتەماڵێکەوە نوێژ دەکەیت؟ جابیریش وتی: بۆیە ئەوەم کرد تا نەفامێکی وەك تۆ بمبینێ، کام لە ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دوو پۆشاکی هەبوو؟!

---

[1] بڕوانە: ٣٥٣، ٣٦١، ٣٧٠.

٣٥٣- حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ أَبُو مُصْعَبٍ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الْمَوَالِي عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ وَقَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ[1].

**٣٥٣- موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: جابیری کوڕی عەبدوڵام ﵄ بینی بە یەك پۆشاکەوە نوێژی دەکرد و دەیوت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە یەك پۆشاکەوە نوێژی دەکرد.**

## ٤- بابُ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ مُلْتَحِفًا بِهِ

قَالَ الزُّهْرِيُّ فِي حَدِيثِهِ: المُلْتَحِفُ: المُتَوَشِّحُ، وَهْوَ المُخَالِفُ بَيْنَ طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ، وَهْوَ الاشْتِمَالُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ. قَالَ: قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: التَحَفَ النَّبِيُّ ﷺ بِثَوْبٍ، وَخَالَفَ بَيْنَ طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ.

## ٤- باسی (حوکمی) نوێژکردن بە یەک پۆشاکەوە کە پێچابێتی بە خۆیەوە

**زوهری لەو فەرموودەی لەخۆپێچانەوەی کە گێڕاویەتەوە دەڵێ: بریتییە لەوەی دوو چمکەکە بەپێچەوانەوە بدات بەسەر هەردوو شانیدا، ئەومیە بەخۆوەپێچان و دان بەسەر هەردوو شاندا، دەڵێ: ئومو هانی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی پێچا بە خۆیەوە، دوو چمکەکەی بەپێچەوانەوە دا بە هەردوو شانیدا (واتە: چەپ بۆ ڕاست و ڕاست بۆ چەپ).**

٣٥٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ قَدْ خَالَفَ بَيْنَ طَرَفَيْهِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٥٢.

[2] بڕوانە: ٣٥٥، ٣٥٦.

**٣٥٤- عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﵁ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ بە یەك پۆشاکەوە نوێژی کرد دوو چمکەکەی بەپێچەوانەوە (دابوو بەسەر شانیدا).**

٣٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، قَدْ أَلْقَى طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ[1].

**٣٥٥- عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﵁ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری ﷺ بینیوە بە پۆشاکێکەوە نوێژی دەکرد لە ماڵی ئومو سەلەمەدا ﵂، هەردوو چمکەکەی دابوو بەسەر هەردوو شانیدا.**

٣٥٦- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُشْتَمِلًا بِهِ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، وَاضِعًا طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ[2].

**٣٥٦- عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە یەك پۆشاکەوە نوێژی دەکرد لە خۆی ئاڵاندبوو، لە ماڵی ئومو سەلەمەدا ﵂ هەردوو چمکەکەی بەپێچەوانەوە دابوو بەسەر هەردوو شانیدا.**

٣٥٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ- أَنَّ أَبَا مُرَّةَ -مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ- أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ، وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ، قَالَتْ:

---

[1] بڕوانە: ٣٥٤.

[2] بڕوانە: ٣٥٤.

فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: .مَنْ هَذِهِ؟،. فَقُلْتُ: أَنَا أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِي طَالِبٍ. فَقَالَ: .مَرْحَبًا بِأُمِّ هَانِئٍ،. فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ، قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْتُ: يا رسول اللهِ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّي أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً قَدْ أَجَرْتُهُ فُلاَنَ بْنَ هُبَيْرَةَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: .قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يا أُمَّ هَانِئٍ،. قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: وَذَاكَ ضُحًى[1].

**٣٥٧- ئومو هانیئی کچی ئەبو تالیب ﵄ دەڵێ: ساڵی ئازادکردنی مەککە ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ڕۆیشتم خۆی دەشۆرد و فاتیمەی کچی پەردەیەکی بۆ کردبوو، ئومو هانی دەڵێ سڵاوم لێ کرد، فەرمووی: ((ئەم ئافرەتە کێیە؟))، منیش وتم: منم ئومو هانیئی کچی ئەبو تالیبم، فەرمووی: ((مەرحەبات لێ بێ ئومو هانی))، جا کاتێ لە خۆشۆردنەکەی بۆیەوە، هەڵسا و هەشت ڕکات نوێژی (سوننەتی) کرد، یەك پۆشاکی پێچابوو بە خۆیەوە، جا کە تەواو بوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (عەلی) کە لە دایکەوە برامە دەڵێ بە پیاوێ کە من پەنام داوە دەیکوژم کە فلانی کوڕی هوبەیرەیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەدڵنیاییەوە پەنای ئەو کەسەمان دا کە تۆ پەنات داوە ئەی ئومو هانی))، ئومو هانی وتی: کاتەکەش چێشتەنگاو بوو.**

٣٥٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ سَائِلًا سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: .أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ؟،[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٨٠.

[2] بڕوانە: ٣٦٥.

**٣٥٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە کەسێ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی نوێژکردن بە یەك پۆشاکەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەریەك لە ئێوە کوا دوو پۆشاکی هەیە؟)).**

## ٥- بابٌ: إِذَا صَلَّى فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ فَلْيَجْعَلْ عَلَى عَاتِقَيْهِ

٣٥٩- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأعرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ شَيْءٌ»[1].

## ٥- باسێک: ئەگەر بە یەک پۆشاکەوە نوێژی کرد ئەوە با چمکەکانی بدات بەسەر هەردوو شانیدا

**٣٥٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەس لە ئێوە با بە یەك پۆشاکەوە نوێژ نەکات، کە هیچی بەسەر هەردوو شانیەوە نەبێت)).**

٣٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: سَمِعْتُهُ -أَوْ كُنْتُ سَأَلْتُهُ- قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ فَلْيُخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ»[2].

**٣٦٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: شایەتی دەدەم لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە فەرموویەتی: ((هەر کەس بە یەك پۆشاکەوە نوێژی کرد، با هەردوو چمکەکانی بەپێچەوانەوە بدات بەسەر هەردوو شانیدا)).**

---

[1] بڕوانە: ٣٦٠.

[2] بڕوانە: ٣٥٩.

## ٦- بابٌ: إِذَا كَانَ الثَّوْبُ ضَيِّقًا

٣٦١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحارِثِ قَالَ: سَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ، فَقَالَ: خَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَجِئْتُ لَيْلَةً لِبَعْضِ أَمْرِي، فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي، وَعَلَيَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ، فَاشْتَمَلْتُ بِهِ وَصَلَّيْتُ إِلَى جَانِبِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «مَا السُّرى يا جَابِرُ؟». فَأَخْبَرْتُهُ بِحَاجَتِي، فَلَمَّا فَرَغْتُ قَالَ: «مَا هذا الاشْتِمَالُ الذِي رَأَيْتُ؟». قُلْتُ: كَانَ ثَوْبٌ. يَعْنِي: ضَاقَ. قَالَ: «فَإِنْ كَانَ وَاسِعًا فَالْتَحِفْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ ضَيِّقًا فَاتَّزِرْ بِهِ»[1].

## ٦- باسێک: ئەگەر پۆشاکی نوێژکەر تەسک بوو[2]

**٣٦١- سەعیدی کوڕی حاریس دەڵێ: پرسیارمان لە جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ کرد دەربارەی نوێژکردن بەیەك پۆشاکەوە، جابیریش وتی: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم لە یەکێك لەسەفەرەکانیدا، جا شەوێك بۆ هەندێ ئیشوکاری خۆم ڕۆیشتم پێغەمبەرم ﷺ بینی نوێژی دەکرد، منیش یەك پۆشاکم لەبەردا بوو پێچابووم بە خۆمەوە، منیش لە تەنیشتیەوە نوێژم دابەست، جا کە لێ بۆیەوە فەرمووی: ((بەم شەوە بۆچی هاتووی جابیر؟)) منیش کارەکەی خۆمم عەرز کرد، ئینجا کە لێ بوومەوە لە کارەکەم فەرمووی: ((ئەم پۆشاکەت چییە لە خۆت ئاڵاندووە و نەتداوە بەسەر شانتدا))، وتم: پۆشاکەکەم تەسکە، فەرمووی: ((ئەگەر پۆشاکەکەت فراوان بوو، چمکەکانی ڕاست و چەپ بدە بەسەر شانتدا، بەڵام ئەگەر تەسك بوو، بیبەستە بە نێوقەدتەوە)).**

---

[1] بڕوانە: ٣٥٢.

[2] نوێژکەر چی بکات؟

٣٦٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: كَانَ رِجَالٌ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَاقِدِي أُزْرِهِمْ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ كَهَيْئَةِ الصِّبْيَانِ، وَقَالَ لِلنِّسَاءِ: «لَا تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوسًا»[١].

**٣٦٢- سەهل ﷺ دەڵێ: پیاوانێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان دەكرد، پشتەماڵەكەیان بەستبوو بە ملیانەوە (لەبەر تەسكی پشتەماڵەكەیان) وەك منداڵان، وە پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتانی فەرموو: ((سەر بەرز مەكەنەوە (لە سوژدەدا)، هەتا پیاوان هەڵدەستنەوە (لە سوژدە) و ڕێك دادەنیشن))[٢].**

## ٧- بابُ الصَّلَاةِ فِي الجُبَّةِ الشَّأْمِيَّةِ

وَقَالَ الحَسَنُ فِي الثِّيَابِ يَنْسُجُهَا المَجُوسِيُّ لَمْ يَرَ بِهَا بَأْسًا. وَقَالَ مَعْمَرٌ: رَأَيْتُ الزُّهْرِيَّ يَلْبَسُ مِنْ ثِيَابِ اليَمَنِ مَا صُبِغَ بِالْبَوْلِ. وَصَلَّى عَلِيٌّ فِي ثَوْبٍ غَيْرِ مَقْصُورٍ.

## ٧- باسی نوێژكردن بە جوبەی شامیەوە (پۆشاكی كافرانەوە)[٣]

**حەسەن دەربارەی پۆشاكێك ئاگرپەرست چنیبێتی دەڵێ: هیچ خراپەیەكی تێدا نییە، وە مەعمەر دەڵێ: زوهریم بینیوە پۆشاكی یەمەنی لەبەردا بووە كە بە میز ڕەنگ كراوە، وە عەلی ﷺ بە قوماشێكی خامی نوێی نەشۆراوەوە نوێژی كردووە.**

---

[١] بڕوانە: ٨١٤، ١٢١٥.

[٢] بۆ ئەوەی عەورەتی پیاوان نەبینن.

[٣] چونكە لەو كاتەدا شام بە دەست كافرانەوە بوو.

٣٦٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ مُغِيرَةَ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ: «يَا مُغِيرَةُ، خُذِ الإِدَاوَةَ». فَأَخَذْتُهَا، فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى تَوَارى عَنِّي، فَقَضَى حَاجَتَهُ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ شَأْمِيَّةٌ، فَذَهَبَ لِيُخْرِجَ يَدَهُ مِنْ كُمِّهَا فَضَاقَتْ، فَأَخْرَجَ يَدَهُ مِنْ أَسْفَلِهَا، فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ فَتَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيهِ، ثُمَّ صَلَّى[1].

**٣٦٣- موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم فەرمووی: ((ئەی موغیرە مەتارەکە هەڵگرە))، منیش هەڵمگرت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تا لە منەوە دیار نەما و دەستی بەئاو گەیاند، لەوکاتەدا جوبەیەکی شامی لەبەردا بوو، جا ویستی دەستی لە قۆڵی جوبەکەوە دەربهێنێ (بۆ دەستنوێژگرتن)، بەڵام قۆڵەکەی تەسك بوو (بۆی دەرنەهات)، بۆیە لەژێر جوبەکەوە دەستی دەرهێنا و منیش ئاوم کرد بە دەستیدا، جا دەستنوێژی گرت، وە (لەجیاتی شۆردنی پێیەکانی) دەستی تەڕی هێنا بە خوفەکانیدا، پاشان نوێژی کرد.**

## ٨- بابُ كَرَاهِيَةِ التَّعَرِّي فِي الصَّلَاةِ وَغَيْرِهَا

٣٦٤- حَدَّثَنَا مَطَرُ بْنُ الفَضْلِ قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحٌ قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ إِسْحَاقَ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَنْقُلُ مَعَهُمُ الحِجارَةَ لِلْكَعْبَةِ وَعَلَيْهِ إِزَارُهُ، فَقَالَ لَهُ العَبَّاسُ عَمُّهُ:يا ابن أَخِي، لَوْ حَلَلْتَ إِزَارَكَ فَجَعَلْتَ عَلَى مَنْكِبَيْكَ دُونَ الحِجَارَةِ. قَالَ: فَحَلَّهُ فَجَعَلَهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، فَسَقَطَ مَغْشِيًّا عَلَيْهِ، فَمَا رُئِيَ بَعْدَ ذَلِكَ عُرْيَانًا ﷺ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٨٢.

[2] بڕوانە: ١٥٨٢، ٣٨٢٩.

## ٨- باسی ناپەسەندی خۆڕووتكردنەوە لە نوێژ و غەیری نوێژیشدا

٣٦٤- جابیری كوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ قوڕەیشدا بەردیان دەهێنا بۆ (دروستكردنەوەی) كەعبە پشتەماڵەیەكی لەبەردا بوو، جا عەباسی مامی پێی وت: ئەی برازام ئەگەر پشتەماڵەكەت لە نێوقەدت بكەیتەوە بیخەیتە سەر شانت تا بەردەكان ئازارت نەدەن، جابیر دەڵێ: ئەویش كردیەوە و خستیە سەر شانی، بەو هۆیەوە ڕووت بۆیەوە و بە ڕوودا كەوتە سەر زەوی، لە هۆش خۆی چوو، ئیدی پاش ئەو جارە (پێغەمبەری خوا ﷺ) بەڕووتی نەبینراوە.

## ٩- بابُ الصَّلَاةِ فِي القَمِيصِ وَالسَّرَاوِيلِ وَالتُّبَّانِ وَالْقَبَاءِ

٣٦٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْن زيدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ، فَقَالَ: .أَوَكُلُّكُمْ يَجِدُ ثَوْبَيْنِ؟!.. ثُمَّ سَأَلَ رَجُلٌ عُمَرَ، فَقَالَ: إِذَا وَسَّعَ اللَّهُ فَأَوْسِعُوا، جَمَعَ رَجُلٌ عَلَيْهِ ثِيَابَهُ، صَلَّى رَجُلٌ فِي إِزَارٍ وَرِدَاءٍ، فِي إِزَارٍ وَقَمِيصٍ، فِي إِزَارٍ وَقَبَاءٍ، فِي سَرَاوِيلَ وَرِدَاءٍ، فِي سَرَاوِيلَ وَقَمِيصٍ، فِي سَرَاوِيلَ وَقَبَاءٍ، فِي تُبَّانٍ وَقَبَاءٍ، فِي تُبَّانٍ وَقَمِيصٍ. قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: فِي تُبَّانٍ وَرِدَاءٍ[1].

## ٩- باسی نوێژكردن بە كراس و دەرپێ و ژێردەرپێ و كەواوە

٣٦٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هەڵسا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ پرسیاری لێ كرد دەربارەی نوێژكردن بە یەك پۆشاكەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ

---

[1] بڕوانە: ٣٥٨.

**فەرمووی: ((ئایا هەر کام لە ئێوە دوو پۆشاکی هەیە؟))، پاشان پیاوێك پرسیاری لە عومەر ﷺ کرد ئەویش دەڵێ: ئەگەر خوا دەسەڵات و دارایی پێ دان ئێوەش بەفراوانی پۆشاك بپۆشن، پیاو دەتوانێ هەموو پۆشاکێك بپۆشێت، پیاو دروستە نوێژ بکات بە ئیزار و پشتەماڵەکەیەوە و بە ئیزار و کراسێکەوە و بە ئیزارو کەوایەکەوە و بە دەرپێ و پشتەماڵەکەیەوە و بە دەرپێ و کراسێکەوە و بە دەرپێ و کەوایەکەوە و بە ژێردەرپێ و کەوایەکەوە بە ژێردەرپێ و کراسەوە، وا بزانم وتی: بە ژێردەرپێ و پشتەماڵەکەیەوە.**

٣٦٦- حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَا يَلْبَسُ الْمحْرِمُ؟ فَقَالَ: «لَا يَلْبَسُ القَمِيصَ وَلَا السَّرَاوِيلَ وَلَا البُرْنُسَ، وَلَا ثَوْبًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ وَلَا وَرْسٌ، فَمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الخُفَّيْنِ وَليَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا أَسْفَلَ مِنَ الكَعْبَيْنِ». وَعَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. مِثْلَهُ[1].

**٣٦٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کەسێك لە ئیحرامدا بێت چ پۆشاکێك لەبەر بکات؟ فەرمووی: ((نابێ کراس و دەرپێ و پۆشاکی کڵاودار و پۆشاکێ زەعفەران و وەرسی پێوە بێت لەبەر بکات، ئینجا هەرکەس جووتێ نەعلی نەبوو، ئەوە با جووتێ خوف لەپێ بکات لە خوارووی قاپارەکانیەوە خوفەکان ببڕێت (تا وەك نەعلی لێ بێ))).**

[1] بڕوانە: ١٣٤.

## ١٠- بابُ مَا يَسْتُرُ مِنَ الْعَوْرَةِ

٣٦٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ[1].

## ١٠- باسی ئەوەی دەبێ داپۆشرێت لە عەوڕەت چەندە

**٣٦٧- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە خۆپێچانەوە بە پۆشاکەکەی، بە جۆرێ ڕێگەی نەبێ دەستی دەربێنێ[2]، هەروەها ڕێگری کردووە لەوەی کەسێ بەجیجکانەوە[3] دانیشێ و پۆشاکێکی لەبەردا بێ، کە هیچ بەسەر عەوڕەتیەوە نییە (واتە: عەوڕەتی بەدەرەوەیە).**

٣٦٨- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِنَادِ، عَنِ الأعرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعَتَيْنِ: عَنِ اللِّمَاسِ وَالنِّبَاذِ، وَأَنْ يَشْتَمِلَ الصَّمَّاءَ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ[4].

**٣٦٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لە دوو جۆر فرۆشتن کردووە، لە فرۆشتن بە دەستلێدان، وە لە فرۆشتن بەهەڵدان بۆ یەکدی، هەروەها ڕێگری کردووە لە خۆپێچانەوە بەجۆرێ نەتوانێ دەستی دەربێنێ، وە**

---

[1] بڕوانە: ١٩٩١، ٢١٤٤، ٢١٤٧، ٥٨٢٠، ٥٨٢٢، ٦٢٨٤.

[2] هەندێ لە زانایان دەڵێن: (اشتمال الصماء) ئەوەیە جلەکانی بپێچێ بە خۆیەوە و چمکێکی بدات بەسەر شانیدا، بەجۆرێ عەوڕەتی دەر بکەوێ. فتح الباري: ٦٢٩/٢.

[3] بەجیجکانەوە دانیشتووە، بەڵام سمت و کلۆکی لە زەویدایە، لەبەر ئەوە بەزۆری دەرپێیان لەپێدا نەبوو عەوڕەتیان دەرکەوتووە.

[4] بڕوانە: ٥٨٤، ٥٨٨، ١٩٩٣، ٢١٤٥، ٢١٤٦، ٥٨١٩، ٥٨٢١.

**پیاو دانیشێ بەجیجکانەوە یەك پۆشاکی لەبەردا بێ، کە هیچ بەسەر عەورەتیەوە نەبێ.**

٣٦٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْن إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن أَخِي ابن شِهَابٍ، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي حُمَيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ فِي تِلْكَ الحجَّةِ فِي مُؤَذِّنِينَ يَوْمَ النَّحْرِ نُؤَذِّنُ بِمِنًى، أَلَا لَا يَحُجُّ بَعْدَ العَامِ مُشْرِكٌ، وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. قَالَ حُمَيْدُ بْن عَبْدِ الرَّحْمَنِ: ثُمَّ أَرْدَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلِيًّا، فَأَمَرَهُ أَنْ يُؤَذِّنَ بِـ {بَرَاءَةٌ}. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَأَذَّنَ مَعَنَا عَلِيٌّ فِي أَهْلِ مِنًى يَوْمَ النَّحْرِ: لَا يَحُجُّ بَعْدَ العَامِ مُشْرِكٌ، وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ[1].

**٣٦٩- حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف گێڕاویەتەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لەو حەجەدا (پێش حەجیماڵئاوایی بوو) ئەبو بەکر ﷺ منی لەگەڵ کۆمەڵێ جاڕدەردا نارد لە ڕۆژی جەژندا لە مینا جاڕ بدەین، کە لە ئەم ساڵ بەدواوە بتپەرست حەج نەکات، وە کەس بەڕووتی تەواف کەعبە نەکات، حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەبو بەکر عەلیشی نارد، فەرمانی پێ کرد جاڕی بەڕائەت بدات (ئایەتەکانی سەرەتای سووڕەتی تەوبە بخوێنێتەوە بۆ بتپەرستان و کافران)، ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: عەلیش لەگەڵ ئێمەدا لەنێو خەڵکی مینا لە ڕۆژی جەژندا جاڕی دا: کە لە ئەم ساڵە بەدواوە بتپەرست نابێ حەج بکات، وە نابێ کەس بەڕووتی تەواف کەعبە بکات.**

---

[1] بروانە: ١٦٢٢، ٣١٧٧، ٤٣٦٣، ٤٦٥٥، ٤٦٥٦، ٤٦٥٧.

## ١١- بابُ الصَّلَاةِ بِغَيْرِ رِدَاءٍ

٣٧٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي ابن أَبِي المَوَالِي، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ المُنْكَدِرِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَهُوَ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ مُلْتَحِفًا بِهِ وَرِدَاؤُهُ مَوْضُوعٌ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْنَا:يا أَبَا عَبْدِ اللهِ، تُصَلِّي وَرِدَاؤُكَ مَوْضُوعٌ؟! قَالَ: نَعَمْ، أَحْبَبْتُ أَنْ يَرَانِي الجُهَّالُ مِثْلُكُمْ، رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي هَكَذَا[1].

## ١١- باسی نوێژکردن بەبێ پشتەماڵ (دروستە)

**٣٧٠- موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ پۆشاکێکی پێچابوو بەخۆیەوە نوێژی دەکرد و پشتەماڵەکەی دانابوو، جا کە لە نوێژەکەی بۆیەوە، وتمان: ئەبو عەبدوڵا (بۆچی) نوێژ دەکەیت و پشتەماڵەکەت داناوە و لەبەرت نەکردووە؟ وتی: بەڵێ بۆیە وام کرد پێم خۆش بوو نەفامی وەك ئێوە بمبینن، من پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ئاوەها نوێژی دەکرد.**

## ١٢- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي الفَخِذِ

وُيرْوى عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَجَرْهَدٍ وَمُحَمَّدِ بْنِ جَحْشٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ((الْفَخِذُ عَوْرَةٌ))[2]. وَقَالَ أَنَسٌ: حَسَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ فَخِذِهِ. وَحَدِيثُ أَنَسٍ أَسْنَدُ، وَحَدِيثُ جَرْهَدٍ أَحْوَطُ حَتَّى يُخْرَجَ مِنِ اخْتِلَافِهِمْ. وَقَالَ أَبُو مُوسَى: غَطَّى النَبِيُّ ﷺ رُكْبَتَيْهِ حِينَ دَخَلَ عُثْمَانُ. وَقَالَ زيدُ بْنُ ثَابِتٍ: أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أَنْ تَرُضَّ فَخِذِي.

---

[1] بڕوانە: ٣٥٢.

[2] بڕوانە: ٢٨٣٢.

## ١٢- باسی ئەوەی باس دەكرێ دەربارەی ڕان (عەورەتە یان نا؟)

**گێڕدراوەتەوە لە عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ و جەرهەد و موحەممەدی كوڕی جەحشەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی: ((ڕان عەورەتە))، ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕانی دەرخست. فەرموودەكەی كە ئەنەس گێڕاویەتەوە سەنەدەكەی ڕاستتر و بەهێزترە، فەرموودەكەی جەرهەد گێڕاویەتەوە ئیحتیاتی زیاتری تێدایە هەتا لە ڕاجیاییەكەیان ڕزگار ببێت، ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێ عوسمان هاتە ژوورەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ڕانی داپۆشی. وە زەیدی كوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: خوای گەورە قورئانی بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ دابەزاند، لەكاتێكدا ڕانی بەسەر ڕانی منەوە بوو، ئینجا ئەوەنە قورس بوو لەسەر ڕانم ترسام (ئێسكی)ڕانم بشكێ .**

٣٧١- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عُلَيَّةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ غَزَا خَيْبَرَ، فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلَاةَ الغَدَاةِ بِغَلَسٍ، فَرَكِبَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ، وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ، فَأَجْرى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ، وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذَ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ حَسَرَ الإِزَارَ عَنْ فَخِذِهِ حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ فَخِذِ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا دَخَلَ القَرْيَةَ قَالَ: «اللَّهُ أَكبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ المُنْذَرِينَ». قَالَهَا ثَلَاثًا. قَالَ: وَخَرَجَ القَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ فَقَالُوا: مُحَمَّدٌ- قَالَ عَبْدُ العَزِيزِ، وَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِنَا- وَالخمِيسُ. يَعْنِي: الجَيْشَ، قَالَ: فَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً، فَجُمِعَ السَّبْيُ، فَجَاءَ دِحْيَةُ فَقَالَ:يا نَبِيَّ اللَّهِ، أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ. قَالَ: «اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً». فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ:يا نَبِيَّ اللَّهِ، أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ! لَا تَصْلُحُ إِلَّا لَكَ. قَالَ: «ادْعُوهُ بِهَا». فَجَاءَ بِهَا، فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «خُذْ جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ غَيْرَهَا». قَالَ: فَأَعْتَقَهَا

النَّبِيُّ ﷺ وَتَزَوَّجَهَا. فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ:يا أَبَا حَمْزَةَ، مَا أَصْدَقَهَا؟ قَالَ: نَفْسَهَا، أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالطَّرِيقِ جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ ﷺ عَرُوسًا، فَقَالَ: «مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ». وَبَسَطَ نِطَعًا، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ- قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَدْ ذَكَرَ السَّوِيق- قَالَ: فَحَاسُوا حَيْسًا، فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

**٣٧١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ غەزای خەیبەری کرد، لە خەیبەردا لە کاتی تاریکایی و لێڵیدا نوێژی بەیانیمان کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وڵاخەکەی بوو، ئەبو تەلحەش سواری وڵاخەکەی بوو، منیش لە پاشکۆی ئەبو تەلحەدا سوار بووبووم، پێغەمبەر ﷺ وڵاخەکەی برد بە کۆڵانەکانی خەیبەردا، ڕانم دەیدا لە ڕانی پێغەمبەر ﷺ، پاشان ئیزارەکە هەڵماڵا لە ڕانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا من بە چاوی خۆم سەیری سپێتی ڕانی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە شارەکەوە سێ جار فەرمووی: ((الله أکبر خەیبەر وێران بوو، بێگومان ئێمە هەر کاتێ دابەزینە گۆڕەپانی هەر گەلێ، بەیانی بێدارکراوانی بەد و ڕەشە))، ئەنەس دەڵێ: جوولەکەکان دەهاتنە دەرەوە بۆ سەر ئیشوکاریان (کە پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەیان دی)، وتیان: ئەوە موحەممەدە -عەبدولعەزیز و هەندێك لە هاوڕێکانمان وتیان:- (الخمیس) واتە: (موحەممەد) و سوپاکەیەتی، ئەنەس دەڵێ: خەیبەرمان بەجەنگ و هێز داگیر کرد، وە ژنە دیلەکان کۆ کرانەوە، جا دیحیە هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەنیزەکێکم لە ژنە دیلەکان پێ بدە، فەرمووی: ((بڕۆ کەنیزەکێك ببە))، ئەویش صەفییەی کچی حویەی برد، ئینجا**

---

[1] بڕوانە: ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥٠٨٦، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٦٣٦٣، ٧٣٣٣، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٥٩٦٨، ٦١٨٥.

پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی کچی حویەی کە گەورەی هۆزی قوڕەیزە و نەزیرە داوتە بە دیحیە؟ ئەو ئافرەتە بۆ تۆ نەبێ بۆ کەسی دیکە شیاو نییە، فەرمووی: ((بانگی بکەن با بیهێنێ))، دیحیەش هێنای کە پێغەمبەر ﷺ سەیری صەفییەی کرد فەرمووی: ((کەنیزەکێکی دیکە لە ئافرەتە دیلەکان ببە جگە لەم))، ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئازادی کرد و مارەی کرد، سابیت بە ئەنەسی وت: ئەی باوکی حەمزە مارەییەکەی چی بوو؟ صەفییە خۆی مارەیی بوو، چونکە ئازادی کرد و مارەی کرد، جا کاتێ گەڕانەوە لە ڕێگادا ئومو سولەیم (دایکی ئەنەس) بۆی ڕێك خست و بەشەو بۆی گوێزایەوە، بەیانی کە ڕۆژ بۆیەوە پێغەمبەر ﷺ بوو بە زاوا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس شتێ خواردنی پێیە بیهێنێ))، سفرەیەکی ڕاخست، پیاوی وا هەبوو خورمای دەهێنا، پیاوی وا هەبوو ڕۆنی دەهێنا، دەڵێ: وا بزانم قاوتیشی باس کرد، ئەنەس دەڵێ: جا کردیان بە خورماوڕۆن، ئەوە نانی زەماوەندەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

## ١٣- بابٌ: فِي كَمْ تُصَلِّي الْمَرْأَةُ فِي الثِّيَابِ؟

وَقَالَ عِكْرِمَةُ: لَوْ وَارَتْ جَسَدَهَا فِي ثَوْبٍ لأَجَزْتُهُ.

٣٧٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنَ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي الفَجْرَ، فَيَشْهَدُ مَعَهُ نِسَاءٌ مِنَ الْمؤمِنَاتِ مُتَلَفِّعَاتٍ فِي مُرُوطِهِنَّ، ثُمَّ يَرْجِعْنَ إِلَى بُيُوتِهِن مَا يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ[١].

---

[١] بڕوانە: ٥٧٨، ٨٦٧، ٨٧٢.

## ١٣- باسێک: ئافرەت بە چەند پۆشاکەوە نوێژ بکات؟

عیکریمه دەڵێ: ئەگەر ئافرەت به یەك پۆشاك هەموو لەشی داپۆشێت، بەلای منەوە دروسته بۆی (نوێژی پێوه بكات).

٣٧٢- عائیشه ﵂ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشه که نوێژی بەیانی دەکرد ئافرەتانی ئیماندار لەگەڵیدا ئامادە دەبوون، به یەك پۆشاك سەر و لاشەیان دادەپۆشی، پاشان دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوەیان (ئەوەندە تاریك بوو) کەس نەیدەناسین.

## ١٤- بابٌ: إِذَا صَلَّى فِي ثَوْبٍ لَهُ أَعْلَامٌ وَنَظَرَ إِلَى عَلَمِهَا

٣٧٣- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بن سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلَامٌ، فَنَظَرَ إِلَى أَعْلَامِهَا نَظْرَةً، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هذِه إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمٍ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلَاتِي». وَقَالَ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كُنْتُ أَنْظُرُ إِلَى عَلَمِهَا وَأَنَا فِي الصَّلَاةِ فَأَخَافُ أَنْ تَفْتِنَنِي»[١].

## ١٤- باسێک: ئەگەر کەسێک نوێژی کرد بە پۆشاکێکی خەتخەتەوە و سەیری خەتەکانی کرد

٣٧٣- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە که پێغەمبەر ﷺ به بەرگێکی چوارگۆشەی خەتخەتەوە نوێژی کرد، جا یەك جار سەیری خەتەکانی کرد، ئینجا که

---

[١] بڕوانه: ٧٥٢، ٥٨١٧.

نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ((ئەم بەرگە ببەن بۆ ئەبو جەهم، بەرگە ئەستووره سادەکەی ئەبو جەهمم بۆ بێنن، چونکە بەڕاستی بێئاگای کردم لە نوێژەکەم)). هیشامی کوڕی عوڕوە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من لە نوێژەکەدا سەیری خەتەکانیم دەکرد، جا ئەترسم سەرم لێ بشێوێنێ و بێئاگام بکات)).

## ١٥- بابٌ: إِنْ صَلَّى فِي ثَوْبٍ مُصَلَّبٍ أَوْ تَصَاوِيرَ، هَلْ تَفْسُدُ صَلَاتُهُ؟ وَمَا يُنْهَى عَنْ ذَلِكَ

٣٧٤- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ: كَانَ قِرَامٌ لِعَائِشَةَ سَتَرَتْ بِهِ جَانِبَ بَيْتِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمِيطِي عَنَّا قِرَامَكِ هذا، فَإِنَّهُ لَا تَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تَعْرِضُ فِي صَلَاتِي»[1].

## ١٥- باسێک: ئەگەر کەسێ بە پۆشاکێکەوە نوێژ بکات کە خاچ یان هەر وێنەیەکی پێوە بێت ئایا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؟ وە کام لەوانە قەدەغە کراوە؟

٣٧٤- ئەنەس ﵁ دەڵێ: عائیشە ﵂ پەردەیەکی تەنکی خوری ڕەنگاوڕەنگی هەبوو کردبووی بە پەردەی شوێنێکی ماڵەکەی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((پەردەکەت لابەرە و دووری خەرەوە لێمان، چونکە بەڕاستی وێنەکانی لە نوێژەکەمدا دێتە بەرچاوم)).

---

[1] بڕوانە: ٥٩٥٩.

## ١٦- بابُ مَنْ صَلَّى فِي فَرُّوجِ حَرِيرٍ ثُمَّ نَزَعَهُ

٣٧٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: أُهْدِيَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَرُّوجُ حَرِيرٍ، فَلَبِسَهُ فَصَلَّى فِيهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا -كَالْكَارِهِ لَهُ- وَقَالَ: «لَا يَنْبَغِي هذا لِلْمُتَّقِينَ»[1].

## ١٦- باسی کەسێک نوێژ بکات بە کەوای چاکداری ئاوریشمەوە، پاشان دایکەنێت لەبەری

**٣٧٥- عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: کەوایەکی چاکداری ئاوریشمیان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لەبەری کرد و نوێژی پێوە کرد، پاشان کە لە نوێژەکەی بۆیەوە، بەتوندی دایکەند لەبەری- وەك ئەوەی حەزی لێ نەبێ -، وە فەرمووی: ((ئەمە بۆ پارێزکاران شیاو نییە)).**

## ١٧- بابُ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الأَحْمَرِ

٣٧٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيفَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ، وَرَأَيْتُ بِلَالًا أَخَذَ وَضُوءَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَرَأَيْتُ النَّاسَ يَبْتَدِرُونَ ذَاكَ الوَضُوءَ، فَمَنْ أَصَابَ مِنْهُ شَيْئًا تَمَسَّحَ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ شَيئًا أَخَذَ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ، ثُمَّ رَأَيْتُ بِلَالًا أَخَذَ عَنَزَةً فَرَكَزَهَا، وَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مُشَمِّرًا، صَلَّى إِلَى العَنَزَةِ بِالنَّاسِ رَكْعَتَيْنِ، وَرَأَيْتُ النَّاسَ وَالدَّوَابَّ يَمُرُّونَ مِنْ بَيْنِ يَدَيِ العَنَزَةِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٥٨٠١.

[2] بڕوانە: ١٨٧.

## ١٧- باسی (حوکمی) نوێژکردن بە جلوبەرگی سوورەوە

٣٧٦- عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەنێو خێوەتێکی وەك گومەزی سووری چەرمیندا بوو، بیلالیشم بینی ئاوی دەستنوێژی پێغەمبەری خوای ﷺ هێنا، وە خەڵکم بینی پێشبڕکێیان دەکرد بۆ ئەو ئاوی دەستنوێژە (تەبەڕوکی پێ بکەن)، جا هەر کەس شتێك لەو ئاوەی بەربکەوتایە، دەیهێنا بەدەموچاوی خۆیدا، هەر کەسیش هیچی بەرنەکەوتایە، بە تەڕی دەستی هاوڕێکەی دەستی تەڕ دەکرد (دەیهێنا بە خۆیدا)، پاشان بیلالم بینی داردەستێکی هێنا و دایچەقاند، وە پێغەمبەر ﷺ لە خێوەتەکە هاتە دەرەوە بە پۆشاکێکی سوورەوە خۆی هەڵکردبوو، ڕوو بە داردەستەکە دوو ڕکات پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، وە خەڵك و ئاژەڵم دەبینی بەبەردەم داردەستەکەدا دەڕۆیشتن.

## ١٨- بابُ الصَّلَاةِ فِي السُّطُوحِ وَالْمِنْبَرِ وَالْخَشَبِ

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَلَمْ يَرَ الحَسَنُ بَأْسًا أَنْ يُصَلَّى عَلَى الجَمْدِ وَالْقَنَاطِرِ، وَإِنْ جَرى تَحْتَهَا بَوْلٌ أَوْ فَوْقَهَا أَوْ أَمَامَهَا، إِذَا كَانَ بَيْنَهما سُتْرَةٌ. وَصَلَّى أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَى سَقْفِ المَسْجِدِ بِصَلَاةِ الإِمَامِ. وَصَلَّى ابن عُمَرَ عَلَى الثَّلْجِ.

## ١٨- باسی (حوکمی) نوێژکردن لەسەر سەربان و دوانگە و تەختەدا

ئەبو عەبدولاّ (ئیمام بوخاری) دەڵێ: حەسەن ڕای وایە قەیناکات نوێژ بکرێت بەسەر بەستەڵەك و سەهۆڵ و پردەوە، با میزیش بەژێریدا یان سەریدا یان

**بەردەمیدا بڕوات، ئەگەر لەنێوان نوێژکەرەکە و میز و پیسییەکەدا شتێ ببێ (پیسییەکە بەر نوێژکەرەکە نەکەوێت)، ئەبو هورەیرە ﷺ لە سەربانی مزگەوت نوێژی کردووە و پێشنوێژەکەی لەنێو مزگەوتدا بووە، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لەسەر بەفر نوێژی کردووە.**

٣٧٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ قَالَ: سَأَلُوا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ الِمنْبَرُ؟ فَقَالَ: مَا بَقِيَ بِالنَّاسِ أَعْلَمُ مِنِّي هُوَ مِنْ أَثْلِ الغَابَةِ، عَمِلَهُ فُلَانٌ مَوْلَى فُلَانَةَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَقَامَ عَلَيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ عُمِلَ وَوُضِعَ، فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ، كَبَّرَ وَقَامَ النَّاسُ خَلْفِهُ، فَقَرَأَ وَرَكَعَ، وَرَكَعَ النَّاسُ خَلْفَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَجَعَ القَهْقَرى، فَسَجَدَ عَلَى الأَرْضِ، ثُمَّ عَادَ إِلَى الِمنْبَرِ ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَجَعَ القَهْقَرى حَتَّى سَجَدَ بِالأَرْضِ، فهذا شَأْنُهُ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: سَأَلَنِي أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ رَحِمَهُ اللَّهُ عَنْ هذا الَحدِيثِ، قَالَ: فَإِنَّمَا أَرَدْتُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ أَعْلَى مِنَ النَّاسِ، فَلَا بَأْسَ أَنْ يَكُونَ الإِمَامُ أَعْلَى مِنَ النَّاسِ بهذا الَحدِيثِ. قَالَ: فَقُلْتُ: إِنَّ سُفْيَانَ بْنَ عُيَيْنَةَ كَانَ يُسْأَلُ عَنْ هذا كَثِيرًا، فَلَمْ تَسْمَعْهُ مِنْهُ؟ قَالَ: لَا[1].

**٣٧٧- پرسیار لە سەهلی کوڕی سەعد ﷺ کرا دوانگەکەی پێغەمبەر ﷺ لەچی دروست کرابوو؟ ئەویش وتی: کەس نەماوە لە من زاناتر بێ لەو بارەیەوە، دوانگەکە لە دارگەزی غابە[2] دروست کرابوو، فلاّن کەسی کۆیلەی فلاّن ژن دروستی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کە دروست کرا و دانرا، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری وەستا و ڕووی کردە قیبلە و الله أکبری کرد و خەڵکیش لەپشتیەوە**

---

[1] بڕوانە: ٤٤٨، ٩١٧، ٢٠٩٤، ٢٥٦٩.

[2] غابە: شوێنێکە لە عەوالی مەدینە، کە ئێستا کەوتۆتە نێو شاری مەدینە.

نوێژیان دابەست، جا قورئانی خوێند و کڕنوشی برد، خەڵکیش لەپشتیەوە کڕنوشیان برد، ئینجا سەری بەرز کردەوە، پاشان بەپشتا هاتە دواوە و (لە دوانگەکە دابەزی و) لەسەر زەوی سوژدەی برد، پاشان گەڕایەوە بۆ سەر دوانگەکە، جا قورئانی خوێند ئینجا کڕنوشی برد، پاشان سەری بەرز کردەوە، پاشان بە پشتا گەڕایە دواوە هەتا لەسەر زەوی سوژدەی برد، ئا ئەمە شێوەی نوێژەکەی بوو، ئەبو عەبدولاّ (ئیمام بوخاری) دەڵێ: عەلی کوڕی عەبدولاّ دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پرسیاری لێ کردم دەربارەی ئەم فەرموودەیە، وتی: بێگومان مەبەستی من ئەوە بوو کە شوێنەکەی پێغەمبەر ﷺ بەرزتر بوو لە خەڵکی، کەواتە قەیناکات بەپێی ئەم فەرموودەیە پێشنوێژ شوێنەکەی بەرزتر بێ لە نوێژخوێنەکان، عەلی دەڵێ وتم: سوفیانی کوڕی عویەینە زۆر لەم بارەیەوە پرسیاری لێ دەکرا، ئایا تۆ ئەم فەرموودەیەت لەو نەبیستووە؟ ئەحمەد وتی: نەخێر.

٣٧٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَقَطَ عَنْ فَرَسِهِ، فَجُحِشَتْ سَاقُهُ أَوْ كَتِفُهُ، وَآلَى مِنْ نِسَائِهِ شَهْرًا، فَجَلَسَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ، دَرَجَتُهَا مِنْ جُذُوعٍ، فَأَتَاهُ أَصْحَابُهُ يَعُودُونَهُ، فَصَلَّى بِهِمْ جَالِسًا وَهُمْ قِيَامٌ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِنْ صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا». وَنَزَلَ لِتِسْعٍ وَعِشْرِينَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ آلَيْتَ شَهْرًا. فَقَالَ: «إِنَّ الشَّهْرَ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[1].

٣٧٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە، بەهۆیەوە لاقی یان شانی بریندار بوو، وە سوێندی

[1] بڕوانە: ٦٨٩، ٧٣٢، ٧٣٣، ٨٠٥، ١١١٤، ١٩١١، ٢٤٦٩، ٥٢٠١، ٥٢٨٩، ٦٦٨٤.

خواردبوو یەك مانگ تێکەڵاوی خێزانەکانی نەکات، ئینجا لە ژوورێکی بەرز تایبەت بە خۆی دانیشت کە پلیکانەکانی لە بنی دارخورما بوو، هاوەڵانی بەهۆی ئەو برینداریيەوە سەردانیان دەکرد، ئینجا بەدانیشتنەوە پێشنوێژی بۆ کردن، هاوەڵان بەپێوە نوێژیان کرد، ئینجا کە سەلامی دایەوە فەرمووی: ((پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بکەون، جا ئەگەر الله أكبرى کرد، ئێوەش الله أكبر بکەن، وە کاتێ کڕنووشی برد، ئێوەش کڕنووش ببەن، وە کاتێ سوژدەی برد سوژدە ببەن، ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد، ئێوەش بەپێوە نوێژ بکەن)). لە پاش بیست و نۆ ڕۆژ هاتە خوارەوە لە ژوورەکەی (و تێکەڵاوی خێزانەکانی کرد)، هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ سوێندی مانگێکت خوارد؟ فەرمووی: ((بێگومان ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە)).

## ١٩- بابٌ: إِذَا أَصَابَ ثَوْبُ الْمُصَلِّي امْرَأَتَهُ إِذَا سَجَدَ

٣٧٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ الشَّيْبَانِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي وَأَنَا حِذَاءَهُ وَأَنَا حَائِضٌ، وَرُبَّمَا أَصَابَنِي ثَوْبُهُ إِذَا سَجَدَ. قَالَتْ: وَكَانَ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ[1].

## ١٩- باسێک: ئەگەر جلوبەرگی نوێژکەرلە کاتی سوژدەبردندا بەر خێزانی بکەوێ

٣٧٩- مەیمونە (ی خێزانی پێغەمبەر ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد منیش لە بەردەمیدا بووم و لە بێنوێژیدا بووم، هەندێ جار کە سوژدەی دەبرد، پۆشاکەکەی بەر من دەکەوت، لەسەر بەرماڵێکی بچکۆلە[2] نوێژی دەکرد.

---

[1] بڕوانە: ٣٣٣.

[2] بەرماڵێکی بچکۆلەی دروستکراو لە پەلی دارخورما بە بەن چنراو وەک حەسیر وایە.

## ٢٠- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى الحَصِيرِ

وَصَلَّى جَابِرٌ وَأَبُو سَعِيدٍ فِي السَّفِينَةِ قَائِمًا. وَقَالَ الحَسَنُ: تُصَلِّي قَائِمًا مَا لَمْ تَشُقَّ عَلَى أَصْحَابِكَ، تَدُورُ مَعَهَا وَإِلَّا فَقَاعِدًا.

٣٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ لَهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: «قُومُوا فَلأُصَلِّ لَكُمْ». قَالَ أَنَسٌ: فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَصَفَفْتُ وَالْيَتِيمَ وَرَاءَهُ، وَالْعَجُوز مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ انْصَرَفَ[١].

## ٢٠- باسی (حوکمی) نوێژکردن لەسەر حەسیر

**جابیر و ئەبو سەعید بەپێوە نوێژیان کردوە لەنێو کەشتیدا، حەسەن دەڵێ: لە کەشتیدا بەپێوە نوێژ بکە ئەگەر نەبوویە زەحمەت بۆ هاوڕێکانت لەگەڵ سووڕانی کەشتیەکەدا تۆش بسووڕێ، بەڵام ئەگەر زەحمەت بوو بۆ هاوڕێکانت ئەوە بەدانیشتنەوە نوێژەکەت بکە.**

**٣٨٠- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە مولەیکەی نەنکی میوانداری پێغەمبەری خوای ﷺ کرد بۆ خواردنێك، کە بۆ ئەوی دروست کردبوو، پێغەمبەریش ﷺ لە خواردنەکەی خوارد، پاشان فەرمووی: ((هەستن با پێشنوێژیتان بۆ بکەم))، ئەنەس دەڵێ: حەسیرێکمان هەبوو ڕەش بووبوو، لەبەر ئەوەی زۆر بەکار هێنرابوو، منیش هەستام (سڕیم) ئاوم لێ پرژاند، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشەوە وەستا و من و منداڵێکی هەتیویش لەدوایەوە**

---

١ بڕوانە: ٧٢٧، ٨٦٠، ٨٧١، ٨٧٤، ١١٦٤.

ڕیز بووین، پیرەژنەکەش (نەنکی ئەنەس) لەدوای ئێمەوە وەستا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی بە پێشنوێژی بۆ کردین، ئینجا سەلامی دایەوە (گەڕایەوە بۆ ماڵەوە).

## ٢١- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى الخُمْرَةِ

٣٨١- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ الشَّيْبَانِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ[1].

## ٢١- باسی نوێژکردن لەسەر بەرماڵێکی بچکۆلە[2]

٣٨١- مەیمونە (ی خێزانی پێغەمبەر ﷺ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر بەرماڵێکی بچووك نوێژی دەکرد.

## ٢٢- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى الفِرَاشِ

وَصَلَّى أَنَسٌ عَلَى فِرَاشِهِ. وَقَالَ أَنَسٌ: كُنا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَيَسْجُدُ أَحَدُنَا عَلَى ثَوْبِهِ[3].

٣٨٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِك، عَنْ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ- أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرِجْلَايَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي، فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا. قَالَتْ: وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ[4].

---

[1] بڕوانە: ٣٣٣.

[2] بەرماڵێکی بچکۆلەی دروستکراو لەگەڵای دارخورما بە بەن چنراو وەک حەسیر وایە .

[3] بڕوانە: ٣٨٥.

[4] بڕوانە: ٣٨٣، ٣٨٤، ٥٠٨، ٥١١، ٥١٢، ٥١٣، ٥١٤، ٥١٥، ٥١٩، ٩٩٧، ١٢٠٩، ٦٢٧٦.

## ٢٢- باسی (حوكمی) نوێژكردن لەسەر نوێن

**ئەنەس ﷺ لەسەر نوێنەكەی نوێژی كرد، وە ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەكرد هەر یەكەمان لەسەر پۆشاكەكەی سوژدەی دەبرد.**

**٣٨٢- عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من لە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دەخەوتم و هەردوو پێم لە ڕووگەكەیدا بوو (لە شوێن سوژدەكەیدا بوو)، جا كە سوژدەی دەبرد تێی دەكوتام، منیش پێم هەڵدەكێشا، بەڵام كاتێ هەڵدەسایەوە، پێیەكانم (درێژ دەكردەوە و) دەمبردەوە شوێنی خۆی، عائیشە دەڵێ لەو ڕۆژگارەداماڵەكان چرایان تێدا نەبوو.**

٣٨٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي وَهْيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ عَلَى فِرَاشِ أَهْلِهِ اعْتِرَاضَ الجَنَازَةِ[١].

**٣٨٣- عورِوە دەڵێ عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد لە كاتێكدا ئەویش لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قیبلەكەیدا لەسەر نوێنی خەوتنەكەی ڕاكشابوو، وەك دانانی جەنازە (لە بەردەمی ئەو كەسەدا كە نوێژی لەسەر دەكات).**

٣٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ عِرَاكٍ، عَنْ عُرْوَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي وَعَائِشَةُ مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ عَلَى الفِرَاشِ الذِي يَنَامَانِ عَلَيْهِ[٢].

---

[١] بڕوانە: ٣٨٢.

[٢] بڕوانە: ٣٨٢.

٣٨٤- عورڕوه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، عائیشەش ﵂ ڕاکشا بوو لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قیبلەکەیدا لەسەر ئەو نوێنەی هەردووکیان لەسەری دەخەوتن.

## ٢٣- بابُ السُّجُودِ عَلَى الثَّوْبِ فِي شِدَّةِ الحَرِّ

وَقَالَ الحَسَنُ: كَانَ القَوْمُ يَسْجُدُونَ عَلَى العِمَامَةِ وَالْقَلَنْسُوَةِ وَيَدَاهُ فِي كُمِّهِ.

٣٨٥- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ المَلِكِ قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ المُفَضَّلِ قَالَ: حَدَّثَنِي غَالِبٌ القَطَّانُ، عَنْ بَكرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَيَضَعُ أَحَدُنَا طَرَفَ الثَّوْبِ مِنْ شِدَّةِ الحرِّ فِي مَكَانِ السُّجُودِ[1].

## ٢٣- باسی سوژدەبردن لەسەر (دامێنی) پۆشاك لەبەر تینی گەرما[2]

حەسەن دەڵێ: هاوەڵان (لەبەر گەرمای بەتین) لەسەر مێزەر و کڵاو سوژدەیان دەبرد، وە هەردوو دەستیان لە قۆڵی پۆشاکەکەیاندا بوو.

٣٨٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد، هەر یەکەمان چمکێکی پۆشاکەکەی دادەنا لەشوێنی سوژدەکەیدا لەبەر تینی گەرما.

## ٢٤- بابُ الصَّلَاةِ فِي النِّعَالِ

٣٨٦- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو مَسْلَمَةَ سَعِيدُ ابْنُ يَزِيدَ الأَزْدِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ[3].

---

[1] بڕوانە: ٥٤٢، ١٢٠٨.

[2] هەروەها لە کاتی سەرمای زۆردا.

[3] بڕوانە: ٥٨٥٠.

## ٢٤- باسی (حوكمی) نوێژكردن به نەعلەوە

**٣٨٦- سەعیدی كوڕی یەزیدی ئەزدی دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی كوڕی مالیك كرد ﷺ ئایا پێغەمبەر ﷺ به نەعلەكانیەوە نوێژی دەكرد؟ وتی: بەڵێ.**

## ٢٥- بابُ الصَّلَاةِ فِي الخِفَافِ

٣٨٧- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: سَمِعْتُ إِبْرَاهِيمَ يُحَدِّثُ عَنْ هَمَّامِ بْنِ الحارِثِ قَالَ: رَأَيْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ، وَمَسَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، فَسُئِلَ، فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ صَنَعَ مِثْلَ هذا. قَالَ إِبْرَاهِيمُ: فَكَانَ يُعْجِبُهُمْ؛ لأَنَّ جَرِيرًا كَانَ مِنْ آخِرِ مَنْ أَسْلَمَ.

## ٢٥- باسی نوێژكردن به خوفەوە

**٣٨٧- هەمامی كوڕی حاریس دەڵێ: جەریری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ بینی میزی كرد، پاشان دەستنوێژی گرت و دەستی تەڕی هێنا به خوفەكانیدا، (لەجیاتی شۆردنی پێیەكانی) پاشان هەستا و نوێژی كرد، جا لەو بارەیەوە پرسیاری لێ كرا، وتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی ئاوای كرد، ئیبڕاهیم دەڵێ: ئەم فەرموودەیان پێ خۆش بوو، چونكە جەریر لەوانە بوو كە درەنگ موسوڵمان بووبوو (واتە: ئەم حوكمە بەردەوامە و نەسخ نەبووەتەوە).**

٣٨٨- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ وَضَّأْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ وَصَلَّى[1].

---

[1] بڕوانە: ١٨٢، ٣٦٣، ٢٩١٨، ٥٧٩٨.

**٣٨٨- موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: ئاوی دەستنوێژم کرد بەدەستی پێغەمبەردا ﷺ، جا دەستی تەڕی هێنا بەسەر خوفەکانیدا و نوێژی کرد.**

## ٢٦- بابٌ: إِذَا لَمْ يُتِمَّ السُّجُودَ

٣٨٩- أَخْبَرَنَا الصَّلْتُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا مَهْدِيٌّ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ، رَأَى رَجُلًا لَا يُتِمُّ رُكُوعَهُ وَلَا سُجُودَهُ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ قَالَ لَهُ حُذَيفَةُ: مَا صَلَّيتَ -قَالَ: وَأَحْسِبهُ قَالَ- لَوْ مُتَّ مُتَّ عَلَى غَيْرِ سُنَّةِ محَمَّد ﷺ[1].

## ٢٦- باسێک: ئەگەر نوێژکەر (پەلە بکات لە سوژدەبردندا) سوژدەکان بەتەواوی نەبات

**٣٨٩- ئەبو وائیل دەگێڕێتەوە لە حوزەیفەوە ﷺ: کە پیاوێکی بینی کڕنووش و سوژدەی بەتەواوی نەدەبرد، ئینجا کاتێ لە نوێژەکەی بۆیەوە، حوزەیفە پێی وت: نوێژت نەکرد، (ئەبو وائیل وتی:) -گومان دەبەم وتی:- ئەگەر بمریت لەسەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نامریت.**

## ٢٧- بابٌ: يُبْدِي ضَبْعَيْهِ وَيُجَافِي فِي السُّجُودِ

٣٩٠- أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ جَعْفَرٍ، عَنِ ابن هُرْمُزَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ ابن بُحَيْنَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ، حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ نَحْوَهُ[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٩١، ٨٠٨.

[2] بڕوانە: ٨٠٧، ٣٥٦٤.

## ٢٧- باسێک: نوێژکەر لە سوژدەدا بنهەنگڵی دەرخات و دەستەکانی نەلکێنێ بەخۆیەوە

٣٩٠- عەبدوڵای کوڕی مالیکی کوڕی بوحەینە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە نوێژی دەکرد، هەردوو دەستی لە یەکدی (و لە هەردوو تەنیشتی) دوور دەخستەوە، هەتا سپیایی بنهەنگڵی دەر دەکەوت. لەیس دەڵێ جەعفەری کوڕی ڕەبیعە وێنەی ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوە.

## ٢٨- بابُ فَضْلِ اسْتِقْبَالِ القِبْلَةِ

يَسْتَقْبِلُ بِأَطْرَافِ رِجْلَيْهِ. قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

٣٩١- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن المَهْدِيِّ قَالَ: حَدَّثَنَا مَنْصُورُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ مَيْمُونِ بْنِ سِيَاهٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى صَلَاتَنا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَذَلِكَ المُسْلِمُ الذِي لَهُ ذِمَّةُ اللَّهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَلَا تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي ذِمَّتِهِ»[2].

## ٢٨- باسی گەورەیی ڕووکردنە قیبلە

ئەبو حومەید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((نوێژکەر هەموو سەر پەنجەکانی ڕوو لە قیبلە کات)).

٣٩١- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس وەك ئەم نوێژەی ئێمە نوێژ بکات، وە ڕوو بکاتە قیبلەکەمان، وە

---

[1] بڕوانە: ٨٢٨.

[2] بڕوانە: ٣٩٢، ٣٩٣.

**سەربڕاوەكانمان بخوات، ئەوە ئەو موسوڵمانەیە كە پەنای خوا و پەنای پێغەمبەری خوای ﷺ هەیە، ئیدی ئێوەش پەنای خوا (و پێغەمبەرەكەی ﷺ) مەشكێنن و غەدری لێ مەكەن)).**

٣٩٢- حَدَّثَنَا نُعَيْمٌ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن الْمبَارَكِ، عَنْ حُمَيدٍ الطَّوِيلِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إله إلا اللَّهُ. فَإِذَا قَالُوهَا وَصَلَّوْا صَلَاَتنَا، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَذَبَحُوا ذَبِيحَتَنَا، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[1].

**٣٩٢- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێ كراوە كە لەگەڵ خەڵكدا بجەنگم هەتا دەڵێن: هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە خوا، جا ئەگەر ئەوەیان وت و نوێژیان كرد وەك نوێژی ئێمە، ڕوویان كردە قیبلەكەمان، وەك ئێمە ئاژەڵیان سەر بڕی، ئەوە بێگومان خوێن وماڵیان لە ئێمە حەڕامە، مەگەر بە هەقی خۆی، وە لێپرسینەوەشیان لەلای خوایە)).**

٣٩٣- قَالَ ابن أَبِي مَرْيَمَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2]. وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيدٌ قَالَ: سَأَلَ مَيْمُونُ بْنُ سِيَاهٍ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: يا أَبَا حَمْزَةَ، مَا يُحَرِّمُ دَمَ العَبْدِ وَمَالَهُ؟ فَقَالَ: مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إله إِلَّا اللَّهُ، وَاسْتَقبَلَ قِبْلَتَنَا، وَصَلَّى صَلَاتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَهُوَ الْمسْلِمُ، لَهُ مَا لِلْمُسْلِمِ، وَعَلَيْهِ مَا عَلَى الْمسْلِمِ[3].

---

[1] بڕوانە: ٣٩١.

[2] ئیمام بوخاری ئەم سەنەدەی هێناوە بۆ بەهێزكردنی فەرموودەكەی پاش ئەوە كە دەبێتە (متابعة) و پاڵپشت بۆی. إرشاد الساري: ٥٥/٢.

[3] بڕوانە: ٣٩١.

**٣٩٣- حومەید دەڵێ: مەیمونی کوڕی سیاه پرسیاری لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ کرد و وتی: ئەی ئەبو حەمزە خوێن و ماڵی مرۆڤ بەچی حەڕام دەبێ؟ وتی: هەر کەس شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا و ڕوو بکاتە قیبلەکەمان، وەك نوێژی ئێمە نوێژ بکات، وە سەربڕاوی ئێمە بخوات، ئەو کەسە موسوڵمانە ئەو (ماف)ەی بۆ موسوڵمان هەیە بۆ ئەویش هەیە، هەر ئەرکێکیش لەسەر موسوڵمان بێ لەسەر ئەویشە.**

## ٢٩- بابُ قِبْلَةِ أَهْلِ المَدِينَةِ وَأَهْلِ الشَّأْمِ وَالْمَشْرِقِ

لَيْسَ فِي المَشْرِقِ وَلَا فِي المَغْرِب قِبْلَةٌ؛ لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((لاَ تَسْتَقْبِلُوا القِبْلَةَ بِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ ولَكن شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا)).

٣٩٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْن عَبْدِ الله قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَان قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَتَيْتُمُ الغَائِطَ فَلَا تَسْتَقْبِلُوا القِبْلَةَ وَلاَ تَسْتَدْبِرُوهَا، ولكن شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا». قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّأْمَ فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ بُنِيَتْ قِبَلَ القِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ وَنَسْتَغْفِرُ الله تَعَالَى. وَعَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أَيُّوبَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، مِثْلَهُ[1].

## ٢٩- باسی (حوکمی) قیبلەی خەڵکی مەدینە و خەڵکی شام و ڕۆژهەڵات

**قیبلە نە لە ڕۆژهەڵاتە، نە لە ڕۆژئاوایە (ئەمە بۆ خەڵکی مەدینەیە)، لەبەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ڕوو مەکەنە قیبلە لە کاتی پیسی، یان میزکردندا، بەڵکوو ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات، یان ڕۆژئاوا)).**

---

[1] بڕوانە: ١٤٤.

٣٩٤- ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر دەستتان بەئاو گەیاند، نە ڕوو بکەنە قیبلە، نە پشتی تێ بکەن، بەڵکوو ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا))، ئەبو ئەیوب دەڵێ: کە ڕۆیشتین بۆ شام ئاودەستمان بینی ڕوو بە قیبلە دروست کرابوو، بۆیە خۆمان لار دەکردەوە و داوای لێبوردنمان لە خوای بەرز و بڵند دەکرد. وە لە زوهرییەوە دەگێڕنەوە ئەویش لە عەتائەوە دەڵێ: لە ئەبو ئەیوبم بیست وێنەی فەرموودەی پێشووی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە.

## ٣٠- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ ﴿١٢٥﴾﴾ البقرة

٣٩٥- حَدَّثَنَا الْحمَيْدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَأَلْنَا ابن عُمَرَ عَنْ رَجُلٍ طَافَ بِالْبَيْتِ العُمْرَةَ، وَلَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَة، أَيأْتِي امْرَأَتَهُ؟ فَقَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ فَطَافَ بِالْبَيتِ سَبْعًا، وَصَلَّى خَلْفَ المقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَة، وَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ الله أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ[1].

## ٣٠- باسی ئەو فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند کە دەفەرمووێ: (شوێن وەستانی ئیبراهیم بکەنە قیبلە)

٣٩٥- عەمری کوڕی دینار دەڵێ: پرسیارمان لە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد دەربارەی کەسێك تەواف عومرە بکات بەدەوری کەعبەدا، هاتوچۆی صەفا و مەڕوەی نەکردبێ، دەتوانێ بچێتە لای خێزانی؟ عەبدوڵا وتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەککە و حەوت جار سووڕایەوە بەدەوری کەعبەدا و لەپشتی مەقامی

---

[1] بڕوانە: ١٦٢٣، ١٦٢٧، ١٦٤٥، ١٦٤٧، ١٧٩٣.

ئیبراهیمەوە دوو ڕكات نوێژی كرد، وە هاتوچۆی نێوان صەفا و مەڕوەی كرد، بێگومان لە پێغەمبەری خوادا ﷺ باشترین سەرمەشقی بۆ ئێوە هەیە.

٣٩٦- وَسَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ الله، فَقَالَ: لَا يَقْرَبَنَّهَا حَتَّى يَطُوفَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَة[١].

**٣٩٦- وە پرسیارمان لە جابیری كوڕی عەبدوڵا ﷺ كرد، ئەویش وتی: نابێ نزیكی خێزانی ببێتەوە، هەتا تەوافی نێوان صەفا و مەڕوە نەكات.**

٣٩٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سَيْفٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُجاهِدًا قَالَ: أُتِيَ ابن عُمَرَ فَقِيلَ لَهُ: هذا رَسُولُ الله ﷺ دَخَلَ الكَعْبَةَ. فَقَالَ ابن عُمَرَ: فَأَقْبَلْتُ وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ خَرَجَ، وَأَجِدُ بِلَالًا قَائِمًا بَيْنَ البَابَيْنِ، فَسَأَلْتُ بِلَالًا فَقُلْتُ: أَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فِي الكَعْبَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ اللَّتَيْنِ عَلَى يَسَارِهِ إِذَادَخَلْتَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى فِي وَجْهِ الكَعْبَةِ رَكْعَتَيْنِ[٢].

**٣٩٧- موجاهید دەڵێ: هەواڵ هێنرا بۆ عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ و پێی وترا: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ چۆیە نێو كەعبە، عەبدوڵای كوڕی عومەریش ﷺ وتی: منیش ڕۆیشتم لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە و بیلالم دی لە نێوان هەردوو دەرگاكەی كەعبەدا وەستابوو، پرسیارم لە بیلال كرد و وتم: ئایا پێغەمبەر ﷺ لە كەعبەدا نوێژی كرد؟ وتی: بەڵێ دوو ڕكاتی كرد لە نێوان ئەو دوو كۆڵەكەدا كە دەكەوێتە لای چەپەوە كاتێ دەچیتە ژوورەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە لە كەعبە و ڕوو بە دەرگای كەعبە دوو ڕكات نوێژی كرد.**

---

[١] بڕوانە: ١٦٢٤، ١٦٤٦، ١٧٩٤.

[٢] بڕوانە: ٤٦٨، ٥٠٤، ٥٠٥، ٥٠٦، ١١٦٧، ١٥٩٨، ١٥٩٩، ٢٩٨٨، ٤٢٨٩، ٤٤٠٠.

٣٩٨- حَدَّثَنَا إسحق بْنُ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا ابن جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابن عَبَّاسٍ قَالَ: لَما دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ البَيتَ دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا، وَلَمْ يُصَلِّ حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ، فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي قُبُلِ الكَعْبَةِ وَقَالَ: «هذه القِبْلَةُ»[1].

**٣٩٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ چۆیە نێو کەعبە لە هەموو لایەکانیەوە نزا و پاڕانەوەی کرد، نوێژی نەکرد هەتا هاتە دەرەوە لە کەعبە، جا کاتێ هاتە دەرەوە ڕوو بە کەعبە دوو ڕکات نوێژی کرد و فەرمووی: ((ئا ئەمە قیبلەیە)).**

## ٣١- بابُ التَّوَجُّهِ نَحْوَ الْقِبْلَةِ حَيْثُ كَانَ

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ((اسْتَقْبِلِ القِبْلَةَ وَكَبِّرْ))[2].

٣٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ رَجَاءٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ صَلَّى، نَحْو بَيتِ المَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ -أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا- وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الكَعْبَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿١٤٤﴾ ﴾ البقرة، فَتَوَجَّه نَحْوَ الكَعْبَةِ، وَقَالَ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ -وَهُمُ اليَهُودُ-: ﴿ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ ﴾ البقرة، فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ، ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَ مَا صَلَّى، فَمَرَّ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الأَنْصَارِ فِي صَلَاةِ العَصْرِ نَحْوَ بَيْتِ المَقْدِسِ، فَقَالَ: هُوَ يَشْهَدُ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَأَنَّهُ تَوَجَّهَ نَحْوَ الكَعْبَةِ. فَتَحَرَّفَ القَوْمُ حَتَّى تَوَجَّهُوا نَحْوَ الكَعْبَةِ[3].

---

[1] بڕوانە: ١٦٠١، ٣٣٥١، ٣٣٥٢، ٤٢٨٨.

[2] بڕوانە: ٧٥٧.

[3] بڕوانە: ٤٠.

## ٣١- باسی ڕووکردن بەرەو ڕووی قیبلە (نوێژکەر) لە هەر کوێ بێ

وە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕوو بکە قیبلە و الله أکبر بکە (و نوێژ دابەستە))).

٣٩٩- بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شانزدە -یان حەڤدە مانگ- ڕوو بە بەیتولەقدیس نوێژی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد ڕوو بکرێتە کەعبە، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێگومان چاوگێڕانت بە ئاسماندا دەبینین)، ئیدی ڕووی کردە کەعبە (لە نوێژکردندا)، جا نەفامان لە خەڵکی -کە جوولەکەکانن- وتیان: (چی وەریگێڕان لەو ڕووگەیەی کە پێشتر ڕوویان تێ دەکرد، (ئەی موحەممەد) تۆش بڵێ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هی خوایە، هەر کەسی بووێ ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست)، ئینجا پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی کرد، پاش ئەوەی نوێژی کرد ڕۆیشتە دەرەوە (لە مزگەوت) و تێ پەڕی بەلای کۆمەڵێك لە ئەنصارڕدا، لە نوێژی عەسردا بوون ڕوو بە بەیتولەقدیس، پیاوەکە وتی: ئەو شایەتی دەدات کە نوێژی کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و ئەو ڕووی کردبۆیە کەعبە (لە نوێژەکەیدا)، جا خەڵکەکەش سووڕانەوە هەتا ڕوویان کردە کەعبە.

٤٠٠- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ، فَإِذَا أَرَادَ الفَرِيضَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ[1].

---

[1] بروانە: ١٠٩٤، ١٠٩٩، ١٢١٧، ٤١٤٠.

**٤٠٠- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر وڵاخەکەیەوە نوێژی (سوننەتی) دەکرد، وڵاخەکەی ڕووی لە هەر شوێنێك بکردایە، بەڵام ئەگەر بیویستایە نوێژی فەرز بکات، لە وڵاخەکە دادەبەزی و ڕووی لە قیبلە دەکرد.**

٤٠١- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ قَالَ إِبْرَاهِيمُ: لَا أَدْرِي زَادَ أَوْ نَقَصَ -فَلَمَّا سَلَّمَ قِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَحَدَثَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ؟ قَالَ: «وَمَا ذَاكَ؟». قَالُوا: صَلَّيْتَ كَذَا وَكَذَا. فَثَنَى رِجْلَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَلَمَّا أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ قَالَ: «إِنَّهُ لَوْ حَدَثَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ لَنَبَّأْتُكُمْ بِهِ، وَلَكِنْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ، أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي، وَإِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ، فَلْيُتِمَّ عَلَيهِ ثُمَّ لِيُسَلِّمْ، ثُمَّ يَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ»[1].

**٤٠١- ئیبراهیم لە عەلقەمەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەبدوڵا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، -ئیبراهیم دەڵێ: نازانم لە نوێژەکەی زیادی کرد یان کەمی کرد-، ئینجا کە سەلامی دایەوە پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا شتێ ڕووی داوە لە نوێژدا؟ فەرمووی: ((چی بووە؟)) پێیان وت: ئاوا و ئاوا نوێژت کرد، جا (پێغەمبەر ﷺ) لەسەر چۆك دانیشت و ڕووی کردە قیبلە و دوو سوژدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە، جا کە ڕووی تێ کردین فەرمووی: ((بێگومان ئەگەر هەر شتێك و گۆڕانێك لە نوێژدا ڕوو بدات، ئەوا پێتان دەڵێم، بەڵام منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە، شتم لەبیر دەچێ چۆن ئێوە شتتان لەبیر دەچێ، جا ئەگەر شتێکم لەبیر چوو بیرم بخەنەوە، وە ئەگەر کەسێکتان لە نوێژەکەیدا گومانی هەبوو، با بگەڕێ بەدوای ڕاستییەکەدا و نوێژەکەی لەسەر ئەوەیان تەواو بکات، پاشان سەلام بداتەوە، پاشان دوو سوژدە ببات)).**

---

[1] بروانە: ٤٠٤، ١٢٢٦، ٦٦٧١، ٧٢٤٩.

## ٣٢- بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقِبْلَةِ، وَمَنْ لَا يَرَى الْإِعَادَةَ عَلَى مَنْ سَهَا فَصَلَّى إِلَى غَيْرِ الْقِبْلَةِ

وَقَدْ سَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ فِي رَكْعَتَيِ الظُّهْرِ، وَأَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ بِوَجْهِهِ، ثُمَّ أَتَمَّ مَا بَقِيَ[1].

٤٠٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ: وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلَاثٍ: فَقُلْتُ: يا رسول الله، لَوِ اتَّخَذْنَا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى فَنَزَلَتْ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾﴾ البقرة. وَآيَةُ الحِجَابِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ أَمَرْتَ نِسَاءَكَ أَنْ يَحْتَجِبْنَ، فَإِنَّهُ يُكَلِّمُهُنَّ البَرُّ وَالْفَاجِرُ. فَنَزَلَتْ آيَةُ الحِجَابِ، وَاجْتَمَعَ نِسَاءُ النَّبِيِّ ﷺ فِي الغَيْرَةِ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ لَهُنَّ: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ﴿٥﴾﴾ التحريم. فَنَزَلَتْ هذه الآيَةُ[2]. حَدَّثَنَا ابن أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا بهذا.

## ٣٢- باسی ئەوەی دەربارەی قیبلە هاتووە، وە ئەوەی دووبارەکردنەوەی نوێژ بە پێویست نازانێ بۆ کەسێ هەڵەی کردبێ و نوێژی کردبێ ڕووی لە قیبلە نەبووبێ

**پێغەمبەر ﷺ لە دووەم ڕکاتی نوێژی نیوەڕۆدا سەلامی دایەوە و ڕووی لە نوێژکەرەکان کرد، پاشان دوو ڕکاتەکەی دیکەی تەواو کرد.**

**٤٠٢- ئەنەس ﷺ گێڕایەوە وتی عومەر ﷺ دەڵێ: لە سێ شتدا هاوڕای پەروەردگارم بووم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە جێگای**

---

[1] بڕوانە: ٤٨٢.

[2] بڕوانە: ٤٤٨٣، ٤٧٩٠، ٤٩١٦.

**وەستانەکەی ئیبڕاهیممان بکردایە بە نوێژگە، جا ئەم ئایەتە دابەزی: (وە جێگای وەستانی ئیبڕاهیم بکەنە قیبلە)، هەروەها ئایەتی حیجاب، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە فەرمانت بکردایە بەخێزانەکانت لەچك بکەن و خۆیان دابپۆشن (دەرنەکەون)، چونکە بێگومان پیاوی چاك و خراپ قسەیان لەگەڵ دەکەن، جا ئایەتی حیجاب[1] دابەزی، وە خێزانەکانی لەبەر هەوێکێشانی (غیرەکردن) یەکدی لە دژی پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوەیان کرد، منیش وتم: ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات ئومێد وایە پەروەردگاری ئێوەی بۆ بگۆڕێ بە ئافرەتانی چاکتر لە ئێوە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە:** ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ﴿٥﴾ ﴾[2]. **(ئیمام بوخاری دەڵێ:) ئیبنو ئەبو مەریەم بۆی گێڕاینەوە وتی: یەحیای کوڕی ئەیوب بۆی باس کردین وتی: حومەید بۆی گێڕامەوە وتی: ئەم فەرمودەیەم لە ئەنەس بیست[3].**

٤٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: بَيْنَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الكَعْبَةَ فَاسْتَقْبِلُوهَا. وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّأْمِ، فَاسْتَدَارُوا إِلَى الكَعْبَةِ[4].

**٤٠٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا خەڵکی لە نوێژی بەیانیدا بوون لە (مزگەوتی) قوبا، لەو کاتەدا کەسێك هات و وتی: بێگومان ئەمشەو**

---

[1] کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب.

[2] سوورەتی (التحريم) ئایەتی: ٥، تەفسیری ئایەتەکەش وتەکەی عومەرە: ئەگەر ئێوە تەڵاق بدا ... .

[3] واتە فەرموودەکە دوو سەنەدی هەیە کە پێی گێڕدراوەتەوە.

[4] بڕوانە: ٤٤٨٨، ٤٤٩١، ٤٤٩٠، ٤٤٩٣، ٤٤٩٤، ٧٢٥١.

**پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بۆ دابەزیوە و فەرمانی پێ کراوە کە ڕوو بکاتە کەعبەی پیرۆز، کەواتە ئێوەش ڕووی تێ بکەن، لەوکاتەدا ئەوان ڕوویان لە شام بوو (کە قودسی لێیە)، ئینجا سووڕانەوە ڕوو بە کەعبە.**

٤٠٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ الله قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقَالُوا: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: «وَمَا ذَاكَ؟». قَالُوا: صَلَّيْتَ خَمْسًا. فَثَنَى رِجْلَيْهِ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ[1].

**٤٠٤- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکاتی کرد، هاوەڵان وتیان: ئایا نوێژ لێی زیاد کراوە؟ فەرمووی: ((بۆ چی بووە؟))، وتیان: پێنج ڕکات نوێژت کرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ (وەك دانیشتنی تەحیاتی) لەسەر چۆکەکانی دانیشت و دوو سوژدەی (هەڵەکردنی) برد.**

## ٣٣- بابُ حَكِّ البُزَاقِ بِالْيَدِ مِنَ المَسْجِدِ

٤٠٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْن جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي القِبْلَةِ، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ حَتَّى رُئِيَ فِي وَجْهِهِ، فَقَامَ فَحَكَّهُ بِيَدِهِ، فَقَالَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلَاتِهِ، فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ -أَوْ إِنَّ رَبَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ- فَلَا يَبْزُقَنَّ أَحَدُكُمْ قِبَلَ قِبْلَتِهِ، ولكن عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمَيْهِ». ثُمَّ أَخَذَ طَرَفَ رِدَائِهِ فَبَصَقَ فِيهِ، ثمَّ رَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: «أَوْ يَفْعَلْ هَكَذَا»[2].

---

[1] بڕوانە: ٤٠١.

[2] بڕوانە: ٢٤١.

# ٣٣- باسی سڕینی بەڵغەم (بەشتێ بیگرێ)[١] بە دەستی لە مزگەوتدا

**٤٠٥- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەڵغەمێکی بینی لە ڕووی قیبلە (ی مزگەوتدا)، جا ئەوە لەسەر دڵی گران بوو، هەتا لە ڕوخساریدا بینرا، جا هەڵسا و بەدەستی سڕی و فەرمووی: ((بێگومان هەر کام لە ئێوە کاتێ دەوەستێ لە نوێژدا، ئەوە بێگومان لەگەڵ پەروەردگاریدا قسە دەکات - یان پەروەردگاری لە نێوان ئەو و قیبلەدایە-، دەبا تف و بەڵغەم نەکاتە ڕووی قیبلەکەی خۆی، بەڵکوو بیکاتە لای چەپی یان ژێر پێکانی))، پاشان چمکێکی جلەکانی گرت و تفی تێ کرد، ئینجا هەندێکی جلەکەی دا بەسەر هەندێکیدا و فەرمووی: ((یان ئاوای لێ بکات)).**

٤٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى بُصَاقًا فِي جِدَارِ القِبْلَةِ فَحَكَّهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلَا يَبْصُقْ قِبَلَ وَجْهِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ قِبَلَ وَجْهِهِ إِذَا صَلَّى»[٢].

**٤٠٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ تف یان بەڵغەمێکی بینی بە دیواری ڕووی قیبلەی مزگەوتەوە[٣]، ئینجا سڕی، پاشان**

---

[١] لە صەحیحی موسلیمدا دەڵێ: (حَكَّهَا بعُرْجُونٍ)، واتە: بە پەلی دارخورمایەك بەڵغەمەکەی سڕی. فتح الباري: ٦٦٨/١.

[٢] بڕوانە: ٧٥٣، ١٢١٣، ٦١١١.

[٣] لە ڕیوایەتی (المُسملي)دا بەم جۆرەیە: (في جدار المسجد)، واتە: بە دیواری مزگەوتەوە، وە لە فەرموودەی (١٢١٣)ی بوخاریدا بەم جۆرەیە: (في قبلة المسجد)، واتە: لە ڕووگەی مزگەوتدا. فتح الباري: ٦٧٠/١.

ڕووی کرده خەڵکەکە و فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان نوێژی کرد، با تف نەکاتە پێشی خۆی، چونکە بێگومان کاتێ نوێژ دەکات، خوا بەرامبەر و ڕووبەڕوویەتی))[١].

٤٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ -أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى فِي جِدَارِ الْقِبْلَةِ مُخَاطًا أَوْ بُصَاقًا أَوْ نُخَامَةً فَحَكَّهُ.

٤٠٧- عائیشەی -دایکی ئیمانداران- ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیواری ڕووی قیبله (ی مزگەوته)وە چڵم یان تف، یان بەڵغەمی بینی، سڕی و کڕاندی.

## ٣٤- بابُ حَكِّ الْمُخَاطِ بِالْحَصَى مِنَ الْمَسْجِدِ

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: إِنْ وَطِئْتَ عَلَى قَذَرٍ رَطْبٍ فَاغْسِلْهُ، وَإِنْ كَانَ يَابِسًا فَلَا.

٤٠٨- ٤٠٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: أَخْبَرَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، أَخبَرَنَا ابن شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ أَبا هُرَيْرَةَ وَأَبا سَعِيدٍ حَدَّثَاهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي جِدَارِ الْمَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَ حَصَاةً فَحَكَّهَا، فَقَالَ: «إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَخَّمَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى»[٢].

## ٣٤- باسی سڕینی چڵم بەچەو لە مزگەوتدا

عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: ئەگەر کەسێك پێی نا بە پیسییەکی تەڕدا با بیشوات، بەڵام ئەگەر وشك بوو نەیشوات.

---

[١] بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر سەیری (مجموع الفتاوى)ی ئیبن تەیمیە بکە: ٦٧٢/٢ و ١٠١/٥.

[٢] بڕوانە: ٤١٠، ٤١٢، ٤١٤، ٤١٦.

٤٠٨- ٤٠٩- حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ: ئەبو هوڕەیرە و ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بۆیان گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیواری مزگەوتەوە بەڵغەمێکی بینی، چەند چەوێکی هەڵگرت و کڕاندی و سڕی و فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان (لە مزگەوتدا لە نوێژدا) بەڵغەمی فڕێ دا، با فڕێی نەداتە بەرامبەری و لای ڕاستی بەڵکوو فڕێی بداتە لای چەپی یان ژێر پێی چەپی)).

## ٣٥- بابٌ: لَا يَبْصُقْ عَنْ يَمِينِهِ فِي الصَّلَاةِ

٤١٠- ٤١١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ وَأَبَا سَعِيدٍ أَخبَرَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي حَائِطِ المَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَصَاةً فَحَتَّهَا، ثُمَّ قَالَ: «إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَخَّمْ قِبَلَ وَجْهِهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ اليُسْرَى»[1].

## ٣٥- باسێک: (نوێژکەر) لە نوێژدا تف نەکاتە لای ڕاستی

٤١٠- ٤١١- ئەبو هوڕەیرە و ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵغەمێکی بە دیواری مزگەوتەوە بینی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ چەند دانە چەوێکی هەڵگرت و کڕاندی، پاشان فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان بەڵغەمی فڕێ دا با فڕێی نەداتە بەرامبەری یان لای ڕاستی، بەڵکوو تف بکاتە لای چەپی یان ژێر پێی چەپی)).

---

[1] بڕوانە: ٤٠٨، ٤٠٩.

٤١٢- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي قَتَادَةُ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يَتْفِلَنَّ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ،ولكن عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ رِجْلِهِ»[1].

**٤١٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با کەستان تف نەکاتە بەردەمی و لای ڕاستی، بەڵکوو بیکاتە لای چەپی یان ژێر پێی (چەپی))).**

## ٣٦- بابٌ: لِيَبْزُقْ عَنْ يَسَارِهِ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ اليُسْرى

٤١٣- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا كَانَ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّمَا يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلَا يَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، ولكن عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ»[2].

## ٣٦- باسێک: با (نوێژکەر) تف بکاتە لای چەپی یان ژێر پێی چەپی

**٤١٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئیماندار هەرکات لە نوێژدا بێت، ئەوە بەدڵنیاییەوە وتووێژ دەکات لەگەڵ پەروەردگاریدا، کەواتە تف نەکاتە بەردەمی خۆی، نەشیکاتە لای ڕاستی، بەڵکوو بیکاتە لای چەپی یان ژێر پێی (چەپی))).**

٤١٤- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَبْصَرَ نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَحَكَّهَا بِحَصَاةٍ، ثُمَّ نَهَى أَنْ يَبْزُقَ الرَّجُلُ

---

[1] بڕوانە: ٢٤١.

[2] بڕوانە: ٢٤١.

بَيْنَ يَدَيْهِ أَوْ عَنْ يَمِينِهِ، ولكن عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ اليُسْرى. وَعَنِ الزُّهْرِيِّ، سَمِعَ حُمَيْدًا عَنْ أَبِي سَعِيدٍ نَحْوَهُ[١].

**٤١٤- ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ بەڵغەمێکی بینی لە ڕووی قیبلەی مزگەوتەوە، بە بەردێك کڕاندی و لایبرد، پاشان قەدەغەی کرد لەوەی مرۆڤ بەڵغەم یان تف بکاتە بەردەمی یان لای ڕاستی (لە نوێژدا)، بەڵکوو بیکاتە لای چەپی یان ژێر پێی چەپی. وە لە زوهرییەوە گێڕدراوەتەوە، کە لە حومەیدی بیستووە ئەویش وێنەی ئەم فەرموودەیەی لە ئەبو سەعیدەوە گێڕاوەتەوە.**

## ٣٧- بابُ كَفَّارَةِ البُزَاقِ فِي المَسْجِدِ

٤١٥- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «البُزَاقُ فِي المَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا».

## ٣٧- باسی کەفارەتی (تاوانی) تف و بەڵغەم کردنە مزگەوت

**٤١٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بەڵغەم کردنە مزگەوت تاوانە، کەفارەتەکەشی داپۆشینیەتی))[٢].**

---

[١] بڕوانە: ٤٠٩.

[٢] لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نێو مزگەوتەکەی خۆڵ و چەو بوو، لەبەر ئەوە بەڵغەمەکە دەبێ داپۆشرێ، چونکە لانابرێ.

## ۳۸- بابُ دَفْنِ النُّخَامَةِ فِي المَسْجِدِ

٤١٦- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَلَا يَبْصُقْ أَمَامَهُ، فَإِنَّمَا يُنَاجِي اللَّهَ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ، وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، فَإِنَّ عَنْ يَمِينِهِ مَلَكًا،وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ، فَيَدْفِنُهَا»[1].

## ۳۸- باسی داپۆشینی بەڵغەم لە مزگەوتدا

**٤١٦- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان هەستا بۆ نوێژکردن، با تف نەکاتە بەردەمی خۆی، چونکە بێگومان وتووێژ لەگەڵ خوادا دەکات تا لە شوێنی نوێژگەیدا بێت، هەروەها تف نەکاتە لای ڕاستی، چونکە بێگومان فریشتەیەك لای ڕاستیەوەیە، بەڵکوو تف بکاتە لای چەپی یان ژێر پێی چەپی و دایپۆشێ)).**

## ۳۹- بابٌ: إِذَا بَدَرَهُ البُزَاقُ فَلْيَأْخُذْ بِطَرَفِ ثَوْبِهِ

٤١٧- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي القِبْلَةِ فَحَكَّهَا بِيَدِهِ، وَرُئِيَ مِنْهُ كَرَاهِيَةٌ -أَوْ رُئِيَ كَرَاهِيَتُهُ لِذَلِكَ وَشِدَّتُهُ عَلَيْهِ- وَقَالَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إذا قَامَ فِي صَلَاتِهِ فَإِنَّمَا يُنَاجِي رَبَّهُ -أَوْ رَبُّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قِبْلَتِهِ- فَلَا يَبْزُقَنَّ فِي قِبْلَتِهِ، ولكن عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحتَ قَدَمِهِ». ثُمَّ أَخَذَ طَرَفَ رِدَائِهِ فَبَزَقَ فِيهِ، وَرَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ قَالَ: «أَوْ يَفْعَل هَكَذَا»[2].

---

[1] بڕوانە: ٤٠٨.

[2] بڕوانە: ٢٤١.

## ٣٩- باسێک: ئەگەر کتوپڕ بەڵغەم هاتە دەمی، با چمکێکی پۆشاکەکەی بگرێ (و تێی بکات)

**٤١٧- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بەڵغەمێکی لە ڕووی قیبلە (ی مزگەوتە)دا بینی، بە بەردێك بە دەستی کڕاندی و لای برد، وە بێزاری لە نێوچاوانیدا بینرا -یان بێزاری و ڕقهەستانی لەو کارە لێ بینرا- و فەرمووی: ((بێگومان کەسێکتان کاتێ لە نوێژدا وەستا، ئەوە بێگومان لەگەڵ پەروەردگاری قسە دەکات -یان پەروەردگاری لە نێوان ئەو و قیبلەکەیدایە-، کەواتە با تف و بەڵغەم نەکاتە قیبلەکەیەوە، بەڵکوو بیکاتە لای چەپی یان ژێر پێی))، پاشان پێغەمبەر ﷺ چمکێکی پۆشاکەکەی گرت بەڵغەمێکی تێ کرد، جا هەندێکی دا بەسەر هەندێکیدا و فەرمووی: ((یان ئاوەهای لێ بکات)).**

## ٤٠- بابُ عِظَةِ الإِمَامِ النَّاسَ فِي إِتْمَامِ الصَّلاَةِ وَذِكْرِ القِبْلَةِ

٤١٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «هَلْ تَرَوْنَ قِبْلَتِي هَا هُنَا؟ فَوَاللَّهِ مَا يَخْفَى عَلَيَّ خُشُوعُكُمْ وَلَا رُكُوعُكُمْ، إِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي».

## ٤٠- باسی ئامۆژگاریکردنی پێشنوێژ بۆ نوێژکەرەکان دەربارەی ڕێکوپێکی نوێژ و باسی قیبلە

**٤١٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئایا ئێوە قیبلەکەی من لە پێشەوە دەبینن؟ جا سوێند بە خوا خوشوع و کڕنوشی ئێوە شاراوە نییە لێم، دڵنیا بن من ئێوە دەبینم لەدوامەوە)).**

٤١٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنا فلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِلَالِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ صَلَاةً، ثُمَّ رَقِيَ الِمنْبَرَ، فَقَالَ فِي الصَّلَاةِ وَفِي الرُّكُوعِ: .إِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ وَرَائِي كمَا أَرَاكُمْ..

**٤١٩- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی نوێژێكی بۆ كردین، پاشان ڕۆیشتە سەر دوانگە و دەربارەی نوێژ و كڕنوش فەرمووی: ((بێگومان من ئێوە لە پشتمەوە دەبینم وەك چۆن ئاوا (لە پێشمەوە) دەتانبینم)).**

## ٤١- بابٌ: هَلْ يُقَالُ مَسْجِدُ بَنِي فُلَانٍ؟

٤٢٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَابَقَ بَيْنَ الخَيْلِ التِي أُضْمِرَتْ مِنَ الحفْيَاءِ، وَأَمَدُهَا ثَنِيَّةُ الوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الخَيْلِ التِي لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا[1].

## ٤١- باسێك: ئایا دەوترێ مزگەوتی فڵان بنەماڵە (یان فڵانە كەس)

**٤٢٠- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕكێیەكی ساز دا لە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕ كرابوون[2] لە حەیفائەوە بۆ (ثَنِيَّةُ الوَدَاعِ)، وە پێشبڕكێی ساز دا لە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕ نەكرابوون لە (ثَنِيَّةُ الوَدَاعِ)ەوە تا مزگەوتی بەنو زورەیق. (نافیع دەڵێ:) وە عەبدوڵا لەو كەسانە بوو كە بەشداری ئەو پێشبڕكێیەی كرد.**

---

[1] بڕوانە: ٢٨٦٨، ٢٨٦٩، ٢٨٧٠، ٧٣٣٦.

[2] ئەو جۆرە ئەسپانە دەبەسترێنەوە و ئاو و ئاڵفی زۆریان پێ دەدرێ، تا قەڵەو دەبن، پاشان ئاو و ئاڵفیان كەم دەكرێتەوە بۆ ماوەیەك غارغارێنیان پێ دەكرێ، تا لاواز بن و گۆشتەكەیان پتەو بێ و بەهێز بن بۆ پێشبڕكێ.

## ٤٢- بابُ الْقِسْمَةِ وَتَعْلِيقِ الْقِنْوِ فِي الْمَسْجِدِ

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: القِنْوُ العِذْقُ، وَالاِثْنَانِ قِنْوَانِ، وَالْجَمَاعَةُ أَيْضًا قِنْوَانٌ، مِثْلَ صِنْوٍ وَصِنْوَانٍ.

٤٢١- وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: عَنْ عَبدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَالٍ مِنَ البَحْرَيْنِ، فَقَالَ: «انْثُرُوهُ فِي المَسْجِدِ». وَكَانَ أَكْثَرَ مَالٍ أُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الصَّلَاةِ، وَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهِ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ، جَاءَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ، فَمَا كَانَ يَرى أَحَدًا إِلَّا أَعْطَاهُ، إِذْ جَاءَهُ العَبَّاسُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطِنِي فَإِنِّي فَادَيْتُ نَفْسِي وَفَادَيْتُ عَقِيلًا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذْ». فَحَثَا فِي ثَوْبِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ يُقِلُّهُ فَلَمْ يَسْتَطِعْ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُؤْمُرْ بَعْضَهُمْ يَرْفَعْهُ إِلَيَّ. قَالَ: «لَا». قَالَ: فَارْفَعْهُ أَنْتَ عَلَيَّ. قَالَ: «لَا». فَنَثَرَ مِنْهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يُقِلُّهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُؤْمُرْ بَعْضَهُمْ يَرْفَعْهُ عَلَيَّ. قَالَ: «لَا». قَالَ: فَارْفَعْهُ أَنْتَ عَلَيَّ. قَالَ: «لَا». فَنَثَرَ مِنْهُ، ثُمَّ احْتَمَلَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى كَاهِلِهِ ثُمَّ انْطَلَقَ، فَمَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُتْبِعُهُ بَصَرَهُ حَتَّى خَفِيَ عَلَيْنَا، عَجَبًا مِنْ حِرْصِهِ، فَمَا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَثَمَّ مِنْهَا دِرْهَمٌ[1].

## ٤٢- باسی دابەشکردن (ی ماڵ و سامان) و هەڵواسینی هێشووە خورما لە مزگەوتدا

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: (القِنْوُ) واتە: هێشووە خورما، دوو هێشوو پێی دەڵێن: (قِنْوَانِ)، کۆمەڵێکیش پێی دەڵێن: (قِنْوَانٌ) وەك: (صِنْو) و (صِنْوَانٍ).**

**٤٢١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: ماڵ و سامانێکی زۆر هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ لە بەحرەینەوە (کە سەرانە بوو لەسەریان دانرابوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە مزگەوتدا هەڵیڕێژن))، ئەو سامانە زۆرترین ماڵ و سامان بوو هێنرابوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ،**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٤٩، ٣١٦٥.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە بۆ نوێژ (بۆ مزگەوت)، لای نەکردەوە بەلای ئەو ماڵەدا، ئینجا کە لە نوێژەکەی بۆیەوە هات لای ماڵ و سامانەکە دانیشت، جا هەر کەسی ببینیایە بەشی دەدا، جا کە عەباسی مامی ﷺ هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشم بدە، بێگومان من بریتی خۆم و عەقیلی (برازام) داوە[1]، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەشی خۆت ببە))، ئەویش بە مشت کردیە عەباکەیەوە، پاشان ویستی هەڵیبگرێ، بەڵام نەیتوانی، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بکە بە یەکێکیان بیدات بە کۆڵمدا، فەرمووی: ((فەرمان ناکەم))، وتی: دەی خۆت بەرزی کەرەوە و بیدە بە کۆڵمدا، فەرمووی: ((بەرزی ناکەمەوە))، جا هەندێکی لێ دەرهێنا، پاشان ویستی هەڵی بگرێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بدە بەیەکێکیان بیدا بە کۆڵمدا، فەرمووی: ((فەرمان ناکەم))، وتی: دەی خۆت بیدە بە کۆڵمدا، فەرمووی: ((نایدەم))، جا هەندێکی دیکەی لێ داکرد، پاشان هەڵیگرت و دای بەکۆڵیدا و ڕۆیشت، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر سەیری دەکرد، هەتا لە چاومان ون بوو، لەبەر ئەوەی سەری سووڕما لە هەڵپە و تەماحەکەی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەسا تا هەمووی دابەشکرد و یەك دیرهەمی تێدا نەما.

## ٤٣- بابُ مَنْ دَعَا لِطَعَامٍ فِي الْمَسْجِدِ وَمَنْ أَجَابَ فِيهِ

٤٢٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، سَمِعَ أَنَسًا قَالَ: وَجَدْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ مَعَهُ نَاسٌ فَقُمْتُ، فَقَالَ لِي: «آرْسَلَكَ أَبُو طَلْحَةَ؟» قُلْتُ: نَعَمْ. فقَالَ: «لِطَعَامٍ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ لَمِنْ مَعَهُ: «قُومُوا». فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقْتُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ[2].

---

[1] لە غەزای بەدردا بەدیل گیرام بە پارە ئازاد کرام.

[2] بڕوانە: ٣٥٧٨، ٥٣٧٨، ٥٤٥٠، ٦٦٨٨.

## ٤٣- باسی کەسێک خەڵک بانگ بکات بۆ نانخواردن لە مزگەوتدا، وە کەسێک بڕوات بەدەم ئەو بانگکردنەوەوە

٤٢٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لە مزگەوتدا چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو، منیش هەڵسام، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە من: ((ئایا ئەبو تەلحە تۆی ناردووە؟))، وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((بۆ خواردن تۆی ناردووە؟))، وتم: بەڵێ، جا فەرمووی بەوانەی لەگەڵیدا بوون: ((هەمووتان هەستن))، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت (بۆ ماڵی ئەبو تەلحە)، منیش لە پێشیانەوە ڕۆیشتم.

## ٤٤- بابُ الْقَضَاءِ وَاللِّعَانِ فِي الْمَسْجِدِ بَيْنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ

٤٢٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخبَرَنَا ابن جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابن شِهَابٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيتَ رَجُلًا وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا أَيَقْتُلُهُ؟ فَتَلَاعَنَا فِي المَسْجِدِ وَأَنَا شَاهِدٌ[1].

## ٤٤- باسی (حوکمی) دادگایی و (حوکمی) نەفرینکردنی پیاوان و ژنان لە یەکدی لە مزگەوتدا

٤٢٣- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ: ئەگەر کەسێك پیاوێك ببینێ لەگەڵ خێزانەکەیدا (زینا بکات)، ئایا بیکوژێ؟ جا من ئامادە بووم لە مزگەوتدا، (ژن و مێردەکە) لیعانیان[2] لەگەڵ یەکدی کرد.

---

[1] بڕوانە: ٤٧٤٥، ٤٧٤٦، ٥٢٥٩، ٥٣٠٨، ٥٣٠٩، ٦٥٤، ٧١٦٥، ٧١٦٦، ٧٣٠٤.

[2] لە باسی لیعاندا ڕوونی دەکەینەوە چۆن چۆنی دەکرێ.

## ٤٥- بَابٌ: إِذَا دَخَلَ بَيْتًا يُصَلِّي حَيْثُ شَاءَ، أَوْ حَيْثُ أُمِرَ، وَلاَ يَتَجَسَّسُ

٤٢٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَتَاهُ فِي مَنْزِلِهِ، فَقَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ لَكَ مِنْ بَيْتِكَ؟». قَالَ: فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى مَكَانٍ، فَكَبَّرَ النَّبِيُّ ﷺ وَصَفَفْنَا خَلْفَهُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ[1].

## ٤٥- باسێک: ئەگەر کەسێک ڕۆیشتە ماڵێکەوە لە هەر شوێنێکیدا ویستی نوێژ بکات، یان لەو شوێنەدا کە فەرمانی پێ کرا، وە نابێ چاو بگێڕێ و بگەڕێ (بۆ دۆزینەوەی شوێنێک نوێژی تێدا بکات)

**٤٢٤- عیتبانی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵەومیان و فەرمووی: ((لە چ شوێنێکی ماڵەکەتدا حەز دەکەیت نوێژت بۆ بکەم؟))، وتی: منیش ئاماژەم کرد بۆ شوێنێکی ماڵەکەم، جا پێغەمبەر ﷺ الله أکبری کرد و نوێژی دابەست، ئێمەش لەدوایەوە ڕیز بووین و دوو ڕکات نوێژی کرد.[2]**

## ٤٦- بابُ المَسَاجِدِ فِي البُيُوتِ

وصَلَّى البَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ فِي مَسْجِدِهِ فِيْ دَارِهِ جَمَاعَةً.

٤٢٥- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْن عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بن الرَّبِيعِ الأَنْصَارِيُّ، أَنَّ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ -وَهوَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

---

[1] بڕوانە: ٤٢٥، ٦٦٧، ٦٨٦، ٨٣٨، ٨٤٠، ١١٨٦، ٤٠٠٩، ٤٠١٠، ٦٤٢٣، ٦٩٣٨.

[2] دوو ڕکاتی پێشنوێژی بۆ کردین.

مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مِنَ الأَنْصَارِ-، أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ أَنْكَرْتُ بَصَرِي، وَأَنَا أُصَلِّي لِقَوْمِي، فَإِذَا كَانَتِ الأَمْطَارُ سَالَ الوَادِي الذِي بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ، لَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ آتِيَ مَسْجِدَهُمْ فَأُصَلِّيَ بِهِمْ، وَوَدِدْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَّكَ تَأْتِينِي فَتُصَلِّيَ فِي بَيْتِي، فَأَتَّخِذَهُ مُصَلًّى. قَالَ: فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَأَفْعَلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ». قَالَ عِتْبَانُ: فَغَدَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ، فَاسْتَأْذَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَذِنْتُ لَهُ، فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى دَخَلَ البَيْتَ، ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ؟». قَالَ: فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ البَيتِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَكَبر، فَقُمْنَا فَصَفَّنَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثمَّ سَلَّمَ. قَالَ: وَحَبَسْنَاهُ عَلَى خَزِيرَةٍ صَنَعْنَاهَا لَهُ. قَالَ: فَثَابَ فِي البَيتِ رِجَالٌ مِنْ أَهْلِ الدَّارِ ذَوُو عَدَدٍ فَاجْتَمَعُوا، فَقَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ: أَيْنَ مَالِكُ بْنُ الدُّخَيْشِنِ؟ -أَوِ ابن الدُّخْشُنِ؟- فَقَالَ بَعْضُهُمْ: ذَلِكَ مُنَافِقٌ لَا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُلْ ذَلِكَ، أَلَا تَرَاهُ قَدْ قَالَ: لَا إله إِلَّا اللَّهُ؛ يُرِيدُ بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ». قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّا نَرى وَجْهَهُ وَنَصِيحَتَهُ إِلَى الْمُنَافِقِينَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ: لَا إله إِلَّا اللَّهُ؛ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ». قَالَ ابن شِهَابٍ: ثُمَّ سَأَلْتُ الحُصَيْنَ بْنَ مُحَمَّدٍ الأَنْصَارِيَّ -وَهْوَ أَحَدُ بَنِي سَالِمٍ، وَهُوَ مِنْ سَرَاتِهِمْ- عَنْ حَدِيثِ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، فَصَدَّقَهُ بِذَلِكَ[1].

## ٤٦- باسی (كردنی شوێنێك به) مزگەوت له ماڵاندا

**بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ له مزگەوتی ماڵەكەیدا نوێژی بەكۆمەڵی كرد.**

**٤٢٥- مەحمودی كوڕی ڕەبیعی ئەنصاری دەگێڕێتەوە: كه عیتبانی كوڕی مالیك ﷺ -كه له هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بووه لەو كەسانه بووه كه ئامادەی جەنگی**

---

[1] بڕوانه: ٤٢٤.

بەدر بوو لە ئەنصارەکان- دەڵێ: ئەو ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بینینی چاوم خراپ بووە و من پێشنوێژی دەکەم بۆ هۆزەکەم، جا ئەگەر باران ببارێت ئەو شیوەی لە نێوان من و ئەواندایە، لافاوی لێ هەڵدەسێ، ئیدی ناتوانم بڕۆم بۆ مزگەوتەکەیان و پێشنوێژییان بۆ بکەم، بۆیە ئاواتەخواز بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بهاتیتایە و لە ماڵەکەمدا نوێژت بکردایە، منیش بمکردایە بە نوێژگە، دەڵێ: پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((بە ویستی خوا بە زوویی ئەو کارە دەکەم))، عیتبان دەڵێ: کاتێ خۆر بەرز بۆیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر هاتن (بۆ ماڵم)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی خواست، منیش مۆڵەتم دا، دانەنیشت هەتا هاتە ژوورەوە، پاشان فەرمووی: ((حەز دەکەیت لە چ جێگایەکی ماڵەکەتدا نوێژ بکەم))، دەڵێ: منیش ئاماژەم کرد بۆ جێگایەك لە ماڵەکەدا، پێغەمبەریش ﷺ هەستا و الله أکبری کرد، ئێمەش لەدوایەوە هەستاین و ڕیز بووین، دوو ڕکات نوێژی کرد[1]، پاشان سەلامی دایەوە، دەڵێ: خواردنێکمان بۆ دروست کردبوو بە ناوی خەزیرە[2]، بۆیە نەمانهێلا بگەڕێتەوە، لە ماڵیاندا چەند پیاوێکی خزمی خۆیان کۆ بووبوونەوە، ئینجا یەکێکیان وتی: مالیکی کوڕی دوخەیشین لەکوێیە؟ -یان کوڕی دوخشون لەکوێیە؟- یەکێکیان وتی: ئەو مالیکە دووڕووە و خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆش ناوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قسەی وا مەکە نابینی دەڵێ: (لا إله إلا الله)، مەبەستیشی

---

[1] واتە بە پێشنوێژی بۆمان و بەکۆمەڵ نوێژمان کرد.

[2] بریتییە لە پارچەگۆشتی بچووك دوای ئەوەی ئاردی پێدا دەکرێت ئاوی تێ دەکرێ و دەکوڵێنرێت. إرشاد الساري: ٢/٨٤-٨٥.

ڕەزامەندی خوایە؟))، وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، وتی: جا بێگومان ئێمە دەبینین ڕووی دڵسۆزی و ئامۆژگاری بۆ ناپاکانە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا ئەوەی بڵێ: (لا إله إلا الله) و مەبەستی پێی ڕەزامەندی خوا بێت قەدەغەی دەکات لە چوونە جەهەنەم)). ئیبنو شیهاب دەڵێ: پرسیارم لە حوصەینی کوڕی موحەممەدی ئەنصاری کرد، کە یەکێکە لە بەنو سالیم، وە لە پیاوە گەورە و سەرۆکەکانیانە دەربارەی فەرموودەکەی مەحمودی کوڕی ڕەبیع، ئەویش گێڕانەوەکەی پشتڕاست کردەوە.

## ٤٧- بابُ التَّيَمُّنِ فِي دُخُولِ المَسْجِدِ وَغَيْرِهِ

وَكَانَ ابن عُمَرَ يَبْدَأُ بِرِجْلِهِ اليُمْنَى، فَإِذَا خَرَجَ بَدَأَ بِرِجْلِهِ اليُسْرى.

٤٢٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأشعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ، فِي طُهُورِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَتَنَعُّلِهِ[1].

## ٤٧- باسی پێشخستنی لای ڕاست لە چوونە مزگەوت و شتی دیکەدا

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ قاچی ڕاستی پێش دەخست لە (ڕۆیشتنە مزگەوتدا)، بەڵام لە هاتنە دەرەوەدا قاچی چەپی پێش دەخست.

---

[1] بڕوانە: ١٦٨.

٤٢٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە پێشخستنی لای ڕاستی پێ خۆش بوو، ئەوەندەی بۆی بکرایە و لە توانایدا بووایە لە هەموو کاروبارێکیدا، لە دەستنوێژگرتنیدا و لە قژداهێنانیدا و لە پێڵاولەپێکردنیدا.

## ٤٨- بابٌ: هَل تُنْبَشُ قُبُورُ مُشْرِكِي الجَاهِلِيَّةِ، وَيُتَّخَذُ مَكَانَهَا مَسَاجِدَ؟

لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((لَعَنَ اللَّهُ اليَهُودَ، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ))[١]. وَمَا يُكْرَهُ مِنَ الصَّلَاةِ فِي القُبُورِ. وَرَأَى عُمَرُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يُصَلِّي عِنْدَ قَبْرٍ، فَقَالَ: القَبْرَ القَبْرَ. وَلَمْ يَأْمُرْهُ بِالإِعَادَةِ.

٤٢٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَذَكَرَتَا لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، فَأُولَئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ القِيَامَةِ»[٢].

## ٤٨- باسێک: ئایا دروستە گۆڕی بتپەرستانی نەفامی هەڵبگێڕدرێتەوە و جێگاکەیان بکرێتە مزگەوت؟

بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((خوا نەفرینی کرد لە جوولەکە، چونکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت))، وە ناپەسەندی نوێژ لە

---

[١] بروانە: ٤٣٥.

[٢] بروانە: ٤٣٤، ١٣٤١.

**گۆڕستاندا، عومەر ئەنەسی بینی نوێژی دەکرد لای گۆڕێکدا، وتی: ئەوە گۆڕە ئەوە گۆڕە، بەڵام فەرمانی پێ نەکرد بە دووبارەکردنەوەی نوێژەکەی.**

**٤٢٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: ئومو حەبیبە و ئومو سەلەمە ﵄ هەردووکیان باسی کەنیسەیەکیان کرد کە لە حەبەشە دیویانە، کە چەند وێنەی تێدا بوو، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((بێگومان ئەوانە ئەگەر پیاوچاکێکیان تیا بووایە و بمردایە، مزگەوتێکیان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکرد، ئەو وێنانەشیان لەسەر دەنەخشاند، ئا ئەوانە خراپترین دروستکراون لای خوا لە ڕۆژی دواییدا)).**

٤٢٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ المَدِينَةَ فَنَزَلَ أَعْلَى المَدِينَةِ، فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَأَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيلَةً، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى بَنِي النَّجَّارِ فَجَاءُوا مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَأَبُو بَكرٍ رِدْفُهُ، وَمَلأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ، حَتَّى ألقَى بِفِنَاءِ أَبِي أَيُّوبَ، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يُصَلِّيَ حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ، وُيصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، وَأَنَّهُ أَمَرَ بِبِنَاءِ المَسْجِدِ، فَأَرْسَلَ إِلَى مَلإٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ فَقَالَ: «يَا بَنِي النَجَّارِ، ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هذا». قَالُوا: لَا واللهِ، لَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلَّا إِلَى اللهِ. فَقَالَ أَنَسٌ: فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ لَكُمْ، قُبُورُ الْمشْرِكِينَ، وَفِيهِ خَرِبٌ، وَفيهِ نَخْلٌ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِقُبُورِ الُمشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، ثُمَّ بِالخربِ فَسُوِّيتْ، وبِالنَّخلِ فَقُطِعَ، فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةَ المَسْجِدِ، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ الحِجَارَةَ، وَجَعَلُوا يَنْقُلُونَ الصَّخْرَ وَهُمْ يَرْتَجِزُونَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ معَهُمْ وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُ الآخِرَهْ فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٣٤.

**٤٢٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە لە لای سەرەوەی مەدینەدا دابەزی، لای دا لەنێو هۆزێکدا پێیان دەوترا: بەنو عەمری کوڕی عەوف، جا پێغەمبەر ﷺ چواردە شەو لە نێویاندا مایەوە، پاشان ناردی بەدوای بەنو نەجاڕدا، ئەوانیش بەشمشێرەکانیانەوە هاتن، من ئێستا ئەو دیمەنەم لەبەر چاوە پێغەمبەر ﷺ وا بەسەر وڵاخەکەیەوە بوو، ئەبو بەکریش لە پاشکۆیدا بوو هۆزی نەجاڕیش بە چواردەوریدا بوون، هەتا گەشتە حەوشەی ماڵی ئەبو ئەیوب، وە پێغەمبەر ﷺ حەزی دەکرد لە هەر جێگایەکدا نوێژ ببێت نوێژ بکات، وە نوێژی دەکرد لە پەچەی مەڕ و بزندا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە دروستکردنی مزگەوتەکەی، ئینجا ناردی بەدوای پیاوماقوڵانی بەنو نەجاڕ و فەرمووی: ((ئەی بەنو نەجاڕ ئەم باخەتانم پێ بفرۆشن))، ئەوانیش وتیان: (نایفرۆشین) نە بە خوا داوای نرخەکەی تەنها لە خوا دەکەین، ئەنەس دەڵێ: پێتان دەڵێم ئەو باغە چی تیا بوو: گۆڕی بتپەرستان و کەلاوە و دارخورمای تێدا بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد گۆڕی بتپەرستەکانیان هەڵگێڕایەوە، پاشان کەلاوەکان تەخت کران و دارخورماکانیش بڕدران، ئینجا دارخورماکانیان لە قیبلەی مزگەوتەوە ڕیز کرد، هەردوو لای دەرگاکەشیان لە بەرد دروست کرد، هاوەڵان کە بەردیان دەهێنا سروودیان دەوت، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ ئەواندا دەیفەرموو: ((خوایە خێر و چاکە نییە جگە لە چاکەی دواڕۆژ، دەی لە ئەنصاڕ و کۆچبەران خۆش بە)).**

## ٤٩- بابُ الصَّلاةِ فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ

٤٢٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بن حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، ثُمَّ سَمِعْتُهُ بَعْدُ يَقُولُ كَانَ يُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ قَبْلَ أَنْ يُبْنَى المَسْجِدُ[1].

[1] بڕوانە: ٢٣٤.

## ٤٩- باسی (حوکمی) نوێژکردن لە پەچەی مەڕدا

**٤٢٩- ئەبو تەیاح دەڵێ: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە پەچەی مەڕدا نوێژی دەکرد (ئەبو تەیاح وتی:) پاشان لێم بیست دەیوت[1] : پێغەمبەر ﷺ لە پەچەی مەڕدا نوێژی دەکرد پێش ئەوەی مزگەوت دروست بکرێ.**

## ٥٠- بابُ الصَّلَاةِ فِي مَوَاضِعِ الإِبِلِ

٤٣٠- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الفَضْلِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَيَّانَ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: رَأَيْتُ ابن عُمَرَ يُصَلِّي إِلَى بَعِيرٍ، وَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَفْعَلُهُ[2].

## ٥٠- باسی نوێژکردن لە جێگای (یەخبوونی) وشتردا (دروستە)

**٤٣٠- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەرم ﷺ بینی نوێژی دەکرد و وشترەکەی لەبەردەمیدا بوو، وە وتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە وای دەکرد.**

## ٥١- بابُ مَنْ صَلَّى وَقُدَّامَهُ تَنُّورٌ أَوْ نَارٌ أَوْ شَيْءٌ مِمَّا يُعْبَدُ، فَأَرَادَ بِهِ اللَّهَ

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: أَخْبَرَنِي أَنَسٌ قَالَ: قَالَ رسول الله ﷺ: ((عُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ وَأنا أُصَلِّي)).

٤٣١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: انْخَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «أُرِيتُ النَّارَ، فَلَمْ أَرَ مَنْظَرًا كَالْيَوْمِ قَطُّ أَفْظَعَ»[1].

---

[1] سەرنج: (پاشان لێم بیست) مەبەست پێی ئەوەیە کە شوعبە کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی فەرموودەکە دەڵێ: لە ماموٚستاکەم (یەزید) بیست لەدواییدا کە دەیوت: ئەوە پێش دروستکردنی مزگەوتەکە بوو .

[2] بڕوانە: ٥٠٧.

## ٥١- باسی کەسێک نوێژ بکات، لەبەردەمیدا تەنوور یان ئاگر یان هەر شتێکی دیکە هەبێ لەوانەی دەپەرسترێ، جا ئەو مەبەستی پێی خوا بێ

زوهری دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئاگرم نیشان درا لە کاتێکدا نوێژم دەکرد)).

٤٣١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: خۆر گیرا و پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی خۆرگیرانی کرد، پاشان فەرمووی: ((ئاگرم نیشان درا، جا هەرگیز دیمەنی وەك ئەو دیمەنەی ئەمڕۆ ترسناکم نەدیوە)).

## ٥٢- بابُ كَرَاهِيَةِ الصَّلاَةِ فِي الْمَقَابِرِ

٤٣٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلَاتِكُمْ، وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا»[٢].

## ٥٢- باسی نوێژکردن لە گۆڕستاندا ناپەسەندە

٤٣٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەندێ لە نوێژە (سوننەتە)کانتان دانێن بۆ ماڵەکانتان، وە ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان))، (واتە: نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوە بکەن و ماڵتان وەك گۆڕستان لێ مەکەن، کە نوێژی تێدا ناکرێ).

---

[١] بڕوانە: ٢٩.

[٢] بڕوانە: ١١٨٧.

## ٥٣- بابُ الصَّلَاةِ فِي مَوَاضِعِ الْخَسْفِ وَالْعَذَابِ

وَيُذْكَرُ أَنَّ عَلِيًّا ﷺ كَرِهَ الصَّلَاةَ بِخَسْفِ بَابِلَ.

٤٣٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَدْخُلُوا عَلَى هؤلاء المُعَذَّبِينَ إِلَّا أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ، فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكينَ فَلَا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ، لَا يُصِيبُكُمْ مَا أَصَابَهُمْ»[1].

## ٥٣- باسی (حوکمی) نوێژکردن لەو شوێنانەی ڕۆچوون بە ناخی زەویدا و لە شوێنی (دابەزینی) سزادا

**گێڕدراوەتەوە کە عەلی ﷺ نوێژکردنی لە زەوی ڕۆچووی بابلدا پێ ناپەسەند بووە.**

**٤٣٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مەڕۆنە نێو شوێنەواری ئەوانەی سزادراون (لە گەلانی پێشوو)، مەگەر بەگریانەوە، جا ئەگەر نەگریان ئەوە مەڕۆنە نێویان، نەوەك ئەوەی تووشی ئەوان بووە، تووشی ئێوەش ببێ)).**

## ٥٤- بابُ الصَّلَاةِ فِي البِيعَةِ

وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: إِنَّا لَا نَدْخُلُ كَنَائِسَكُمْ مِنْ أَجْلِ التَّمَاثِيلِ التِي فِيهَا الصُّوَرَ. وَكَانَ ابن عَبَّاسٍ يُصَلِّي فِي البِيعَةِ إِلَّا بِيعَةً فِيهَا تَمَاثِيلُ.

٤٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدَة، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ذَكَرَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ كَنِيسَةً رَأَتْهَا بِأَرْضِ الحَبَشَةِ، يُقَالُ لَهَا مَارِيَةُ، فَذَكَرَتْ لَهُ مَا رَأَتْ فِيهَا مِنَ

---

[1] بروانه: ٣٣٨٠، ٣٣٨١، ٤٤١٩، ٤٤٢٠، ٤٧٠٢.

الصُّوَرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُولَئِكَ قَوْمٌ إِذَا مَاتَ فِيهِمُ العَبْدُ الصَّالِحُ -أَوِ الرَّجُلُ الصَّالِحُ- بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ»[1].

## ٥٤- باسی (حوکمی) نوێژکردن لە پەرستگای گاوراندا

**عومەر ﷺ دەڵێ: بێگومان ئێمە ناڕۆینە کەنیسەکانتانەوە، لەبەر ئەو پەیکەرانەی وێنە(ی زیندەوەر)یان پێوەیە. وە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە پەرستگای گاوردا نوێژی دەکرد، جگە لە پەرستگایەك کە پەیکەری تێدا بووایە.**

**٤٣٤- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئومو سەلەمە ﷺ باسی کەنیسەیەکی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە وڵاتی حەبەشە بینیویەتی کە پێی دەوترا: ماریە، جا باسی ئەو وێنانەی کرد کە لەو کەنیسەدا بینیویەتی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەوانە گەلێك بوون کاتێ پیاوێکی چاك لەنێویاندا بمردایە، لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد، وە ئەو وێنانەیان تێدا دروست دەکرد، ئەوانە خراپترین دروستکراون لای خوا)).**

## ٥٥- بابٌ

٤٣٥- ٤٣٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، قَالَا: لَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ بِهَا كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ وَهُوَ كَذَلِكَ: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى اليَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ» يُحَذِّرُ مَا صَنَعُوا[2].

---

[1] بڕوانە: ٤٢٧.

[2] بڕوانە: ١٣٣٠، ١٣٩٠، ٣٤٥٣، ٣٤٥٤، ٤٤٤١، ٤٤٤٣، ٤٤٤٤، ٥٨١٥، ٥٨١٦.

## ٥٥- باسێک

٤٣٥- ٤٣٦- عائیشه و عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێن: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو، قوماشێكی خەتخەتی دابوو بەسەر ڕوخساریدا، كە تەنگەنەفەس دەبوو لای دەبرد لەسەر ڕوخساری، ئا لەو حاڵەتەدا بوو دەیفەرموو: ((نەفرینی خوا لە جوولەكە و گاورەكان بێت، گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كرد بە مزگەوت))، موسوڵمانانی بێدار دەكردەوە لەوەی ئەوان كردبوویان.

٤٣٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ».

٤٣٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا جوولەكە لەناو بەرێت، گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كرد بە مزگەوت)).

## ٥٦- بَابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «جُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا»

٤٣٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ قَالَ: حَدَّثَنَا سَيَّارٌ -هُوَ أَبُو الحَكَمِ- قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ الفَقِيرُ قَالَ: حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، وَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الغَنَائِمُ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ»[1].

---

[1] بڕوانه: ٣٣٥.

## ٥٦- باسى ئەم فەرموودەيەى پێغەمبەر ﷺ: «هەموو زەويم بۆ كراوە بە مزگەوت و پاككەرەوە»

**٤٣٨- جابيرى كوڕى عەبدولا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((پێنج شتم پێ دراوە بەهیچ كام لە پێغەمبەرانى پێش من نەدراوە: (دوژمنان) مانگەڕێيەك بەترس و بيم لێم (شكاون و بەسەرياندا) سەر خراوم، هەموو زەويم بۆ كراوە بە مزگەوت و پاككەرەوە، وە هەر كەس لە ئوممەتەكەم كاتى نوێژى بەسەردا هات، لە هەر كوێيەك بوو با نوێژ بكات، وە غەنيمەتەكان (بەتەنها) بۆ من حەڵاڵ كراوە، وە هەر پێغەمبەرێك دەنێردرا بۆ گەلەكەى بەتايبەتى، بەڵام من نێردرام بۆ هەموو خەڵكى، وە شەفاعەت (ى گەورەى ڕۆژى دوايى)م پێ دراوە)).**

## ٥٧- بابُ نَوْمِ الْمَرْأَةِ فِي الْمَسْجِدِ

٤٣٩- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ وَلِيدَةً كَانَتْ سَوْدَاءَ لِحَيٍّ مِنَ العَرَبِ، فَأَعْتَقُوهَا، فَكَانَتْ مَعَهُمْ، قَالَتْ: فَخَرَجَتْ صَبِيَّةٌ لَهُمْ عَلَيْهَا وِشَاحٌ أَحْمَرُ مِنْ سُيُورٍ قَالَتْ: فَوَضَعَتْهُ -أَوْ وَقَعَ مِنْهَا- فَمَرَّتْ بِهِ حُدَيَّاةٌ وَهْوَ مُلْقًى، فَحَسِبَتْهُ لَحْمًا فَخَطَفَتْهُ، قَالَتْ: فَالْتَمَسُوهُ فَلَمْ يَجِدُوهُ، قَالَتْ: فَاتَّهَمُونِي بِهِ، قَالَتْ: فَطَفِقُوا يُفَتِّشُونَ حَتَّى فَتَّشُوا قُبُلَهَا، قَالَتْ: واللهِ إِنِي لَقَائِمَة مَعَهُمْ، إِذْ مَرَّتِ الْحدَيَّاةُ فَأَلْقَتْهُ، قَالَتْ: فَوَقَعَ بَيْنَهُمْ قَالَتْ: فَقُلْتُ: هذا الذِي اتَّهَمْتُمُونِي بِهِ -زَعَمْتُمْ- وَأَنَا مِنْهُ بَرِيئَةٌ، وَهُوَ ذَا هوَ. قَالَتْ: فَجَاءَت إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَسْلَمَتْ. قَالَتْ عَائِشَةَ: فَكَانَ لَهَا خِبَاءٌ فِي الَمسْجِدِ -أَوْ حِفْشٌ- قَالَتْ: فَكَانَتْ تَأْتِينِي فَتَحَدَّثُ عِنْدِي -قَالَتْ- فَلَا تَجْلِسُ عِنْدِي مَجْلِسًا إِلَّا قَالَتْ: وَيَوْمَ الوِشَاحِ مِنْ أَعَاجِيبِ رَبِّنَا ... أَلَا إِنَّهُ مِنْ بَلْدَةِ الكُفْرِ أَنْجَانِي

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ لَهَا: مَا شَأْنُكِ لَا تَقْعُدِينَ مَعِي مَقْعَدًا إِلَّا قُلْتِ هذا؟ قَالَتْ: فَحَدَّثَتْنِي بهذا الحَدِيثِ[1]

## ٥٧- باسی خەوتنی ئافرەت لە مزگەوتدا

**٤٣٩- عائيشە ﵂ دەگێڕێتەوە: كەنیزەكێكی ڕەشپێست كە هی خێڵێكی عەرەب بوو، ئازادیان كردبوو، جا لەگەڵیاندا بوو، ئەو كەنیزەكە وتی: جا كچۆڵەیەكی ئەو خێڵە لە ماڵ دەردەچێ، ملوانكەیەكی مور و سووری چنراو بە پێستی لە ملدا بوو، (كەنیزەكەكە) وتی: جا دایدەنێ -یان لێی دەكەوێ-، جا داڵەسوورەیەك[2] بەلای ملوانكەكەدا تێ دەپەڕێ دانراوە، وا دەزانێ گۆشتە و دەیفڕێنێ، كەنیزەكەكە وتی: ئینجا بەدوایدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە، دەڵێ: منیان پێ تاوانباركرد، دەڵێ: دەستیان كرد بە پشكنین، تەنانەت نێو لەشیشیان پشكنی، دەڵێ: سوێند بە خوا لەگەڵیاندا وەستابووم، لەپڕ كۆلارەكە تێ پەڕی ملوانكەكەی فڕێ دا، دەڵێ: كەوتە نێوانیانەوە، دەڵێ: منیش وتم: ئەوە ئەو ملوانكەیە منتان پێ تاوانبار كرد و -بە درۆ وتتان: دزیوتە-، منیش بەری بووم ئا ئەوەتانێ، عائیشە دەڵێ: ئینجا ئەو كەنیزەكە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمان بوو، عائیشە دەڵێ: جا خێوەتێكی بچووك یان ماڵێكی بچكۆلەی هەبوو لە مزگەوتدا، عائیشە دەڵێ: زۆر جار دەهات بۆ لام و قسەی بۆ دەكردم، -وتی:- هەر جارێ دانیشتایە لام ئەم شیعرەی دەوت: ڕۆژی ملوانكەكە یەكێكە لە ڕۆژە سەرسووڕهێنەرەكانی پەروەردگارم، ئەوسا**

---

[1] بڕوانە: ٣٨٣٥.

[2] داڵەسوورە پێشی دەوترێت: كۆلارە: كە باڵدارێكە گۆشت دەخوات. ئەلمونجید بە كوردی: ٧٣٤/١.

**بزانن لە شاری کافران ڕزگاری کردم، عائیشە دەڵێ: منیش وتم: ئەوە چیتە هەر جارێك لەگەڵمدا دادەنیشی، ئەم هۆنراوە دەڵێی؟ جا ئەویش ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە (کە باس کرا).**

## ٥٨- بابُ نَوْمِ الرِّجَالِ فِي المَسْجِدِ

وَقَالَ أَبُو قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ: قَدِمَ رَهْطٌ مِنْ عُكْلٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فكَانُوا فِي الصُّفَّةِ[1]. وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: كَانَ أَصْحَابُ الصُّفَّةِ الفُقَرَاءَ.

٤٤٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ، أَنَّهُ كَانَ يَنَامُ وَهْوَ شَابٌّ أَعْزَبُ لَا أَهْلَ لَهُ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

## ٥٨- باسی خەوتنی پیاوان لە مزگەوتدا (دروستە)

**ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەنەس ﷺ دەڵێ: کۆمەڵێ لە هۆزی عوکل هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، جا لە صوفەدا[3] دەمانەوە. عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: ئەو کەسانەی لەصوفەدا بوون، هەژارەکان بوون.**

**٤٤٠- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕامەوە: کە ئەو گەنجێکی ڕەبەن بوو، خێزانی نەبوو، لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ دەخەوت.**

---

[1] بڕوانە: ٢٣٣.

[2] بڕوانە: ١٢١١، ١١٥٦، ٣٧٣٨، ٣٧٤٠، ٧٠١٥، ٧٠٢٨، ٧٠٣٠.

[3] صوفە: شوێنێک بوو لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ هەژارە کۆچەرییەکانی تێدا دەمایەوە، بە شەو و ڕۆژ هەر لەوێ بوون.

٤٤١- حَدَّثَنَا قُتَيبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بن أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيتَ فَاطِمَةَ، فَلَمْ يَجِدْ عَلِيًّا فِي البَيْتِ، فَقَالَ: «أَيْنَ ابن عَمِّكِ؟». قَالَتْ: كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ شَيْءٌ، فَغَاضَبَنِي فَخَرَجَ فَلَمْ يَقِلْ عِنْدِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِإِنْسَانٍ: «انْظُرْ أَيْنَ هُوَ؟». فَجَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هُوَ فِي المَسْجِدِ رَاقِدٌ. فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ، قَدْ سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ شِقِّهِ، وَأَصَابَهُ تُرَابٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُهُ عَنْهُ، وَيَقُولُ: «قُمْ أَبَا تُرَابٍ، قُمْ أَبَا تُرَابٍ»[1].

**٤٤١- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ماڵی فاتیمە، بەڵام عەلی نەدی لە ماڵەوە، بۆیە فەرمووی: ((ئامۆزاکەت لەکوێیە؟))، فاتیمە وتی: شتێ لە نێوانماندا ڕووی دا، ڕقی منی هەڵسان و چووە دەرەوە، نیوەڕۆ خەویشی لای من نەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بەکەسێکی فەرموو: ((بزانە لەکوێیە؟))، ئینجا کابرا هاتەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەتا لە مزگەوت ڕاکشاوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات لە کاتێکدا ئەو ڕاکشابوو، پشتەماڵەکەی (کە دابووی بە خۆیدا) لەسەر لایەکی لاچووبوو تۆزی لێ نیشتبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە لابردن و سڕینی تۆزەکەی پێوەی بوو و دەیفەرموو: ((هەستە ئەی خۆڵاوی، هەستە ئەی خۆڵاوی)).**

٤٤٢- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى قَالَ: حَدَّثَنَا ابن فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: رَأَيْتُ سَبْعِينَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ، مَا مِنْهُمْ رَجُلٌ عَلَيْهِ رِدَاءٌ، إِمَّا إِزَارٌ وَإِمَّا كِسَاءٌ، قَدْ رَبَطُوا فِي أَعْنَاقِهِمْ، فَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ نِصْفَ السَّاقَيْنِ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ الكَعْبَيْنِ، فَيَجْمَعُهُ بِيَدِهِ، كَرَاهِيَةَ أَنْ تُرى عَوْرَتُهُ.

---

[1] بڕوانە: ٣٧٠٣، ٦٢٠٤، ٦٢٨٠.

**٤٤٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: حەفتا کەسم لە ئەهلی صوفە دیوە، کەسیان تێدا نەبوو پشتەماڵێکی پێوە بێت، یان ئیزارێکی[1] پێوە بوو، یان پۆشاکێکیان لەبەردا بوو دەیانبەست بەملیانەوە، جا هەیان بوو دەگەیشتە نیوەی لاقەکانی، هەیانبوو دەگەیشتە قولەپێکانی، (بە دەست دەیانگرت) لە ترسی ئەوەی عەورەتیان دەربکەوێ.**

## ٥٩- بَابُ الصَّلَاةِ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ

وَقَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَصَلَّى فِيهِ[2].

٤٤٣- حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَارِبُ بْنُ دِثَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ -قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهُ قَالَ ضُحًى- فَقَالَ: «صَلِّ رَكْعَتَيْنِ». وَكَانَ لِي عَلَيْهِ دَيْنٌ فَقَضَانِي وَزَادَنِي[3].

## ٥٩- باسی نوێژکردن (لە مزگەوتدا) کاتی هاتنەوە (ی کەسێك) لە سەفەر

**کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە سەفەر بهاتایەتەوە، یەکەم جار دەچوویە مزگەوت و نوێژی دەکرد تێیدا.**

**٤٤٣- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت بوو، ڕۆیشتمە خزمەتی- میسعەر[4] دەڵێ: وا بزانم وتی: لە چێشتەنگاودا بوو-، جا پێغەمبەر ﷺ**

---

[1] ئیزار: لە نێوکەوە بۆ بەشی خوارەوەی لەش دادەپۆشێ.

[2] بڕوانە: ٢٧٥٧.

[3] بڕوانە: ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٠٦٧، ٦٣٨٧.

[4] میسعەر: یەکێکە لە گێڕەرەوانی ئەم فەرموودەیە.

فەرمووی: ((دوو ڕكات نوێژ بكە))، وە من قەرزێكم لای بوو، ئەویش قەرزەكەی دامەوە بە زیادیشەوە.

## ٦٠- بابٌ: إِذَا دَخَلَ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ

٤٤٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ السَّلَمِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ»[1].

## ٦٠- باسێک: کەسێ ڕۆیشتە مزگەوت با دوو ڕکات نوێژ بکات

٤٤٤- ئەبو قەتادەی سەلەمی ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر كەسێكتان چووە نێو مزگەوتەوە، پێش ئەوەی دانیشێت با دوو ڕكات نوێژ بكات)).

## ٦١- بابُ الحَدَثِ فِي المَسْجِدِ

٤٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «المَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ الذِي صَلَّى فِيهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ، تَقُولُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ»[2].

## ٦١- باسێ (حوکمێ) دەستنوێژ شکان لە مزگەوتدا

٤٤٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فریشتە داوا دەكات بۆ هەركام لە ئێوە، هەتا لەو شوێنەدا بێت نوێژی تێدا

---

[1] بڕوانە: ١١٦٣.

[2] بڕوانە: ١٧٦.

کردووه (له مزگەوتدا)، به مەرجێ دەستنوێژی نەشکێ، فریشتەکه دەڵێ: خوایه لێی خۆش به، خوایه ڕەحمی پێ بکه)).

## ٦٢- بابُ بُنْيَانِ المَسْجِدِ

وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: كَانَ سَقْفُ المَسْجِدِ مِنْ جَرِيدِ النَّخْلِ. وَأَمَرَ عُمَرُ بِبِنَاءِ المَسْجِدِ وَقَالَ: أَكِنَّ النَّاسَ مِنَ المَطَرِ، وَإِيَّاكَ أَنْ تُحَمِّرَ أَوْ تُصَفِّرَ، فَتَفْتِنَ النَّاسَ. وَقَالَ أَنَسٌ: يَتَبَاهَوْنَ بِهَا، ثُمَّ لَا يَعْمُرُونَهَا إِلَّا قَلِيلًا. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: لَتُزَخْرِفُنَّهَا كَمَا زَخْرَفَتِ اليَهُودُ وَالنَّصَارى.

٤٤٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا نَافِعٌ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ أَخْبَرَهُ أَنَّ المَسْجِدَ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَبْنِيًّا بِاللَّبِنِ، وَسَقْفُهُ الجَرِيدُ، وَعُمُدُهُ خَشَبُ النَّخلِ، فَلَمْ يَزِدْ فِيهِ أَبُو بَكْرٍ شَيْئًا، وَزَادَ فِيهِ عُمَرُ وَبَنَاهُ عَلَى بُنْيَانِهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّبِنِ وَالْجَرِيدِ، وَأَعَادَ عُمُدَهُ خَشَبًا، ثُمَّ غَيَّرَهُ عُثْمَانُ، فَزَادَ فِيهِ زِيَادَةً كَثِيرَةً، وَبَنَى جِدَارَهُ بِالحِجَارَةِ الَمنْقُوشَةِ وَالْقَصَّةِ، وَجَعَلَ عُمُدَهُ مِنْ حِجَارَةٍ مَنْقُوشَةٍ، وَسَقَفَهُ بِالسَّاجِ.

## ٦٢- باسی دروستکردنی مزگەوت[1]

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: سەری مزگەوتی (مەدینه) پەلی دارخورما بوو، عومەر ﷺ فەرمانی کرد به دروستکردنەوەی مزگەوت (و سەرگرتنی)، وتی: با خەڵك بپارێزێ له باران، وه خۆت بپارێزه لەوەی سوور و زەردی کەیت، بەهۆیەوه خەڵك تێك بدەیت وسەریان لێ بشێوێنی، ئەنەس ﷺ دەڵێ: خەڵکی (له دروستکردنی مزگەوتدا) شانازی دەکەن بەسەر یەکدیدا، بەڵام به عیبادەت

[1] مەبەستی دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەری خوایه ﷺ له مەدینه.

ئاوەدانی ناکەنەوە، زۆر بەکەمی نەبێت. وە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: سوێند بە خوا مزگەوتەکان دەڕازێننەوە هەر وەك چۆن جوولەکە و گاورەکان کەنیسە و پەرستگاکانیان ڕازاندەوە.

٤٤٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: مزگەوت (ی مەدینە) لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە خشتی قوڕ دروست کرابوو، سەرەکەشی پەلی دارخورما بوو، کۆڵەکەکانیشی داری دارخورما بوو، جا لە سەردەمی ئەبو بەکردا ﷺ هیچی لێی زیاد نەکرد، بەڵام عومەر ﷺ لە سەردەمی خۆیدا لێی زیاد کرد، لەسەر بناغەکەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دروستی کردەوە بە خشتی قوڕ و پەلی دارخورما، کۆڵەکەکانیشی بۆ دانایەوە (بەڵام مزگەوتەکەی گەورە کرد)، پاشان عوسمان ﷺ گۆڕی، زۆری لێ زیاد کرد و دیوارەکانی کرد بە گەچ و بەردی ڕەنگاوڕەنگ، وە پایەکانیشی لە بەردی ڕەنگاوڕەنگ دروست کرد و سەرەکەشی بە داری ساج گرت.

## ٦٣- بابُ التَّعَاوُنِ فِي بِنَاءِ المَسْجِدِ

وَقَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ التوبة.

٤٤٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُخْتَارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحذَّاءُ، عَنْ عِكْرِمَةَ: قَالَ لِي ابن عَبَّاسٍ وَلابِنِهِ عَلِيٍّ: انْطَلِقَا إِلَى أَبِي سَعِيدٍ فَاسْمَعَا مِنْ حَدِيثِهِ. فَانْطَلَقْنَا فَإِذَا هُوَ فِي حَائِطٍ يُصْلِحُهُ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَاحْتَبَى ثُمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّثُنَا حَتَّى أَتَى ذِكْرُ

بِنَاءِ المَسْجِدِ، فَقَالَ: كُنَّا نَحْمِلُ لَبِنَةً لَبِنَةً، وَعَمَّارٌ لَبِنَتَيْنِ لَبِنَتَيْنِ، فَرَآهُ النَّبِيُّ ﷺ فَيَنْفُضُ التُّرَابَ عَنْهُ وَيَقُولُ: «وَيْحَ عَمَّارٍ تَقْتُلُهُ الفِئَةُ البَاغِيَةُ، يَدْعُوهُمْ إِلَى الجَنَّةِ، وَيَدْعُونَهُ إِلَى النَّارِ». قَالَ: يَقُولُ عَمَّارٌ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الفِتَنِ[1].

## ٦٣- باسی هاوکاریکردنی یەکدی لە دروستکردنی مزگەوتدا

**وە باسی ئەم فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکانی خوا بۆ بتپەرستان شیاو نییە، شایەتی بێباوەڕی دەدەن لەسەر خۆیان، کردەوەکانیان پوچەڵ بۆتەوە، وە هەمیشە لە دۆزەخدا دەبن، بێگومان مزگەوتەکانی خوا ئەو کەسانە ئاوەدانی دەکەنەوە کە باوەڕیان هەیە بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و بەچاکی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن، وە جگە لە خوا لە کەس ناترسن، جا ئەوەی وا بێ ئومێد وایە لە ڕێنموونیکراوان بێ).**

**٤٤٧- عیکریمە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ بە من و عەلی کوڕی وت: بڕۆن بۆ لای ئەبو سەعید، گوێ بگرن لە فەرموودەکانی، ئێمەش هەردووکمان ڕۆیشتین ئەویش لە باخەکەیدا بوو چاکی دەکرد، ئینجا پشتەماڵەکەی هەڵگرت پێچای بە خۆیەوە، پاشان دەستی کرد بە گێڕانەوەی فەرموودە بۆمان، هەتا هاتە سەر باسی دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، وتی: ئێمە یەك یەك خشتمان هەڵدەگرت، بەڵام عەمار دوو دوو خشتی هەڵدەگرت، کە پێغەمبەر ﷺ بینی خۆڵەکەی لێ تەکاند و فەرمووی: ((هاوار بۆ عەمار دەستە ستەمکارەکە دەیکوژن، ئەم ئەوان بانگ دەکات بۆ بەهەشت، بەڵام ئەوان ئەم بانگ دەکەن بۆ دۆزەخ))، دەڵێ: عەماریش دەیوت: پەنا دەگرم بە خوا لە ئاژاوە.**

---

[1] بڕوانە: ٢٨١٢.

## ٦٤- بابُ الاسْتِعَانَةِ بِالنَّجَّارِ وَالصُّنَّاعِ فِي أَعْوَادِ الْمِنْبَرِ وَالْمَسْجِدِ

٤٤٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى امْرَأَةٍ أَنْ: «مُرِي غُلَامَكِ النَجَّارَ يَعْمَلْ لِي أَعْوَادًا أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ»[1].

## ٦٤- باسی داوای هاوكاریكردن

## له دارتاش و پیشەساز بۆ دروستكردنی دوانگه و مزگەوت

**٤٤٨- سەهل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای ئافرەتێك و فەرمووی: ((فەرمان بدە بە غوڵامە دارتاشەكەت لە چەند تەختەیەك (دوانگەیەكم) بۆ دروست بكات، لەسەریان دانیشم)).**

٤٤٩- حَدَّثَنَا خَلَّادٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْن أَيْمَنَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلا أَجْعَلُ لَكَ شَيْئًا تَقْعُدُ عَلَيْهِ، فَإِنَّ لِي غُلَامًا نَجَّارًا؟ قَالَ: «إِنْ شِئْتِ». فَعَمِلَتِ المِنْبَرَ[2].

**٤٤٩- جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: كە ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا شتێكت بۆ ساز بكەم لەسەری دانیشیت، چونكە من غوڵامێكی دارتاشم هەیە؟ فەرمووی: ((ئەگەر حەز دەكەی بیكە))، ئینجا ئەویش[3] دوانگەكەی دروست كرد.**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٧.

[2] بڕوانە: ٩١٨، ٢٠٩٥، ٣٥٨٤، ٣٥٨٥.

[3] واتە: ئافرەتەكە دوانگەكەی دروست كرد، بەڵام ئەمە مەجازە، چونكە غوڵامەكە بە فەرمانی ئافرەتەكە دوانگەكەی دروست كرد. إرشاد الساري: ٢/١٠٩.

## ٦٥- بابُ مَنْ بَنَى مَسْجِدًا

٤٥٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنِي ابن وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، أَنَّ بُكَيْرًا حَدَّثَهُ، أَنَّ عَاصِمَ بْنَ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ عُبَيْدَ اللَّهِ الخَوْلَانِيَّ، أَنَّهُ سَمِعَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، يَقُولُ عِنْدَ قَوْلِ النَّاسِ فِيهِ حِينَ بَنَى مَسْجِدَ الرَّسُولِ ﷺ: إِنَّكُمْ أَكْثَرْتُمْ، وَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ بَنَى مَسْجِدًا -قَالَ بُكَيْرٌ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ- بَنَى اللَّهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الجَنَّةِ».

## ٦٥- باسی (گەورەیی) ئەو کەسەی مزگەوتێک دروست بکات

**٤٥٠- عوبەیدوڵای خەولانی دەڵێ: لە عوسمانی کوڕی عەففانم ﷺ بیست دەیوت: لەو کاتەی مزگەوتی پێغەمبەری ﷺ دروست کردەوە (و گەورەی کرد)، هەندێك لە خەڵك قسەیان لەسەر عوسمان دەکرد، عوسمان وتی: بێگومان ئێوە زۆر لەسەری ڕۆیشتن، چونکە من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((هەر کەس مزگەوتێ دروست بکات، -بوکەیر دەڵێ: وا بزانم فەرمووی: مەبەستی پێی ڕەزامەندی خوا بێ-، ئەوا خوا وێنەی ئەو مزگەوتەی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات)).**

## ٦٦- بابٌ: يَأْخُذُ بِنُصُولِ النَّبْلِ إِذَا مَرَّ فِي المَسْجِدِ

٤٥١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: قُلْتُ لِعَمْرٍو: أَسَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: مَرَّ رَجُلٌ فِي المَسْجِدِ وَمَعَهُ سِهَامٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمْسِكْ بِنِصَالِهَا»[١].

---

[١] بڕوانە: ٧٠٧٣، ٧٠٧٤.

## ٦٦- باسێک: هەرکەس تیری پێ بوو تێ پەڕی بە نێو مزگەوتدا، با دەستی بگرێ بە نووکەکانیەوە

**٤٥١- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێك بە مزگەوتدا تێ پەڕی چەند تیرێکی پێ بوو پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((دەست بگرە بە نووکەکانیەوە)) ، (نەوەك کەسێکی پێ بریندار بکەیت).**

## ٦٧- بابُ المُرُورِ فِي المَسْجِدِ

٤٥٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بُرْدَةَ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَرَّ فِي شَيْءٍ مِنْ مَسَاجِدِنَا أَوْ أَسْوَاقِنَا بِنَبْلٍ، فَلْيَأْخُذْ عَلَى نِصَالِهَا، لَا يَعْقِرْ بِكَفِّهِ مُسْلِمًا»[1].

## ٦٧- باسی تێپەڕبوون بە مزگەوتدا (دروستە)

**٤٥٢- ئەبو بوردە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((هەر کەس تێ پەڕی بە هەر کام لە مزگەوتەکانماندا یان بازاڕەکانماندا بە تیرەوە، ئەوە با دەست بگرێت بە نووکەکانیەوە، تا بە دەستی خۆی موسوڵمانێك بریندار نەکات)).**

## ٦٨- بابُ الشِّعْرِ فِي المَسْجِدِ

٤٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ الحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا شعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، أَنَّهُ سَمِعَ حَسَّانَ بْنَ ثَابِتٍ الأنصَارِيَّ يَسْتَشْهِدُ أَبَا

---

[1] بڕوانە: ٧٠٧٥.

هُرَيْرَةَ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ هَلْ سَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَا حَسَّانُ، أَجِبْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ القُدُسِ؟» قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: نَعَمْ[1].

## ٦٨- باسی (حوکمی خوێندنەوەی) هۆنراوە لە مزگەوتدا

**٤٥٣- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە و دەڵێ: گوێی لێ بوو حەسانی کوڕی سابیتی ئەنصاڕی ﷺ داوای شایەتی لە ئەبو هورەیرە ﷺ کرد، وتی: سوێنت دەدەم (یان پرسیارت لێ دەکەم) بە خودا، ئایا گوێت لە پێغەمبەر ﷺ بوو کە دەیفەرموو: ((ئەی حەسان لەبری پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵام بدەرەوە، خوایە بە جیبریل پشتیوانی بکە))؟ ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: بەڵێ (گوێم لێ بوو).**

## ٦٩- بابُ أَصْحَابِ الحِرَابِ فِي المَسْجِدِ

٤٥٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْن الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا عَلَى بَابِ حُجْرَتِي، وَالحَبَشَةُ يَلْعَبُونَ فِي المَسْجِدِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ، أَنْظُرُ إِلَى لَعِبِهِمْ[2].

## ٦٩- باسی دروستە تیربازەکان بچنە مزگەوتەوە

**٤٥٤- عائیشە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوام ﷺ لەبەردەم ژوورەکەی خۆمدا بینی، حەبەشییەکانیش (بە شمشێر و قەڵغان) لە مزگەوتدا یارییان**

---

[1] بڕوانە: ٣٢١٢، ٦١٥٢.

[2] بڕوانە: ٤٥٥، ٩٥٠، ٩٨٨، ٢٩٠٧، ٣٥٣٠، ٥١٩٠، ٥٢٣٦.

**دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پشتەماڵەکەی کردبووە پەردە بۆم، منیش سەیری یارییەکەیانم دەکرد (واتە: هیچ قسەی نەکرد) .**

٤٥٥- زَادَ إِبْرَاهِيمُ بْن الْمُنْذِرِ: حَدَّثَنَا ابن وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَالحبَشَةُ يَلْعَبُونَ بِحِرَابِهِمْ[1] .

**٤٥٥- (لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا) ئیبراهیمی کوڕی مونزیر دەڵێ: ئیبنو وەهب بۆی گێڕامەوە وتی: یونس بۆی گێڕامەوە لە ئیبنو شیهابەوە لە عورووەوە لە عائیشەوە ﵂ گێڕایەوە و ئەمەی لە فەرموودەکە زیاد کرد وتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی، وە حەبەشییەکانیش بە شمشێرەکانیان یارییان دەکرد.**

## ٧٠- بابُ ذِكْرِ البَيْعِ وَالشِّرَاءِ عَلَى المِنْبَرِ فِي المَسْجِدِ

٤٥٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: أَتَتْهَا بَرِيرَة تَسْأَلُهَا فِي كِتَابَتِهَا، فَقَالَتْ: إِنْ شِئْتَ أَعْطَيْتُ أَهْلَكِ وَيَكُونُ الوَلَاءُ لِي. وَقَالَ أَهْلُهَا: إِنْ شِئْتِ أَعْطَيْتِهَا مَا بَقِيَ- وَقَالَ سُفْيَانُ مَرَّة: إِنْ شِئْتِ أَعْتَقْتِهَا ويكُونُ الوَلَاءُ لَنَا- فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ذَكَّرَتْهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: «ابْتَاعِيهَا فَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّ الوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ». ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى المِنْبَرِ -وَقَالَ سُفْيَانُ مَرَّةً: فَصَعِدَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى المِنْبَرِ - فَقَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ؟! مَن اشْتَرَطَ شَرْطًا ليْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَلَيْسَ لَهُ، وَإِنِ اشْتَرَطَ مِائَةَ مَرَّةٍ». قَالَ عَلِيٌّ: قَالَ يَحْيَى. وَعَبْدُ الوَهَّابِ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ

---

[1] بڕوانە: ٤٥٤.

عَمْرَةَ. وَقَالَ جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ: عَنْ يَحْيَى قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ. رَوَاهُ مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَمْرَةَ، أَنَّ بَرِيرَةَ. وَلَمْ يَذْكُرْ صَعِدَ الْمِنْبَرَ[١].

## ٧٠- باسی ناوهێنانی کڕین و فرۆشتن لەسەر دوانگە لە مزگەوتدا

**٤٥٦- عەلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێ: سوفیان لە یەحیاوە ئەویش لە عەمرەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بەریرە هات بۆ لای عائیشە، داوای لێ کرد (یارمەتی بدات بۆ ئازادبوونی) لە نووسراوەکەیدا لەگەڵ خاوەنەکەیدا، عائیشەش وتی: ئەگەر دەتەوێ پارەی ئازادکردنەکەت دەدەم بە خاوەنەکەت، وە سەرپەرشتیارییەکەت[٢] بۆ من بێت، خاوەنەکەشی وتی: ئەگەر تۆ ویستت ئەوەی ماوە بیدەرێ - سوفیان جارێکیان وتی: ئەگەر ویستت ئازادی بکە، بەڵام سەرپەرشتیارییەکەی بۆ ئێمە بێت -، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات، ئەوەم بۆ باس کرد، فەرمووی: ((بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە بەڕاستی سەرپەرشتیاری بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردووە))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و چووە سەر دوانگە - سوفیان جارێکیان وتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر دوانگە-، وتی: ((ئەوە خەڵکانێك چییانە کۆمەڵە مەرجێك دادەنێن لە پەڕاوەکەی خوادا نییە؟! جا هەر کەس مەرجێ دانێ لە کتێبی خوادا نەبێ، ئەوە هیچی بۆ نییە با سەد مەرجیش دانێ))[٣]. عەلی دەڵێ: یەحیا و**

---

[١] بڕوانە: ١٤٩٣، ٢١٥٥، ٢١٦٨، ٢٥٣٦، ٢٥٦٠، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥، ٢٥٧٨، ٢٧١٧، ٢٧٢٦، ٢٧٢٩، ٢٧٣٥، ٥٠٩٧، ٥٢٧٩، ٥٢٨٤، ٥٤٣٠، ٦٧١٧، ٦٧٥١، ٦٧٥٤، ٦٧٥٨، ٦٧٦٠.

[٢] سەرپەرشتیاری کەنیزەک، یان کۆیلەی ئازادکراو ئەو پەیوەندییەیە دوای مردنیان هەرچیان هەبوو بۆ ئازادکەرەکەیەتی.

[٣] سەرنج: زانایان دەڵێن مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرمایشتە ئەوەیە نابێ کەس مەرجێک بەمەرج بگرێ لە مامەڵەکاندا کە پێچەوانە بێ لەگەڵ دەقێک لە دەقەکانی قورئاندا.

**عەبدولوەهاب دەگێڕنەوە لە یەحیاوە ئەویش لە عەمرەتەوە، وە جەعفەری کوڕی عەون لە یەحیاوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە عەمرەتم بیست وتی: لە عائیشەم بیست. مالیك گێڕاویەتەوە لە یەحیاوە، ئەویش لە عەمرەتەوە دەگێڕێتەوە، کە بەریرە باسی چوونە سەر دوانگەی نەکرد لە فەرموودەکەدا.**

## ٧١- بابُ التَّقاضِي وَالْمُلَازَمَةِ فِي المَسْجِدِ

٤٥٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ:حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ قَالَ:أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ كَعْبٍ أَنَّهُ تَقَاضَى ابن أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي المَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ فَنَادى: «يَا كَعْبُ». قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «ضَعْ مِنْ دَيْنِكَ هذا». وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ أَيِ: الشَّطرَ قَالَ: لَقَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «قُمْ فَاقْضِهِ»[1].

## ٧١- باسی داوای قەرزدانەوە

## لە قەرزدار و جیانەبوونەوە لێی لە مزگەوتدا

**٤٥٧- کەعب ﷺ دەڵێ: قەرزێکی لای ئیبنو ئەبو حەدرەد بوو، داوای قەرزدانەوەی کرد لێی لە مزگەوتدا، ئینجا دەنگیان ئەوەندە بەرز بۆیەوە بەرادمیەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی خۆیەوە گوێی لێ بوو، بۆیە هاتە دەرەوە بۆ لایان، جا بەشێکی پەردەی (دەرگای) ژوورەکەی لادا و بانگی کرد: ((ئەی کەعب!))، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێڕایەڵتم، فەرمووی:**

---

[1] بڕوانە: ٤٧١، ٢٤١٨، ٢٤٢٤، ٢٧٠٦، ٢٧١٠.

((بەشێك لە قەرزەكەت دابشكێنە))، جا ئاماژەی بۆ كرد كە نیوەی دابشكێنێ، كەعبیش وتی: بەدڵنیاییەوە ئەوا دامشكاند ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی (بە ئیبنو ئەبو حەدرەد): ((دە تۆش هەستە قەرزەكەی بدەرەوە)).

## ٧٢- بابُ كَنْسِ الْمَسْجِدِ وَالْتِقَاطِ الْخِرَقِ وَالْقَذَى وَالْعِيدَانِ

٤٥٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَجُلًا أَسْوَدَ -أَوِ امْرَأَةً سَوْدَاءَ- كَانَ يَقُمُّ الْمَسْجِدَ، فَمَاتَ، فَسَأَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْهُ، فَقَالُوا: مَاتَ. قَالَ: «أَفَلَا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي بِهِ، دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ» أَوْ قَالَ: «قَبْرِهَا» فَأَتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ[1].

## ٧٢- باسی گسكدانی مزگەوت و هەڵگرتنەوەی پەڕۆ و پووش و چیلكەدار (ی نێو مزگەوت)

٤٥٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پیاوێكی ڕەشپێست -یان ئافرەتێكی ڕەشپێست- مزگەوتی پاك دەكردەوە و گسكی دەدا، جا مرد، پێغەمبەریش ﷺ لەبارەیەوە پرسیاری كرد، هاوەڵان وتیان مردووە، فەرمووی: ((دەی بۆ ئێوە لە مردنی ئاگادارتان نەكردم؟ گۆڕی ئەو پیاوەم نیشان بدەن)) یان فەرمووی: ((گۆڕی ئەو ئافرەتە))، جا ڕۆیشتە سەر گۆڕەكەی و نوێژی لەسەر كرد.

---

[1] بڕوانە: ٤٦٠، ١٣٣٧.

## ٧٣- بابُ تَحْرِيمِ تِجَارَةِ الخَمْرِ فِي المَسْجِدِ

٤٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا أُنْزِلَ الآيَاتُ مِنْ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي الرِّبَا، خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى المَسْجِدِ، فَقَرَأَهُنَّ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ حَرَّمَ تِجَارَةَ الخَمْرِ[1].

## ٧٣- باسی حەڕامکردنی بازرگانی عارەق لە مزگەوتدا

**٤٥٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ چەند ئایەتەکەی سوورەتی بەقەرە دەربارەی ڕیبا دابەزێنرا، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە دەرەوە بۆ مزگەوت و ئەو ئایەتانەی خوێندەوە بۆ خەڵکی، پاشان بازرگانی عارەقی حەڕام کرد.**

## ٧٤- بابُ الخَدَمِ لِلْمَسْجِدِ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا ﴿٣٥﴾﴾ آل عمران. لِلْمَسْجِدِ يَخْدُمُهَا.

٤٦٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ وَاقِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ امْرَأَةً -أَوْ رَجُلًا- كَانَتْ تَقُمُّ المَسْجِدَ -وَلَا أُرَاهُ إِلَّا امْرَأَةً- فَذَكَرَ حَدِيثَ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى عَلَى قَبْرِهِ.

## ٧٤- باسی خزمەتکاری مزگەوت

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: مەبەست لە: (ئەوەی لە سکمدایە نەزرم کرد بۆ تۆ (خودا)یە و ئازادە)، واتە: بۆ خزمەتکردنی مزگەوتی بەیتولمەقدیس.**

---

[1] بڕوانە: ٢٠٨٤، ٢٢٢٦، ٤٥٤٠، ٤٥٤١، ٤٥٤٢، ٤٥٤٣.

٤٦٠- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئافرەتێك -یان پیاوێك - خزمەتی مزگەوتی دەکرد و پاکی دەکردەوە -دڵنیام کە ئافرەت بوو-، جا فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد لەسەر گۆڕەکەی.

## ٧٥- بَابُ الأَسِيرِ أَوِ الْغَرِيمِ يُرْبَطُ فِي الْمَسْجِدِ

٤٦١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا رَوْحٌ، وَمُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ عِفْرِيتًا مِنَ الجِنِّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ البَارِحَةَ -أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا- لِيَقْطَعَ عَلَيَّ الصَّلاَةَ، فَأَمْكَنَنِي اللَّهُ مِنْهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْبِطَهُ إِلَى سَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي المَسْجِدِ؛ حَتَّى تُصْبِحُوا وَتَنْظُرُوا إِلَيْهِ كُلُّكُمْ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ أَخِي سُلَيْمَانَ: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾﴾ ص. قَالَ رَوْحٌ: فَرَدَّهُ خَاسِئًا»[1].

## ٧٥- باسی (حوکمی) دیل یان قەرزدار لە مزگەوتدا ببەسترێتەوە

٤٦١- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان ئەمشەو دێوێکی جنۆکە پەلاماری دام -یان وتەیەکی لەو شێوەی فەرموو-، بۆ ئەوەی نوێژەکەم پێ ببڕێت، جا خوا زاڵی کردم بەسەریدا و گرتم، جا ویستم بیبەستمەوە بە پایەیەك بە پایەکانی مزگەوتەوە، هەتا ڕۆژ بکەنەوە و هەمووتان سەیری بکەن، بەڵام نزاکەی سولەیمانی برام ﷺ بیر کەوتەوە کە (دەڵێ: ئەی پەروەردگارم پاشایەتییەکی وام پێ بدە، کە لەدوای من بۆ کەس نەلوێ)).

[1] بڕوانە: ١٢١٠، ٣٢٨٤، ٣٤٢٣، ٣٤٢٣، ٤٨٠٨.

ڕەوح (یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دێوەکەی بە ڕیسوایی دەرکرد.

## ٧٦- بابُ الاغْتِسَالِ إِذَا أَسْلَمَ، وَرَبْطِ الأَسِيرِ أَيْضًا فِي الْمَسْجِدِ

وَكَانَ شُرَيْحٌ يَأْمُرُ الغَرِيمَ أَنْ يُحْبَسَ إِلَى سَارِيَةِ المَسْجِدِ

٤٦٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْن أَبِي سَعِيدٍ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ خَيْلًا قِبَلَ نَجْدٍ، فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ، يُقَالُ لَهُ ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ، فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي المَسْجِدِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَطْلِقُوا ثُمَامَةَ». فَانْطَلَقَ إِلَى نَخْلٍ قَرِيبٍ مِنَ المَسْجِدِ، فَاغْتَسَلَ ثُمَّ دَخَلَ المَسْجِدَ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إله إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ[1].

## ٧٦- باسی خۆشۆردنی کەسێک کاتێ موسوڵمان ببێ، هەروەها بەستنەوەی دیل لە مزگەوتدا

**شوڕەیح فەرمانی دەرکرد قەرزدار ببەسترێتەوە بە پایەی مزگەوتەوە.**

**٤٦٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چەند سوارێکی نارد ڕوو بە نەجد، ئینجا (گەڕانەوە و) پیاوێکیان لە هۆزی حەنیفە هێنا، ناوی سومامەی کوڕی ئوسال بوو، ئینجا بەستیانەوە بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای و فەرمووی: ((سومامە بکەنەوە))، ئەویش ڕۆیشت بۆ نێو باغێکی خورمای نزیك لە مزگەوت و خۆی شۆرد، پاشان هاتەوە بۆ مزگەوت، وتی:** (أَشْهَدُ أَنْ لَا إله إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ).

---

[1] بڕوانە: ٤٦٩، ٢٤٢٢، ٢٤٢٣، ٤٣٧٢.

## ٧٧- بابُ الخَيْمَةِ فِي المَسْجِدِ لِلْمَرْضَى وَغَيْرِهِمْ

٤٦٣- حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أُصِيبَ سَعْدٌ يَوْمَ الخَنْدَقِ فِي الأَكْحَلِ، فَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ خَيْمَةً فِي المَسْجِدِ لِيَعُودَهُ مِنْ قَرِيبٍ، فَلَمْ يَرُعْهُمْ -وَفِي المَسْجِدِ خَيْمَةٌ مِنْ بَنِي غِفَارٍ- إِلَّا الدَّمُ يَسِيلُ إِلَيْهِمْ، فَقَالُوا:يا أَهْلَ الخَيْمَةِ، مَا هَذَا الَّذِي يَأْتِينَا مِنْ قِبَلِكُمْ؟ فَإِذَا سَعْدٌ يَغْذو جُرْحُهُ دَمًا، فَمَاتَ فِيهَا[1].

## ٧٧- باسی (دروستە) خێوەتهەڵدان لە مزگەوتدا بۆ نەخۆش و غەیری نەخۆش

**٤٦٣- عائیشە ﵂ دەڵێ: سەعد ﵁ لە ڕۆژی جەنگی خەندەقدا تیرێك دابووی لە شادەماری باڵی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا خێوەتێکی بۆ هەڵدابوو، تا زوو زوو سەردانی بکات، وە لە مزگەوتدا خێوەتێکی هۆزی غیفاریشی تێدا بوو، لە پڕێکا چۆڕاگەی خوێن هات بۆ نێو خێوەتەکەیان، زۆر ترسان، وتیان: هۆ خەڵکی نێو خێوەتەکە ئەم خوێنە چییە لەلای ئێوەوە دێت بۆ لای ئێمە؟ جا کە سەیریان کرد سەعدە برینەکەی خوێنی لەبەر دەڕوا، ئیدی هەر لەو خێوەتەدا مرد.**

## ٧٨- بابُ إِدْخَالِ البَعِيرِ فِي المَسْجِدِ لِلْعِلَّةِ

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: طَافَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى بَعِيرٍ[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٨١٣، ٣٩٠١، ٤١١٧، ٤١٢٢.

[2] بڕوانە: ١٦١٢.

٤٦٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ابْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنِّي أَشْتَكِي. قَالَ: «طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ». فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ البَيْتِ، يَقْرَأُ بِالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ[1].

## ٧٨- باسی وشتر بردنە مزگەوتەوە لەبەر پێویستییەک

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەسواری وشترەوە تەوافی کەعبەی کرد.**

**٤٦٤- ئومو سەلەمە ﷺ دەڵێ: لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵام کرد کە من نەخۆشم، فەرمووی: ((لەدوای خەڵکەوە تەواف بکە بەسواری وڵاخەکەتەوە))، منیش تەوافم کرد لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەپەنا کەعبەدا نوێژی دەکرد، سوورەتی (والطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ)ی دەخوێند.**

## ٧٩- بابٌ

٤٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسٌ أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ خَرَجَا مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ ﷺ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، وَمَعَهُمَا مِثْلُ المِصْبَاحَيْنِ يُضِيآنِ بَيْنَ أَيْدِيهِمَا، فَلَمَّا افْتَرَقَا صَارَ مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا وَاحِدٌ حَتَّى أَتَى أَهْلَهُ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٦١٩، ١٦٢٦، ١٦٣٣، ٤٨٥٣.

[2] بڕوانە: ٣٦٣٩، ٣٨٠٥ ٥٥٧.

## ٧٩- باسێک

٤٦٥- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، دوو پیاو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە شەوێکی تاریکدا (لە مزگەوت) لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوون، دەرچوون و ڕووناکییەکیان پێ بوو، بە وێنەی دوو چرا بەردەمیانی ڕۆشن دەکردەوە[1]، جا کاتێ لە یەکدی جیا بوونەوە، لەگەڵ هەر یەکێکیاندا ڕووناکییەکی لەگەڵدا بوو، هەتا گەیشتەوە ماڵەوە.

## ٨٠- بابُ الخَوْخَةِ وَالمَمَرِّ فِي المَسْجِدِ

٤٦٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو النَّضْرِ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ مَا عِنْدَ اللَّهِ». فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ ﷺ، فَقُلْتُ فِي نَفْسِي: مَا يُبْكِي هذا الشَّيْخَ؟ إِنْ يَكُنِ اللَّهُ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ مَا عِنْدَ اللَّهِ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هُوَ العَبْدَ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ أَعْلَمَنَا. قَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ لَا تَبْكِ، إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَمَالِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَخِذًا خَلِيلًا مِنْ أُمَّتِي لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ، ولكن أُخُوَّةُ الإِسْلَامِ وَمَوَدَّتُهُ، لَا يَبْقَيَنَّ فِي المَسْجِدِ بَابٌ إِلا سُدَّ إِلَّا بَابُ أَبِي بَكْرٍ»[2].

## ٨٠- باسی دەرگا و دەروازە و ڕێڕەو لە مزگەوتدا

٤٦٦- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتاری دا و فەرمووی: ((بێگومان خوای گەورە بەندەیەکی لە نێوان دونیا و ئەوەی لای خۆیەتی

---

[1] لەبەر ڕێزگرتنی ئەو دوو هاوەڵە لەلایەن خودای گەورەوە. بڕوانە: فتح الباري: ٧٣٤/٢.

[2] بڕوانە: ٣٦٥٤، ٣٩٠٤.

**سەرپشك كرد، بەندەكەش ئەوەی لای خوای هەڵبژارد))، ئینجا ئەبو بەكر ﷛ گریا، منیش لە دڵی خۆمدا وتم: چی وا لەم پیاوە پیر و ڕیشسپییە دەكات بگری؟! ئەگەر خوا بەندەیەك سەرپشك بكات لە نێوان دونیا و ئەوەی لای خوایە، جا بەندەكەش ئەوەی لای خوایە هەڵبژێری، جا بەندەكە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، وە ئەبو بەكر لە هەمووومان زاناتر بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەبو بەكر مەگری، بێگومان ئەبو بەكر لە هەموو كەس چاكەی زیاتر بەسەر منەوە هەیە، بەهاوڕێیەتی و بەماڵ و سامانی، وە ئەگەر لەنێو ئومەتمدا كەسێكم بكردایە بە دۆستی گیانیبەگیانی خۆم، بێگومان ئەبو بەكرم هەڵدەبژارد، بەڵكوو برایەتی ئیسلامی و خۆشەویستی هەیە لە نێوانماندا، هەر دەرگایەك لە مزگەوتدایە دەبێ دابخرێ، جگە لە دەرگای ماڵی ئەبو بەكر)).**

٤٦٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الجُعْفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ يَعْلَى بْنَ حَكِيمٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ الذِي مَاتَ فِيهِ عَاصِبٌ رَأْسَهُ بِخِرْقَةٍ، فَقَعَدَ عَلَى المِنْبَرِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَمَنَّ عَلَيَّ فِي نَفْسِهِ وَمَالِهِ مِنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي قُحَافَةَ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَخِذًا مِنَ النَّاسِ خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا، ولكن خُلَّةُ الإِسْلَامِ أَفْضَلُ، سُدُّوا عَنِّي كُلَّ خَوْخَةٍ فِي هذا المَسْجِدِ غَيْرَ خَوْخَةِ أَبِي بَكْرٍ»[1].

**٤٦٧- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷟ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشییەدا كە پێیەوە وەفاتی كرد، لەماڵ هاتە دەرەوە سەری بە پارچەقوماشێك پێچابوو، ئینجا لەسەر دوانگەكە دانیشت، ئەوسا سوپاس و ستاییشی خوای كرد، پاشان فەرمووی: ((بێگومان كەس نییە لەنێو هاوەڵاندا چاكەی زیاتر بێ بەسەرمەوە**

---

[1] بڕوانە: ٣٦٥٦، ٣٦٥٧، ٦٧٣٨.

لە ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافە، چ بەگیانی چ بە سامانی، وە ئەگەر من (جگە لە خوا) لەنێو خەڵکدا کەسێکم بکردایە بە دۆستی گیانیبەگیانی خۆم، ئەوە ئەبو بەکرم هەڵدەبژارد، بەڵام دۆستایەتی ئیسلام چاکترە، هەموو دەرگا بچووکەکان دابخەن کە لەسەر مزگەوتە، جگە لە دەرگاکەی ماڵی ئەبو بەکر)).

## ٨١- بابُ الأَبْوَابِ وَالغَلَقِ لِلْكَعْبَةِ وَالمَسَاجِدِ

قَالَ البخاري: قَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ: ثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابن جُرَيْجٍ قَالَ: قَالَ لِي ابن أَبِي مُلَيْكَةَ:يا عَبْدَ المَلِكِ، لَوْ رَأَيْتَ مَسَاجِدَ ابن عَبَّاسٍ وَأَبْوَابَهَا.

٤٦٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ وَقُتَيْبَةُ قَالَا: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدِمَ مَكَّةَ، فَدَعَا عُثْمَانَ بْنَ طَلْحَةَ، فَفَتَحَ البَابَ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ وَبِلَالٌ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ، ثُمَّ أَغْلَقَ البَابُ، فَلَبِثَ فِيهِ سَاعَةً، ثُمَّ خَرَجُوا. قَالَ ابن عُمَرَ: فَبَدَرْتُ فَسَأَلْتُ بِلَالًا فَقَالَ: صَلَّى فِيهِ. فَقُلْتُ: فِي أَيٍّ؟ قَالَ: بَيْنَ الأُسْطُوَانَتَيْنِ. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَذَهَبَ عَلَيَّ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى[1].

## ٨١- باسی دەرگا و قفڵ بۆ کەعبە و مزگەوتەکان (پێویستە)

ئیمام بوخاری دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی موحەممەد بۆی گێڕامەوە وتی: سوفیان لە ئیبنو جورەیجەوە بۆی گێڕامەوە وتی: ئیبنو ئەبو مولەیکە وتی: ئەی عەبدولمەلیك! خۆزگە مزگەوت و دەرگاکانی عەبدوڵای کوڕی عەباست ببینیایە (لەبەر ڕێکوپێکی و پاکوخاوێنی سەرت سووڕ دەما).

---

[1] بڕوانە: ٣٩٧.

**٤٦٨- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەککە و عوسمانی کوڕی تەلحەی بانگ کرد، دەرگای کەعبەی کردەوە[١]، پێغەمبەر ﷺ و بیلال و ئوسامە و عوسمانی کوڕی تەلحە چوونە ژوورەوە، پاشان دەرگاکە داخرا و ماوەیەك پێغەمبەر ﷺ لەنێو کەعبەدا مایەوە، پاشان هاتنە دەرەوە، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: بەزوویی چووم پرسیارم لە بیلال کرد (ئایا پێغەمبەر ﷺ لەنێو کەعبەدا نوێژی کرد؟)، وتی: بەڵێ نوێژی تێدا کرد، وتم: لە چ شوێنێکیدا؟ وتی: لە نێوان دوو پایەکەدا، عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێ: لەبیرم چوو پرسیاری لێ بکەم چەند ڕکاتی کرد.**

## ٨٢- بَابُ دُخُولِ المُشْرِكِ المَسْجِدَ

٤٦٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَيْلًا قِبَلَ نَجْدٍ، فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ، يُقَال لَهُ: ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ، فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي المَسْجِدِ[٢].

## ٨٢- باسی چوونەژوورەوەی بتپەرست بۆ نێو مزگەوت (دروستە؟)

**٤٦٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند سوارێکی نارد ڕوو بە نەجد، ئینجا (لە گەڕانەوەیاندا) پیاوێکیان لە هۆزی حەنیفە هێنا، پێی دەگوترا: سومامەی کوڕی ئوسال، ئینجا بەستیانەوە بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە.**

---

[١] چونکە کلیلی دەرگای کەعبە لای عوسمانی کوڕی تەلحە بوو.

[٢] بڕوانە: ٤٦٢.

## ٨٣- بابُ رَفعِ الصَّوْتِ فِي المَسَاجِدِ

٤٧٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الجُعَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ خُصَيْفَةَ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كُنْتُ قَائِمًا فِي المَسْجِدِ فَحَصَبَنِي رَجُلٌ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، فَقَالَ: اذْهَبْ فَأْتِنِي بِهَذَيْنِ. فَجِئْتُهُ بِهِمَا. قَالَ: مَنْ أَنْتُمَا -أَوْ مِنْ أَينَ أَنْتُمَا؟- قَالَا: مِنْ أَهْلِ الطَّائِفِ. قَالَ: لَوْ كُنْتُمَا مِنْ أَهْلِ البَلَدِ لأَوْجَعْتُكُمَا، تَرْفَعَانِ أَصْوَاتَكُمَا فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

## ٨٣- باسی (حوکمی) دەنگبەرزکردنەوە لەنێو مزگەوتدا (دروستە یان نا؟)

**٤٧٠- سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: من لە مزگەوتدا وەستابووم، پیاوێك پیچکەبەردێکی تێ گرتم، کە سەیرم کرد دەبینم عومەری کوڕی خەتابە ﷺ، ئینجا وتی: بڕۆ ئەو دوو پیاوەم بۆ بێنە، منیش هێنام بۆی وتی: ئێوە کێن؟ -یان ئێوە خەڵکی کوێن؟- وتیان: خەڵکی تائیفین، وتی: ئەگەر خەڵکی ئەم شارە بوونایە لێدانێکی چاکم دەکردن، چۆن لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەنگ بەرز دەکەنەوە.**

٤٧١- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابن وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، عَنِ ابن شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَقَاضَى ابن أَبِي حَدرَدٍ دَيْنًا لَهُ عَلَيْهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي المَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ وَنَادَى: «يَا كَعْبُ بْنَ مَالِكٍ،يا كَعْبُ». قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَأَشَارَ بِيَدِهِ أَنْ ضَعِ الشَّطْرَ مِنْ دَيْنِكَ. قَالَ كَعْبٌ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُمْ فَاقْضِهِ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٤٥٧.

٤٧١- عەبدوڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە کە کەعبی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قەرزێکی لای ئیبنو ئەبو حەدرەد بوو، داوای دانەوەی کرد لێی لە مزگەوتدا، جا دەنگیان بەرز بۆیەوە، بەرادەیەکی وا پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەوە گوێی لێ بوو، بۆیە هاتە دەرەوە بۆ لایان، هەتا بەشێکی پەردەی (دەرگای) ژوورەکەی لادا و بانگی کرد: ((ئەی کەعبی کوڕی مالیك! ئەی کەعب!))، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێڕایەڵتم و لە خزمەتدام، جا بە دەستی ئاماژەی کرد کە نیوەی قەرزەکەت دابشکێنە، کەعبیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵنیاییەوە ئەوە دامشکاند، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (بە ئیبنو ئەبو حەدرەد): ((هەستە تۆش قەرزەکەی بدەرەوە)).

## ٨٤- بابُ الحِلَقِ وَالْجُلُوسِ فِي المَسْجِدِ

٤٧٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ المُفَضَّلِ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ عَلَى المِنْبَرِ: مَا تَرى فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ؟ قَالَ: .مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ الصُّبْحَ صَلَّى وَاحِدَةً، فَأَوْتَرَتْ لَهُ مَا صَلَّى. وَإِنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ وِتْرًا، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِهِ[1].

## ٨٤- باسی دانیشتن بەبازنەیی و دانیشتن لە مزگەوتدا (دروستە)

٤٧٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە بوو، پیاوێك پرسیاری لێ کرد دەربارەی شەونوێژ ڕات چییە؟ فەرمووی: ((دوو ڕکات دوو ڕکات (بکرێ)، جا ئەگەر ترسی نوێژی بەیانی بوو یەك ڕکات (ویتر)

[1] بڕوانە: ٤٧٣، ٩٩٠، ٩٩٣، ٩٩٥، ٩٩٨، ١١٣٧.

بکات، ئەوە ئەو نوێژانە کردوویەتی بۆی دەکات بە تاك)). (نافیع دەڵێ:) عەبدوڵای کوڕی عومەر دەیوت: با کۆتا نوێژتان ویتر بێت، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەوە کردووە.

٤٧٣- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهْوَ يَخْطُبُ، فَقَالَ: كَيفَ صَلَاةُ اللَّيلِ؟ فَقَالَ: «مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ، تُوتِرُ لَكَ مَا قَدْ صَلَّيْتَ». قَالَ الوَلِيدُ بْنُ كَثِيرٍ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ أَنَّ ابن عُمَرَ حَدَّثَهُمْ أَنَّ رَجُلًا نَادى النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ فِي المَسْجِدِ[1].

٤٧٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، پیاوێك هات بۆ لای وتی: شەونوێژ چۆنە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دوو ڕکات دوو ڕکات بیکە، جا ئەگەر ترسایت نوێژی بەیانی ببێت، ئەوە یەك ڕکات بکە، ئەوە ئەو نوێژانەی کردووتە هەمووی دەکات بە ویتر)). وەلیدی کوڕی کەسیر وتی: عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵا بۆی گێڕامەوە کە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕاونەتەوە: کە لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا بوو، پیاوێك بانگی کرد[2].

٤٧٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّ أَبَا مُرَّةَ -مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ- أَخبَرَهُ عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي المَسْجِدِ فَأَقْبَلَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَذَهَبَ وَاحِدٌ، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأى فُرْجَةً فَجَلَسَ، وَأَمَّا الآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: «أَلا أُخْبِرُكُمْ

[1] بڕوانە: ٤٧٢.

[2] لەبری ئەوەی: (لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، پیاوێک هات بۆ لای)، کە لە گێڕانەوەکەی پێشوودا هاتووە.

عَنِ الثَّلَاثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوى إِلَى اللَّهِ، فَآوَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَا، فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ، فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ»[1].

**٤٧٤- ئەبو واقیدی لەیسی ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا بوو، سێ کەس هاتن، ئینجا دووانیان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، یەکێکیان ڕۆیشت، جا یەکێك لەو دووانەی کە هاتن، لە نێوان دوو کەسدا بۆشاییەکی بینی تێیدا دانیشت، ئەوەی دیکەیان لەپشتیانەوە دانیشت، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێ بۆیەوە، فەرمووی: ((هەواڵتان بدەمێ دەربارەی ئەم سێ کەسە؟ یەکێکیان پەنای هێنا بۆ لای خوا، خواش وەریگرت و پەنای دا، دووەمیشیان شەرمی کرد خواش شەرمکردنەکەی لێ وەرگرت، بەڵام سێیەمیان پشتی هەڵکرد، بۆیە خواش گوێی پێ نەدا)).**

## ٨٥- بابُ الاسْتِلْقَاءِ فِي الْمَسْجِدِ وَمَدِّ الرِّجْلِ

٤٧٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُسْتَلْقِيًا فِي الَمسْجِدِ، وَاضِعًا إِحْدى رِجْلَيْهِ عَلَى الأخرى. وَعَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الُمسَيَّبِ قَالَ: كَانَ عُمَرُ وَعُثْمَانُ يَفْعَلَانِ ذَلِكَ[2].

## ٨٥- باسی بە پشتدا پاڵکەوتن لە مزگەوتدا و قاچدرێژکردن (دروستە)

**٤٧٥- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامەیەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینی لە مزگەوتدا بە پشتدا پاڵ کەوتبوو، قاچێکی خستبووە سەر قاچەکەی**

[1] بڕوانە: ٦٦.

[2] بڕوانە: ٥٩٦٩، ٦٢٨٧.

دیکەی. ئیبنو شیهاب لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عومەر و عوسمانیش ﷺ وایان دەکرد (واتە: بە پشتدا پاڵ دەکەوتن و قاچیان دەخستە سەر قاچ).

## ٨٦- بابُ المَسْجِدِ يَكُونُ فِي الطَّرِيقِ مِنْ غَيرِ ضَرَرٍ بِالنَّاسِ

وَبِهِ قَالَ الحَسَنُ وَأَيُّوبُ وَمَالِكٌ.

٤٧٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُقَيْلٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ- قَالَتْ: لَمْ أَعْقِلْ أَبَوَيَّ إِلاَّ وَهُمَا يَدِينَانِ الدِّينَ، وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْنَا يَوْمٌ إِلاَّ يَأْتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ طَرَفَيِ النَّهَارِ بُكْرَةً وَعَشِيَّةً، ثُمَّ بَدَا لأَبِي بَكْرٍ فَابْتَنَى مَسْجِدًا بِفِنَاءِ دَارِهِ، فَكَانَ يُصَلِّي فِيهِ وَيَقْرَأُ القُرْآنَ، فَيَقِفُ عَلَيْهِ نِسَاءُ المُشْرِكِينَ، وَأَبْنَاؤُهُمْ يَعْجَبُونَ مِنْهُ وَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَجُلًا بَكَّاءً لاَ يَمْلِكُ عَيْنَيْهِ إِذَا قَرَأَ القُرْآنَ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ أَشْرَافَ قُرَيْشٍ مِنَ المُشْرِكِينَ[1].

## ٨٦- باسی (دروستکردنی) مزگەوت لە ڕێگادا (دروستە) ئەگەر زیان نەگەیەنێ بە خەڵک

ئەمە ڕای حەسەن و ئەیوب و مالیکە.

٤٧٦- عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: فامم نەکردوٚتەوە کە من هەر دایك و باوکم بە باوەڕدار بە ئایینی ئیسلام دیوە، وە هیچ ڕۆژێك بەسەرماندا تێ نەپەڕیوە، کە پێغەمبەری خوای ﷺ لەمسەر و ئەوسەری ڕۆژەوە بەیانی و ئێوارە سەرمان لێ نەدا، پاشان ئەبو بەکر ڕایەکی بۆ پەیدا بوو، مزگەوتێکی دروست کرد

---

[1] بڕوانە: ٢١٣٨، ٢٢٦٣، ٢٢٦٤، ٢٢٩٧، ٣٩٠٥، ٤٠٩٣، ٥٨٠٧، ٦٠٧٩.

له بۆشایی پاڵ ماڵەكەیدا، جا نوێژی تێدا دەكرد و قورئانی تێدا دەخوێند، ئینجا ئافرەت و منداڵانی بتپەرستان لایدا دەوەستان، لایان سەیر بوو و تەماشایان دەكرد، ئەبو بەكریش پیاوێكی گرینۆك بوو، كاتێك قورئانی بخوێندایە، فرمێسك به چاوەكانیدا دەهاتە خوارەوە و خۆی بۆ ڕانەدەگیرا، بۆیه ئەو كارە سەرانی بتپەرستانی قورەیشی زۆر ترساند.

## ٨٧- بابُ الصَّلاَةِ فِي مَسْجِدِ السُّوقِ

وَصَلَّى ابن عَوْنٍ فِي مَسْجِدٍ فِي دَارٍ يُغْلَقُ عَلَيْهِمُ البَابُ.

٤٧٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلاَةُ الجَمِيعِ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلاَتِهِ فِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وَأَتَى المَسْجِدَ، لاَ يُرِيدُ إِلاَّ الصَّلاَةَ، لَمْ يَخْطُ خُطْوَةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ خَطِيئَةً، حَتَّى يَدْخُلَ المَسْجِدَ، وَإِذَا دَخَلَ المَسْجِدَ كَانَ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَتْ تَحْبِسُهُ، وَتُصَلِّي -يَعْنِي: عَلَيْهِ- المَلاَئِكَةُ مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يُحْدِثْ فِيهِ»[1].

## ٨٧- باسی نوێژكردن له مزگەوتی بازاڕدا (دروستە)

ئیبنو عەون لەمزگەوتێكدا نوێژی كرد لەماڵێكدا بوو، دەرگاكەی دادەخرا لەسەریان.

٤٧٧- ئەبو هورەیرە ﵁ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كه فەرموویەتی: ((نوێژی بەكۆمەڵ پاداشتی زیاترە له نوێژی ماڵەوە و نوێژی بازاڕ بە بیست و

[1] بڕوانە: ١٧٦.

پێنج پلە، چونکە بەڕاستی ئەگەر کەسێکتان دەستنوێژ بگرێ بەجوانی و بڕوات بۆ مزگەوت، تەنها مەبەستی نوێژکردن بێت، هەر هەنگاوێك کە دەینێت، خوا بەهۆیەوە پلەیەکی بەرز دەکاتەوە، وە تاوانێکی لێ دەسڕێتەوە، هەتا دەڕواتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، وە ئەگەر ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ نێو مزگەوت، ئەوە هەر لە نوێژدایە هەتا بەهۆی نوێژەوە بمێنێتەوە، فریشتەکانیش داوای لێخۆشبوون دەکەن -واتە: بۆ ئەو کەسە-، هەتا لەو جێگایەی بێت کە نوێژی تێدا دەکات، (فریشتەکان دەڵێن:) خوایە لێی خۆش بە، خوایە بەزەییت پێیدا بێتەوە، (لەو دوعایانە بەردەوام دەبن) هەتا دەستنوێژی نەشکێت لەوێدا)).

## ٨٨- بابُ تَشْبِيكِ الأَصَابِعِ فِي المَسْجِدِ وَغَيْرِهِ

٤٧٨- ٤٧٩- حَدَّثَنَا حَامِدُ بْنُ عُمَرَ، عَنْ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، حَدَّثَنَا وَاقِدٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ -أَوِ ابْنِ عَمْرٍو-: شَبَّكَ النَّبِيُّ ﷺ أَصَابِعَهُ.

## ٨٨- باسی پەنجەی هەردوو دەست کردن بە نێو یەکدیدا لە مزگەوت و جێگەی دیکەشدا (دروستە)

٤٧٨- ٤٧٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر -یان عەبدوڵای کوڕی عەمر- ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنجەکانی کرد بە نێو یەکدیدا.

٤٨٠- وَقَالَ عَاصِمُ بْنُ عَلِيٍّ: حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ: سَمِعْتُ هَذَا الحَدِيثَ مِنْ أَبِي، فَلَمْ أَحْفَظْهُ، فَقَوَّمَهُ لِي وَاقِدٌ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي وَهُوَ يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو، كَيْفَ بِكَ إِذَا بَقِيتَ فِي حُثَالَةٍ مِنَ النَّاسِ، بِهَذَا»[1].

---

[1] بڕوانە: ٤٧٩.

**٤٨٠- عاصیمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: ئەم فەرموودەیەم لە باوکم بیست بەچاکی لەبەرم نەبوو، بۆیە واقید بۆی ڕاست کردمەوە، دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: لە باوکم بیست دەیوت: عەبدوڵا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدوڵای کوڕی عەمر حاڵت چۆنە ئەگەر لەنێو کۆمەڵێ خەڵکی هەرچی و پەرچیدا[١] بمێنیت؟))، وەك فەرموودەکەی پێشوو گێڕایەوە[٢].**

٤٨١- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ، يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا». وَشَبَّكَ أَصَابِعَهُ[٣].

**٤٨١- ئەبو مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمووی: ((بێگومان باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەك دیواری خانوو وایە، هەندێکی هەندێکی دیکەی بەیەکەوە بەهێز دەکات و دەبەستێتەوە))، ئینجا پەنجەکانی کرد بە نێو یەکدیدا.**

٤٨٢- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ شُمَيْلٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلاَتَيِ العَشِيِّ -قَالَ ابْنُ سِيرِينَ: سَمَّاهَا أَبُو هُرَيْرَةَ، وَلَكِنْ نَسِيتُ أَنَا - قَالَ: فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَ إِلَى خَشَبَةٍ مَعْرُوضَةٍ فِي المَسْجِدِ فَاتَّكَأَ عَلَيْهَا، كَأَنَّهُ غَضْبَانُ، وَوَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى اليُسْرَى، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، وَوَضَعَ خَدَّهُ الأَيْمَنَ عَلَى ظَهْرِ كَفِّهِ اليُسْرَى، وَخَرَجَتِ السَّرَعَانُ مِنْ أَبْوَابِ المَسْجِدِ فَقَالُوا:

---

[١] واتە: لەنێو خەڵکێکی تێکەڵ و پێکەڵدا .

[٢] وەک لەفەرموودەکەی پێشوودا وتی: پێغەمبەر ﷺ پەنجەکانی کرد بە نێو یەکدیدا.

[٣] بڕوانە: ٢٤٤٦، ٦٠٢٦.

قَصُرَتِ الصَّلاَةُ. وَفِي القَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَفِي القَوْمِ رَجُلٌ فِي يَدَيْهِ طُولٌ يُقَالُ لَهُ: ذُو اليَدَيْنِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَسِيتَ أَمْ قَصُرَتِ الصَّلاَةُ؟ قَالَ: «لَمْ أَنْسَ، وَلَمْ تُقْصَرْ». فَقَالَ: «أَكَمَا يَقُولُ ذُو اليَدَيْنِ». فَقَالُوا نَعَمْ. فَتَقَدَّمَ فَصَلَّى مَا تَرَكَ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ. فَرُبَّمَا سَأَلُوهُ ثُمَّ سَلَّمَ، فَيَقُولُ: نُبِّئْتُ أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ[1].

**٤٨٢- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی نوێژێکی نیوەڕۆ (یان عەسر)ی بۆ کردین -ئیبنو سیرین دەڵێ: ئەبو هوڕەیرە نوێژەکەی ناو برد، بەڵام من بیرم چوو- دەڵێ: جا دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، پاشان سەلامی دایەوە، جا هەڵسا و ڕۆیشت بۆ لای ئەو تەختەی کە لە مزگەوتدا دانرابوو، پاڵی دا پێیەوە، دەتوت ڕقی هەڵساوە، دەستی ڕاستی خستە سەر دەستی چەپی و پەنجەکانی کرد بە نێو یەکدیدا، گوڵمی ڕاستی خستە سەر پشتی دەستی چەپی، وە ئەوانەی بەپەلە بوون لە دەرگاکانی مزگەوتەوە ڕۆیشتنە دەرەوە و وتیان: نوێژ کورت بۆتەوە؟! ئەبو بەکر و عومەریش ﷺ لەنێو خەڵکەکەدا بوون، بەڵام ترسان و نەیانوێرا قسە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن، وە لەنێو خەڵکەکەدا پیاوێکی تێدا بوو دەستەکانی درێژ بوو، پێیان دەوت خاوەن دوو دەستە درێژەکە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبیرت چوو (دوو ڕکاتت کرد)، یان نوێژ کورت بۆتەوە؟ فەرمووی: ((نە لەبیرم چووە و نە نوێژیش کورت بۆتەوە!)) ئینجا فەرمووی: ((ئایا بەم جۆرەیە کە خاوەن دوو دەستە درێژەکە دەیڵێ؟))، ئەوانیش وتیان: بەڵێ وایە، ئینجا پێش خەڵکەکە کەوت و ئەوەی مابوو لە نوێژەکە کردی، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان الله أکبری کرد و سوژدەی برد وەك سوژدەی دیکە یان درێژتر، پاشان سەری بەرز کردەوە و الله**

---

[1] بڕوانە: ٧١٤، ٧١٥، ١٢٢٧، ١٢٢٨، ١٢٢٩، ٦٠٥١، ٧٢٥٠.

أكبرى كرد، جا سوژدەیەكی دیكەی وەك سوژدەی پێشوو یان درێژتر، پاشان سەری بەرز كردەوە و الله أكبرى كرد، جا وا بزانم پرسیاریان لە ئیبنو سیرین كرد لە فەرموودەكەدا: (پاشان سەلامی دایەوە) هەبوو؟ ئەویش دەڵێ: هەواڵم پێ دراوە كە عیمرانی كوڕی حوصەین وتی: پاشان سەلامی دایەوە.

## ٨٩- بَابُ المَسَاجِدِ التي عَلَى طُرُقِ المَدِينَةِ والمَوَاضِعِ اليي صَلَّى فِيهَا النَّبِيُّ ﷺ

٤٨٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ المُقَدَّمِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: رَأَيْتُ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يَتَحَرَّى أَمَاكِنَ مِنَ الطَّرِيقِ فَيُصَلِّي فِيهَا، وَيُحَدِّثُ أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يُصَلِّي فِيهَا، وَأَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي فِي تِلْكَ الأَمْكِنَةِ. وَحَدَّثَنِي نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي فِي تِلْكَ الأَمْكِنَةِ. وَسَأَلْتُ سَالِمًا، فَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ وَافَقَ نَافِعًا فِي الأَمْكِنَةِ كُلِّهَا، إِلاَّ أَنَّهُمَا اخْتَلَفَا فِي مَسْجِدٍ بِشَرَفِ الرَّوْحَاءِ.

## ٨٩- باسی ئەو مزگەوتانەی لەسەر ڕێگای مەدینەدا بوون، وە ئەو شوێنانەی كە پێغەمبەر ﷺ نوێژی تێدا كردوون

٤٨٣- مووسای كوڕی عوقبە دەڵێ: سالیمی كوڕی عەبدوڵام بینی دەگەڕا بەدوای چەند شوێنێكدا لە ڕێگادا و نوێژی دەكرد تێیدا، وە دەیوت: عەبدوڵای باوكی لەو شوێنانەدا نوێژی دەكرد و دەیوت: ئەو پێغەمبەری ﷺ دیوە لەو جێگایانەدا نوێژی دەكرد. (مووسای كوڕی عوقبە دەڵێ:) نافیع بۆی گێڕامەوە لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ كە ئەو لەو جێگایانەدا نوێژی دەكرد، وە پرسیارم لە سالیم كرد، وا دەزانم لە هەموو ئەو جێگایانەدا لەگەڵ نافیعدا یەكقسە بوون، تەنها لە مزگەوتی دێی (شَرَف الرَّوْحَاء) نەبێت، ڕایان جیا بوو.

٤٨٤- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَنْزِلُ بِذِى الْحُلَيْفَةِ حِينَ يَعْتَمِرُ، وَفِي حَجَّتِهِ حِينَ حَجَّ، تَحْتَ سَمُرَةٍ فِي مَوْضِعِ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَكَانَ إِذَا رَجَعَ مِنْ غَزْوٍ كَانَ فِي تِلْكَ الطَّرِيقِ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ هَبَطَ مِنْ بَطْنِ وَادٍ، فَإِذَا ظَهَرَ مِنْ بَطْنِ وَادٍ أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِي عَلَى شَفِيرِ الْوَادِي الشَّرْقِيَّةِ، فَعَرَّسَ ثَمَّ حَتَّى يُصْبِحَ، لَيْسَ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِحِجَارَةٍ، وَلاَ عَلَى الأَكَمَةِ الَّتِي عَلَيْهَا الْمَسْجِدُ، كَانَ ثَمَّ خَلِيجٌ يُصَلِّي عَبْدُ اللَّهِ عِنْدَهُ، فِي بَطْنِهِ كُثُبٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَمَّ يُصَلِّي، فَدَحَا السَّيْلُ فِيهِ بِالْبَطْحَاءِ حَتَّى دَفَنَ ذَلِكَ الْمَكَانَ الذِي كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي فِيهِ[1].

**٤٨٤- نافیع دەڵێ عەبدوڵا ﵁ هەواڵی پێ داوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ عەمرەی بکردایە، یان لە حەجدا کاتێ کە حەجی بکردایە، هەمیشە لە** (ذي الحليفة) **لای دەدا، لەژێر درەختی سەمووڕەدا[2] لە جێگای ئەو مزگەوتەی لە** (ذي الحليفة)**دایە، وە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە بگەڕایەتەوە لە غەزا لەو ڕێگایەوە یان حەج و عەمرەی بکردایە لەشیوی (عەقیقەوە) دەهاتە خوارەوە، کە لە شیوەکە دەردەچوو، لە شیوی بەتحادا وشترەکەی یەخ دەدا، کە دەکەوێتە قەراغی ڕۆژهەڵاتی عەقیقەوە، جا شەو لەوێ دەمایەوە تا ڕۆژ دەبۆیەوە، لەو مزگەوتە نەدەمایەوە کە لەسەر جێگایەکی بەردینە، هەروەها لەو گردۆڵکەش نەدەمایەوە کە مزگەوتێکی بەسەرەوەیە، لەوێدا شیوێکی قوڵ هەبوو، عەبدوڵا تێیدا نوێژی دەکرد، کە لەنێویدا چەند تەپۆڵکەیەکی لم هەبوو، پێغەمبەریش ﷺ کاتی خۆی لەوێدا نوێژی دەکرد، ئینجا لافاو لم و زیخی پاڵ پێوە ناوە بۆ نێو شیوەکە، هەتا وای لێ هاتووە ئەو شوێنەی کە عەبدوڵا نوێژی تێدا دەکرد، داپۆشرابوو بەو لم و زیخە.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٣٢، ١٥٣٣، ١٧٦٧، ١٥٧٥، ١٥٧٦، ١٧٩٩.

[2] درەختێکی گەورەی دڕکاوییە.

٤٨٥- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى حَيْثُ المَسْجِدُ الصَّغِيرُ الَّذِي دُونَ المَسْجِدِ الَّذِي بِشَرَفِ الرَّوْحَاءِ، وَقَدْ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَعْلَمُ المَكَانَ الَّذِي كَانَ صَلَّى فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ، يَقُولُ: ثَمَّ عَنْ يَمِينِكَ حِينَ تَقُومُ فِي المَسْجِدِ تُصَلِّي، وَذَلِكَ المَسْجِدُ عَلَى حَافَةِ الطَّرِيقِ اليُمْنَى، وَأَنْتَ ذَاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ، بَيْنَهُ وَبَيْنَ المَسْجِدِ الأَكْبَرِ رَمْيَةٌ بِحَجَرٍ أَوْ نَحْوُ ذَلِكَ.

**٤٨٥- وە (نافیع دەگێڕێتەوە) کە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لەو جێگایەدا نوێژی دەکرد کە مزگەوتێکی بچکۆلەی لێیە، کە نزیکە لەو مزگەوتەی لە گوندی شەرەفی ڕەوحایە، بێگومان عەبدوڵا ئەو شوێنەی دەزانی کە کاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ نوێژی تێدا دەکرد و دەیوت: ئەو مزگەوتە لەوێدا لەلای ڕاستی خۆتەوەیە، کاتێ لە مزگەوتەکەدا دەوەستی نوێژ بکەیت، ئەو مزگەوتە (ی نێوەڕاستی)ش لە قەراغی ڕاستی ڕێگاکەدایە، کاتێک لە مەدینەوە دەڕۆیت بۆ مەککە، نێوانی ئەم مزگەوتە و مزگەوتە گەورەکە بەردهاوێژێك یان نزیکی بەردهاوێژێك دەبێ.**

٤٨٦- وَأَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يُصَلِّي إِلَى العِرْقِ الَّذِي عِنْدَ مُنْصَرَفِ الرَّوْحَاءِ، وَذَلِكَ العِرْقُ انْتِهَاءُ طَرَفِهِ عَلَى حَافَةِ الطَّرِيقِ، دُونَ المَسْجِدِ الَّذِي بَيْنَهُ وَبَيْنَ المُنْصَرَفِ، وَأَنْتَ ذَاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ. وَقَدِ ابْتُنِيَ ثَمَّ مَسْجِدٌ، فَلَمْ يَكُنْ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي فِي ذَلِكَ المَسْجِدِ، كَانَ يَتْرُكُهُ عَنْ يَسَارِهِ وَوَرَاءَهُ، وَيُصَلِّي أَمَامَهُ إِلَى العِرْقِ نَفْسِهِ، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَرُوحُ مِنَ الرَّوْحَاءِ، فَلاَ يُصَلِّي الظُّهْرَ حَتَّى يَأْتِيَ ذَلِكَ المَكَانَ فَيُصَلِّي فِيهِ الظُّهْرَ، وَإِذَا أَقْبَلَ مِنْ مَكَّةَ فَإِنْ مَرَّ بِهِ قَبْلَ الصُّبْحِ بِسَاعَةٍ أَوْ مِنْ آخِرِ السَّحَرِ عَرَّسَ حَتَّى يُصَلِّيَ بِهَا الصُّبْحَ.

**٤٨٦- وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە نزیکی ئەو تەپۆلکە نوێژی دەکرد (کە پێی دەڵێن: (عرق الظبیة) لە کۆتایی ڕەوحادایە، کۆتایی ئەم یاڵە لە قەراغی ڕێگاکە کۆتایی دێت، لە نزیکی ئەو مزگەوتەی کە لە نێوان یاڵەکە و کۆتایی ڕەوحادایە کە (لە مەدینەوە) بڕۆی بۆ مەککە، بێگومان ئا لەوێدا مزگەوتێ**

دروست کرابوو، عەبدوڵا هەرگیز لەو مزگەوتەدا نوێژی نەدەکرد، بەڵکوو بەجێی دەهێلا دەکەوتە لای چەپیەوە، لەپشتیەوە لەبەردەم مزگەوتەکەوە ڕوو بە خودی یالی (عرق الظبية) نوێژی دەکرد، وە عەبدوڵا بەیانییان لە ڕەوحاوە دەکەوتە ڕێ و نوێژی نیوەڕۆی نەدەکرد، هەتا دەگەشتە ئەو شوێنە، ئینجا لەوێدا نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، وە ئەگەر لە مەککەوە بهاتایە، ئەگەر سەعاتێ پێش نوێژی بەیانی یان لە کۆتایی بەرەبەیاندا بەوێدا تێپەڕیبایە، شەو لەوێدا دەمایەوە هەتا نوێژی بەیانی لەوێدا دەکرد.

٤٨٧- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْزِلُ تَحْتَ سَرْحَةٍ ضَخْمَةٍ دُونَ الرُّوَيْثَةِ عَنْ يَمِينِ الطَّرِيقِ، وَوِجَاهَ الطَّرِيقِ فِي مَكَانٍ بَطْحٍ سَهْلٍ، حَتَّى يُفْضِيَ مِنْ أَكَمَةٍ دُوَيْنَ بَرِيدِ الرُّوَيْثَةِ بِمِيلَيْنِ، وَقَدِ انْكَسَرَ أَعْلاَهَا، فَانْثَنَى فِي جَوْفِهَا، وَهِيَ قَائِمَةٌ عَلَى سَاقٍ، وَفِي سَاقِهَا كُثُبٌ كَثِيرَةٌ.

٤٨٧-(نافیع دەڵێ) کە عەبدوڵا بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەژێر درەختێکی گەورەدا پێش ئەوەی بگەیتە گوندی ڕوەیسە لای دەدا، کە لەلای ڕاستی ڕێگەکە و ڕووبەڕوویەتی لە دەشتێکی فراواندا، لەو تەپۆڵکەوە دەست پێ دەکات کە دوو میل دوورە لەو شوێنەوە بەریدی ڕوەیسەی لێ دادەبەزێت، ئەو تەپۆڵکەیەش بەشی سەرەوەی نەماوە هاتۆتە خوارەوە بۆ نێو تەپۆڵکەکە، جا ئەو تەپۆڵکەیە وەك دیوار ڕێك بەپێوەیە و وەستاوە، لە بنیشیدا لمی زۆر لە شێوەی تەپۆڵکەی بچووکدا هەبوو.

٤٨٨- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي طَرَفِ تَلْعَةٍ مِنْ وَرَاءِ العَرْجِ وَأَنْتَ ذَاهِبٌ إِلَى هَضْبَةٍ عِنْدَ ذَلِكَ المَسْجِدِ قَبْرَانِ أَوْ ثَلاَثَةٌ، عَلَى القُبُورِ رَضْمٌ مِنْ حِجَارَةٍ عَنْ يَمِينِ

الطَّرِيقِ، عِنْدَ سَلِمَاتِ الطَّرِيقِ، بَيْنَ أُولَئِكَ السَّلِمَاتِ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَرُوحُ مِنَ العَرْجِ بَعْدَ أَنْ تَمِيلَ الشَّمْسُ بِالهَاجِرَةِ، فَيُصَلِّي الظُّهْرَ فِي ذَلِكَ المَسْجِدِ.

**٤٨٨- (نافیع دەڵێ:) هەروەها عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە قەراغی شوێنلافاوێکدا نوێژی کرد، کە لە پشت گوندی عەرجەوەیە، کە دەڕۆی بۆ لای ئەو گردەی لای ئەو مزگەوتەی دوو یان سێ گۆڕ هەیە، گۆڕەکان کۆمەڵەبەردێکی گەورەیان بە سەرەوەیە، کە لەلای ڕاستی ڕێگاکەوەن، لەلای درەختەکانی (یان تاوێرەبەردەکانی) ئەم لا و لای ڕێگاکەدا لەنێو ئەو درەختانەوە یان تاوێرانەوە، دوای ئەوەی خۆر لا دەدا لە نێوەڕاستی ئاسمان، بە قرچەی گەرما عەبدولا لە عەرەجەوە دەڕۆیشت و نوێژی نیوەڕۆی لەو مزگەوتە دەکرد.**

٤٨٩- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَزَلَ عِنْدَ سَرَحَاتٍ عَنْ يَسَارِ الطَّرِيقِ، فِي مَسِيلٍ دُونَ هَرْشَى، ذَلِكَ المَسِيلُ لاَصِقٌ بِكُرَاعِ هَرْشَى، بَيْنَهُ وَبَيْنَ الطَّرِيقِ قَرِيبٌ مِنْ غَلْوَةٍ، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي إِلَى سَرْحَةٍ، هِيَ أَقْرَبُ السَّرَحَاتِ إِلَى الطَّرِيقِ، وَهْيَ أَطْوَلُهُنَّ.

**٤٨٩- (نافیع دەڵێ:) عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لای ئەو درەختە گەورانەدا دادەبەزی کە لەلای چەپی ڕێگاکەن، لە شوێنلافاوێکدا نزیکی یاڵ و گەردەنەی هەرشا، ئەو شوێنلافاوە نووساوە بەدامێنی هەرشاوە، لە نێوان ئەو و ڕێگەکەدا نزیکی تیرهاوێژێك دەبێ، وە عەبدولاّ لەلای درەختێك لەو درەختانە نوێژی دەکرد کە نزیکترین ئەو درەختانە بوو لە ڕێگەکەوە، لە هەمووشیان درێژتر بوو.**

٤٩٠- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْزِلُ فِي المَسِيلِ الَّذِي فِي أَدْنَى مَرِّ الظَّهْرَانِ قِبَلَ المَدِينَةِ، حِينَ يَهْبِطُ مِنَ الصَّفْرَاوَاتِ يَنْزِلُ فِي بَطْنِ ذَلِكَ المَسِيلِ عَنْ يَسَارِ

الطَّرِيقِ، وَأَنْتَ ذَاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ، لَيْسَ بَيْنَ مَنْزِلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ الطَّرِيقِ إِلاَّ رَمْيَةٌ بِحَجَرٍ.

**٤٩٠- وه (نافيع دەڵێ:) عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەو لافاوگە دادەبەزی کە لە خوارووی (مَرِّ الظَّهْرَانِ)ی ڕوو بە مەدینەیە، کاتێ دادەبەزی بۆ صەفراوات لەنێو لافاوگەکەدا دادەبەزێت، بەلای چەپی ڕێگەکەدا کە دەڕۆیت بۆ مەککە، لەنێوان شوێنی دابەزینەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕێگەکەدا بەردهاوێژێکە.**

٤٩١- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْزِلُ بِذِي طُوى وَيَبِيتُ حَتَّى يُصْبِحَ، يُصَلِّي الصُّبْحَ حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ، وَمُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ، لَيْسَ فِي المَسْجِدِ الَّذِى بُنِيَ ثَمَّ، وَلَكِنْ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ[1].

**٤٩١- وه (نافيع دەڵێ:) عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە (ذِي طُوى) دادەبەزی و شەو لەوێ دەمایەوە، تا بانگی بەیانی دەبوو، نوێژی بەیانی دەکرد کاتێ دەهات بۆ مەککە، ئەو نوێژگەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر تەپۆڵکەیەکی گەورە بوو، لەنێو ئەو مزگەوتەدا نییە کە لەوێدا دروست کراوە، بەڵکوو لە خوارەوەی ئەوەوەیە، لەسەر گردێکی گەورەدایە.**

٤٩٢- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَقْبَلَ فُرْضَتَي الجَبَلِ الَّذِي بَيْنَهُ وَبَيْنَ الجَبَلِ الطَّوِيلِ نَحْوَ الكَعْبَةِ، فَجَعَلَ المَسْجِدَ الَّذِي بُنِيَ ثَمَّ يَسَارَ المَسْجِدِ بِطَرَفِ الأَكَمَةِ، وَمُصَلَّى النَّبِيِّ ﷺ أَسْفَلَ مِنْهُ عَلَى الأَكَمَةِ السَّوْدَاءِ، تَدَعُ مِنَ الأَكَمَةِ عَشَرَةَ أَذْرُعٍ أَوْ نَحْوَهَا، ثُمَّ تُصَلِّي مُسْتَقْبِلَ الفُرْضَتَيْنِ مِنَ الجَبَلِ الذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَ الكَعْبَةِ.

---

[1] بڕوانە: ١٥٥٣، ١٥٥٤، ١٥٧٣، ١٥٧٤، ١٧٦٧، ١٧٦٩.

٤٩٢- وه (نافیع دەڵێ:) عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوه که پێغەمبەر ﷺ ڕووی کرده ئەو مله و گەردەنەی له شاخەکەدایه، که دەکەوێته نێوان پێغەمبەر ﷺ و شاخه درێژەکەی لای کەعبەوه، جا ئەو مزگەوتەی که لەوێدا دروست کراوه خستیه لای چەپی ئەو مزگەوتەی که له کۆتایی تەپۆڵکەکەدایه، نوێژگەکەی پێغەمبەر ﷺ له خواریەوه بوو لەسەر گردەڕەشەکه، له گردەکه ده گەز یان نزیکی ده گەز بەجێ دێڵی، پاشان ڕوو به مله و گەردەنەکه نوێژ بکه، که لەو شاخەدایه له نێوان تۆ و کەعبەدایه.

# أبوابُ سُترةِ المصلي

## ٩٠- بابُ سُتْرَةُ الإِمَامِ، سُتْرَةُ مَنْ خَلْفَهُ

٤٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الاحْتِلَامَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِمِنًى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ، فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ، وَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ، وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ، فَلَمْ يُنْكَرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ[1].

# باسەکانی سوترەی نوێژکەر

## ٩٠- باسی سوترەی پێشنوێژ (ئیمام)، کە سوترەشە بۆ نوێژکەرەکانی دوای خۆی

٤٩٣- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: بەسواری ماکەرێکەوە هاتم، لەوکاتەدا نزیك بووم لە باڵغبوونەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە مینا پێشنوێژی دەکرد بۆ خەڵکی، بێئەوەی ڕووی لە دیوارێك بێت، جا بەسواری ماکەرەکەوە تێ پەڕیم بە بەردەم بەشێکی ڕیزی نوێژکەرەکاندا، ئینجا دابەزیم و ماکەرەکەم بەرەڵا کرد بلەوەڕێ، منیش ڕۆیشتمە ڕیزی نوێژکەرەکانەوە، کەسیش لەسەر ئەوە ڕەخنەی لێ نەگرتم.

٤٩٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ العِيدِ أَمَرَ بِالحَرْبَةِ فَتُوضَعُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا وَالنَّاسُ وَرَاءَهُ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ، فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الأُمَرَاءُ[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٦.

[2] بڕوانە: ٤٩٨، ٩٧٢، ٩٧٣.

**٤٩٤- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە كە لە شار دەردەچوو بۆ نوێژی جەژن، فەرمانی دەكرد نێزەیەكیان لەپێشیەوە دادەچەقاند، جا خۆی ڕوو بەو نێزەیە نوێژی دەكرد و موسوڵمانانیش لە ددوایەوە بوون، وە هەمیشە لە سەفەردا وای دەكرد، بۆیە لەو كاتەوە ئەمیرەكانیش هەر هێلاویانەتەوە و كاریان پێ كردووە.**

٤٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمْ بِالبَطْحَاءِ -وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ- الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَالعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، تَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ المَرْأَةُ وَالحِمَارُ[1].

**٤٩٥- عەونی كوڕی ئەبو جوحەیفە دەڵێ: لە باوكمم بیست كە پێغەمبەر ﷺ لە بەتحا[2] پێشنوێژی بۆ كردن، -لەپێشەوە نێزەیەك داچەقێنرابوو- دوو ڕكاتی نیوەڕۆ و دوو ڕكاتی عەسر (بەكورتكراوە و كۆكراوەیی بۆ كردین)، لەپێش خۆی (و نێزەكەوە) ئافرەت و گوێدرێژ تێپەڕ دەبوون. (هیچ زیانێكی بە نوێژەكەیان نەدەگەیاند).**

## ٩١- بابُ قَدْرِ كَمْ يَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ بَينَ المُصَلِّي وَالسُّتْرَةِ؟

٤٩٦- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ الجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ[3].

---

[1] بڕوانە: ١٨٧.

[2] شوێنێكە لە دەرەوەی مەككەدایە.

[3] بڕوانە: ٧٣٣٤.

# ٩١- باسی ئەندازەی نێوان نوێژکەر و سوترەکە دەبێ چەند بێت؟

**٤٩٦- سەهل ﷺ دەڵێ: هەمیشە نێوانی جێنوێژەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دیوارەکەدا بەئەندازەی شوێنی تێپەڕبوونی مەڕێك بوو.**

٤٩٧- حَدَّثَنَا المَكِّيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: كَانَ جِدَارُ المَسْجِدِ عِنْدَ المِنْبَرِ مَا كَادَتِ الشَّاةُ تَجُوزُهَا.

**٤٩٧- سەلەمە ﷺ دەڵێ: (نێوانی) دیواری مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دوانگەکەدا مەڕێکی پێدا تێ نەدەپەڕی.**

## ٩٢- بابُ الصَّلاةِ إلى الحَرْبَةِ[1]

٤٩٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَخْبَرَنِي نَافِعٌ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُرْكَزُ لَهُ الْحَرْبَةُ فَيُصَلِّي إِلَيْهَا[2].

# ٩٢- باسی نوێژکردن ڕوو بە نێزە[3]

**٤٩٨- عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نێزەیەکیان لە پێشیەوە بۆ دادەچەقاند، جا ڕوو بەو نێزەیە نوێژی دەکرد.**

---

[1] (الحربة) ئاسنێکی کورتە، سەرێکی تیژی هەیە و لە شەڕدا بەکار دەهێنرێت. قاموسی ڕستە: ٤٢٩/١.

[2] بڕوانە: ٤٩٤.

[3] نێزە یان سونگی بە واتای (حربة)یە. قاموسی صادق: ٢٤٦.

## ٩٣- بابُ الصَّلَاةِ إِلَى العَنَزَةِ[١]

٤٩٩- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْنُ بْنُ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْهَاجِرَةِ، فَأُتِيَ بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، فَصَلَّى بِنَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ، وَالْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ يَمُرُّونَ مِنْ وَرَائِهَا[٢].

## ٩٣- باسی نوێژکردن ڕوو بە ڕم

**٤٩٩- عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە دەڵێ: لە باوکمم ﷺ بیست وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە گەرمای نیوەڕۆ هات بۆ لامان، ئینجا ئاوی دەستنوێژیان بۆ هێنا، دەستنوێژی گرت، نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بۆ کردین (پێشنوێژی بۆ کردین)، وە لە پێشیەوە ڕمێك داچەقێنرا بوو، ئافرەت و گوێدرێژ لە پشت ڕمەکەوە هاتووچۆیان دەکرد و دەڕۆیشتن.**

٥٠٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَاتِمِ بْنِ بَزِيعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَاذَانُ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ تَبِعْتُهُ أَنَا وَغُلَامٌ وَمَعَنَا عُكَّازَةٌ أَوْ عَصًا أَوْ عَنَزَةٌ وَمَعَنَا إِدَاوَةٌ، فَإِذَا فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ نَاوَلْنَاهُ الإِدَاوَةَ[٣].

**٥٠٠- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە دەڕۆیشت بۆ سەرئاو، من و غولامێك بەدوایدا دەڕۆیشتین، لەگەڵ خۆماندا گۆچانێك، یان دارعەسا، یان ڕمێکمان پێ بوو، وە جەوەندەیەکی بچووك ئاویشمان پێ بوو، جا کە لە دەست گەیاندن بەئاو تەواو دەبوو، جەوەندە ئاوەکەمان پێ دەدا (خۆی پێ پاك دەکردەوە).**

---

[١] (العنزة) لە حەڕبە کورتترە یان حەڕبە ڕمێکە نووکەکەی پانە، بەڵام (العنزة) نیو ڕمە. إرشاد الساري: ١٥٢/٢. و النهاية في غريب الحديث والأثر: ٢٦٢/٢.

[٢] بڕوانە: ١٨٧.

[٣] بڕوانە: ١٥٠.

# ٩٤- بابُ السُّتْرَة بِمَكَّةَ وَغَيْرِهَا

٥٠١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْهَاجِرَةِ فَصَلَّى بِالْبَطْحَاءِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَنَصَبَ بَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةً، وَتَوَضَّأَ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَتَمَسَّحُونَ بِوَضُوئِهِ[1].

# ٩٤- باسی سوتره لە مەککە و جێگای دیکەشدا (دروستە)

**٥٠١- ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەرمای نیوەڕۆدا هاتە دەر و لە بەتحادا نوێژی نیوەڕۆ و عەسری (بۆ هەریەکەیان) دوو ڕکاتی کرد، وە لەپێشیەوە ڕمێکی داچەقاند و دەستنوێژی گرت، جا خەڵکەکەش (دەستیان دەدایە بەر) ئاوی دەستنوێژەکەی و دەیانهێنا بە خۆیاندا.**

# ٩٥- بابُ الصَّلَاةِ إِلَى الأُسْطُوَانَةِ

وَقَالَ عُمَرُ: المُصَلُّونَ أَحَقُّ بِالسَّوَارِي مِنَ المُتَحَدِّثِينَ إِلَيْهَا، وَرَأَى عُمَرُ رَجُلًا يُصَلِّي بَيْنَ أُسْطُوَانَتَيْنِ فَأَدْنَاهُ إِلَى سَارِيَةٍ فَقَالَ: صَلِّ إِلَيْهَا.

٥٠٢- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: كُنْتُ آتِي مَعَ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ فَيُصَلِّي عِنْدَ الأُسْطُوَانَةِ الَّتِي عِنْدَ الْمُصْحَفِ، فَقُلْتُ:يا أَبَا مُسْلِمٍ، أَرَاكَ تَتَحَرَّى الصَّلَاةَ عِنْدَ هَذِهِ الأُسْطُوَانَةِ. قَالَ: فَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَحَرَّى الصَّلَاةَ عِنْدَهَا.

---

[1] بڕوانە: ١٨٧.

## ٩٥- باسی نوێژکردن ڕوو بە کۆڵەکە و پایە (دروستە)

وە عومەر ﷺ دەڵێ: نوێژکەران شایستەترن بە کۆڵەکەکان لە قسەکەران لە پەنایدا، وە عومەر پیاوێکی بینی لە نێوان دوو کۆڵەکەدا نوێژی دەکرد، عومەریش نزیکی کردەوە لە کۆڵەکەیەکیان، وتی: ڕوو بەوەیان نوێژ بکە.

٥٠٢- یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید دەڵێ: من لەگەڵ سەلەمی کوڕی ئەکوەعدا دەهاتم (بۆ مزگەوت)، جا کە سەلەمە لەلای کۆڵەکە لای سندوقی قورئانەکەدا نوێژی کرد، منیش وتم ئەی ئەبو موسلیم دەتبینم هەوڵ دەدەیت لای ئەم کۆڵەکەیەدا نوێژ بکەیت؟ وتی: چونکە بێگومان پێغەمبەرم ﷺ دیوە هەوڵی نوێژکردنی دەدا لەپەنای ئەو کۆڵەکەیەدا.

٥٠٣- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَامِرٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ كِبَارَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ عِنْدَ الْمَغْرِبِ. وَزَادَ شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَنَسٍ: حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ ﷺ[1].

٥٠٣- ئەنەس ﷺ دەڵێ: بێگومان گەورەهاوەڵانی پێغەمبەرم ﷺ دەبینی، پەلەیان دەکرد لەکاتی نوێژی مەغریبدا بۆ لای کۆڵەکەکانی (مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ). شوعبە لە گێڕانەوەکەیدا لە عومەرەوە ئەویش لە ئەنەسەوە ئەمەی زیاد کردووە: هەتا پێغەمبەر ﷺ دەهات بۆ نوێژ.

---

[1] بڕوانە: ٦٢٥.

## ٩٦- بابُ الصَّلاةِ بَيْنَ السَّوارِي فِي غَيْرِ جَمَاعَةٍ

٥٠٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ الْبَيْتَ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ، وَبِلاَلٌ، فَأَطَالَ ثُمَّ خَرَجَ، وَكُنْتُ أَوَّلَ النَّاسِ دَخَلَ عَلَى أَثَرِهِ فَسَأَلْتُ بِلاَلًا: أَيْنَ صَلَّى؟ قَالَ: بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ الْمُقَدَّمَيْنِ[1].

## ٩٦- باسی (حوكمی) نوێژكردن له نێوان كۆڵەكە و پایەكاندا ئەگەر نوێژكەرەكە بەتەنیا بوو[2]

**٥٠٤- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە نێو كەعبەوە لەگەڵ ئوسامەی كوڕی زەید و عوسمانی كوڕی تەلحە و بیلال، زۆر مایەوە پاشان هاتە دەرەوە، من یەكەم كەس بووم دوای هاتنەدەرەوەی چوومە نێو كەعبە و پرسیارم لە بیلال كرد: پێغەمبەر ﷺ لەكوێدا نوێژی كرد؟ وتی: لە نێوان ئەو دوو كۆڵەكەی پێشەوەدا.**

٥٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْكَعْبَةَ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَبِلاَلٌ، وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ، فَأَغْلَقَهَا عَلَيْهِ وَمَكَثَ فِيهَا، فَسَأَلْتُ بِلاَلًا حِينَ خَرَجَ: مَا صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: جَعَلَ عَمُودًا عَنْ يَسَارِهِ، وَعَمُودًا عَنْ يَمِينِهِ، وَثَلاَثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ -وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ- ثُمَّ صَلَّى. وَقَالَ لَنَا إِسْمَاعِيلُ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ وَقَالَ: عَمُودَيْنِ عَنْ يَمِينِهِ[3].

**٥٠٥- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو كەعبە لەگەڵ ئوسامەی كوڕی زەید و بیلال و عوسمانی كوڕی تەلحەی حەجەبی،**

---

[1] بڕوانە: ٣٩٧.

[2] واتە: نوێژكەر بۆخۆی بەتەنها نوێژی دەكرد وە بەجەماعەت لەگەڵ پێشنوێژدا نەبوو.

[3] بڕوانە: ٣٩٧.

ئینجا دەرگای کەعبەی لەسەر خۆی داخست، ماوەیەك مایەوە تێیدا، ئینجا کاتێ بیلال هاتە دەرەوە پرسیارم لێ کرد: پێغەمبەر ﷺ چی کرد (لەنێو کەعبەدا)؟ وتی: کۆڵەکەیەکی خستە لای چەپی و کۆڵەکەیەکی خستە لای ڕاستی، سێ کۆڵەکەشیانی خستە پشتیەوە- لەو ڕۆژگارەدا کەعبە لەسەر شەش کۆڵەکە دروست کرابوو- پاشان نوێژی کرد. (ئیمام بوخاری دەڵێ:) وە ئیسماعیل پێی وتین: مالیك بۆی گێڕامەوە وتی: دوو کۆڵەکەی خستە لای ڕاستیەوە.

## ٩٧- بابٌ

٥٠٦- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو ضَمْرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْكَعْبَةَ مَشَى قِبَلَ وَجْهِهِ حِينَ يَدْخُلُ، وَجَعَلَ الْبَابَ قِبَلَ ظَهْرِهِ، فَمَشَى حَتَّى يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِدَارِ الَّذِى قِبَلَ وَجْهِهِ قَرِيبًا مِنْ ثَلاَثَةِ أَذْرُعٍ، صَلَّى يَتَوَخَّى الْمَكَانَ الَّذِى أَخْبَرَهُ بِهِ بِلاَلٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِيهِ. قَالَ وَلَيْسَ عَلَى أَحَدِنَا بَأْسٌ إِنْ صَلَّى فِي أَيِّ نَوَاحِي الْبَيْتِ شَاءَ[1].

## ٩٧- باسێک

٥٠٦- نافیع دەڵێ: عەبدوڵا هەر کاتێ بڕۆیشتایەتە کەعبە، ڕووبەڕووی خۆی دەچوو کاتێ دەچووە ژوورەوە، دەرگاکەی دەخستە پشتیەوە، جا ڕۆیشت هەتا نێوانی ئەو و ئەو دیوارەی ڕووبەڕوویەتی بە نزیکی سێ گەز بو، لەو شوێنەدا کە بیلال وتبووی پێغەمبەر ﷺ لەوێدا نوێژی کردووە نوێژی کرد، وە وتی: هەر یەك لە ئێمە لە هەر جێگایەکی نێو کەعبەدا نوێژ بکات هیچی لەسەر نییە.

---

[1] بڕوانە: ٣٩٧.

## ٩٨- بابُ الصَّلاةِ إلى الرَّاحِلَةِ وَالبَعِيرِ وَالشَّجَرِ وَالرَّحْلِ

٥٠٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الْمُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُعَرِّضُ رَاحِلَتَهُ فَيُصَلِّي إِلَيْهَا. قُلْتُ: أَفَرَأَيْتَ إِذَا هَبَّتِ الرِّكَابُ؟ قَالَ: كَانَ يَأْخُذُ هَذَا الرَّحْلَ فَيُعَدِّلُهُ فَيُصَلِّي إِلَى آخِرَتِهِ -أَوْ قَالَ مُؤَخَّرِهِ- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يَفْعَلُهُ[1].

## ٩٨- باسی (حوکمی) نوێژکردن ڕوو بە وڵاخ و وشتر و درەخت و کورتان یان زینی وشتر

**٥٠٧- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وڵاخەکەی ڕادەگرت و بەرەوڕووی نوێژی دەکرد. (نافیع دەڵێ) وتم: پێم بڵێ ئەی ئەگەر وشترەکە ڕۆیشت؟ وتی: زین و کورتانەکەی لێ دەکردەوە و دایدەنا لەبەردەمیدا ڕوو بە کۆتاییەکەی -یان بەشی دواوەی کورتانەکە-، نوێژی دەکرد، نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەریش ﷺ وای دەکرد.**

## ٩٩- بابُ الصَّلاةِ إلى السَّرِيرِ

٥٠٨- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَعَدَلْتُمُونَا بِالْكَلْبِ وَالْحِمَارِ؟! لَقَدْ رَأَيْتُنِي مُضْطَجِعَةً عَلَى السَّرِيرِ، فَيَجِيءُ النَّبِيُّ ﷺ فَيَتَوَسَّطُ السَّرِيرَ فَيُصَلِّي، فَأَكْرَهُ أَنْ أُسَنِّحَهُ فَأَنْسَلُّ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ السَّرِيرِ حَتَّى أَنْسَلَّ مِنْ لِحَافِي[2].

---

[1] بڕوانە: ٤٣٠.

[2] بڕوانە: ٣٨٢.

## ٩٩- باسی (حوکمی) نوێژکردن ڕوو بە نوێن و پێخەف

**٥٠٨- ئەسوەد دەڵێ: عائیشە ﷺ وتی: ئێمەتان هاوتای سەگ و کەر کردووە؟ سوێند بە خوا من خۆمم بینیوە لەسەر نوێنی نووستن ڕاکشابووم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەهات لەسەر نێوەڕاستی نوێنەکەدا نوێژی دەکرد[1]، منیش پێم ناخۆش بوو ڕێك ڕووبەڕووی ڕاست ببمەوە و هەستمەوە، بۆیە لەلای خوارەوەی نوێنەکەوە بەهێوری خۆم دەکێشایەوە، هەتا بەهێواشی لەژێر لێفەکەم دەهاتمە دەرەوە. (واتە: وەك ئەوەی بەبەردەم نوێژەکەیدا بڕۆم).**

## ١٠٠- بابٌ: يَرُدُّ الْمُصَلِّي مَنْ مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ

وَرَدَّ ابن عُمَرَ فِي التشَهُّدِ وَفِي الكَعْبَةِ وَقَالَ: إنْ أَبَى إِلَّا أَنْ تُقَاتِلَهُ، فَقَاتِلْهُ.

٥٠٩- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ. وَحَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ هِلاَلٍ الْعَدَوِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ السَّمَّانُ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ يُصَلِّي إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ شَابٌّ مِنْ بَنِي أَبِي مُعَيْطٍ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَدَفَعَ أَبُو سَعِيدٍ فِي صَدْرِهِ، فَنَظَرَ الشَّابُّ فَلَمْ يَجِدْ مَسَاغًا إِلاَّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَعَادَ لِيَجْتَازَ فَدَفَعَهُ أَبُو سَعِيدٍ أَشَدَّ مِنَ الأُولَى، فَنَالَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى مَرْوَانَ فَشَكَا إِلَيْهِ مَا لَقِيَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَدَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ خَلْفَهُ عَلَى مَرْوَانَ، فَقَالَ مَا لَكَ وَلاِبْنِ أَخِيكَ يا أَبَا سَعِيدٍ؟ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ»[2].

---

[1] بەمجۆرەش مانا دەکرێت و ڕاستە: نوێنەکەی دەخستە نێوان خۆی و قیبلەکەیەوە. إرشاد الساري: ١٥٩/٢.

[2] بڕوانە: ٣٢٧٤.

## ١٠٠- باسێک: نوێژکەر نەهێڵێت کەس بڕوات بە بەردەمیدا

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە کاتی تەحیاتخوێندن و لە کەعبەشدا ڕێگری کردووە لەوەی کەس بڕوات بە بەردەمی نوێژەکەیدا، وە وتوویەتی: ئەگەر هەر نەگەڕایەوە تا بە شەڕکردن نەبێ، شەڕی لەگەڵدا بکە.

٥٠٩- ئەبو صالیح دەڵێ: ئەبو سەعید ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر ئەبو صالیح دەڵێ: ئەبو سەعیدم[1] بینی لە ڕۆژی هەینیدا نوێژی دەکرد ڕوو بە شتێك بوو بۆیە سوترە لە نێوان ئەو و خەڵکەکەدا، گەنجێك لە بنەماڵەی ئەبو موعیت ویستی بەبەردەمیدا تێ پەڕێت، ئەبو سەعیدیش پاڵی پێوە نا و نەیهێڵا بڕوات، گەنجەکەش سەیری کرد هیچ ڕێگەیەکی نییە لە بەردەمیەوە نەبێ، بۆیە جارێکی دیکە گەڕایەوە لە بەردەمیەوە بڕوات، ئەبو سەعیدیش بەتوندتر لە جاری پێشوو دای بە سینگیدا و گێڕایەوە، گەنجەکەش جنێوی دا بە ئەبو سەعید، پاشان ڕۆیشت بۆ لای مەڕوان[2] شکاتی لا کرد کە ئەبو سەعید چی لەگەڵدا کردووە، ئەبو سەعیدیش لەدوایدا چووە ژوورەوە بۆ لای مەڕوان، مەڕوان وتی: چی بووە لە نێوان تۆ و برازاکەتدا ئەی ئەبو سەعید؟ ئەبو سەعید وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان نوێژی دەکرد ڕوو بە شتێك، کردبوویە سوترە لە نێوان خۆی و خەڵکیدا، ئینجا کەسێك ویستی بڕوات بەبەردەمیدا، ئەوە با پاڵی پێوە بنێ و نەهێڵێ، جا ئەگەر وازی نەهێنا با شەڕی لەگەڵدا بکات، چونکە بەڕاستی ئەو کەسە (کارەکەی کاری) شەیتانە)).

---

[1] ئەم فەرموودەیە ئیمام بوخاری بە دوو سەنەد گێڕاویەتەوە.

[2] مەڕوانی کوڕی حەکەمی کوڕی ئومەوی کە ساڵی شەست و پێنجی کۆچی مردووە. إرشاد الساري: ١٦١/٢.

## ١٠١- بابُ إِثْمِ المَارِّ بَيْنَ يَدَيِ المُصَلِّي

٥١٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ ابْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ- عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ يَسْأَلُهُ مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي؟ فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ، خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ». قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي أَقَالَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ شَهْرًا، أَوْ سَنَةً؟.

## ١٠١- باسی تاوانی ئەو کەسەی بە بەردەم نوێژکەردا دەڕوات

**٥١٠- بوسری کوڕی سەعید دەڵێ: زەیدی کوڕی خالید ناردی بۆ لای ئەبو جەهەم ﷺ تا پرسیاری لێ بکات چی بیستووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کەسێ بە بەردەم نوێژکەردا بڕوات؟ ئەبو جەهمیش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئەو کەسەی بە بەردەم نوێژکەردا دەڕوات، بیزانیبایە چەند تاوانی لەسەرە، ئەوە بێگومان وەستانی چل باشتر بوو بۆی لەوەی کە بە بەردەمیدا تێ پەڕێ))، ئەبو نەزر[1] دەڵێ: نازانم وتی: چل ڕۆژ، یان چل مانگ، یان چل ساڵ.**

## ١٠٢- بابُ اسْتِقْبَالِ الرَّجُلِ صَاحِبَهُ أَوْ غَيْرَهُ فِي صَلَاتِهِ وَهُوَ يُصَلِّي

وَكَرِهَ عُثْمَانُ أَنْ يُسْتَقْبَلَ الرَّجُلُ وَهُوَ يُصَلِّي، وَإِنَّمَا هذا إِذَا اشْتَغَلَ بِهِ، فَأَمَّا إِذَا لَمْ يَشْتَغِلْ فَقَدْ قَالَ زيدُ بْنُ ثَابِتٍ: مَا بَالَيْتُ، إِنَّ الرَّجُلَ لَا يَقْطَعُ صَلَاةَ الرَّجُلِ.

---

[1] ئەبو نەزر یەکێکە لەوانەی فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە.

## ١٠٢- باسی ئەگەر کەسێك ڕوو بکاتە هاوڕێیەکەی یان کەسێکی دیکە لە نوێژەکەیدا کاتێ نوێژ دەکات

**عوسمان ﷺ بە ناپەسەندی داناوە پیاو ڕووی تێ بکرێت لە کاتێکدا نوێژ دەکات، بێگومان ئەمە لە کاتێکدایە نوێژکەرەکە بێئاگا بکات لە نوێژەکەی، بەڵام ئەگەر بێئاگای نەکات، ئەوە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ وتوویەتی: من گوێی پێ نادەم، چونکە بێگومان پیاو نوێژی پیاو بەتاڵ ناکاتەوە (ئەگەر لەبەردەمیدا بێ).**

٥١١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ خَلِيلٍ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ -يَعْنِي: ابْنَ صُبَيْحٍ- عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ فَقَالُوا: يَقْطَعُهَا الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ. قَالَتْ قَدْ جَعَلْتُمُونَا كِلاَبًا؟ لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - يُصَلِّي، وَإِنِّي لَبَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى السَّرِيرِ، فَتَكُونُ لِي الْحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَسْتَقْبِلَهُ فَأَنْسَلُّ انْسِلاَلًا. وَعَنِ الأَعْمَشِ عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ نَحْوَهُ[1].

**٥١١- مەسروق دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﷺ کە لەلای ئەودا باسی ئەو شتانە کرا کە نوێژ دەبڕێ و بەتاڵی دەکاتەوە، وتیان: سەگ و گوێدرێژ و ئافرەت نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە (ئەگەر تێ پەڕن بە بەردەم نوێژکەردا)، عائیشەش وتی: بەڕاستی ئێمەتان کردووە بە سەگ؟ بێگومان پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی دەکرد، منیش لە نێوان ئەو و قیبلەدا لەسەر نوێنی خەوتن ڕاکشابووم، جا ئیش و پێویستییەکم دەبوو، پێم ناخۆش بوو ڕووبەڕووی پێغەمبەر ﷺ هەستمەوە، بۆیە بەهێواشی لەژێر پێخەفەکە دەهاتمە دەرەوە. هەروەها بە وێنەی ئەو فەرموودە ئەعمەش لە ئیبراهیمەوە، ئەویش لە ئەسوەدەوە لە عائیشە گێڕاویەتەوە.**

---

[1] بڕوانە: ٣٨٢.

## ١٠٣- بابُ الصَّلاةِ خَلْفَ النَّائِمِ

٥١٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَأَنَا رَاقِدَةٌ مُعْتَرِضَةٌ عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَيْقَظَنِي فَأَوْتَرْتُ[1].

## ١٠٣- باسی نوێژکردن لەپشت کەسێکی خەوتووەوە (دروستە)

**٥١٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، منیش لەسەر نوێنەکەی ڕاکشابووم و خەوتبووم، جا کاتێ بیویستایە نوێژی ویتر بکات، خەبەری دەکردمەوە و نوێژی ویترم دەکرد.**

## ١٠٤- بابُ التَّطَوُّعِ خَلْفَ المَرْأَةِ

٥١٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ-، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَرِجْلَايَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا. قَالَتْ: وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ[2].

## ١٠٤- باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لەپشت ئافرەتەوە (دروستە)

**٥١٣- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: من لەبەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ دەخەوتم هەردوو قاچم لە ڕووی قیبلەکەی ئەوەوە بوو، جا کاتێ**

---

[1] بڕوانە: ٣٨٢.

[2] بڕوانە: ٣٨٢.

سوژدەی ببردایە دەیدا لە قاچم، منیش هەردوو قاچم هەڵدەکێشا، ئینجا کە هەڵدەسایەوە قاچەکانم درێژ دەکردەوە. وە عائیشە ﵂ دەڵێ: لەو کات و ڕۆژگارەدا ماڵان چرایان تێدا نەبوو.

## ١٠٥- بابُ مَن قالَ: لا يَقْطَعُ الصَّلاةَ شَيْءٌ

٥١٤- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنِ الأَسْوَدِ عَنْ عَائِشَةَ. قَالَ الأَعْمَشُ: وَحَدَّثَنِي مُسْلِمٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ: الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ، فَقَالَتْ: شَبَّهْتُمُونَا بِالْحُمُرِ وَالْكِلاَبِ؟ وَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي، وَإِنِّي عَلَى السَّرِيرِ-بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ- مُضْطَجِعَةً فَتَبْدُو لِي الْحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَجْلِسَ فَأُوذِيَ النَّبِيَّ ﷺ فَأَنْسَلُّ مِنْ عِنْدِ رِجْلَيْهِ[1].

## ١٠٥- باسی ئەوەی دەڵێ: هیچ شتێک نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە (تێپەڕی بە بەردەم نوێژکەردا)

٥١٤- ئەسوەد و مەسڕوق دەگێڕنەوە لە عائیشەوە ﵂ کە لای ئەودا باسی ئەو شتانە کرا کە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، کە: سەگ و گوێدرێژ و ئافرەتە، عائیشەش وتی: ئێمەتان بە گوێدرێژ و سەگ چوواندووە؟! سوێند بە خوا پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی کردووە، منیش ڕاکشاوم لەسەر نوێنەکە -لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قیبلەکەیدا-، جا ئیشێکم بۆ پەیدا بووە، حەزم نەکردووە (ڕووبەڕووی) هەڵسمەوە ئەزیەتی پێغەمبەر ﷺ بدەم، بۆیە لەلای خوارەوەی نوێنەکەوە بەهێواشی دەهاتمە دەرەوە.

---

[1] بڕوانە: ٣٨٣.

٥١٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَخِي ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ سَأَلَ عَمَّهُ عَنِ الصَّلاَةِ يَقْطَعُهَا شَيْءٌ، فَقَالَ: لاَ يَقْطَعُهَا شَيْءٌ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُومُ فَيُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، وَإِنِّي لَمُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ عَلَى فِرَاشِ أَهْلِهِ[1].

**٥١٥- ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە کە پرسیاری لە مامەی کردووە: چ شتێك نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە (کە لەپێشتەوە تێ پەڕێ)؟ ئەویش وتوویەتی: هیچ شتێك نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، عورِوەی کوڕی زوبەیر بۆی گێڕامەوە کە عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا هەڵدەسا شەونوێژی دەکرد لەسەر نوێنی خێزانی، لەو کاتەدا منیش لە نێوان ئەو و قیبلەدا ڕاکشابووم.**

## ١٠٦- بابٌ: إِذَا حَمَلَ جَارِيَةً صَغِيرَةً عَلَى عُنُقِهِ فِي الصَّلَاةِ

٥١٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي وَهْوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلأَبِي الْعَاصِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا[2].

## ١٠٦- باسێک: ئەگەر نوێژکەر کچۆڵەیەک بەسەر شان و ملیەوە بێت لەکاتی نوێژکردندا

**٥١٦- ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، لەو کاتەدا ئومامەی کچی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ (لەسەر**

---

[1] بڕوانە: ٣٨٢.

[2] بڕوانە: ٥٩٩٦.

**ملى) هەلگرتبوو، هەروەها (زەینەب کچى) ئەبو عاصى کوڕى ڕەبیعەى کوڕى عەبدى شەمس بوو، جا کاتێ (پێغەمبەر ﷺ) سوژدەى ببردایە دایدەنا و کاتێ هەڵدەسایەوە هەڵیدەگرتەوە.**

## ١٠٧- بابٌ: الصلاة إلى فِرَاشٍ فِيهِ حَائِضٌ

٥١٧- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ قَالَ: أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي خَالَتِي مَيْمُونَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ قَالَتْ: كَانَ فِرَاشِي حِيَالَ مُصَلَّي النَّبِيِّ ﷺ فَرُبَّمَا وَقَعَ ثَوْبُهُ عَلَيَّ وَأَنَا عَلَى فِرَاشِي[1].

## ١٠٧- باسێک: ئەگەر کەسێک نوێژ بکات ڕوو بە نوێنێک ئافرەتی حەیزداری تێدا بێ

**٥١٧- عەبدوڵاى کوڕى شەدادى کوڕى هاد دەڵێ: مەیمونەى کچى حاریسەى پوورم ﵂ بۆى گێڕامەوە وتی: نوێنی خەوتنەکەم لەپاڵ نوێژگەکەى پێغەمبەردا ﷺ بوو، بۆیە هەندێ جار جلەکانی بەر من دەکەوت، لە کاتێکدا من لەسەر نوێنەکەى خۆم بووم.**

٥١٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ سُلَيْمَانُ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَدَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ مَيْمُونَةَ تَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَأَنَا إِلَى جَنْبِهِ نَائِمَةٌ، فَإِذَا سَجَدَ أَصَابَنِي ثَوْبُهُ، وَأَنَا حَائِضٌ. وَزَادَ مُسَدَّدٌ، عَنْ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ الشَّيْبَانِيُّ: وَأَنَا حَائِضٌ[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٣٣.

[2] بڕوانە: ٣٣٣.

**٥١٨- عەبدوڵای کوڕی شەداد دەڵێ: لە مەیمونەم ﵂ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، منیش لەتەنیشتیدا خەوتبووم، جا کاتێ سوژدەی دەبرد، پۆشاکەکەی بەرم دەکەوت، لەو کاتەدا من لە حەیزدا بووم. هەروەها موسەدەد لە خالیدەوە گێڕاویەتەوە و دەڵێ: سولەیمانی شەیبانی بۆی گێڕاینەوە بەم زیادەوە: وە من لەو کاتەدا لە حەیزدا بووم.**

## ١٠٨- بابٌ: هَل يَغمِزُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ عِنْدَ السُّجُود لِكَيْ يَسْجُدَ؟

٥١٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: بِئْسَمَا عَدَلْتُمُونَا بِالْكَلْبِ وَالْحِمَارِ؟! لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ غَمَزَ رِجْلَيَّ فَقَبَضْتُهُمَا[1].

## ١٠٨- باسێک: ئایا پیاو لە کاتی سوژدەدا دەکوتێتە خێزانی بۆئەوەی (ڕێگای بکاتەوە) سوژدە ببات؟

**٥١٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: چەند خراپە کە ئێمەتان چواندووە بە سەگ و گوێدرێژ، سوێند بە خوا خۆم دیومە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کردووە، منیش لە نێوان ئەو و قیبلەدا ڕاکشاوم، جا کە بیویستایە سوژدە ببات، دەیکوتایە قاچەکانم، منیش قاچەکانم هەڵدەکێشا.**

## ١٠٩- بابُ المَرْأَةِ تَطْرَحُ عَنِ المُصَلِّي شَيْئًا مِنَ الأَذى

٥٢٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِسْحَاقَ السُّرْمَارِيُّ قَالَ:حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

---

[1] بڕوانە: ٣٨٢.

قَائِمٌ يُصَلِّي عِنْدَ الْكَعْبَةِ، وَجَمْعُ قُرَيْشٍ فِي مَجَالِسِهِمْ إِذْ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ: أَلاَ تَنْظُرُونَ إِلَى هَذَا الْمُرَائِي، أَيُّكُمْ يَقُومُ إِلَى جَزُورِ آلِ فُلاَنٍ، فَيَعْمِدُ إِلَى فَرْثِهَا وَدَمِهَا وَسَلاَهَا فَيَجِيءُ بِهِ، ثُمَّ يُمْهِلُهُ حَتَّى إِذَا سَجَدَ وَضَعَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَاهُمْ، فَلَمَّا سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَضَعَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، وَثَبَتَ النَّبِيُّ ﷺ سَاجِدًا، فَضَحِكُوا حَتَّى مَالَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ مِنَ الضَّحِكِ، فَانْطَلَقَ مُنْطَلِقٌ إِلَى فَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلاَمُ وَهْيَ جُوَيْرِيَةٌ، فَأَقْبَلَتْ تَسْعَى، وَثَبَتَ النَّبِيُّ ﷺ سَاجِدًا حَتَّى أَلْقَتْهُ عَنْهُ، وَأَقْبَلَتْ عَلَيْهِمْ تَسُبُّهُمْ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصَّلاَةَ قَالَ «اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ، اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ، اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ». ثُمَّ سَمَّى «اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِعَمْرِو بْنِ هِشَامٍ، وَعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ، وَعُمَارَةَ بْنِ الْوَلِيدِ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَوَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُهُمْ صَرْعَى يَوْمَ بَدْرٍ، ثُمَّ سُحِبُوا إِلَى الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «وَأُتْبِعَ أَصْحَابُ الْقَلِيبِ لَعْنَةً»[1].

## ١٠٩- باسی ئافرەت شتێکی پیس بەسەر نوێژکەرەوە بێت لای ببات

**٥٢٠- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەپەنا کەعبەدا وەستابوو نوێژی دەکرد، کۆمەڵێکیش لە قورەیشییەکان لە شوێنی دانیشتنەکەیاندا دانیشتبوون، کەسێك لەنێویاندا وتی: ئەوە بۆ سەیری ئەم کابرا ڕیابازە ناکەن، کام لە ئێوە دەڕوات بۆ ماڵی فلان کەس وشترێکیان سەر بڕیوە، شیاکە و خوێن و ورگ و ڕیخۆڵەکانی دێنێ، پاشان چاوەڕوانی موحەممەد بکات تا دەڕوات بە سوژدەدا، بیخاتە نێوان هەردوو شانیەوە؟ جا نالەبارترینیان**

[1] بڕوانە: ٢٤٠.

ڕۆیشت (و هێنای)، ئینجا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سوژدەوە خستیە نێوان هەردوو شانی، پێغەمبەریش ﷺ هەر لە سوژدەدا مایەوە، ئەوانیش دەستیان کرد بە پێکەنین، هەتا کەوتن بەسەر یەکدیدا لە پێکەنینا، جا کەسێك[1] ڕۆیشت بۆ لای فاتیمە ﵂ (ی کچی پێغەمبەر ﷺ)، کە ئەو کاتە فاتیمە کچۆڵەیەك بوو، فاتیمەش بەپەلە هات، پێغەمبەریش ﷺ لە سوژدەدا مابۆیەوە، هەتا فاتیمە پیساییەکانی لابرد بەسەریەوە، وە (فاتیمە) ڕووی کردە قوڕەیشییەکان، دەستی کرد بەجنێودان پێیان، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ((خوایە تۆڵە لە قوڕەیش بسەنی، خوایە تۆڵە لە قوڕەیش بسەنی، خوایە تۆڵە لە قوڕەیش بسەنی))، پاشان ناوی بردن و فەرمووی: ((خوایە تۆڵە بسەنی لە عەمری کوڕی هیشام و، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە و ئومەیەی کوڕی خەلەف و عوتبەی کوڕی ئەبو موعیت و عومارەی کوڕی وەلید)). عەبدوڵا وتی: جا سوێند بە خوا هەموویانم لە ڕۆژی بەدردا (بەکوژراوی) بینی کەوتبوون، پاشان ڕاکێشران بۆ نێو بیرێك کە بیرێك بوو لە بەدر (و فڕێ درانە نێویەوە)، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوانەی لەم بیرەدان نەفرینیان بەدوادا ڕۆیشت)).

---

[1] لەوانەیە عەبدوڵای کوڕی مەسعود بووبێت. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٧١/٢.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٩- كِتَابُ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٩- پەڕاوی کاتەکانی نوێـژ

## ١- بابُ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ وَفَضْلِها

وَقَوْلِهِ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴿١٠٣﴾﴾ النساء، وَقَّتَهُ عَلَيْهِمْ.

٥٢١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ أَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا، فَدَخَلَ عَلَيْهِ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، فَأَخْبَرَهُ أَنَّ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ أَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا وَهُوَ بِالْعِرَاقِ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ أَبُو مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: مَا هَذَا يا مُغِيرَةُ؟ أَلَيْسَ قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ جِبْرِيلَ نَزَلَ فَصَلَّى، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ «بِهَذَا أُمِرْتُ؟». فَقَالَ عُمَرُ لِعُرْوَةَ: إِعْلَمْ مَا تُحَدِّثُ، أَوَإِنَّ جِبْرِيلَ هُوَ أَقَامَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقْتَ الصَّلَاةِ؟ قَالَ عُرْوَةُ: كَذَلِكَ كَانَ بَشِيرُ بْنُ أَبِي مَسْعُودٍ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ[1].

## ١- باسی کاتەکانی نوێژ و گەورەییان

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان نوێژ لەسەر باوەڕداران فەرزکراوێکی کات بۆ دیاریکراوە)، کاتەکانی بۆ دیاری کردوون.**

---

[1] بڕوانە: ٣٢٢١، ٤٠٠٧.

**٥٢١- ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە: کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕۆژێکیان نوێژی دوا خست، ئینجا عوروەی کوڕی زوبەیر هات بۆ لای و بۆی گێڕایەوە، کە موغیرەی کوڕی شوعبە ڕۆژێکیان نوێژی دوا خست لە کاتێکدا لە عێراق بوو، جا ئەبو مەسعودی ئەنصاری ﷺ هات بۆ لای و وتی: ئەمە چییە موغیرە ﷺ مەگەر نەتزانیوە کە جیبریل ﷺ دابەزی و نوێژی کرد، ئینجا پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کرد، پاشان جیبریل ﷺ نوێژی کرد، جا پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کرد، پاشان جیبریل ﷺ نوێژی کرد، ئینجا پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کرد، پاشان جیبریل ﷺ نوێژی کرد، ئینجا پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کرد، پاشان جیبریل ﷺ نوێژی کرد، ئینجا پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەم جۆرە فەرمانم پێ دراوە))، جا عومەر وتی بە عوروە: بزانە چی دەڵێیت، ئایا جیبریل ﷺ خۆی پێشنوێژی دەکرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نوێژەکاندا؟ عوروە دەڵێ: بەشیری کوڕی ئەبو مەسعودیش بە هەمان شێوە ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە لەباوکیەوە (کە خۆی لێی بیستبوو).**

**٥٢٢-** قَالَ عُرْوَةُ: وَلَقَدْ حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ، وَالشَّمْسُ فِي حُجْرَتِهَا قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ[1].

**٥٢٢- عوروە دەڵێ: بێگومان عائیشە ﷺ بۆی گێڕامەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد هێشتا خۆر لە ژوورەکەی (واتە: ژوورەکەی عائیشە**

[1] بڕوانە: ٥٤٤، ٥٤٥، ٥٤٦، ٣١٠٣.

ﷺ)دا بوو، پێش ئەوە خۆرەکە بەرز بێتەوە و نەمێنێ. (مەبەستی ئەوەیە لە نزیکی خۆرئاوابووندا نوێژی عەسری کردووە).

## ٢- بابُ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ الروم.

٥٢٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادٌ -هُوَ ابْنُ عَبَّادٍ- عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا إِنَّا مِنْ هَذَا الْحَيِّ مِنْ رَبِيعَةَ، وَلَسْنَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلاَّ فِي الشَّهْرِ الْحَرَامِ، فَمُرْنَا بِشَيْءٍ نَأْخُذْهُ عَنْكَ، وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا. فَقَالَ «آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: الإِيمَانِ بِاللَّهِ - ثُمَّ فَسَّرَهَا لَهُمْ: شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ- وَإِقَامُ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَأَنْ تُؤَدُّوا إِلَيَّ خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ، وَأَنْهَى عَنِ الدُّبَّاء، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُقَيَّرِ، وَالنَّقِيرِ»[1].

## ٢- باسی ئەم فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و لێی بترسن و بەچاکی نوێژەکانتان بەجێ بێنن وە لە هاوەڵدانەران مەبن)

٥٢٣- ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: چەند کەسێکی هۆزی عەبدولقەیس بە نوێنەرایەتی هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان: ئێمە لە هۆزی ڕەبیعەین، لەو مانگانەدا نەبێ جەنگی تێدا حەڕامە ناتوانین بگەینە خزمەتت، کەواتە فەرمانمان پێ بدە بەشتێ کە لێت وەرگرین، ئەو خەڵکانەشی بۆ بانگ بکەین کە بەجێمان هێشتوون (لە تایفەکەمان)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فەرمانتان پێ دەدەم بە چوار شت و ڕێگریشتان لێ دەکەم

[1] بڕوانە: ٥٣.

لە چوار شت: باوەڕبوون بە خوا))، پاشان ڕوونی کردەوە بۆیان (ئەو چوارە چین): ((شایەتومانهێنانە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، وە بێگومان من پێغەمبەری خوام، وە نوێژکردن، وە زەکاتدان، وە دەبێ پێنجیەکی ئەوەی بەغەنیمەت دەیگرن بیدەن، وە ڕێگری دەکەم لە (خواردنەوە لەنێو) کولەکەی هەڵکۆڵراو و کوپە و دەفری هەڵکۆڵراو لە بنی دارخورما و کوپەی قیر و زەفت تێهەڵسواو))[1].

## ٣- بابُ البَيْعَةِ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ

٥٢٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا قَيْسٌ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ[2].

## ٣- باسی پەیماندان لەسەر بەجێهێنانی نوێژ

٥٢٤- جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پەیمانم دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەجێهێنانی نوێژ و زەکاتدان و ئامۆژگاریکردنی هەموو موسوڵمانێك.

## ٤- بابٌ: الصَّلَاةُ كَفَّارَةٌ

٥٢٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: حَدَّثَنِي شَقِيقٌ قَالَ: سَمِعْتُ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْفِتْنَةِ؟ قُلْتُ: أَنَا، كَمَا قَالَهُ. قَالَ إِنَّكَ عَلَيْهِ -أَوْ عَلَيْهَا- لَجَرِيءٌ. قُلْتُ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ

---

[1] ئەم چوار دەفرە هۆی قەدەغەکردنیان ئەوەیە ئەگەر سرکە و دۆشاویان تێ بکرێ، زوو دەبنە عارەق، هەندێ لە زانایان دەڵێن: هۆی حەرامکردنیان لەبەر ئەوەیە ئەم چوار شتە عارەقیان تیا دروست دەکرا، تا نەبێتە هۆی گەڕانەوە بۆ عارەقخواردنەوە، بۆیە دوای دڵنیابوون لەوەی ناگەڕێنەوە سەری، هەموویان بەکارهێنانیان حەڵاڵ کرایەوە.

[2] بڕوانە: ٥٧.

وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالأَمْرُ وَالنَّهْى. قَالَ لَيْسَ هَذَا أُرِيدُ، وَلَكِنِ الْفِتْنَةُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ. قَالَ: لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْهَا بَأْسٌ يا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا. قَالَ: أَيُكْسَرُ أَمْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: يُكْسَرُ. قَالَ: إِذًا لاَ يُغْلَقَ أَبَدًا. قُلْنَا أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ الْبَابَ؟ قَالَ: نَعَمْ، كَمَا أَنَّ دُونَ الْغَدِ اللَّيْلَةَ، إِنِّي حَدَّثْتُهُ بِحَدِيثٍ لَيْسَ بِالأَغَالِيطِ. فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَ حُذَيْفَةَ، فَأَمَرْنَا مَسْرُوقًا، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: الْبَابُ عُمَرُ[1].

## ٤- باسێک: نوێژکردن سڕەرەوەیە (بۆ گوناهەکان)

**٥٢٥- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: لەلای عومەردا ﷺ دانیشتبووین، وتی: کامتان دەربارەی ئاژاوە و بەڵا فەرموودەی پێغەمبەری خوای ﷺ لەبەرە؟ وتم: من لەبەرمە، عومەر وتی: بێگومان تۆ چاونەترسی سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ -یان سەبارەت بەو فەرموودەیە- وتم: بەڵا و ئاشوب و تاوان کە تووشی مرۆڤ دەبن بەهۆی کەسوکار و ماڵ و منداڵ و دراوسێیەوە، نوێژ و ڕۆژوو و ماڵبەخشین و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەیسڕێتەوە، عومەر وتی: ئەم جۆرەم ناوێ، بەڵکوو ئەو ئاژاوەم دەوێ کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدات. حوزەیفە وتی: ئەو ئاژاوەیە هیچ زیانێکی بۆ تۆ نابێ ئەی گەورەی ئیمانداران، چونکە بەڕاستی لە نێوان تۆ و ئەو ئاژاوەدا دەرگایەکی داخراو هەیە، عومەر وتی: ئایا ئەو دەرگا دەشکێنرێ یان دەکرێتەوە؟ حوزەیفە وتی: دەشکێنرێ، عومەر وتی: کەواتە هەتاهەتایە ناداخرێتەوە، (شەقیق دەڵێ:) وتمان بە حوزەیفە: ئایا عومەر دەیزانی ئەو دەرگایە چییە؟ حوزەیفە وتی: بەڵێ دەیزانی وەك چۆن دەزانرێ ئەمشەو پێش سبەینێیە، بێگومان من فەرموودەیەکم بۆ گێڕایەوە هیچ هەڵە و تێکەڵ و پێکەڵییەکی تێدا نییە، (شەقیق دەڵێ:) ترساین پرسیار**

---
[1] بڕوانە: ١٤٣٥، ١٨٩٥، ٣٥٨٦، ٧٠٩٦.

**لە حوزەیفە بکەین، بۆیە داوام لە مەسروق کرد ئەو پرسیاری لێ کرد (دەرگاکە کێیە؟)، وتی: دەرگاکە عومەرە.**

٥٢٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ رَجُلًا أَصَابَ مِنَ امْرَأَةٍ قُبْلَةً، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود. فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلِي هَذَا؟ قَالَ: «لِجَمِيعِ أُمَّتِي كُلِّهِمْ»[1].

**٥٢٦- ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: پیاوێك ماچی لە ئافرەتێك کرد، ئینجا هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، بەو هۆیەوە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (لەمسەر و ئەوسەری ڕۆژ و لە بەشێکی شەودا نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان لادەبەن و دەیانسڕنەوە)، جا پیاوەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە هەر بۆ منە؟ فەرمووی: ((ئەمە بۆ هەموو ئوممەتەکەمە تێکڕا)).**

## ٥- بابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ لِوَقْتِهَا

٥٢٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: الْوَلِيدُ بْنُ الْعَيْزَارِ أَخْبَرَنِي قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عَمْرٍو الشَّيْبَانِيَّ يَقُولُ: حَدَّثَنَا صَاحِبُ هَذِهِ الدَّارِ - وَأَشَارَ إِلَى دَارِ عَبْدِ اللَّهِ- قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَالَ: «الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا». قَالَ:

[1] بڕوانە: ٤٦٨٧.

ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: «ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ». قَالَ ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: «الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». قَالَ حَدَّثَنِي بِهِنَّ وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي[1].

## ٥- باسی گەورەیی نوێژکردن لە سەرەتای کاتەکەیدا

**٥٢٧- ئەبو عەمری شەیبانی دەڵێ: خاوەنی ئەوماڵە بۆی گێڕاینەوە - ئاماژەی کرد بۆ ماڵی عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ- وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر کرد ﷺ کام کردەوە لای خوا خۆشەویستترە؟ فەرمووی: ((نوێژکردن لە سەرەتای کاتەکەیەوە))، وتی: پاشان چ کردەوەیەکی دیکە؟ فەرمووی: ((پاشان چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا))، وتی: پاشان چی دیکە؟ فەرمووی: ((جیهاد و تێکۆشان لەپێناو ئایینی خوادا))، عەبدوڵا وتی: ئەمانە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم و بۆی باس کردم، وە ئەگەر پرسیاری زیاترم بکردایە وەڵامی زیاتری دەدامەوە.**

## ٦- بابٌ: الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ كَفَّارَةٌ

٥٢٨- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي حَازِمٍ وَالدَّرَاوَرْدِيُّ، عَنْ يَزِيدَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ، يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسًا، مَا تَقُولُ ذَلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ؟». قَالُوا لاَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ شَيْئًا. قَالَ «فَذَلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، يَمْحُو اللَّهُ بِهَا الْخَطَايَا».

---

[1] بڕوانە: ٢٧٨٢، ٥٩٧٠، ٧٥٣٤.

## ٦- باسێک: پێنج نوێژەکە سڕەرەوەن (بۆ تاوانەکان)

**٥٢٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو: ((پێم بڵێن ئەگەر ڕووبارێك لەبەر دەرگای كەسێكتاندا بێت، هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێ بشوات چی دەڵێیت ئەو خۆشۆردنە هیچ چڵك دەهێڵێ (بە لاشەیەوە)؟))، وتیان: نەخێر هیچ چڵكی پێوە ناهێڵێ، فەرمووی: ((ئەوەی وترا نموونەی پێنج نوێژە فەرزەكەیە، خوا تاوانەكانی پێ لادەبات و نایهێڵێ)).**

## ٧- بابُ تَضْيِيعِ الصَّلاَةِ عَنْ وَقْتِهَا

٥٢٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ حَدَّثَنَا مَهْدِيٌّ، عَنْ غَيْلاَنَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ مَا أَعْرِفُ شَيْئًا مِمَّا كَانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ. قِيلَ: الصَّلاَةُ. قَالَ: أَلَيْسَ ضَيَّعْتُمْ مَا ضَيَّعْتُمْ فِيهَا؟.

## ٧- باسی فەوتاندنی نوێژ لە کاتەکەی خۆی

**٥٢٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: هیچ شتێك ناناسمەوە لەوەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبوو، وترا: نوێژ (وەك خۆی نەماوەتەوە)؟! ئەنەس وتی: مەگەر ئەویشتان نەفەوتاندووە بەوشێوەی فەوتاندووتانە لە نوێژەكاندا. (واتە: لەكاتی خۆیاندا ئەنجامیان نادەن، یان دەیانفەوتێنن).**

٥٣٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ وَاصِلٍ أَبُو عُبَيْدَةَ الْحَدَّادُ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي رَوَّادٍ أَخِي عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ يَقُولُ: دَخَلْتُ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ بِدِمَشْقَ وَهُوَ يَبْكِي، فَقُلْتُ: مَا يُبْكِيكَ؟ فَقَالَ: لاَ أَعْرِفُ شَيْئًا مِمَّا أَدْرَكْتُ إِلاَّ هَذِهِ

الصَّلاَةَ، وَهَذِهِ الصَّلاَةُ قَدْ ضُيِّعَتْ. وَقَالَ بَكْرٌ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ الْبُرْسَانِيُّ، أَخْبَرَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي رَوَّادٍ نَحْوَهُ.

**٥٣٠- زوهری دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای ئەنەسی كوڕی مالیك لە دیمەشق لەو كاتەدا دەگریا، منیش وتم: بۆچی دەگری؟ وتی: هیچ لەو شتانەی بینیومە نایناسمەوە جگە لەم نوێژە، ئەم نوێژەش فەوتێنراوە و گۆڕاوە. وێنەی ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە: بەكر دەڵێ موحەممەدی كوڕی بەكری بورسانی بۆی گێڕامەوە وتی: عوسمانی كوڕی ئەبو ڕەواد بۆی گێڕامەوە.**

## ٨- بابٌ: الْمُصَلِّي يُنَاجِي رَبَّهُ ﷻ

٥٣١- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلاَ يَتْفِلَنَّ عَنْ يَمِينِهِ، وَلَكِنْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى». وَقَالَ سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ: لاَ يَتْفِلُ قُدَّامَهُ أَوْ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمَيْهِ. وَقَالَ شُعْبَةُ: لاَ يَبْزُقُ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ. وَقَالَ حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «لاَ يَبْزُقْ فِي الْقِبْلَةِ وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ»[1].

## ٨- باسێك: نوێژكەر قسە و موناجات لەگەڵ پەروەردگاری ﷻ دەكات

**٥٣١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان هەر كەسێك لە ئێوە كە نوێژ دەكات، وتووێژ دەكات لەگەڵ پەروەردگاریدا، دەی كەواتە با تف (یان**

---

[1] بڕوانە: ٢٤١.

**بەڵغەم) نەکاتە لای ڕاستیەوە، بەڵکوو بیکاتە ژێر قاچی چەپیەوە))، وە لەم فەرموودەیەدا سەعید دەڵێ: لە قەتادەوە (و لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:) ((با تف نەکاتە پێشەوە یان بەردەمی، بەڵکوو بیکاتە لای چەپیەوە، یان ژێر پێیەوە))، وە ڕیوایەتی شوعبە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تف نەکاتە بەردەمی و لای ڕاستیەوە، بەڵکوو بیکاتە لای چەپی یان ژێر پێیەوە))، وە حومەید لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((با تف نەکاتە قیبلە(ی مزگەوتەوە)، وە نەیکاتە لای ڕاستیەوە، بەڵکوو بیکاتە لای چەپی یان ژێر پێیەوە)).**

٥٣٢- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلاَ يَبْسُطْ ذِرَاعَيْهِ كَالْكَلْبِ، وَإِذَا بَزَقَ فَلاَ يَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ»[1].

**٥٣٢- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((بەرێکوپێکی سوژدە ببەن، باڵتان ڕامەخەن وەك سەگ (دەستەکانی ڕادەخات)، وە ئەگەر کەسێکتان تفی کرد با تف (یان بەڵغەم) نەکاتە بەردەمیەوە، وە نەیکاتە لای ڕاستییەوە، چونکە بێگومان ئەو کەسە لەگەڵ پەروەردگاریدا قسە دەکات)).**

## ٩- بابُ الإِبْرَادِ بِالظُّهْرِ فِي شِدَّةِ الحَرِّ

٥٣٣- ٥٣٤- حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ: حَدَّثَنَا الأَعْرَجُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ وَغَيْرُهُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَنَافِعٌ -مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ-

---

[1] بروانە: ٢٤١، ٨٢٢.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»[1].

## ٩- باسی (گەورەیی) دواخستنی نوێژی نیوەڕۆ بۆ کاتی فێنکی لە تینی گەرمادا

**٥٣٣- ٥٣٤- صالحی کوڕی کەیسان لە دوو ڕێگە لە هەریەك لە ئەبو هوڕەیرە و عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: هەردووکیان بۆیان گێڕایەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئەگەر زۆر گەرما بوو، ئەوە نوێژەکەتان (دوا بخەن و) بەفێنکی بیکەن، چونکە بێگومان تینی گەرما لە هەناسە و هاڵاوی ئاگری دۆزەخەوەیە)).**

٥٣٥- حَدَّثَنَا ابْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْمُهَاجِرِ أَبِي الْحَسَنِ، سَمِعَ زَيْدَ بْنَ وَهْبٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ النَّبِيِّ ﷺ الظُّهْرَ، فَقَالَ: «أَبْرِدْ أَبْرِدْ» أَوْ قَالَ: «انْتَظِرِ انْتَظِرْ». وَقَالَ: «شِدَّةُ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ». حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ[2].

**٥٣٥- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: بانگبێژەکەی پێغەمبەر ﷺ دەستی بە بانگی نیوەڕۆ کرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دوای بخە با فێنك بێ، دوای بخە با فێنك بێ))، یان فەرمووی: ((چاوەڕوان بکە، چاوەڕان بکە))، وە فەرمووی: ((تینی گەرما لە هەناسە و هاڵاوی دۆزەخەوەیە، جا ئەگەر قرچەی گەرما بوو، نوێژ**

---

[1] بڕوانە: ٥٣٦.

[2] بڕوانە: ٥٣٩، ٦٢٩، ٣٢٥٨.

**دوا بخەن و بەفێنکی بیکەن))، (ئەوەندە بانگ دوا کەوت) هەتا سێبەری گردۆڵکەکانمان بینی.**

٥٣٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَفِظْنَاهُ مِنَ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ .إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلاَةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ.[1].

**٥٣٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر تینی گەرما بوو، ئەوە نوێژ بەفێنکی بکەن، چونکە بەڕاستی تینی گەرما لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە)).**

٥٣٧- .وَاشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا فَقَالَتْ: يا رَبِّ، أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا. فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ: نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ، فَهُوَ أَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْحَرِّ، وَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الزَّمْهَرِيرِ.[2].

**٥٣٧- (ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) ((ئاگری دۆزەخ لای پەروەردگاری سکاڵای کرد و وتی: ئەی پەروەردگارم بەشێکم بەشێکمی خواردووە، جا ڕێگەی دا دوو هەناسە بدات: هەناسەدانێك لە زستاندا و هەناسەدانێکیش لە هاویندا، جا ئەمەیان ئەو تینی گەرمایە کە هەستی پێ دەکەن (لە هاویندا)، وە بەهێزترین سەرماشە ئەوەی هەستی پێ دەکەن (لە زستاندا))).**

٥٣٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: .أَبْرِدُوا بِالظُّهْرِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ. تَابَعَهُ سُفْيَانُ وَيَحْيَى وَأَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ[1].

---

[1] بڕوانە: ٥٣٣.

[2] بڕوانە: ٣٢٦٠.

٥٣٨- ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نوێژی نیوەڕۆ بەفێنكی بكەن، چونكە بێگومان تینی گەرما لە هاڵاوی ئاگری دۆزەخەوەیە)). سوفیان و یەحیا و ئەبو عەوانە لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، پاڵپشتی گێڕانەوەكەی حەفصیان كردووە.

## ١٠- بَابُ الإِبْرَادِ بِالظُّهْرِ فِي السَّفَرِ

٥٣٩- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا مُهَاجِرٌ أَبُو الْحَسَنِ -مَوْلًى لِبَنِي تَيْمِ اللَّهِ- قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ وَهْبٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَرَادَ الْمُؤَذِّنُ أَنْ يُؤَذِّنَ لِلظُّهْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَبْرِدْ». ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُؤَذِّنَ فَقَالَ لَهُ «أَبْرِدْ». حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلاَةِ»[2]. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (تَتَفَيَّأُ): تَتَمَيَّلُ.

## ١٠- باسی ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ بەفێنكی لە سەفەردا

٥٣٩- ئەبو زەڕی غیفاری ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین لە سەفەرێكدا، بانگبێژەكە ویستی بانگی نیوەڕۆ بدات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((با فێنك بێت))، پاشان ویستی بانگ بدات پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((با فێنك بێت))، (ئەوەندە دوای خست) هەتا سێبەری گردۆڵكەكانمان بینی، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان تینی گەرما لە هەناسە و هاڵاوی

---

[1] بڕوانە: ٣٢٥٩.

[2] بڕوانە: ٥٣٥.

دۆزەخەوەیە، جا ئەگەر قرچەی گەرما بوو، ئەوا نوێژی نیوەڕۆ بەفێنکی بکەن)). عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: مانای (تَتَفَيَّأُ)، واتە: لار دەبێتەوە (و سێبەر دەكات).

## ١١- بابُ وَقْتِ الظُّهْرِ عِنْدَ الزَّوَالِ

وَقَالَ جَابِر: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي بِالْهَاجِرَةِ[1].

٥٤٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ حِينَ زَاغَتِ الشَّمْسُ فَصَلَّى الظُّهْرَ، فَقَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَذَكَرَ السَّاعَةَ، فَذَكَرَ أَنَّ فِيهَا أُمُورًا عِظَامًا ثُمَّ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَسْأَلَ عَنْ شَيْءٍ فَلْيَسْأَلْ، فَلاَ تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَخْبَرْتُكُمْ مَا دُمْتُ فِي مَقَامِي هَذَا». فَأَكْثَرَ النَّاسُ فِي الْبُكَاءِ، وَأَكْثَرَ أَنْ يَقُولَ: «سَلُونِي». فَقَامَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُذَافَةَ السَّهْمِيُّ فَقَالَ: مَنْ أَبِي؟ قَالَ «أَبُوكَ حُذَافَةُ». ثُمَّ أَكْثَرَ أَنْ يَقُولَ: «سَلُونِي». فَبَرَكَ عُمَرُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا. فَسَكَتَ ثُمَّ قَالَ «عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ آنِفًا فِي عُرْضِ هَذَا الْحَائِطِ فَلَمْ أَرَ كَالْخَيْرِ وَالشَّرِّ»[2].

## ١١- باسی لادانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان سەرەتای کاتی نیوەڕۆیە

جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە قرچەی گەرمادا نوێژی نیوەڕۆی دەکرد.

٥٤٠- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لایدا، (لە ماڵ) ڕۆیشتە دەرەوە (بۆ مزگەوت) و نوێژی

---

[1] بڕوانە: ٥٦٠.

[2] بڕوانە: ٩٣.

**نیوەڕۆی کرد، ئینجا لەسەر دوانگە ڕاوەستا و باسی ڕۆژی دوایی کرد، باسی کرد کە لە ڕۆژی دواییدا چەند کارێکی گەورە و گرنگی تێدایە، پاشان فەرمووی: ((هەر کەس دەیەوێ دەربارەی شتێك پرسیار بکات، با پرسیار بکات، پرسیاری هەر شتێکم لێ بکەن، وەڵامتان دەدەمەوە هەتا لەم جێگایەدا بم))، جا خەڵکی دەستیان کرد بە گریان، ئەویش زۆر دەیفەرموو: ((پرسیارم لێ بکەن))، جا عەبدوڵای کوڕی حوزافەی سەهمی هەستایەوە و وتی: باوکم کێیە؟ فەرمووی: ((باوکت حوزافەیە))، پاشان زۆر دەیفەرموو: ((پرسیارم لێ بکەن))، ئینجا عومەر لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت، وتی: ڕازین خوا پەروەردگارمانە و ئیسلام ئایینمانە و موحەممەد ﷺ پێغەمبەرمانە، جا بێدەنگ بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئا ئێستا بەهەشت و دۆزەخم نیشان درا لەپاڵ ئەو دیوارەدا، جا هەرگیز وێنەی ئەو چاکە (ی کە لە بەهەشتدایە) و وێنەی ئەو خراپە (ی کە لە دۆزەخدایە) نەمبینیوە))[1].**

٥٤١- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الصُّبْحَ وَأَحَدُنَا يَعْرِفُ جَلِيسَهُ، وَيَقْرَأُ فِيهَا مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ، وَيُصَلِّي الظُّهْرَ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَالْعَصْرَ وَأَحَدُنَا يَذْهَبُ إِلَى أَقْصَى الْمَدِينَةِ ثُمَّ يَرْجِعُ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ -وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي الْمَغْرِبِ- وَلاَ يُبَالِي بِتَأْخِيرِ الْعِشَاءِ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ. ثُمَّ قَالَ: إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ. وَقَالَ مُعَاذٌ: قَالَ شُعْبَةُ: ثُمَّ لَقِيتُهُ مَرَّةً فَقَالَ: أَوْ ثُلُثِ اللَّيْلِ[2].

**٥٤١- ئەبو بەرزە ﷺ دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی دەکرد هەر کەسمان هاوڕێکەی پاڵی دەناسی (ئەوەندە دونیا ڕووناك دەبۆیەوە)، وە لە نوێژی**

---

[1] دروستە بەم جۆرەش کۆتایی فەرموودەکە مانا بکرێت: جا هەرگیز شتێکم نەبینیوە (کە هۆکار بێت بۆ چوونە بەهەشت) وەک چاکە، (وە هۆکاربێت بۆ چوونە دۆزەخ) وەک خراپە. بڕوانە: ارشاد الساری: ١٩٥/٢.

[2] بڕوانە: ٥٤٧، ٥٦٨، ٥٩٩، ٧٧١.

**بەیانیدا لە نێوان شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند، وە کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دەدا نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، عەسریشی دەکرد یەکێکمان دەڕۆیشت بۆ ئەوپەڕی مەدینە و دەگەڕایەوە هێشتا خۆر بەتەواوی دەبینرا (ئاوا نەبووبوو)، -(ئەبو مینهال دەڵێ:) بەڵام لەبیرم چوو دەربارەی مەغریب (ئەبو بەرزە) چی وت- وە گرنگ نەبوو بەلایەوە دواخستنی عیشا تا سێیەکی شەو، پاشان وتی: تا نیوەی شەو، موعاز وتی: شوعبە دەڵێ: جارێك بە ئەبو مینهال گەشتم وتی: یان سێیەکی شەو.**

٥٤٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ -يَعْنِي: ابْنَ مُقَاتِلٍ- قَالَ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنِي غَالِبٌ الْقَطَّان، عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالظَّهَائِرِ فَسَجَدْنَا عَلَى ثِيَابِنَا اتِّقَاءَ الْحَرِّ[١].

**٥٤٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە ئەگەر لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژی نیوەڕۆیانمان بکردایە، لەسەر جلوبەرگەکانمان سوژدەمان دەبرد بۆ خۆپاراستن لە گەرمی (چەو و بەردی زەوییەکە).**

## ١٢- بابُ تَأْخِيرِ الظُّهْرِ إِلَى العَصْرِ

٥٤٣- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ -هُوَ: ابْنُ زَيْدٍ- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ زَيْدٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِالْمَدِينَةِ سَبْعًا وَثَمَانِيًا، الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ. فَقَالَ أَيُّوبُ: لَعَلَّهُ فِي لَيْلَةٍ مَطِيرَةٍ؟ قَالَ: عَسَى[٢].

---

[١] بڕوانە: ٣٨٥.

[٢] بڕوانە: ٥٦٢، ١١٧٤.

## ١٢- باسی دواخستنی نوێژی نیوەڕۆ بۆ کاتی عەسر

**٥٤٣- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە (جارێ) حەوت ڕکات و (جارێ) هەشت ڕکات نوێژی کرد[1] (کە کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر هەروەها مەغریب و عیشا بوو، ئەیوب (سختیانی) وتی (بە جابیر): لەوانەیە لە شەوێکی باراناویدا بووبێ؟ (جابیر) وتی: لەوانەیە.**

## ١٣- بابُ وَقْتِ العَصْرِ

وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ: مِنْ قَعْرِ حُجْرَتِهَا.

٥٤٤- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ لَمْ تَخْرُجْ مِنْ حُجْرَتِهَا[2].

## ١٣- باسی کاتی نوێژی عەسر

**ئەبو ئوسامە لە هیشامەوە گێڕاویەتەوە وتی: (نوێژی عەسر دەکرا خۆر) لەنێو ماڵی عائیشەدا مابوو.**

**٥٤٤- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد، هێشتا تیشکی خۆر لە ژوورەکەمدا مابوو.**

٥٤٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ فِي حُجْرَتِهَا، لَمْ يَظْهَرِ الْفَيْءُ مِنْ حُجْرَتِهَا[1].

---

[1] هەشت ڕکاتەکە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بوو، حەوت ڕکاتەکەش نوێژی مەغریب و عیشا بوو.

[2] بڕوانە: ٥٢٢.

**٥٤٥- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد تیشکی خۆر لە ژوورەکەیدا بوو، هێشتا سێبەر پەیدا نەبووبوو لە ژوورەکەیدا.**

٥٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي صَلاَةَ الْعَصْرِ وَالشَّمْسُ طَالِعَةٌ فِي حُجْرَتِي، لَمْ يَظْهَرِ الْفَيْءُ بَعْدُ. وَقَالَ مَالِكٌ، وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَشُعَيْبٌ، وَابْنُ أَبِي حَفْصَةَ: وَالشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ.

**٥٤٦- عائیشه ﵂ دەڵێ: هەمیشه کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەسری دەکرد، تیشکی خۆر لە ژوورەکەمدا مابوو، هێشتا سێبەری لێ نەهاتبوو. مالیك و یەحیای کوڕی سەعید و شوعەیب و ئیبنو ئەبو حەفصە بەم شێوە گێڕاویانەتەوە: پێش ئەوەی خۆر دەربچێ و نەمێنێ (لە ژوورەکەیدا).**

٥٤٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَوْفٌ، عَنْ سَيَّارِ بْنِ سَلاَمَةَ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَأَبِي عَلَى أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ؟ فَقَالَ: كَانَ يُصَلِّي الْهَجِيرَ الَّتِي تَدْعُونَهَا الأُولَى حِينَ تَدْحَضُ الشَّمْسُ، وَيُصَلِّي الْعَصْرَ، ثُمَّ يَرْجِعُ أَحَدُنَا إِلَى رَحْلِهِ فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ -وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي الْمَغْرِبِ- وَكَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ الَّتِي تَدْعُونَهَا الْعَتَمَةَ، وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا، وَكَانَ يَنْفَتِلُ مِنْ صَلاَةِ الْغَدَاةِ حِينَ يَعْرِفُ الرَّجُلُ جَلِيسَهُ، وَيَقْرَأُ بِالسِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ[٢].

**٥٤٧- سەیاری کوڕی سەلامە دەڵێ: من و باوکم ڕۆیشتین بۆ لای ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﵁، ئینجا باوکم پێی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نوێژی فەرزی**

---

[١] بڕوانە: ٥٢٢.

[٢] بڕوانە: ٥٤١.

**دەکرد؟ ئەویش وتی: نوێژی قرچەی گەرمای نیوەڕۆی دەکرد، کە ئێوە پێی دەڵێن نوێژی یەکەم، کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دەدا، وە نوێژی عەسری دەکرد، پاشان کەسمان هەبوو (دوای کردنی نوێژەکە بەکۆمەڵ) دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە یان لە قەراغی شاری مەدینە هێشتا خۆر بە ئاسمانەوە بوو (گەرمای مابوو)، -بەڵام لەبیرم چوو دەربارەی مەغریب چی وت-، پێی خۆش بوو نوێژی عیشا کە ئێوە پێی دەڵێن عەتەمە دوا بخات (بۆ سێیەك یان نیوەی شەو)، وە لای ناپەسەند بوو خەوتن پێش نوێژی عیشا و قسەکردن (کە پێویست نەبێ) لەپاش عیشا، کاتێ لە نوێژی بەیانی دەبۆیەوە، هەر کەس هاوڕێکەی پاڵی دەناسییەوە، وە لە نوێژی بەیانیاندا شەست تا سەد ئایەتی دەخوێند.**

٥٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الْعَصْرَ ثُمَّ يَخْرُجُ الإِنْسَانُ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَيَجِدُهُمْ يُصَلُّونَ الْعَصْرَ[1].

**٥٤٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە نوێژی عەسرمان دەکرد، پاشان کەسێك (کە نوێژی عەسری کردبوو) دەچوو بۆ خێڵی عەمری کوڕی عەوف (لە قوباو کە دوو میل لە مەدینە دوور بوو لەو کاتەدا)، دەیبینین نوێژی عەسر دەکەن.**

٥٤٩- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ يَقُولُ: صَلَّيْنَا مَعَ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ الظُّهْرَ، ثُمَّ خَرَجْنَا حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، فَوَجَدْنَاهُ يُصَلِّي الْعَصْرَ، فَقُلْتُ:يا عَمِّ، مَا هَذِهِ الصَّلاَةُ الَّتِي صَلَّيْتَ؟ قَالَ: الْعَصْرُ، وَهَذِهِ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّتِي كُنَّا نُصَلِّي مَعَهُ.

---

[1] بڕوانە: ٥٥٠، ٥٥١، ٧٣٢٩.

**٥٤٩- ئەبو ئومامە دەڵێ: لەگەڵ عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا نوێژی نیوەڕۆمان کرد، پاشان ڕۆیشتین تا چووینە لای ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ، دەبینین نوێژی عەسر دەکات، وتم: مامە ئەم نوێژە چ نوێژێکە کە تۆ کردت؟ وتی: نوێژی عەسرە، وە نوێژکردنی عەسری پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بوو کە ئێمە لە خزمەتیدا نوێژمان دەکرد.**

٥٥٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، وَبَعْضُ الْعَوَالِي مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَمْيَالٍ أَوْ نَحْوِهِ[1].

**٥٥٠- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد خۆر هێشتا بە ئاسمانەوە بەرز بوو (دوای نوێژکردنەکە)، وە کەسێك بیویستایە بڕوات بۆ عەوالی (دێهاتەکانی دەوروبەری مەدینە ڕوو بە نەجد) دەگەیشتە لایان هێشتا خۆر بەرز بوو، وە هەندێ (لەگوندەکانی) عەوالی لە مەدینەوە چوار میل، یان نزیك لەوە دەبوو.**

٥٥١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الْعَصْرَ ثُمَّ يَذْهَبُ الذَّاهِبُ مِنَّا إِلَى قُبَاءٍ، فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ[2].

**٥٥١- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە نوێژی عەسرمان دەکرد، پاشان کەسێکمان بڕۆیشتایە بۆلای (خەڵکی) قوباو دەڕۆیشت بۆلایان هێشتا خۆر بەرز بوو.**

---

[1] بڕوانە: ٥٤٨.

[2] بڕوانە: ٥٤٨.

## ١٤- بابُ إِثْمِ مَنْ فَاتَتْهُ العَصْرُ

٥٥٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ». قالَ أبو عَبْدِ اللَّهِ: ﴿ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ ﴿٣٥﴾ ﴾ محمد. وَتَرْتُ الرَّجُلَ: إذا قَتَلْتَ لَهُ قَتِيلاً، أَو أخَذتَ لَهُ مَالاً.

## ١٤- باسی تاوانی ئەو کەسەی نوێژی عەسری بڕوات

**٥٥٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەو کەسەی نوێژی عەسری بڕوات (بەبێ بیانوو)، وەك ئەوە وایە ماڵ و منداڵی لێ سەنرابێتەوە و تیا چووبن)). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ﴿ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ ﴿٣٥﴾ ﴾[1] وَتَرْتُ الرَّجُلَ: ئەگەر کەسێکی لێ بکوژی، یان سامان و ماڵەکەی لێ بسەنی.**

## ١٥- بابُ مَنْ تَرَكَ العَصْرَ

٥٥٣- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ قَالَ: كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ فِي غَزْوَةٍ فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ، فَقَالَ: بَكِّرُوا بِصَلاَةِ الْعَصْرِ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ صَلاَةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ»[2].

---

[1] ﴿ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ ﴿٣٥﴾ ﴾ واتە: (پاداشتی کردەوەکانتان کەم کاتەوە).

[2] بڕوانە: ٥٩٤.

## ١٥- باسی (تاوانی) ئەو كەسەی (بەئەنقەست) نوێژی عەسر نەكات

٥٥٣- ئەبو مەلیح دەڵێ: لەغەزایەكدا ئێمە لەگەڵ بورەیدەدا بووین، ڕۆژێكی هەور بوو وتی: پەلە بكەن لە كردنی نوێژی عەسردا، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر كەس نوێژی عەسر نەكات، ئەوە بێگومان كردەوەكانی پوچەڵ بووەتەوە)).

## ١٦- بَابُ فَضْلِ صَلاَةِ العَصْرِ

٥٥٤- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَظَرَ إِلَى القَمَرِ لَيْلَةً -يَعْنِي الْبَدْرَ- فَقَالَ :إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ ﴾ ق، قَالَ إِسْمَاعِيلُ: افْعَلُوا، لاَ تَفُوتَنَّكُمْ[1].

## ١٦- باسی گەورەیی نوێژی عەسر

٥٥٤- جەریر ﷺ دەڵێ: شەوێك لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، سەیری مانگی كرد -مەبەستی مانگی چواردە بوو-، جا فەرمووی: ((بێگومان ئێوە پەروەردگارتان دەبینن هەروەك چۆن ئەو مانگی چواردەیە دەبینن، بەبێ قەرەباڵغی و پاڵپاڵێن ناكەن بۆ بینینی، جا هەتا دەتوانن نوێژی پێش

---

[1] بڕوانە: ٥٧٣، ٤٨٥١، ٧٤٣٤، ٧٤٣٥، ٧٤٣٦.

خۆرهەڵاتن و نوێژی پێش خۆرئاوابوون (بەیانییان و عەسران) مەفەوتێنن و بیانكەن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وە بەندایەتی و ستاییشی پەروەردگارتان بكەن پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوابوون))). ئیسماعیل (كە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیەیە) دەڵێ: وشەی (افْعَلُوا) یانی با لە دەستتان دەرنەچن (ئەو دوو نوێژی بەیانی و عەسرە).

٥٥٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ -وَهْوَ أَعْلَمُ بِهِمْ- كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ»[1].

٥٥٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((چەند فریشتەیەك بەشەو و چەند فریشتەیەك بەڕۆژ بە شوێن یەكدیدا بەنۆرە لەگەڵتانن، لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسردا بەیەك دەگەن، پاشان ئەوانەی لەگەڵتان بوون بەرز دەبنەوە (بۆ خزمەتی خوای گەورە)، ئەویش پرسیاریان لێ دەكات (دەربارەی بەندەكان) -لە كاتێكدا خۆی شارەزاترە بە بەندەكان لەوان-: چۆن بەندەكانی منتان بەجێ هێلا؟ فریشتەكانیش دەڵێن: كە بەجێمان هێلان نوێژیان دەكرد، كاتێكیش ڕۆیشتین بۆ لایان نوێژیان دەكرد)).

---

[1] بڕوانە: ٣٢٢٣، ٧٤٢٩، ٧٤٨٦.

## ١٧- بابُ مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ الْغُرُوبِ

٥٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَدْرَكَ أَحَدُكُمْ سَجْدَةً مِنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَلْيُتِمَّ صَلاَتَهُ، وَإِذَا أَدْرَكَ سَجْدَةً مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَلْيُتِمَّ صَلاَتَهُ»[1].

## ١٧- باسی (حوکمی) کەسێک بە یەک ڕکاتی نوێژی عەسردا بگات پێش خۆرئاوابوون

**٥٥٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان بگات بە یەك ڕکاتی نوێژی عەسردا پێش ئەوەی خۆر ئاوا ببێت، ئەوە با نوێژەکەی تەواو بکات، هەروەها ئەگەر بە یەك ڕکاتی نوێژی بەیانی گەشت پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ، ئەوە با نوێژەکەی تەواو بکات)).**

٥٥٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا بَقَاؤُكُمْ فِيمَا سَلَفَ قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْعَصْرِ إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ، أُوتِيَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ التَّوْرَاةَ فَعَمِلُوا حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ النَّهَارُ عَجَزُوا، فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُوتِيَ أَهْلُ الإِنْجِيلِ الإِنْجِيلَ فَعَمِلُوا إِلَى صَلاَةِ الْعَصْرِ، ثُمَّ عَجَزُوا، فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُوتِينَا الْقُرْآنَ فَعَمِلْنَا إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ، فَأُعْطِينَا قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، فَقَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ: أَيْ رَبَّنَا، أَعْطَيْتَ هَؤُلاَءِ قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، وَأَعْطَيْتَنَا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، وَنَحْنُ كُنَّا أَكْثَرَ عَمَلًا -قَالَ:- قَالَ اللَّهُ ﷻ: هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ أَجْرِكُمْ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَهُوَ فَضْلِي أُوتِيهِ مَنْ أَشَاءُ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٥٧٩، ٥٨٠.

[2] بڕوانە: ٢٢٦٨، ٢٢٦٩، ٣٤٥٩، ٥٠٢١، ٧٤٦٧، ٧٥٣٣.

**٥٥٧- سالیمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای باوکیەوە ﵄ کە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((بێگومان مانەوەی ئێوە لەچاو مانەوەی ئەو گەلانەی لەپێش ئێوەدا بوون و تێ پەڕین، وەك نێوان نوێژی عەسر تا خۆرئاوابوونە، جوولەکەکانی خاوەن تەوڕات تەوڕاتیان پێ درا و تا ڕۆژ نیوە بوو کاریان پێ کرد، ئیدی نەیانتوانی و پەکیان کەوت، بۆیە سەرو قیراتیان پێ درا، پاشان (گاورە) خاوەن ئینجیلەکان ئینجیلیان پێ درا، جا ئەوانیش تا نوێژی عەسر کاریان پێ کرد، پاشان نەیانتوانی و پەکیان کەوت، ئەوانیش هەرکەس و سەرو قیراتیان پێ درا، پاشان ئێمە قورئانمان پێ درا و تا خۆرئاوابوون کارمان پێ کرد، هەر یەکەمان دوو قیراتی پێ درا، جا خاوەن تەوڕات و ئینجیلەکان وتیان: ئەی پەروەردگارمان ئەوان سەرو دوو قیراتت پێ داون، بەڵام ئێمە سەرو قیراتێکت پێ داوین، لە کاتێکدا ئێمە کاری زۆرترمان کردووە؟))، (عەبدوڵا دەڵێ پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((خوا ﷻ فەرمووی: ئایە لە پاداشتەکەی خۆتان هیچ ستەمێکم لێ کردوون؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی دەی ئەوە بەخششی خۆمە بەکێم بووێ دەیدەم پێی)).**

٥٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: .مَثَلُ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ وَالنَّصَارَى كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَأْجَرَ قَوْمًا يَعْمَلُونَ لَهُ عَمَلًا إِلَى اللَّيْلِ، فَعَمِلُوا إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ، فَقَالُوا: لاَ حَاجَةَ لَنَا إِلَى أَجْرِكَ. فَاسْتَأْجَرَ آخَرِينَ فَقَالَ: أَكْمِلُوا بَقِيَّةَ يَوْمِكُمْ، وَلَكُمُ الَّذِي شَرَطْتُ، فَعَمِلُوا حَتَّى إِذَا كَانَ حِينَ صَلاَةِ الْعَصْرِ قَالُوا: لَكَ مَا عَمِلْنَا. فَاسْتَأْجَرَ قَوْمًا فَعَمِلُوا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ، وَاسْتَكْمَلُوا أَجْرَ الْفَرِيقَيْنِ.[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٢٧١.

**٥٥٨- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((نموونەی موسوڵمان و جوولەکە و گاور وەك پیاوێك وایە خەڵکانێکی بەکرێ گرتبێ کارێکی بۆ بکەن، لە سەرەتای ڕۆژەوە تا شەو دادێ، جا (جوولەکەکان) کاریان کرد تا نیوەڕاستی ڕۆژ، ئینجا وتیان: پێویستمان بە کرێی تۆ نییە، ئینجا خەڵکانی دیکەی بەکرێ گرت (گاورەکان) و وتی: کاری ئەوەی ماوە لە ڕۆژەکەتان بیکەن، بەڵام بەو مەرجەی کە دامناوە (تا شەو کار بکەن)، جا ئەوانیش کاریان کرد تا نوێژی عەسر وتیان: هەرچیمان کردووە بۆ خۆت، ئینجا خەڵکانێکی دیکەی بەکرێ گرت، ئەوەی مابوو لە کاری ڕۆژەکەیان تا خۆرئاوابوون کردیان، وە کرێ و پاداشتی دوو کۆمەڵەکەی دیکەیان تەواو کرد و بەئەنجامیان گەیاند)).**

## ١٨- بابُ وَقْتِ المَغْرِبِ

وَقَالَ عَطَاءٌ: يَجْمَعُ المَرِيضُ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ.

٥٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مِهْرَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو النَّجَاشِيِّ صُهَيْبٌ -مَوْلَى رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ- قَالَ: سَمِعْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ يَقُولُ: كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ.

## ١٨- باسی (دیاریکردنی) کاتی نوێژی ئێوارە

**عەتاو دەڵێ: نەخۆش نوێژی ئێوارە و عیشا کۆ دەکاتەوە.**

**٥٥٩- ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نوێژی ئێوارەمان دەکرد، جا هەر کام لە ئێمە کە دەگەڕایەوە، (تیرمان دەهاویشت) ئەو کەسە شوێنی پێکانی تیرەکەی دەبینێ.**

٥٦٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: قَدِمَ الْحَجَّاجُ فَسَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، فَقَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ نَقِيَّةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالْعِشَاءَ أَحْيَانًا وَأَحْيَانًا، إِذَا رَآهُمُ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ أَبْطَوْا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ كَانُوا -أَوْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ[1].

**٥٦٠- موحەممەدی کوڕی عەمر دەڵێ: حەججاج هات (بۆ مەدینە نوێژی دوا دەخست)، ئێمەش پرسیارمان لە جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ کرد وتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی لە قرچەی گەرمادا دەکرد، عەسریشی کاتێ دەکرد خۆر پاك و ڕۆشن بوو، ئێوارەشی کاتێ دەکرد خۆرئاوا بووبوو، عیشاشی هەندێ جار زوو دەکرد، هەندێ جاریش دوای دەخست، گەر بیبینیبایە موسوڵمانان کۆ بوونەتەوە پەلەی دەکرد، وە ئەگەر بیبینیبایە دوا دەکەون دوای دەخست، ئەوان (هاوەڵان) -یان پێغەمبەر ﷺ- نوێژی بەیانییان بەتاریکی دەکرد.**

٥٦١- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: قَالَ حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْمَغْرِبَ إِذَا تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ.

**٥٦١- سەلەمە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی ئێوارەمان دەکرد، کاتێ بەتەواوی خۆرئاوا دەبوو (دیار نەدەما).**

٥٦٢- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ زَيْدٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ سَبْعًا جَمِيعًا وَثَمَانِيًا جَمِيعًا[2].

---

[1] بڕوانە: ٥٦٥.

[2] بڕوانە: ٥٤٣.

٥٦٢- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەوت ڕکات نوێژی کرد بە کۆکردنەوە (ی نوێژی ئێوارە و عیشا پێکەوە)، هەشت ڕکاتیشی کرد بە کۆکردنەوە (ی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە).

## ١٩- بابُ مَنْ كَرِهَ أَنْ يُقَالَ لِلْمَغْرِبِ: الْعِشَاءُ

٥٦٣- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ -هُوَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو- قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنِ الْحُسَيْنِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ الْمُزَنِيُّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَغْلِبَنَّكُمُ الأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلاَتِكُمُ الْمَغْرِبِ». قَالَ: وَتَقُولُ الأَعْرَابُ: هِيَ الْعِشَاءُ.

## ١٩- باسی ئەوەی لای پەسەند نییە بە نوێژی ئێوارە بوترێ: عیشا

٥٦٣- عەبدوڵای کوڕی بورەیدە دەڵێ عەبدوڵای موزەنی ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((با عەرەبە دەشتەکییەکان زاڵ نەبن بەسەرتاندا لەسەر ناوی نوێژەکەتان کە مەغریبە))، عەبدوڵای موزەنی دەڵێ: عەرەبە دەشتەکییەکان بە مەغریب دەڵێن: عیشا (چونکە عەرەبە دەشتەکییەکان زاراوەی عیشا بۆ سەرەتای شەو بەکار دێنن).

## ٢٠- بابُ ذِكْرِ الْعِشَاءِ وَالْعَتَمَةِ وَمَنْ رَآهُ وَاسِعًا

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ((أَثْقَلُ الصَّلاَةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ الْعِشَاءُ وَالْفَجْرُ))[1]. وَقَالَ: ((لَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالْفَجْرِ))[1]. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَالِاخْتِيَارُ أَنْ يَقُولَ: الْعِشَاءُ؛

[1] بڕوانە: ٦٥٧.

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ﴿٥٨﴾ ﴾ النور. وُيذْكَرُ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: كُنا نَتَنَاوَبُ النَّبِيَّ ﷺ عِنْدَ صَلَاةِ العِشَاءِ فَأَعْتَمَ بِهَا[٢]. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ وَعَائِشَةُ: أَعْتَمَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْعِشَاءِ[٣]. وَقَالَ بَعْضُهُمْ عَنْ عَائِشَةَ: أَعْتَمَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْعَتَمَةِ[٤]. وَقَالَ جَابِرٌ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي العِشَاءَ[٥]. وَقَالَ أَبُو بَرْزَةَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُؤَخِّرُ العِشَاءَ[٦]. وَقَالَ أَنَسٌ: أَخَّرَ النَّبِيُّ ﷺ العِشَاءَ الآخِرَةَ[٧]. وَقَالَ ابن عُمَرَ، وَأَبُو أَيُّوبَ، وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ المَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ[٨].

٥٦٤- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُس، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ سَالِمٌ أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً صَلاَةَ الْعِشَاءِ -وَهْيَ الَّتِي يَدْعُو النَّاسُ الْعَتَمَةَ- ثُمَّ انْصَرَفَ، فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا فَقَالَ: «أَرَأَيْتُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ؟ فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ»[٩].

---

[١] بڕوانە: ٦١٥.

[٢] بڕوانە: ٥٦٧.

[٣] بڕوانە: ٥٦٦، ٥٧١.

[٤] بڕوانە: ٨٦٤.

[٥] بڕوانە: ٥٦٥.

[٦] بڕوانە: ٥٤٧.

[٧] بڕوانە: ٥٧٢.

[٨] بڕوانە: ١١٠٧، ٤٤١٤، ١٦٧٣.

[٩] بڕوانە: ١١٦.

# ٢٠- باسی ناوبردنی نوێژی عیشا و عەتەمە، وە ئەو کەسەی بۆچوونی وایە (بوترێت) عیشا دروستە

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ فەرموویەتی: ((قورسترین نوێژ بەلای دووڕووانەوە نوێژی عیشا و بەیانییە))، وە دەفەرمووێ: ((ئەگەر بیانزانیبایە چ پاداشتێك لە نوێژی عیشا و بەیانیدا هەیە (دەهاتن بۆیان)))، ئەبو عەبدولاّ (ئیمام بوخاری) دەڵێ: قسەی ڕاست و هەڵبژاردە ئەوەیە بڵێی: عیشا، لەبەر ئەم فەرماییشتەی خودا: (لەدوای نوێژی عیشاوە)، وە لە ئەبو مووسا دەگێڕدرێتەوە کە وتوویەتی: ئێمە نۆرەمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بۆ نوێژی عیشا (هەمووومان پێکەوە نەدەهاتین)، بۆیە ئەویش نوێژەکەی دوا دەخست. عەبدولاّی کوڕی عەباس و عائیشە ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دواخست، وە هەندێك لە عائیشەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەتەمەی[1] دوا خست، وە جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای دەکرد، ئەبو بەرزە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای دوا دەخست، وە ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای دووەمی دوا خست، وە عەبدولاّی کوڕی عومەر و ئەبو ئەیوب و عەبدولاّی کوڕی عەباس ﷺ دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئێوارە و عیشای کرد.

٥٦٤- سالیم دەڵێ: عەبدولاّ ﷺ پێی وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك پێشنوێژی نوێژی عیشای بۆ کردین، کە ئەو نوێژەیە خەڵکی ناوی دەبەن بە عەتەمە، پاشان نوێژەکەی تەواو کرد و ڕووی تێ کردین و فەرمووی: ((هەواڵم بدەنێ

---

[1] واتە: عەتەمەی لەجیاتی عیشا بەکار هێناوە، بەڵام ئەوە ڕاوییەکە وای لێ کردوە، ئەگینا بەم شێوەیە: (پێغەمبەر ﷺ) شەوێک نوێژی عیشای دوا خست، کە ئەو نوێژەیە خەڵکی پێی دەڵێن: عەتەمە. (فتح الباری: ٥٨/٣).

ئەم شەو چ شەوێکە؟ ئەوسا دڵنیا بن لە ئەم شەوەوە تا سەد ساڵی دیکە هیچ کەس لەوانەی ئێستا لەسەر زەویدان نەماون))[1].

## ٢١- بابُ وَقْتِ العِشَاءِ إِذَا اجْتَمَعَ النَّاسُ، أَوْ تَأَخَّرُوا

٥٦٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو -هُوَ: ابْنُ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ- قَالَ: سَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ صَلاَةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: كَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالْعِشَاءَ إِذَا كَثُرَ النَّاسُ عَجَّلَ، وَإِذَا قَلُّوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ بِغَلَسٍ[2].

## ٢١- باسی کاتی نوێژی عیشا

## ئەگەر خەڵک کۆ و ئامادە بوون، یان دوا کەوتن

٥٦٥- موحەممەدی کوڕی عەمر-کە کوڕی حەسەنی کوڕی عەلییە- دەڵێ: پرسیارمان لە جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش وتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی لە قرچەی گەرمادا دەکرد، نوێژی عەسریشی دەکرد هێشتا خۆر بە ئاسمانەوە زیندوو و پرشنگدار بوو، نوێژی ئێوارەشی کاتێ دەکرد خۆرئاوا دەبوو، نوێژی عیشاش ئەگەر خەڵك زۆر ئامادە بوونایە زوو دەیکرد، بەڵام ئەگەر کەم بوونایە دوای دەخست (بۆئەوەی بێن)، نوێژی بەیانیشی بەتاریکی و لێڵی دەکرد.

---

[1] سەرنج: لەم فەرموودەیەدا ئەو مانایە وەرناگیرێ کە کەس لەدوای ئەو سەد ساڵەی پێغەمبەری خودا ﷺ باسی کردووە لە سەردەمی خۆیدا لەسەر زەوی نامێنێ، بەڵکوو مەبەستی لەوانەیە کە لەو سەردەم و چەرخەی ئەودا دەژین، پاش سەد ساڵی دیکە کەسیان نامێنن)، بڕوانە: إرشاد الساري:٢١٥/٢. ئەوەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ لەدوای گەڕان و وردبوونەوە لە کتێبەکانی ژیاننامە و تەڕاجیم دەرکەوتووە، لەو سەد ساڵەدا کەس نەماوە کە بوونی هەبووە لە سەردەمی وتنی ئەو فەرموودەیەوە.

[2] بڕوانە: ٥٦٠.

# ٢٢- بابُ فَضْلِ العِشَاءِ

٥٦٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ قَالَتْ: أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً بِالْعِشَاءِ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَفْشُوَ الإِسْلاَمُ، فَلَمْ يَخْرُجْ حَتَّى قَالَ عُمَرُ: نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ. فَخَرَجَ فَقَالَ لأَهْلِ الْمَسْجِدِ: «مَا يَنْتَظِرُهَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ غَيْرُكُمْ»[1].

# ٢٢- باسی گەورەیی نوێژی عیشا[2]

**٥٦٦- عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ بۆی گێڕاوەتەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك نوێژی عیشای دوا خست، ئەوەش پێش بڵاوبوونەوەی ئیسلام بوو، پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ نەهاتە دەرەوە هەتا عومەر ﵁ وتی: ئافرەتان و منداڵان خەوتن. ئینجا هاتە دەرەوە بۆ مزگەوت و فەرمووی بەو خەڵکەی لە مزگەوتدا بوون: ((جگە لە ئێوە کەسی دیکە لە خەڵکی سەر زەوی چاوەڕوانی ئەم نوێژە ناکات)).**

٥٦٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَأَصْحَابِي الَّذِينَ قَدِمُوا مَعِي فِي السَّفِينَةِ نُزُولًا فِي بَقِيعِ بُطْحَانَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، فَكَانَ يَتَنَاوَبُ النَّبِيَّ ﷺ عِنْدَ صَلاَةِ الْعِشَاءِ كُلَّ لَيْلَةٍ نَفَرٌ مِنْهُمْ، فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ ﷺأَنَا وَأَصْحَابِي وَلَهُ بَعْضُ الشُّغْلِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ، فَأَعْتَمَ بِالصَّلاَةِ حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ، ثُمَّ خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فَصَلَّى بِهِمْ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ قَالَ لِمَنْ حَضَرَهُ: «عَلَى رِسْلِكُمْ، أَبْشِرُوا، إِنَّ مِنْ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكُمْ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ يُصَلِّي هَذِهِ السَّاعَةَ غَيْرُكُمْ». أَوْ قَالَ: «مَا صَلَّى هَذِهِ السَّاعَةَ أَحَدٌ غَيْرُكُمْ». لاَ يَدْرِي أَيَّ الْكَلِمَتَيْنِ قَالَ. قَالَ أَبُو مُوسَى: فَرَجَعْنَا، فَفَرِحْنَا بِمَا سَمِعْنَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

---

[1] بڕوانە: ٥٦٩، ٨٦٢، ٨٦٤.

[2] یان گەورەیی چاوەڕوانکردنی.

٥٦٧- ئەبو بوردە دەگێڕێتەوە لە ئەبو مووساوە ﷺ دەڵێ: من و ئەو هاوڕێیانەم کە لە کەشتییەکەدا لەگەڵماندا هاتنەوە لە بەقیعی بوتحان لامان دابوو، پێغەمبەریش ﷺ لە مەدینە بوو، هەر شەوی چەند کەسێکیان بەنۆرە دەچۆیە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی عیشادا، جا من و هاوڕێکانم لە کاتێکدا چووینە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، هەندێ سەرقاڵی هەبوو بە ئیشوکاری خۆیەوە، بۆیە نوێژی عیشای دوا خست تا درەنگانێکی شەو، پاشان پێغەمبەر ﷺ هات پێشنوێژی بۆ کردن، جا کە لە نوێژەکەی بۆیەوە بەو کەسانەی فەرموو کە ئامادەبوون لەگەڵیدا: ((پەلە مەکەن مژدەتان لێ بێ ئەمە لە بەخششی خوایە بەسەرتانەوە، بێگومان ئا لەم کاتەدا کەس نییە نوێژ بکات جگە لە ئێوە))، یان فەرمووی: ((لەم کاتەدا کەس نوێژی نەکردووە جگە لە ئێوە))، نازانێ (یان نازانم)[1] کام ڕستەیانی فەرمووە، ئەبو مووسا دەڵێ: جا گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە و دڵخۆش بووین بەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەری خوامان ﷺ بیست.

## ٢٣- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ النَّوْمِ قَبْلَ العِشَاءِ

٥٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا[2].

---

[1] وەك ئەوەی لە گێڕانەوەیەکی دیکەی بوخاریدا هاتووە. إرشاد الساري: ٢١٨/٢.

[2] بڕوانە: ٥٤١.

## ٢٣- باسی ئەوەی بە ناپەسەند دادەنرێت لە خەوتن لەپێش عیشادا

**٥٦٨- ئەبو بەرزە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خەوتن لەپێش عیشا و قسەکردن لەدوای عیشا بەلایەوە ناپەسەند بوو.**

## ٢٤- بَابُ النَّوْمِ قَبْلَ الْعِشَاءِ لِمَنْ غُلِبَ

٥٦٩- حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ: قَالَ صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَت: أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْعِشَاءِ حَتَّى نَادَاهُ عُمَرُ: الصَّلاَةَ، نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ. فَخَرَجَ فَقَالَ: «مَا يَنْتَظِرُهَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ غَيْرُكُمْ». قَالَ: وَلاَ يُصَلَّى يَوْمَئِذٍ إِلاَّ بِالْمَدِينَةِ، وَكَانُوا يُصَلُّونَ فِيمَا بَيْنَ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ الأَوَّلِ[1].

## ٢٤- باسی خەوتن پێش عیشا بۆ کەسێ خەو زۆری بۆ بێنێ (ناپەسەند نییە)

**٥٦٩- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك نوێژی عیشای دوا خست، هەتا عومەر ﷺ بانگی کرد وتی: ژن و منداڵەکان خەوتن، پێغەمبەریش ﷺ لە ماڵ هاتە دەرەوە بۆ مزگەوت و فەرمووی: ((جگە لەئێوە کەس لە خەڵکی سەر زەوی چاوەڕوانی ئەم نوێژە ناکات))، عائیشە دەڵێ: لەو ڕۆژگارەدا لە مەدینە نەبێ نوێژ (ی بەکۆمەڵ) نەدەکرا، وە موسوڵمانان لەو کاتەدا لە نێوان ئاوابوونی سووراییی ڕۆژ (پاش ئاوابوونی خۆر) تا سێیەکی یەکەمی شەو نوێژی عیشایان دەکرد.**

---

[1] بڕوانە: ٥٦٦.

٥٧٠- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ شُغِلَ عَنْهَا لَيْلَةً، فَأَخَّرَهَا حَتَّى رَقَدْنَا فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا، ثُمَّ رَقَدْنَا، ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا، ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ غَيْرُكُمْ». وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يُبَالِي أَقَدَّمَهَا أَمْ أَخَّرَهَا، إِذَا كَانَ لاَ يَخْشَى أَنْ يَغْلِبَهُ النَّوْمُ عَنْ وَقْتِهَا، وَكَانَ يَرْقُدُ قَبْلَهَا. قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ.

**٥٧٠- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك سەرقاڵ بوو نوێژی عیشای بۆ نەكرا، بەو هۆیەوە دوای خست هەتا لە مزگەوتدا خەوتین، پاشان خەبەرمان بۆیەوە، ئینجا خەوتینەوە، پاشان خەبەرمان بۆیەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان، پاشان فەرمووی: ((جگە لە ئێوە كەس لە خەڵكی سەر زەوی چاوەڕوانی نوێژ ناكات))، (نافیع دەڵێ:) عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ گوێی لێ نەبوو پێشی بخات یان دوای بخات، ئەگەر ترسی نەبووایە خەوی لێ بكەوێ و كاتەكەی بەسەر بچێ، هەروەها عەبدوڵا هەندێ جار پێش عیشا دەخەوت. ئیبنو جوڕەیج دەڵێ: بە عەتائم وت. (واتە: ئیبنو جوڕەیج دەڵێ: وتم بە عەتاو تۆ ڕات چییە لەسەر دواخستنی نوێژی عیشا، ئەویش وتی: لە ئیبنو عەباسم بیست ... جا فەرموودەی دوای ئەمەی بۆ گێڕامەوە).**

٥٧١- وَقَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: أَعْتَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيْلَةً بِالْعِشَاءِ حَتَّى رَقَدَ النَّاسُ وَاسْتَيْقَظُوا، وَرَقَدُوا وَاسْتَيْقَظُوا، فَقَامَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ: الصَّلاَةَ. قَالَ عَطَاءٌ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَخَرَجَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ الآنَ، يَقْطُرُ رَأْسُهُ مَاءً، وَاضِعًا يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ فَقَالَ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُصَلُّوهَا هَكَذَا». فَاسْتَثْبَتُّ عَطَاءً كَيْفَ وَضَعَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَأْسِهِ يَدَهُ كَمَا أَنْبَأَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ، فَبَدَّدَ لِي عَطَاءٌ بَيْنَ أَصَابِعِهِ شَيْئًا مِنْ تَبْدِيدٍ، ثُمَّ وَضَعَ أَطْرَافَ أَصَابِعِهِ عَلَى قَرْنِ الرَّأْسِ ثُمَّ ضَمَّهَا، يُمِرُّهَا كَذَلِكَ عَلَى الرَّأْسِ حَتَّى مَسَّتْ

إِبْهَامُهُ طَرَفَ الأُذُنِ مِمَّا يَلِي الْوَجْهَ عَلَى الصُّدْغِ وَنَاحِيَةِ اللِّحْيَةِ، لاَ يُقَصِّرُ وَلاَ يَبْطُشُ إِلاَّ كَذَلِكَ، وَقَالَ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُصَلُّوا هَكَذَا»[1].

**٥٧١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك نوێژی عیشای دوا خست هەتا خەڵك خەوتن و هەستان لە خەو، جارێکی دیکە خەوتن و هەستانەوە، جا عومەریش ﷺ هەستایەوە و وتی: با نوێژ بکەین (ئەی پێغەمبەر ﷺ)، عەتاو دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ وتی: جا پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ هاتە دەرەوە، دەڵێی ئێستا لەبەرچاومە، سەری ئاوی لێ دەتکا و دەستی لەسەر سەری دانابوو دەیفەرموو: ((ئەگەر قورس و گران نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، فەرمانم پێ دەکردن کە ئاوەها لەم کاتەدا نوێژی عیشا بکەن))، ئیبنو جوڕەیج دەڵێ: بۆ دڵنیابوون لە عەتائم پرسی: پێغەمبەر ﷺ چۆن دەستی لەسەر سەری دانابوو وەك ئەوەی عەبدوڵای کوڕی عەباس بۆی گێڕاینەوە؟ عەتائیش کەمێك پەنجەکانی بۆ بڵاو کردمەوە، پاشان سەری پەنجەکانی لەلایەکی سەریەوە دانا، پاشان پەنجەکانی لکاند بەیەکەوە و ئاوەها دەیهێنان بەسەر سەریدا (بۆ لای خوارەوە)، هەتا پەنجەگەورەی دای لەقەراغی گوێی لەلای لاجایینی و بەشێکی ڕیشیەوە، نە هێواش بوو نە بەپەلە لەم کارەدا، هەر بەم شێوەیە بوو، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر گران نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، فەرمانم پێ دەکردن ئاوەها لەم کاتەدا نوێژی عیشا بکەن)).**

## ٢٥- بابُ وَقْتِ العِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ

وَقَالَ أَبُو بَرْزَةَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَسْتَحِبُّ تَأْخِيرَهَا[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٢٣٩.

[2] بڕوانە: ٥٤١.

٥٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحِيمِ الْمُحَارِبِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَخَّرَ النَّبِيُّ ﷺ صَلاَةَ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ صَلَّى، ثُمَّ قَالَ: «قَدْ صَلَّى النَّاسُ وَنَامُوا، أَمَا إِنَّكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرْتُمُوهَا». وَزَادَ ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ، سَمِعَ أَنَسًا: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ خَاتَمِهِ لَيْلَتَئِذٍ[1].

## ٢٥- باسی کاتی نوێژی عیشا تا نیوەی شەوە

**ئەبو بەرزە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی باش بوو نوێژی عیشا دوا بخرێت.**

**٥٧٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای دوا خست بۆ نیوەی شەو، پاشان نوێژی کرد، پاشان فەرمووی: ((بێگومان خەڵکی نوێژیان کرد و خەوتن، بەڵام ئێوە هەر لە نوێژکردنداندان هەتا چاوەڕێی نوێژکردن بن)). لەگێڕانەوەی ئیبنو ئەبو مەریەمدا دەڵێ: یەحیای کوڕی ئەیوب بۆی گێڕاینەوە ئەویش دەڵێ: حومەید بۆی گێڕاینەوە کە لە ئەنەسی بیستووە بەم زیادەوە: دەڵێی سەیری بریسکەی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ دەکەم لەو شەودا (کە نوێژەکەی دوا خست) بە بەرچاومەوەیە.**

## ٢٦- بابُ فَضْلِ صَلاَةِ الْفَجْرِ

٥٧٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا قَيْسٌ: قَالَ لِي جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ نَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ فَقَالَ: «أَمَا إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا، لاَ تُضَامُونَ -أَوْ لاَ تُضَاهُونَ- فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا». ثُمَّ قَالَ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ﴿١٣٠﴾﴾ طه[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٠٠، ٦٦١، ٨٤٧، ٥٨٦٩.

[2] بڕوانە: ٥٥٤.

## ٢٦- باسی گەورەیی نوێژی بەیانی

**٥٧٣- جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، کاتێ سەیری مانگی کرد لە شەوی چواردەدا، جا فەرمووی: ((ئەوسا بزانن بێگومان لە داهاتوودا (قیامەت) پەروەردگارتان دەبینن چۆن ئێستا ئەم مانگی چواردەیە دەبینن، بەبێ قەرەباڵغی و پاڵپاڵێن بۆ بینینی، (یان بەبێ لێتێکچوون و گومان لە بینینی)، جا ئەگەر توانیتان نوێژی پێش خۆرهەڵاتن و نوێژی پێش خۆرئاوابوونتان لە دەست دەرنەچێ، با لە دەستتان دەرنەچێ و بیانکەن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ستاییش و بەندایەتی پەروەردگارت بکە پێش هەڵاتنی خۆر و پێش ئاوابوونی))).**

٥٧٤- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنِي أَبُو جَمْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ». وَقَالَ ابْنُ رَجَاءٍ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، أَنَّ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ أَخْبَرَهُ بِهَذَا.
حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، عَنْ حَبَّانَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ حَدَّثَنَا أَبُو جَمْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ.

**٥٧٤- ئەبو بەکر لە ئەبو مووسای باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەس دوو نوێژە فێنکەکە (کە لەمسەر و ئەوسەری ڕۆژەوەن، کە نوێژی بەیانی و عەسرن) بکات، دەچێتە بەهەشتەوە)). ئەم فەرموودەیە بەم ڕێگەیە و سەنەدەش هاتووە: ئیبنو ڕەجا دەڵێ: هەمام بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو جەمرەوە کە ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڵای کوڕی قەیس ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕایەوە. (ئیمام بوخاری دەڵێ:) ئیسحاق بۆی گێڕاینەوە لە حەبانەوە دەڵێ: هەمام بۆی گێڕاینەوە، ئەویش دەڵێ: ئەبو جەمرە بۆی**

**گێڕاینەوە لە ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڵاوە لە باوکیەوە، ئەو لە پێغەمبەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەی پێشووی گێڕاوەتەوە.**

## ٢٧- بابُ وَقْتِ الفَجْرِ

٥٧٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ حَدَّثَهُ، أَنَّهُمْ تَسَحَّرُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ قَامُوا إِلَى الصَّلاَةِ. قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: قَدْرُ خَمْسِينَ أَوْ سِتِّينَ، يَعْنِي: آيَةً[1].

## ٢٧- باسی کاتی نوێژی بەیانی

**٥٧٥- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پارشێویان کرد، پاشان هەڵسان بۆ نوێژکردن، (ئەنەس دەڵێ:) وتم: چەندێکیان لە نێواندا بوو؟ (زەید) وتی: ئەندازەی (خوێندنی) پەنجا، یان شەست، مەبەستی ئایەت بوو (لە پەنجا و شەستەکە).**

٥٧٦- حَدَّثَنَا حَسَنُ بْنُ صَبَّاحٍ، سَمِعَ رَوْحًا، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ وَزَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ تَسَحَّرَا، فَلَمَّا فَرَغَا مِنْ سَحُورِهِمَا قَامَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ إِلَى الصَّلاَةِ فَصَلَّى. قُلْنَا لأَنَسٍ: كَمْ كَانَ بَيْنَ فَرَاغِهِمَا مِنْ سَحُورِهِمَا وَدُخُولِهِمَا فِي الصَّلاَةِ؟ قَالَ: قَدْرُ مَا يَقْرَأُ الرَّجُلُ خَمْسِينَ آيَةً[2].

**٥٧٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ و زەیدی کوڕی سابیت ﷺ پارشێویان کرد، جا کە لێ بوونەوە لە پارشێوەکەیان،**

---

[1] بڕوانە: ١٩٢١.

[2] بڕوانە: ١١٣٤.

**پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ نوێژ و نوێژی کرد، (قەتادە دەڵێ:) بە ئەنەسمان وت: نێوانی لێبوونەوەیان لە پارشێوەکەیان و دەستکردنیان بەنوێژەکەیان چەند بوو؟ وتی: ئەوەندەی کەسێك پەنجا ئایەت بخوێنێ.**

٥٧٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ أَخِيهِ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ أَنَّهُ سَمِعَ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ يَقُولُ: كُنْتُ أَتَسَحَّرُ فِي أَهْلِي، ثُمَّ يَكُونُ سُرْعَةٌ بِي أَنْ أُدْرِكَ صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[١].

**٥٧٧- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: من لە ماڵەوەمان پارشێوم دەکرد، پاشان پەلەم دەکرد کە بە نوێژی بەیانی ڕابگەم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ.**

٥٧٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ قَالَتْ: كُنَّ نِسَاءُ الْمُؤْمِنَاتِ يَشْهَدْنَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الْفَجْرِ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، ثُمَّ يَنْقَلِبْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ حِينَ يَقْضِينَ الصَّلاَةَ، لاَ يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الْغَلَسِ[٢].

**٥٧٨- عوروەی کوڕی زوبەیر گێڕایەوە کە عائیشە ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی: ئافرەتانی ئیماندار لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئامادەی نوێژی بەیانی دەبوون بە پۆشاکەکانیان خۆیان دادەپۆشی، پاشان کاتێ نوێژەکەیان تەواو دەکرد و دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوەیان، کەس نەیدەناسین لەبەر تاریکی و لێڵی .**

---

[١] بڕوانە: ١٩٢٠.

[٢] بڕوانە: ٣٧٢.

## ٢٨- بابُ مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الفَجْرِ رَكْعَةً

٥٧٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ وَعَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ وَعَنِ الأَعْرَجِ يُحَدِّثُونَهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ»[1].

## ٢٨- باسی ئەو کەسەی بە ڕکاتێکی نوێژی بەیانی ڕابگات[2]

**٥٧٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس لە نوێژی بەیانیدا بەرکاتێك ڕابگات پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ، ئەوە بێگومان بە نوێژی بەیانی ڕاگەیشتووە، وە هەرکەس بە ڕکاتێکی نوێژی عەسر ڕابگات پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت، ئەوە بێگومان بە نوێژی عەسر ڕاگەیشتووە)).**

## ٢٩- بابُ مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً

٥٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلَاةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ»[3].

## ٢٩-باسی هەر کەس لە نوێژدا بە یەک ڕکات ڕابگات

**٥٨٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس بە یەك ڕکات ڕابگات لە نوێژدا، ئەوە بێگومان بەو نوێژە ڕاگەیشتووە)).**

---

[1] بڕوانە: ٥٥٦.

[2] با ڕکاتێکی دیکە بکات و نوێژەکەی تەواو بکات، واتە: بە کردنی یەك ڕکاتی نوێژەکەی لە کاتەکەدا نوێژەکەی قبووڵە.

[3] بڕوانە: ٥٥٦.

## ٣٠- بابُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ

٥٨١- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرضِيُّونَ، وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَشرُقَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ العَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ. حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ سَمِعْتُ أَبَا العَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي نَاسٌ بهذا.

## ٣٠- باسی (حوکمی) نوێژکردن لەدوای نوێژی بەیانی تا خۆر بەرز دەبێتەوە

**٥٨١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: چەند پیاوچاکێك لای من شاهێدییان دا، کە چاکترینیان لای من عومەرە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە لە نوێژکردن دوای نوێژی بەیانی تا خۆر هەڵدێ (بەرز دەبێتەوە)، هەروەها دوای نوێژی عەسریش هەتا خۆر ئاوا دەبێ. ئەم فەرموودە بەم ڕێگەیەش هاتووە: موسەدەد دەڵێ: یەحیا بۆی گێڕاینەوە لە شوعبەوە ئەویش لە قەتادەوە دەڵێ: لە ئەبولعالییەم بیستووە، ئەویش لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەڵێ: چەند کەسێك ئەمەیان بۆ گێڕاومەتەوە.**

٥٨٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ أَخْبَرَنِي أَبِي قَالَ أَخْبَرَنِي ابْنُ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لاَ تَحَرَّوْا بِصَلاَتِكُمْ طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلاَ غُرُوبَهَا»[1].

**٥٨٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەئەنقەست (ئەنجامدانی) نوێژەکانتان مەخەنە کاتی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆرەوە)).**

---

[1] بڕوانە: ٥٨٥، ٥٨٩، ١١٩٢، ١٦٢٩، ٣٢٧٣.

٥٨٣- وَقَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا طَلَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَأَخِّرُوا الصَّلاَةَ حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَإِذَا غَابَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَأَخِّرُوا الصَّلاَةَ حَتَّى تَغِيبَ. تَابَعَهُ عَبْدَةُ[1].

**٥٨٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کاتێ خۆر لە ئاسۆ سەر دەردێنێ نوێژ دوا خەن هەتا خۆر بەرز دەبێتەوە، وە کاتێ (بەشێکی) خۆر ئاوا دەبێ، نوێژ دوا خەن تا بەیەکجاری ئاوا دەبێ)). عەبدە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یەحیای کردووە.**

٥٨٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ خُبَيْبِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ، وَعَنْ لِبْسَتَيْنِ، وَعَنْ صَلاَتَيْنِ: نَهَى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَعَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَعَنْ الاِحْتِبَاءِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ يُفْضِي بِفَرْجِهِ إِلَى السَّمَاءِ، وَعَنِ الْمُنَابَذَةِ وَالْمُلاَمَسَةِ[2].

**٥٨٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لە دوو جۆر کڕین و فرۆشتن، وە لە دوو شێوە پۆشین، وە لە دوو نوێژ: ڕێگری کردووە لە نوێژکردن لەدوای نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵدێ (بەرز دەبێتەوە)، وە لەدوای نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوا دەبێت بەتەواوی، وە ڕێگری کردووە لەوەی پۆشاکێك بپێچێت بە خۆیەوە لە هیچ شوێنێکەوە ڕێگەی نەبێ دەستی دەربێنێ، هەروەها ڕێگری کردووە لە دانیشتن بەچیچکانەوە (بەڵام سمتەکانی بخاتە سەر زەوی) و پارچەقوماشێك بپێچێ بە خۆیەوە، وە عەورەتی ڕووی بە**

---

[1] بڕوانە: ٣٢٧٢.

[2] بڕوانە: ٣٦٨.

سەرەوە دیار بێ و دانەپۆشرابێ، وە ڕێگری کردووە لە فرۆشتن بە فڕێدان بۆ یەکدی، وە لە فرۆشتن بە دەستلێدان)).

## ٣١- بابٌ: لَا يَتَحَرى الصَّلَاةَ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ

٥٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَتَحَرَّى أَحَدُكُمْ فَيُصَلِّي عِنْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَلاَ عِنْدَ غُرُوبِهَا»[١].

## ٣١- باسێک: نابێ نوێژکەر لە کاتی ئاوابوونی خۆردا نوێژی (سوننەت) بکات

**٥٨٥- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەئەنقەست هیچ کەس لە ئێوە نوێژ نەکات نە لە کاتی خۆرهەڵاتندا، نە لە کاتی خۆرئاوابووندا)).**

٥٨٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ الْجُنْدَعِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ صَلاَةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ»[٢].

**٥٨٦- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست فەرمووی: ((پاش نوێژی بەیانی نوێژی (سوننەت) نییە هەتا خۆر بەرز دەبێتەوە، وە پاش نوێژی عەسر نوێژ نییە هەتا خۆر ئاوا دەبێت)).**

---

[١] بڕوانە: ٥٨٢.

[٢] بڕوانە: ١١٨٨، ١١٩٧، ١٨٦٤، ١٩٩٢، ١٩٩٥.

٥٨٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ قَالَ: سَمِعْتُ حُمْرَانَ بْنَ أَبَانَ يُحَدِّثُ عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: إِنَّكُمْ لَتُصَلُّونَ صَلاَةً، لَقَدْ صَحِبْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَمَا رَأَيْنَاهُ يُصَلِّيهَا، وَلَقَدْ نَهَى عَنْهُمَا، يَعْنِي: الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ[١].

**٥٨٧- حومرانی کوڕی ئەبان دەگێڕێتەوە لە موعاویەوە کە دەڵێ: بێگومان ئێوە نوێژێك دەکەن بەڕاستی ئێمە هاوڕێیەتی پێغەمبەرمان ﷺ کردووە، نەماندیوە ئەو نوێژە بکات، بێگومان ڕێگری لەو دوو ڕکات نوێژە دەکرد، واتە: دوو ڕکات نوێژی دوای عەسر.**

٥٨٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ خُبَيْبٍ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلاَتَيْنِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ[٢].

**٥٨٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لە دوو نوێژ: دوای نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵدێ (و بەرز دەبێتەوە)، وە دوای نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوا دەبێت.**

## ٣٢- بابُ مَنْ لَمْ يَكْرَهِ الصَّلَاةَ إِلَّا بَعْدَ العَصْرِ وَالْفَجْرِ

رَوَاهُ عُمَرُ[٣]، وَابْنُ عُمَرَ[٤]، وَأَبُو سَعِيدٍ[٥]، وَأَبُو هُرَيْرَةَ[٦] ﷺ.

---

١ بڕوانە: ٣٧٦٦.

٢ بڕوانە: ٣٦٨.

٣ بڕوانە: ٥٨١.

٤ بڕوانە: ٥٨٥.

٥ بڕوانە: ١٨٦٤.

٦ بڕوانە: ٥٨٨.

٥٨٩- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أُصَلِّي كَمَا رَأَيْتُ أَصْحَابِي يُصَلُّونَ، لاَ أَنْهَى أَحَدًا يُصَلِّي بِلَيْلٍ وَلاَ نَهَارٍ مَا شَاءَ، غَيْرَ أَنْ لاَ تَحَرَّوْا طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلاَ غُرُوبَهَا[1].

## ٣٢- باسی ئەو کەسەی هیچ نوێژێکی بەلاوە ناپەسەند نەبووە لەپاش عەسر و بەیانییەوە نەبێت

**عومەر و عەبدوڵای کوڕی و ئەبو سەعید و ئەبو هورەیرە ﷵ ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە (لە پێغەمبەرەوە ﷺ).**

**٥٨٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷻ دەڵێ: من بەو شێوە نوێژ دەکەم کە هاوڕێکانم بینیوە نوێژیان دەکرد: ڕێگری لەکەس ناکەم نە بەشەو نە بەڕۆژ، کەی ویستی نوێژ بکات، بەڵام لە کاتی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون بەئەنقەست نوێژ نەکات.**

## ٣٣- بابُ مَا يُصَلَّى بَعْدَ العَصْرِ مِنَ الفَوَائِتِ وَنَحْوِهَا

وَقَالَ كُرَيْبٌ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ العَصْرِ رَكْعَتَيْنِ وَقَالَ: ((شَغَلَنِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِ القَيْسِ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ)).

٥٩٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ أَيْمَنَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي أَنَّهُ سَمِعَ عَائِشَةَ قَالَتْ: وَالَّذِي ذَهَبَ بِهِ مَا تَرَكَهُمَا حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ، وَمَا لَقِيَ اللَّهَ تَعَالَى حَتَّى ثَقُلَ عَنِ الصَّلاَةِ، وَكَانَ يُصَلِّي كَثِيرًا مِنْ صَلاَتِهِ قَاعِدًا -تَعْنِي: الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ- وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّيهِمَا، وَلاَ يُصَلِّيهِمَا فِي الْمَسْجِدِ مَخَافَةَ أَنْ يُثَقِّلَ عَلَى أُمَّتِهِ، وَكَانَ يُحِبُّ مَا يُخَفِّفُ عَنْهُمْ[2].

---

[1] بڕوانە: ٥٨٢.

[2] بڕوانە: ٥٩١، ٥٩٢، ٥٩٣، ١٦٣١.

# ٣٣- باسی ئەوەی کە دەکرێ پاش (نوێژی) عەسر لە نوێژە فەوتاوەکان و وێنەیان

کوڕەیب لە ئومو سەلەمەوە ﵂ دەگێڕێتەوە ودەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پاش نوێژی عەسر دوو ڕکات نوێژی کرد و فەرمووی: ((کەسانێ لە خێڵی عەبدولقەیس سەرقاڵیان کردم لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پاش نیوەڕۆ)). (واتە: ئەمە ئەو دوو ڕکاتەیە).

٥٩٠- عەبدولواحیدی کوڕی ئەیمەن لە ئەیمەنی باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە لە عائیشەی ﵂ بیستووە وتوویەتی: سوێند بەو خوایەی پێغەمبەری ﷺ بردەوە بۆ لای خۆی، ئەم دوو ڕکاتە سوننەتەی پاش نوێژی عەسری واز لێ نەهێناوە، هەتا بە خزمەت خوای گەورە گەشت، وە وەفاتی نەکرد و نەگەیشتە خزمەتی خوا، هەتا بەناڕەحەتی و گرانی نوێژی دەکرد، وە زۆر جار نوێژی بەدانیشتنەوە دەکرد- مەبەستی: ئەو دوو ڕکاتەی پاش عەسر بوو-، وە پێغەمبەر ﷺ ئەو دوو ڕکاتەش کە دەیکرد لە مزگەوت نەیدەکرد، لە ترسی ئەوەی کە قورس بێت لەسەر ئوممەتەکەی، چونکە ئەو هەمیشە حەزی لەوە بوو کە کارئاسانی بکات بۆ ئوممەتەکەی.

٥٩١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي قَالَتْ عَائِشَةُ: ابْنَ أُخْتِي، مَا تَرَكَ النَّبِيُّ ﷺ السَّجْدَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ عِنْدِي قَطُّ[1].

٥٩١- هیشام دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە کە عائیشە ﵂ وتوویەتی: ئەی خوشکەزای خۆم: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز دوو ڕکاتەکەی پاش نوێژی عەسری واز لێ نەهێناوە کە لای من بووە.

---

[1] بڕوانە: ٥٩٠.

٥٩٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: رَكْعَتَانِ لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَعُهُمَا سِرًّا وَلاَ عَلاَنِيَةً: رَكْعَتَانِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَرَكْعَتَانِ بَعْدَ الْعَصْرِ[1].

**٥٩٢- ئەسوەد دەڵێ: عائیشە ﵂ دەڵێ: هیچ کات پێغەمبەری خوا ﷺ دوو نوێژی (سوننەتی) واز لێ نەدەهێنا، نە بەپەنهانی نە بەئاشکرا: دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، وە دوو ڕکات پاش نوێژی عەسر.**

٥٩٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: رَأَيْتُ الأَسْوَدَ وَمَسْرُوقًا شَهِدَا عَلَى عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْتِينِي فِي يَوْمٍ بَعْدَ الْعَصْرِ إِلاَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ[2].

**٥٩٣- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: ئەسوەد و مەسرووق شایەتییان دا کە عائیشە ﵂ وتوویەتی: هەر ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ پاش نوێژی عەسر بهاتایە بۆماڵی من، دوو ڕکات نوێژی دەکرد.**

## ٣٤- بابُ التَّبْكِيرِ بِالصَّلاَةِ فِي يَوْمِ غَيْمٍ

٥٩٤- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ عَنْ يَحْيَى -هُوَ: ابْنُ أَبِي كَثِيرٍ- عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، أَنَّ أَبَا الْمَلِيحِ حَدَّثَهُ قَالَ: كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ فَقَالَ: بَكِّرُوا بِالصَّلاَةِ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ «مَنْ تَرَكَ صَلاَةَ الْعَصْرِ حَبِطَ عَمَلُهُ»[3].

---

[1] بڕوانە: ٥٩٠.

[2] بڕوانە: ٥٩٠.

[3] بڕوانە: ٥٥٣.

## ٣٤- باسی زوو نوێژكردن له ڕۆژی هەوراویدا

٥٩٤- ئەبو مەليح دەڵێ: ئێمه له ڕۆژێكی هەوراویدا لەگەڵ بورەیدەدا بووین، وتی: زوو نوێژ (ی عەسر) بكەن، چونكه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر كەس واز له نوێژی عەسر بێنێ، كردەوەكانی پوچەڵ بۆتەوە)).

## ٣٥- بابُ الأذَانِ بَعْدَ ذَهَابِ الوَقْتِ

٥٩٥- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سِرْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: لَوْ عَرَّسْتَ بِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «أَخَافُ أَنْ تَنَامُوا عَنِ الصَّلاَةِ». قَالَ بِلاَلٌ: أَنَا أُوقِظُكُمْ. فَاضْطَجَعُوا وَأَسْنَدَ بِلاَلٌ ظَهْرَهُ إِلَى رَاحِلَتِهِ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ فَنَامَ، فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَدْ طَلَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَقَالَ: «يَا بِلاَلُ، أَيْنَ مَا قُلْتَ؟». قَالَ: مَا أُلْقِيَتْ عَلَيَّ نَوْمَةٌ مِثْلُهَا قَطُّ. قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَبَضَ أَرْوَاحَكُمْ حِينَ شَاءَ، وَرَدَّهَا عَلَيْكُمْ حِينَ شَاءَ،يا بِلاَلُ قُمْ فَأَذِّنْ بِالنَّاسِ بِالصَّلاَةِ». فَتَوَضَّأَ، فَلَمَّا ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ وَابْيَاضَّتْ قَامَ فَصَلَّى[1].

## ٣٥- باسی (حوكمی) بانگدان پاش بەسەرچوونی كاتەكەی

٥٩٥- ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: شەوێك له خزمەت پێغەمبەردا ﷺ به ڕێگادا دەڕۆیشتین، پیاوێك لەنێو خەڵكەكەدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە پشوویەكت پێ بدایناية (و سەرخەوێكمان بشكاندایه) له بەرەبەیاندا، فەرمووی: ((دەترسم كه خەوتان لێ بكەوێ و نوێژی بەیانی خەبەرتان نەبێتەوە))، بیلال وتی: من خەبەرتان دەكەمەوە، ئیدی ئەوانیش ڕاكشان و بیلالیش پاڵی دایەوە به وڵاخەكەیەوە، خەو زۆری بۆ هێنا و خەوی لێ كەوت، جا كه پێغەمبەر ﷺ خەبەری

[1] بڕوانه: ٧٤٧١.

بۆیەوە خۆر سەری دەرهێنابوو، فەرمووی: ((بیلال کوا ئەوەی کە وتت؟))، بیلالیش وتی: هەرگیز ئاوا خەو زۆری بۆ نەهێناوم، فەرمووی: ((بێگومان خوا کاتێ ویستی گیانەکانتانی بردەوە بۆ لای خۆی، وە کاتێ ویستی گێڕایەوە بۆتان، ئەی بیلال هەستە و بانگی نوێژکردن بدە بۆ موسوڵمانان))، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت، جا کاتێ خۆر بەرز بۆیەوە و سپی هەڵگەڕا (و دنیا ڕۆشن بۆیەوە)، هەستا و نوێژی کرد (بۆ موسوڵمانان).

## ٣٦- بابُ مَنْ صَلَّى بِالنَّاسِ جَمَاعَةً بَعْدَ ذَهَابِ الوَقْتِ

٥٩٦- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ جَاءَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا كِدْتُ أُصَلِّي الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتِ الشَّمْسُ تَغْرُبُ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَاللَّهِ مَا صَلَّيْتُهَا». فَقُمْنَا إِلَى بُطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ لِلصَّلاَةِ، وَتَوَضَّأْنَا لَهَا، فَصَلَّى الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ[1].

## ٣٦- باسی کەسێک پێشنوێژی بکات بۆ کەسانێک پاش بەسەرچوونی کاتی نوێژەکە

٥٩٦- جابیری کوڕی عەبدولا ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا پاش ئەوەی خۆر ئاوابوو، هات و دەستی کرد بە جنێودان بە کافرانی قوڕەیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەریك بوو نوێژی عەسرم بۆ نەکرێ، هەتا ئەو کاتەی نزیك بوو خۆر ئاوا دەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

---

[1] بڕوانە: ٥٩٨، ٦٤١، ٩٤٥، ٤١١٢.

((سوێند بە خوا منیش نوێژی عەسرم نەکردووە))، ئینجا هەستاین و چووینە شیوی بوتحان، پێغەمبەریش ﷺ دەستنوێژی گرت، ئێمەش دەستنوێژمان گرت، ئینجا نوێژی عەسری کرد دوای ئەوەی خۆر ئاوابوو، پاشان دوای ئەوە نوێژی مەغریبی کرد.

## ٣٧- بابُ مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، وَلَا يُعِيدُ إِلَّا تِلْكَ الصَّلَاةَ

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: مَنْ تَرَكَ صَلَاةً وَاحِدَةً عِشْرِينَ سَنَةً لَمْ يُعِدْ إِلَّا تِلْكَ الصَّلَاةَ الوَاحِدَة.

٥٩٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ وَمُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَا: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ». ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾ طه. قَالَ مُوسَى: قَالَ هَمَّامٌ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ بَعْدُ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾ طه. وَقَالَ حَبَّانُ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ.

## ٣٧- باسی کەسێ نوێژێکی لەبیر چووبێ و (کاتەکەی نەمابێت) کەی بیری هاتەوە بیکات، وە تەنها ئەو نوێژەش دەگێڕێتەوە

ئیبراهیم دەڵێ: هەر کەس پێش بیست ساڵ یەك نوێژی نەکردبێت، تەنها هەر ئەو نوێژە دەکاتەوە و بەس.

٥٩٧- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس نوێژێکی لەبیر چوو، کەی بیری هاتەوە بیکات، هیچ کەفارەتێکی نییە ئەو نوێژکردنەوە نەبێ، (چونکە خوا دەفەرمووێ:) (بەچاکی نوێژ بکە تا منت بیر کەوێتەوە))). مووسا دەڵێ: هەمام وتی: گوێم لە قەتادە بوو دواتر دەیوت: (بە چاکی نوێژ بکە

تا منت بیر کەوێتەوە). بەم ڕێگەیەش وێنەی گێڕانەوەی دووەم هاتووە: حەبان دەڵێ: هەمام بۆی گێڕاینەوە، ئەویش دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە، ئەویش دەڵێ: ئەنەس لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆی گێڕاینەوە.

## ٣٨- بَابُ قَضَاءِ الصَّلَوَاتِ الأُولَى فَالأُولَى

٥٩٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَال: حَدَّثَنَا يَحْيَى -هُوَ: ابْنُ أَبِي كَثِيرٍ- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: جَعَلَ عُمَرُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ يَسُبُّ كُفَّارَهُمْ وَقَالَ: مَا كِدْتُ أُصَلِّي الْعَصْرَ حَتَّى غَرَبَتْ. قَالَ: فَنَزَلْنَا بُطْحَانَ، فَصَلَّى بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ[1].

## ٣٨- باسی گێڕانەوەی نوێژە (فەوتاوە)کان دەبێ بەڕیزبەندی بێت

٥٩٨- جابیر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەنگی خەندەقدا عومەر ﷺ دەستی کرد بە جنێودان بە بێباوەڕانی قوڕەیش و وتی: نەمتوانی نوێژی عەسر بکەم هەتا خۆر ئاوابوو، جابیر دەڵێ: جا چووینە شیوی بوتحان و لەوێ نوێژی کرد، پاش ئەوەی خۆر ئاوابوو، پاشان نوێژی ئێوارەی کرد.

## ٣٩- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ السَّمَرِ بَعْدَ الْعِشَاءِ

٥٩٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْمِنْهَالِ قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي إِلَى أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: حَدِّثْنَا كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ؟ قَالَ: كَانَ يُصَلِّي الْهَجِيرَ وَهِيَ الَّتِي تَدْعُونَهَا الأُولَى حِينَ تَدْحَضُ الشَّمْسُ، وَيُصَلِّي الْعَصْرَ، ثُمَّ

---

[1] بڕوانە: ٥٩٦.

يَرْجِعُ أَحَدُنَا إِلَى أَهْلِهِ فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ. وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي الْمَغْرِبِ. قَالَ: وَكَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ. قَالَ: وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا، وَكَانَ يَنْفَتِلُ مِنْ صَلاَةِ الْغَدَاةِ حِينَ يَعْرِفُ أَحَدُنَا جَلِيسَهُ، وَيَقْرَأُ مِنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ[1].

## ٣٩- باسی ئەوەی قسە و دەمەتەقێ بێزراو و ناپەسەندە دوای (نوێژی) عیشا

**٥٩٩- ئەبولمنیهال دەڵێ: لەگەڵ باوکمدا ڕۆیشتین بۆ خزمەت ئەبو بەرزەی ئەسلەمی، جا باوکم پێی وت: بۆمان بگێڕەرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نوێژی فەرزی دەکرد؟ ئەبو بەرزە وتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد لە قرچەی گەرمادا، کە ئەو نوێژەیە ئێوە پێی دەڵێن: یەکەم نوێژ، کاتێك خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دەدا، وە نوێژی عەسری دەکرد، پاشان یەکێ لە ئێمە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەی لەوپەڕی مەدینە و هێشتا خۆر بەرز بوو، بەڵام لەبیرم چوو سەبارەت بە مەغریب چی وت، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەزی لێ بوو کە نوێژی عیشا دوا بخات، دەڵێ: وە بەلایەوە ناپەسەند بوو خەوتن لەپێش عیشا و قسەکردن لەدوای عیشا، وە لە نوێژی بەیانی دەبۆیەوە، کاتێ کەسێك لە ئێمە دەیزانی هاوڕێکەی پاڵی کێیە، وە شەست تا سەد ئایەتی دەخوێند (لە نوێژی بەیانییاندا).**

## ٤٠- بابُ السَّمَرِ فِي الْفِقْهِ وَالْخَيْرِ بَعْدَ الْعِشَاءِ

٦٠٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الصَّبَّاحِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَلِيٍّ الْحَنَفِيُّ، حَدَّثَنَا قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: انْتَظَرْنَا الْحَسَنَ وَرَاثَ عَلَيْنَا حَتَّى قَرُبْنَا مِنْ وَقْتِ قِيَامِهِ، فَجَاءَ فَقَالَ: دَعَانَا جِيرَانُنَا هَؤُلاَءِ. ثُمَّ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: نَظَرْنَا النَّبِيَّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى كَانَ شَطْرُ اللَّيْلِ يَبْلُغُهُ، فَجَاءَ فَصَلَّى لَنَا،

---

[1] بڕوانە: ٥٤١.

ثُمَّ خَطَبَنَا فَقَالَ: «أَلاَ إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا ثُمَّ رَقَدُوا وَإِنَّكُمْ لَمْ تَزَالُوا فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّلاَةَ». قَالَ الْحَسَنُ: وَإِنَّ الْقَوْمَ لاَ يَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا انْتَظَرُوا الْخَيْرَ. قَالَ قُرَّةُ: هُوَ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٤٠- باسی قسەکردن لەبارەی فیقه و و چاکەوە دوای (نوێژی) عیشا (دروستە)

**٦٠٠- قورەی کوڕی خالید دەڵێ: چاوەڕوانی حەسەنمان کرد دوا کەوت لە هاتن بۆ لامان، هەتا نزیك بووینەوە لە کاتی هەستانی (لە وتنەوەی دەرسەکەی کە شەوانەی پێی دەوتین)، ئینجا هات و وتی: ئەو دراوسێیانەمان دەعوەتیان کردین (بۆیە دوا کەوتم لە هاتن)، پاشان وتی: ئەنەس وتی: شەوێك چاوەڕوانی پێغەمبەرمان ﷺ کرد هەتا گەیشتە نیوەی شەو، ئینجا هات و پێشنوێژی بۆ کردین، پاشان وتارێکی بۆ داین و فەرمووی: ((ئاگادار بن بێگومان خەڵکی نوێژیان کرد و پاشان خەوتوون، بەڵام ئێوە هەر لە نوێژدان تا چاوەڕوانی نوێژ بکەن))، حەسەن دەڵێ: بێگومان خەڵکی هەر لە خێر و چاکەدان هەتا چاوەڕوانی خێر بکەن، قورە دەڵێ: ئەم وتەیەی حەسەنیش هەر لە فەرموودەکەی ئەنەسە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە.**

٦٠١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، وَأَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ صَلاَةَ الْعِشَاءِ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ؟ فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةٍ لاَ

---

[1] بڕوانە: ٥٧٢.

يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ». فَوَهِلَ النَّاسُ فِي مَقَالَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى مَا يَتَحَدَّثُونَ مِنْ هَذِهِ الأَحَادِيثِ عَنْ مِائَةِ سَنَةٍ، وَإِنَّمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ، يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنَّهَا تَخْرِمُ ذَلِكَ الْقَرْنَ[1].

**٦٠١- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی ژیانیدا نوێژی عیشای کرد، جا کە سەلامی دایەوە، هەستایەوە و فەرمووی: ((هەواڵم بدەنێ ئەم شەوەتان چ شەوێکە؟ چونکە بێگومان تا سەد ساڵی دیکە ئەم کاتە لەوانەی ئەمڕۆ لەسەر زەویدان کەسی نامێنێ)). جا خەڵکی بەهەڵەدا چوون (یان ترسان) کە مەبەستی فەرماییشتەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ چییە، (وایان دەزانی دونیا پاش سەد ساڵی دیکە وێران دەبێ)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لەوەی ئەمڕۆ لەسەر زەویدا))، مەبەستی ئەوەبوو هەموو خەڵکی ئەو چەرخە دەمرن.**

## ٤١- بابُ السَّمَرِ مَعَ الضَّيْفِ وَالأَهْلِ

٦٠٢- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا أَبُو عُثْمَانَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا أُنَاسًا فُقَرَاءَ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: ((مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِثٍ، وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَامِسٌ أَوْ سَادِسٌ)). وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلاَثَةٍ، فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَشَرَةٍ، قَالَ: فَهُوَ أَنَا وَأَبِي وَأُمِّي -فَلاَ أَدْرِي قَالَ: وَامْرَأَتِي- وَخَادِمٌ بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ. وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ لَبِثَ حَيْثُ صُلِّيَتِ الْعِشَاءُ، ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِثَ حَتَّى تَعَشَّى النَّبِيُّ ﷺ فَجَاءَ بَعْدَ مَا مَضَى مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ، قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ: وَمَا حَبَسَكَ عَنْ أَضْيَافِكَ؟ -أَوْ قَالَتْ: ضَيْفِكَ- قَالَ: أَوَمَا عَشَّيْتِيهِمْ؟ قَالَتْ: أَبَوْا حَتَّى تَجِيءَ، قَدْ عُرِضُوا فَأَبَوْا. قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ، فَقَالَ:يا غُنْثَرُ، فَجَدَّعَ

---

[1] بڕوانە: ١١٦.

وَسَبَّ، وَقَالَ: كُلُوا لاَ هَنِيئًا. فَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ أَطْعَمُهُ أَبَدًا، وَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذُ مِنْ لُقْمَةٍ إِلاَّ رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرُ مِنْهَا. قَالَ: يَعْنِي: حَتَّى شَبِعُوا وَصَارَتْ أَكْثَرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذَلِكَ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ فَإِذَا هِيَ كَمَا هِيَ أَوْ أَكْثَرُ مِنْهَا، فَقَالَ لاِمْرَأَتِهِ:يا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ، مَا هَذَا؟ قَالَتْ: لاَ وَقُرَّةِ عَيْنِي، لَهِيَ الآنَ أَكْثَرُ مِنْهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِثَلاَثِ مَرَّاتٍ. فَأَكَلَ مِنْهَا أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ -يَعْنِي: يَمِينَهُ- ثُمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً، ثُمَّ حَمَلَهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ، وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ، فَمَضَى الأَجَلُ، فَفَرَّقَنَا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ، اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ، فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ، أَوْ كَمَا قَالَ[1].

## ٤١- باسی قسه و دەمەتەقێکردن لەگەڵ ماڵ و منداڵ و میواندا لەدوای عیشا و شەودا

**٦٠٢- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر دەڵێ: ئەو کەسانەی لە صوفەدا[2] دەمانەوە، کەسانێکی هەژار بوون، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس خواردنی دوو کەسی هەیە، با کەسی سێیەمیش لەگەڵ خۆی ببات، وە ئەگەر خواردنی چوار کەسی هەیە، با پێنجەم یان شەشەمیش ببات))، ئینجا ئەبو بەکر ﷺ سێ کەسی هێنا لەگەڵ خۆیدا، پێغەمبەریش ﷺ دە کەسی برد لەگەڵ خۆی، عەبدوڕەحمان دەڵێ: (کەسەکان ئەبو بەکر هێنایەوە) من و باوکم و دایکم لە ماڵەوە بووین، (ئەبو عوسمان) دەڵێ: - جا نازانم عەبدوڕەحمان وتی: خێزانم - و خزمەتکارێکیشمان لەگەڵ بوو، کە خزمەتکاری ئێمە و ماڵی باوکم بوو، وە ئەبو بەکر ﷺ لای پێغەمبەر ﷺ نانی ئێوارەی خوارد، پاشان مایەوە تا نوێژی عیشاش کرا، پاشان گەڕایەوە، ئەبو بەکر مایەوە هەتا پێغەمبەر ﷺ نانی شێوانی خوارد، جا کاتێ**

---

[1] بڕوانە: ٣٥٨١، ٦١٤٠، ٦١٤١.

[2] صوفە: بەشی دواوەی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بوو.

هاتەوە ئەوەندە لە شەو ڕۆیشتبوو تا خوا حەز بکات، خێزانەکەی بە ئەبو بەکری وت: چی بوو درەنگ گەڕایتەوە بۆ لای میوانەکانت؟ -یان وتی: میوانەکەت- ئەبو بەکر وتی: ئەڵێی نانی ئێوارەتان نەخواردووە؟ خێزانی وتی: ڕازی نەبوون نان بخۆن هەتا تۆ نەیەیتەوە، پێشیان ڕاگەیاندرا نان و خواردنیان بۆ دانرێ، بەڵام ڕازی نەبوون، عەبدوڕەحمان دەڵێ: منیش ڕۆیشتم و خۆم شاردەوە (لە ترسا)، ئەبو بەکر پێی وتم: تەمەڵی سست! لوتت بە بڕین بچێ، ئەی وا و وا لێکراو (بۆچی نانت بۆ میوانەکان دانەناوە؟) دە بخۆن و نۆشی گیانتان نەبێ، جا وتی: سوێند بە خوا لەو نانە و خواردنە ناخۆم، (عەبدوڕەحمان دەڵێ:) سوێند بە خوا ئێمە هەر پاروویەکمان هەڵدەگرت، ئیللا لەژێریەوە بەرز دەبۆوە و زیاتر دەبوو لە پاروەکە، هەر وا بوو هەتا تێریان خوارد، خواردنەکە وەك خۆی وابوو، بگرە زیاتر بوو لە پێش خواردنەکەی، جا ئەبو بەکر سەیری خواردنەکەی کرد دەبینێ وەك خۆیەتی، بگرە زیاترە لەوەی هێنرابوو، بۆیە بە خێزانەکەی وت: ئەمە چییە خوشکی بەنو فیراس؟ خێزانەکەشی وتی: نازانم چییە سوێند بەو زاتەی چاو و دڵمی ڕۆشن کردۆتەوە، خواردنەکە ئێستا سێ قاتی ئەو خواردنەیە کە دانرابوو بۆیان، جا ئەبو بەکر لێی خوارد و وتی: سوێندخواردنەکەم (کە لەم نانە ناخۆم) لە شەیتانەوە بوو، پاشان پارووییەکی لێ خوارد، پاشان خواردنەکەی هەڵگرت و بردی بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا خواردنەکە لای پێغەمبەر ﷺ مایەوە، (عەبدوڕەحمان دەڵێ:) لە نێوان ئێمە و هۆزێکدا پەیمان هەبوو ماوەکەی تەواو بووبوو (جا سووپاکە گەڕانەوە بۆ مەدینە)، جا پێغەمبەر ﷺ کردینی بە دوانزە بەشەوە، هەر بەشەی پیاوێك سەرکردەی بوو، هەر یەکەیان ئەوەندە خەڵکی لەگەڵدا بوو، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێ چەند زۆر بوون، جا هەموو ئەو سووپایە لەو خواردنەیان خوارد (و بەشی کردن)، یان وەك ئەوەی وتی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ١٠- كِتَابُ الأَذَانِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٠- پەڕاوی بانگدان

## ١- بابُ بَدْءِ الأَذَانِ

وَقَوْلُهُ ﷻ: ﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾﴾ المائدة، وَقَوْلُهُ: ﴿إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ ﴿٩﴾﴾ الجمعة.

٦٠٣- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ذَكَرُوا النَّارَ وَالنَّاقُوسَ، فَذَكَرُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى، فَأُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ وَأَنْ يُوتِرَ الإِقَامَةَ[1].

## ١- باسی دەسپێکردنی بانگدان

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (کاتێ بانگ دەدەن بۆ نوێژ، هاوبەشدانەران گاڵتە و لاقرتێی پێ دەکەن، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوان گەلێکی تێنەگەیشتوو و نەفامن)، وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (کاتێ بانگ درا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینیدا).**

**٦٠٣- ئەنەس ﷺ دەڵێ: (دەربارەی بانگ بۆ نوێژ) باسی ئاگر و زەنگیان کرد، جا باسی جوولەکە و گاورەکانیان کرد، (سەرەنجام) فەرمان کرا بە بیلال کە بانگ بڵێت بە وتنەوەی وشەکان دوو جار دوو جار، وە قامەتیش وشەکانی یەك جار یەك جار بڵێ.**

[1] بڕوانە: ٦٠٥، ٦٠٧، ٣٤٥٧، ٦٠٦.

٦٠٤- حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَاةَ، لَيْسَ يُنَادَى لَهَا، فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ بُوقًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ. فَقَالَ عُمَرُ: أَوَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا بِلَالُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ».

**٦٠٤- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: موسوڵمانان کاتێ هاتن بۆ مەدینە لە کاتی نوێژەکاندا کۆ دەبوونەوە، چاوەڕێی نوێژیان دەکرد، بانگی بۆ نەدەدرا، جا ڕۆژێکیان لەوبارەیەوە قسەیەکیان کرد، هەندێکیان وتیان: زەنگێکی وەك زەنگی گاورەکان دانێن، هەندێکی دیکەیان وتیان: کەڕەنایەکی وەك کەڕەنای جوولەکەکان دانێن، عومەریش ﷺ وتی: ئەی بۆ پیاوێ نانێرن بانگی خەڵك بکات بۆ نوێژ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ (هاتن بۆ) نوێژ)).**

## ٢- بابٌ: الأذانُ مَثْنَى مَثْنَى

٦٠٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ عَطِيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ وَأَنْ يُوتِرَ الإِقَامَةَ إِلَّا الإِقَامَةَ[1].

## ٢- باسێك: وشەکانی بانگ دوو جار دوو جار دەوترێنەوە

**٦٠٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: بیلال ﷺ فەرمانی پێ درا کە وشەکانی بانگ دوو جار دوو جار بڵێتەوە، بەڵام وشەکانی قامەت یەك جار بڵێتەوە. جگە لەوشەی** (قَدْ قامتِ الصلاةُ) **(کە دوو جار بیڵێتەوە).**

---

[1] بڕوانە: ٦٠٣.

٦٠٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا كَثُرَ النَّاسُ -قَالَ:- ذَكَرُوا أَنْ يَعْلَمُوا وَقْتَ الصَّلاَةِ بِشَيْءٍ يَعْرِفُونَهُ، فَذَكَرُوا أَنْ يُورُوا نَارًا أَوْ يَضْرِبُوا نَاقُوسًا، فَأُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ وَأَنْ يُوتِرَ الإِقَامَةَ[1].

**٦٠٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێ خەڵك (ی نوێژکەر) زۆر بوون -وتی:- باسی ئەوەیان کرد کە بە شتێك خەڵك ئاگادار بکەنەوە کە کاتی نوێژەکانی پێ بزانن، جا وتیان: (لە کاتی نوێژەکاندا) ئاگر بکەنەوە، یان زەنگێك لێ بدەن، سەرەنجام فەرمان درا بە بیلال کە دوو جار دوو جار وشەکانی بانگ بڵێتەوە، وە وشەکانی قامەتیش یەك جار بڵێتەوە.**

## ٣- بابٌ: الإِقَامَةُ وَاحِدَةٌ، إِلَّا قَوْلَهُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ

٦٠٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَأَنْ يُوتِرَ الإِقَامَةَ. قَالَ إِسْمَاعِيلُ: فَذَكَرْتُ لأَيُّوبَ فَقَالَ: إِلاَّ الإِقَامَةَ[2].

## ٣- باسێک: قامەتکردن وشەکانی یەک جار دەوترێن جگە لە وشەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ)

**٦٠٧- ئەنەس ﷺ دەڵێ: بیلال ﷺ فەرمانی پێ درا کە وشەکانی بانگ دووبارە بکاتەوە، وە وشەکانی قامەتیش یەك جار بڵێت. ئیسماعیل دەڵێ: ئەمەم بۆ ئەیوب باس کرد، وتی: جگە لە: (قَدْ قامتِ الصلاةُ) (دوو جار دەوترێت).**

---

[1] بڕوانە: ٦٠٣.

[2] بڕوانە: ٦٠٣.

## ٤- بابُ فَضْلِ التَّأْذِينِ

٦٠٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قَضَى النِّدَاءَ أَقْبَلَ، حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ، حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطُرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ، يَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا، اذْكُرْ كَذَا. لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى»[1].

## ٤- باسی گەورەیی بانگدان

**٦٠٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کاتێ بانگ درا بۆ نوێژ، شەیتان پشت هەڵدەکات و دەڕوات، تڕی لێ دەبێتەوە، بۆ ئەوەی گوێی لە بانگدانەکە نەبێت، ئینجا کە بانگەکە تەواو دەبێت، دەگەڕێتەوە هەتا قامەتی نوێژ دەکرێ، جارێکی دیکە پشت هەڵدەکاتەوە هەتا قامەتەکە تەواو دەبێت، جا دەگەڕێتەوە هەتا لە دڵی مرۆڤی نوێژکەر گومان دروست بکات، وە دەڵێ: بیر لەو شتە و لەو شتە بکەرەوە، کە پێشتر هەر بیری لێ نەکردۆتەوە (بە خەیاڵیدا نەهاتووە)، هەتا ئەو کەسە نوێژکەرە وای لێ دێت نازانێ چەند ڕکات نوێژی کردووە)).**

## ٥- بابُ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالنِّدَاءِ

وَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ: أَذِّنْ أَذَانًا سَمْحًا، وَإِلَّا فَاعْتَزِلْنَا.

٦٠٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ الأَنْصَارِيِّ، ثُمَّ الْمَازِنِيِّ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ

---

[1] بڕوانە: ١٢٢٢، ١٢٣١، ١٢٣٢، ٣٢٨٥.

قَالَ لَهُ: «إِنِّي أَرَاكَ تُحِبُّ الْغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ، فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلاَةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ، فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلاَ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ إِلاَّ شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

## ٥- باسی (پاداشتی) دەنگبەرزکردنەوە بە بانگدان

**عومەری کوڕی عەبدولعەزیز وتی (بە بانگبێژێك): بانگدانەکە بە ئاواز و لاواندنەوەوە مەڵێ، بەڕێکی بیڵێ، دەنا لێمان دوور کەوەرەوە (بانگ مەدە).**

**٦٠٩- عەبدوڕەحمانی کوڕی صەعصەعەی ئەنصاڕی پاشان مازینی لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە کە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ پێی وت: ((بەڕاستی من دەتبینم حەزت لە مەڕ و ماڵات و دەشت و چۆڵەوانییە، جا کاتێ لەنێو مەڕ و ماڵاتەکەتدا بوویت، یان لە دەشت و چۆڵەوانییەکەدا بوویت و بانگت دا بۆ نوێژ، ئەوە دەنگت بەرز بکەرەوە بەو بانگدانەت، چونکە بێگومان هیچ جنۆکە و مرۆڤ و شتێك نییە کە گوێی لە دەنگی بانگبێژ بێت، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا شایەتی بۆ دەدات))، ئەبو سەعید دەڵێ: ئەمەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە.**

## ٦- بابُ مَا يُحْقَنُ بِالأَذَانِ مِنَ الدِّمَاءِ

٦١٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا غَزَا بِنَا قَوْمًا لَمْ يَكُنْ يَغْزُو بِنَا حَتَّى يُصْبِحَ وَيَنْظُرَ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا كَفَّ عَنْهُمْ، وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ أَذَانًا أَغَارَ عَلَيْهِمْ، قَالَ: فَخَرَجْنَا إِلَى خَيْبَرَ فَانْتَهَيْنَا إِلَيْهِمْ لَيْلًا، فَلَمَّا أَصْبَحَ وَلَمْ يَسْمَعْ أَذَانًا رَكِبَ وَرَكِبْتُ خَلْفَ أَبِي طَلْحَةَ، وَإِنَّ قَدَمِي لَتَمَسُّ قَدَمَ

---

[1] بڕوانە: ٣٢٩٦، ٧٥٤٨.

النَّبِيِّ ﷺ. قَالَ فَخَرَجُوا إِلَيْنَا بِمَكَاتِلِهِمْ وَمَسَاحِيهِمْ فَلَمَّا رَأَوُا النَّبِيَّ ﷺ قَالُوا: مُحَمَّدٌ وَاللَّهِ، مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ. قَالَ: فَلَمَّا رَآهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ»[1].

## ٦- باسی ئەو کەسانەی بەهۆی بانگدانەوە نابێ خوێنیان بڕژێنرێ

**٦١٠- حومەید دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر غەزای هۆزێکی پێ بکردینایە، هیچ کات جەنگ و غەزاکەی پێ نەدەکردین هەتا بانگی بەیانی نەبووایە و سەرنجی نەدایە، جا ئەگەر گوێی لە بانگدان بووایە، وازی لێ دەهێنان، بەڵام ئەگەر گوێی لە بانگدان نەبووایە، دەیدا بەسەریاندا، ئەنەس دەڵێ: جا ئێمە ڕۆیشتین بۆ خەیبەر و شەو گەیشتینە لایان، جا کاتێ بانگی بەیانی بوو، پێغەمبەر ﷺ گوێی لە بانگ نەبوو سواری وڵاخەکەی بوو، منیش لە پاشەوەی ئەبو تەلحەوە سوار بووم، بێگومان پێم دەیدا لە پێی پێغەمبەر ﷺ، ئەنەس دەڵێ: (جوولەکەکان) بە سەبەتە و بێڵ و خاکەنازەکانیانەوە لە قەڵاکانیان هاتنە دەرەوە ڕوو بە ئێمە، ئینجا کە پێغەمبەریان ﷺ بینی وتیان: سوێند بە خوا موحەممەد (هات)، موحەممەد و سووپاکەی (هات)، ئەنەس دەڵێ: جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بینینی فەرمووی: ((الله أكبر الله أكبر خەیبەر وێران بوو، بێگومان هەر کات ئێمە بڕۆینە گۆڕەپانی هەر گەلێکەوە جا چەند خراپە بەیانی بێدارکراوەکانی)).**

---

[1] بڕوانە: ٣٧١.

## ٧- بابُ مَا يَقُولُ إِذَا سَمِعَ الْمُنَادِي؟

٦١١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ».

## ٧- باسی موسوڵمان چی بڵێ کاتێ گوێی لە بانگدەر دەبێ؟

**٦١١- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر گوێتان لە بانگ بوو، ئەوە بانگدەرەکە چی دەڵێ ئێوەش وەك ئەو بڵێن)).**

٦١٢- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنِي عِيسَى بْنُ طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ يَوْمًا فَقَالَ مِثْلَهُ إِلَى قَوْلِهِ: وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ رَاهَوَيْهِ قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى نَحْوَهُ[١].

**٦١٢- عیسای کوڕی تەلحە دەڵێ: ڕۆژێ گوێی لە موعاویە بوو بە وێنەی وتەی بانگبێژەکەی وت[٢] لەگەڵ: (وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ). (ئیمام بوخاری دەڵێ): ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوییە دەڵێ: وەهبی کوڕی جەریر بۆی گێڕاینەوە، وتی: هیشام بۆی گێڕاینەوە لە یەحیاوە وێنەی فەرموودەکەی پێشوو.**

٦١٣- قَالَ يَحْيَى: وَحَدَّثَنِي بَعْضُ إِخْوَانِنَا، أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. وَقَالَ: هَكَذَا سَمِعْنَا نَبِيَّكُمْ ﷺ يَقُول[٣].

---

[١] بڕوانە: ٦١٣، ٩١٤.

[٢] واتە: بانگدەرەکە چی وت ئەمیش وتی.

[٣] بڕوانە: ٦١٢.

**٦١٣- یەحیا دەڵێ: هەندێ لە برایانمان بۆیان گێڕامەوە کە عیسای کوڕی تەلحە وتوویەتی: کاتێ بانگدەرەکە وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)، موعاویە وتی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)، وە وتی: لە پێغەمبەرەکەتانم ﷺ بیستووە ئاوەهای دەفەرموو.**

## ٨- بابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ النِّدَاءِ

٦١٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَيَّاشٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ. حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

## ٨- باسی دوعا و نزاکردن لە (کۆتایی) بانگداندا

**٦١٤- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس کاتێ گوێی لە بانگە بڵێ: ئەی خودایە، پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە (کە یەکتاپەرستییە)، وە ئەم نوێژەی کە دەکرێ، پلەی بەرز و بڵند بدە بە موحەممەد، وە بیبەرە ئەو جێگایە پەسەندەی کە خۆت بەڵێنت پێ داوە. ئەو کەسە لە ڕۆژی دواییدا تکا و شەفاعەتی من دەیگرێتەوە)).**

## ٩- بابُ الاِسْتِهَامِ فِي الأَذَانِ

وَيُذْكَرُ أَن أقوَامًا اختَلَفُوا فِي الأَذَانِ فَأقْرَعَ بَينَهُمْ سَعْدٌ.

٦١٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ -مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ- عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ،

---

[1] بڕوانە: ٤٧١٩.

ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[1].

## ٩- باسی تیروپشككردن بۆ بانگدان

**دەگێڕنەوە كە كەسانێك لەسەر بانگدان ڕێك نەكەوتن، بۆیە سەعدیش ﷺ لە نێوانیاندا تیروپشكی كرد.**

**٦١٥- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر خەڵكی بیانزانییایە لە بانگدان و ڕیزی یەكەمی نوێژدا چەند پاداشت هەیە، ئینجا تەنها بەقورعەكێشی نەبووایە دەستیان نەكەوتایە، ئەوە قورعەكێشیان دەكرد لەسەریان، وە ئەگەر بیانزانییایە چ پاداشتێك لە زووهاتن بۆ نوێژدا هەیە، پێشبڕكێیان دەكرد بۆی، وە ئەگەر بیانزانییایە چ پاداشتێك لە نوێژی عیشا و بەیانیدا هەیە، دەهاتن بۆ هەردووكیان ئەگەر بەگاگۆڵكێش بووایە)).**

## ١٠- بَابُ الكَلاَمِ فِي الأَذَانِ

وَتَكَلَّمَ سُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ فِي أَذَانِهِ. وَقَالَ الحَسَنُ: لَا بَأْسَ أَنْ يَضْحَكَ وَهْوَ يُؤَذِّنُ أَوْ يقيمُ.

٦١٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ وَعَبْدِ الْحَمِيدِ صَاحِبِ الزِّيَادِيِّ وَعَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: خَطَبَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ فِي يَوْمٍ رَدْغٍ، فَلَمَّا بَلَغَ الْمُؤَذِّنُ: حَي عَلَى الصَّلاَةِ. فَأَمَرَهُ أَنْ يُنَادِيَ: الصَّلاَةُ فِي الرِّحَالِ. فَنَظَرَ الْقَوْمُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: فَعَلَ هَذَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، وَإِنَّهَا عَزْمَةٌ[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٥٤، ٧٢١، ٣٦٨٩.

[2] بڕوانە: ٦٦٨، ٩٠١.

## ١٠- باسی قسەکردن لەنێو بانگداندا (دروستە)

سولەیمانی کوڕی صوڕەد لە کاتێکدا بانگی دەدا قسەی کرد. حەسەن دەڵێ: قەیناکا کاتێ (بانگبێژ) بانگ دەدات یان قامەت دەکات پێ بکەنێ.

٦١٦- عەبدوڵای کوڕی حاریس دەڵێ: لە ڕۆژێکی قوڕاویدا عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ وتاری بۆ دەداین، جا کاتێ بانگدەرەکە گەشتە (حَی عَلَى الصَّلاَةِ) عەبدوڵا فەرمانی پێ کرد کە بە دەنگی بەرز بڵێ: لە ماڵەوە نوێژ بکەن، خەڵکەکەش سەیری یەکدییان کرد (لایان سەیر بوو)، بۆیە عەبدوڵا وتی: کەسێك کە لە من چاکترە (واتە: پێغەمبەر ﷺ) ئەمەی کردووە، هەرچەند نوێژی هەینی پێویست و فەرزە نەك ڕوخسەت.

## ١١- بَابُ أَذَانِ الأَعْمَى إِذَا كَانَ لَهُ مَنْ يُخْبِرُهُ

٦١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ بِلاَلًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ». ثُمَّ قَالَ: وَكَانَ رَجُلًا أَعْمَى لاَ يُنَادِي حَتَّى يُقَالَ لَهُ: أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ[1].

## ١١- باسی بانگدانی نابینا ئەگەر کەسێک هەبوو کاتی نوێژەکانی پێ بڵێ (دروستە)

٦١٧- سالیمی کوڕی عەبدوڵا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان (ڕەمەزانان) بیلال لە شەودا بانگ دەدات، کەواتە

---

[1] بڕوانە: ٦٢٠، ٦٢٣، ١٩١٨، ٢٦٥٦، ٧٢٤٨.

بخۆن و بخۆنەوە هەتا عەبدوڵای کوڕی ئومو مەکتوم بانگ دەدات))، (عەبدوڵا یان ئیبنو شیهاب) وتی: عەبدوڵای کوڕی ئومو مەکتوم پیاوێکی کوێر بوو بانگی بەیانی نەدەدا، هەتا پێیان نەوتایە بانگی بەیانی بووە، بانگی بەیانی بووە.

## ١٢- بَابُ الْأَذَانِ بَعْدَ الْفَجْرِ

٦١٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي حَفْصَةُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا اعْتَكَفَ الْمُؤَذِّنُ لِلصُّبْحِ وَبَدَا الصُّبْحُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تُقَامَ الصَّلَاةُ[١].

## ١٢- باسی بانگدان پاش (هەڵهاتنی) سپێدە

**٦١٨- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: حەفصە ﵂ بۆی گێڕامەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بانگدەر دادەنیشت[٢]، (چاوەڕوانی) بانگی بەیانی دەکرد و بانگی بەیانی دەبوو، پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی سوننەتی کورتی دەکرد، پێش ئەوەی قامەت بکرێ بۆ نوێژی بەیانی.**

٦١٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ عَائِشَةَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالإِقَامَةِ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ[٣].

**٦١٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی سووکەڵەی دەکرد لە نێوان بانگ و قامەتدا لە نوێژی بەیانیدا.**

---

[١] بڕوانە: ١١٧٣، ١١٨١.

[٢] یان بانگدەر بەپێوە دەوەستا بۆ بانگدانی بانگی بەیانی.

[٣] بڕوانە: ٦٢٦، ٩٩٤، ١١٢٣، ١١٥٩، ١١٦٠، ١١٦١، ١١٦٨، ١١٦٩، ١١٧٠، ١١٧١، ٦٣١٠.

٦٢٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ بِلاَلًا يُنَادِي بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ»[1].

**٦٢٠- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بیلال بەشەو بانگ دەدات (لە ڕەمەزاندا)، کەواتە بخۆن و بخۆنەوە هەتا عەبدوڵای ئومو مەکتوم بانگ دەدات)).**

## ١٣- بابُ الأذانِ قبلَ الفجْرِ

٦٢١- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ -أَوْ أَحَدًا مِنْكُمْ- أَذَانُ بِلاَلٍ مِنْ سَحُورِهِ، فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ -أَوْ يُنَادِي- بِلَيْلٍ؛ لِيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ وَلِيُنَبِّهَ نَائِمَكُمْ، وَلَيْسَ أَنْ يَقُولَ الْفَجْرُ أَوِ الصُّبْحُ». وَقَالَ بِأَصَابِعِهِ وَرَفَعَهَا إِلَى فَوْقُ وَطَأْطَأَ إِلَى أَسْفَلُ «حَتَّى يَقُولَ هَكَذَا». وَقَالَ زُهَيْرٌ بِسَبَّابَتَيْهِ إِحْدَاهُمَا فَوْقَ الأُخْرَى، ثُمَّ مَدَّهَا عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ[2].

## ١٣- باسی (حوکمی) بانگدان پێش سپێدە

**٦٢١- عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بانگدانی بیلال ڕێگری کەستان -یان کەسێك لە ئێوە- نەکات لە خواردنی پارشێو، چونکە بێگومان ئەو لە شەودا بانگ دەدات -یان بانگ دەڵێ- تا شەونوێژکەرتان بگەڕێتەوە (سەرخەوێ بشکێنێ)، وە تا خەوتووتان بێدار**

---

[1] بڕوانە: ٦١٧.

[2] بڕوانە: ٥٢٩٨، ٧٢٤٧.

**بکاتەوە، نەك بۆ ئەوە بێ بڵێ: سپێدە یان نوێژی بەیانی بووە))، جا بە پەنجەکانی ئاماژەی کرد بۆ سەرەوە و نزمی کردنەوە بۆ خوارەوە ((هەتا ئاوەها ئاماژەی کرد))، وە زوهەیر بەهەردوو پەنجەی شایەتومانی ئاماژەی کرد و یەکیانی نایە سەر ئەوی دیکەیان، پاشان لێکی جیا کردنەوە بە لای ڕاست و چەپیدا))[1].**

٦٢٢- ٦٢٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: عُبَيْدُ اللَّهِ حَدَّثَنَا، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ. وَعَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ. وَحَدَّثَنِي يُوسُفُ بْنُ عِيسَى الْمَرْوَزِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا الْفَضْلُ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ بِلاَلًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ».

**٦٢٢- ٦٢٣- ئەم فەرموودەیە عەبدوڵای کوڕی عومەر و عائیشە ﷺ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان بیلال بەشەودا بانگ دەدات، کەواتە بخۆن و بخۆنەوە هەتا عەبدوڵای کوڕی ئومو مەکتوم بانگ دەدات)).**

## ١٤- بابٌ: كَمْ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ، وَمَنْ يَنْتَظِرُ الإِقَامَةَ؟

٦٢٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْوَاسِطِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِد، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ - ثَلاَثًا - لِمَنْ شَاءَ»[2].

---

[1] واتە: ئاماژەی دا بەهاتنی بەیانی تەواو و ڕاست (الفجر الصادق)، کە ڕووناکی لە چواردەوری ئاسمان پەیدا دەبێت بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتەوە.

[2] بڕوانە: ٦٢٧.

## ١٤- باسێک: ماوەی نێوان بانگ و قامەت چەندە، وە (حوکمی) ئەو کەسەی چاوەڕوانی قامەت دەکات؟

**٦٢٤- عەبدوڵای کوڕی موغەففەلی موزەنی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژێکی (سوننەت) هەیە- ئەم وتەیەی سێ جار فەرموو- (پاشان لە سێیەمدا فەرمووی:) بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ (سوننەت بکات))).**

٦٢٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ عَامِرٍ الأَنْصَارِيَّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ كَانَ الْمُؤَذِّنُ إِذَا أَذَّنَ قَامَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُمْ كَذَلِكَ يُصَلُّونَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ شَيْءٌ. قَالَ عُثْمَانُ بْنُ جَبَلَةَ، وَأَبُو دَاوُدَ عَنْ شُعْبَةَ: لَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلاَّ قَلِيلٌ[1].

**٦٢٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێ بانگبێژەکە بانگی دەدا، خەڵکانێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەپەلە دەڕۆیشتنە پەنا پایەکان، هەتا پێغەمبەر ﷺ دەهاتە مزگەوتەوە، ئەوان هەر لە شوێنی خۆیان بوون، دوو ڕکات نوێژی سوننەتیان دەکرد پێش نوێژی مەغریب، وە لە نێوان بانگ و قامەتدا شتێکی وا نەبوو. عوسمانی کوڕی جەبەلە و ئەبو داود لە شوعبەوە گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: نێوان بانگ و قامەت کەمێکیان بەین بوو.**

---

[1] بڕوانە: ٥٠٣.

## ١٥- بابُ مَنِ انْتَظَرَ الإِقامَةَ

٦٢٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ بِالأُولَى مِنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، بَعْدَ أَنْ يَسْتَبِينَ الْفَجْرُ ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ لِلإِقَامَةِ[١].

## ١٥- باسی ئەوەی چاوەڕوانی قامەت دەکات

**٦٢٦- عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە بانگبێژەکە لە بانگی بەیانی دەبۆیەوە[٢]، هەڵدەسا و دوو ڕکات نوێژی سوننەتی سووکەڵەی دەکرد پێش نوێژی بەیانی و پاش ئەوەی سپێدە دەردەکەوت و ڕوون دەبۆیەوە، پاشان لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا، هەتا بانگبێژەکە دەهات بۆ لای بۆئەوەی قامەت بکات.**

## ١٦- بابٌ: بَينَ كُلِّ أَذانَيْنِ صَلاةٌ لِمَنْ شاءَ

٦٢٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ قَالَ: حَدَّثَنَا كَهْمَسُ بْنُ الْحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ» - ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ:- «لِمَنْ شَاءَ»[٣].

---

[١] بڕوانە: ٦١٩.

[٢] سەرنج: بانگ و قامەت هەردووکیان چونکە وشەکانیان یەکن، هەردووکیان بە بانگ دانراون، بۆیە لە فەرموودەکەدا فەرمووی: (إذا سكت المؤذن بالأولى)، واتە: بانگی یەکەمی دا واتە بانگی قامەت نا، مانای ئەم فەرموودەیە و فەرموودەکەی دوای خۆی یەک دەگرنەوە لەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ لە نێوان دوو بانگەکەدا - بانگ و قامەت - سوننەتی کردووە.

[٣] بڕوانە: ٦٢٤.

## ١٦- باسێک: لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژ (ی سوننەت) هەیە بۆ ئەوەی بیەوێ

٦٢٧- عەبدوڵای کوڕی موغەفەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژێکی (سوننەت) هەیە، لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژێکی (سوننەت) هەیە))، پاشان لە جاری سێیەمدا فەرمووی: ((بۆ کەسێك کە بیەوێ)).

## ١٧- بابُ مَنْ قَالَ: لِيُؤَذِّنْ فِي السَّفَرِ مُؤَذِّنٌ وَاحِدٌ

٦٢٨- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِي، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ رَحِيمًا رَفِيقاً، فَلَمَّا رَأَى شَوْقَنَا إِلَى أَهَالِينَا قَالَ: «ارْجِعُوا فَكُونُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ وَصَلُّوا، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»[1].

## ١٧- باسی ئەوەی کە دەڵێ: با لە سەفەردا یەک بانگبێژ بانگ بدات

٦٢٨- مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ چەند کەسێکی هۆزەکەمدا ڕۆیشتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بیست شەو لە خزمەتیدا ماینەوە، بەبەزەیی و نەرمونیان بوو (لەگەڵماندا)، ئینجا کە زانی زۆر بیری خاوخێزانمان دەکەین فەرمووی: ((بگەڕێنەوە لەنێو منداڵ و خێزانەکانتاندا بن و شارەزایان بکەن و

---

[1] بڕوانە: ٦٣٠، ٦٣١، ٦٥٨، ٦٨٥، ٨١٥، ٨١٩، ٢٨٤٨، ٦٠٠٨، ٧٢٤٦.

نوێژ بکەن، ئینجا کە نوێژ بوو با یەکێکتان بانگتان بۆ بدات، ئەوەشتان لە هەمووتان بەتەمەنترە پێشنوێژیتان بۆ بکات).

## ١٨- بابُ الأذَانِ لِلْمُسَافِرِ إِذَا كَانُوا جَمَاعَةً، وَالإِقَامَةِ، وَكَذَلِكَ بِعَرَفَةَ وَجَمْعٍ وَقَوْلِ الْمُؤَذِّنِ: الصَّلَاةُ فِي الرِّحَالِ فِي اللَّيْلَةِ الْبَارِدَةِ أَوِ الْمَطِيرَةِ

٦٢٩- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْمُهَاجِرِ أَبِي الْحَسَنِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَرَادَ الْمُؤَذِّنُ أَنْ يُؤَذِّنَ، فَقَالَ لَهُ «أَبْرِدْ». ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُؤَذِّنَ فَقَالَ لَهُ «أَبْرِدْ». ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُؤَذِّنَ، فَقَالَ لَهُ: «أَبْرِدْ». حَتَّى سَاوَى الظِّلُّ التُّلُولَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»[1].

## ١٨- باسی (حوکمی) بانگدان و قامەتکردن بۆ ڕێبوار ئەگەر کۆمەڵێک بوون، هەروەها (بانگدان و قامەتکردن) لە عەرەفە و موزدەلیفەدا، وە بانگبێژ لە شەوی سارد و باراناویدا بڵێ: لە جێگای خۆتان نوێژەکانتان بکەن

٦٢٩- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، بانگبێژەکە ویستی بانگ بدات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((با فێنك بكات))، پاشان ویستی بانگ بدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با فێنك بكات))، دواتر ویستی بانگ بدات، دیسان فەرمووی: ((با فێنك بكات))، هەتا سێبەر لەگەڵ گردۆڵکەکان یەکسان بوون، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان تینی گەرما لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە)).

---

[1] بڕوانە: ٥٣٥.

٦٣٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ قَالَ: أَتَى رَجُلَانِ النَّبِيَّ ﷺ يُرِيدَانِ السَّفَرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَنْتُمَا خَرَجْتُمَا فَأَذِّنَا، ثُمَّ أَقِيمَا، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا»[1].

**٦٣٠- مالیکی کوڕی حومیریس ﷺ دەڵێ: دوو پیاو هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دەیانویست بڕۆن بۆ سەفەر، پێغەمبەر ﷺ پێیانی فەرموو: ((ئەگەر ڕۆیشتن بۆ سەفەر (کاتێ نوێژ بوو) ئەوە بانگ بدەن، پاشان قامەت بکەن، ئینجا با ئەوەتان کە گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات)).**

٦٣١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ قَالَ حَدَّثَنَا مَالِكٌ: أَتَيْنَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ شَبَبَةٌ مُتَقَارِبُونَ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ يَوْمًا وَلَيْلَةً، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَحِيمًا رَفِيقًا، فَلَمَّا ظَنَّ أَنَّا قَدِ اشْتَهَيْنَا أَهْلَنَا أَوْ قَدِ اشْتَقْنَا، سَأَلَنَا عَمَّنْ تَرَكْنَا بَعْدَنَا، فَأَخْبَرْنَاهُ، قَالَ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَأَقِيمُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ وَمُرُوهُمْ - وَذَكَرَ أَشْيَاءَ أَحْفَظُهَا أَوْ لاَ أَحْفَظُهَا- وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»[2].

**٦٣١- ئەبو قیلابە دەڵێ: مالیك ﷺ بۆی گێڕاینەوە و وتی: ئێمە چەند گەنجێکی هاوتەمەن بووین ڕۆیشتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا بیست شەو و ڕۆژ لە خزمەتیدا ماینەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بەبەزەیی و میهرەبان بوو، ئینجا کە زانی ئێمە ئارەزووی خاوخێزانمان دەکەین، یان زۆر بیریان دەکەین، پرسیاری لێ کردین کە هاتووین کێمان لەدوای خۆمان بەجێ هێشتووە؟ ئێمەش عەرزمان کرد، فەرمووی: ((بگەڕێنەوە بۆلای خاوخێزانتان و لەلایان بمێننەوە و**

[1] بڕوانە: ٦٢٨.

[2] بڕوانە: ٦٢٨.

شارەزایان بکەن و فەرمانیان پێ بدەن (بەوەی پێویستە)))، -جا پێغەمبەر ﷺ شتانێکی فەرمووو لەبیرم ماوە یان لەبیرم نەماوە-، وە فەرمووی: ((نوێژ بکەن بەوشێوەی من دەبینن نوێژ دەکەم، ئینجا کە نوێژ بوو با یەکێکتان بانگتان بۆ بدات، وە ئەوەتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات)).

٦٣٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ قَالَ أَذَّنَ ابْنُ عُمَرَ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ بِضَجْنَانَ[1]، ثُمَّ قَالَ: صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ. فَأَخْبَرَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ مُؤَذِّنًا يُؤَذِّنُ، ثُمَّ يَقُولُ عَلَى إِثْرِهِ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ. فِي اللَّيْلَةِ الْبَارِدَةِ أَوِ الْمَطِيرَةِ فِي السَّفَرِ[2].

٦٣٢- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ لە شەوێکی سارددا لە زەجنان بانگی دا، پاشان وتی: هەر کەس لەجێگە و شوێنی خۆتاندا نوێژ بکەن، ئینجا بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد بە بانگبێژەکە بانگ بدات، پاشان بەدوای بانگەکەدا بڵێ: ((ئەوسا ئاگادار بن لە جێگای و شوێنی خۆتان نوێژ بکەن)). لە شەوی سارد یان باراناویدا لە سەفەردا.

٦٣٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، قَالَ أَخْبَرَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، قَالَ حَدَّثَنَا أَبُو الْعُمَيْسِ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالأَبْطَحِ فَجَاءَهُ بِلاَلٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلاَةِ، ثُمَّ خَرَجَ بِلاَلٌ بِالْعَنَزَةِ حَتَّى رَكَزَهَا بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالأَبْطَحِ[3] وَأَقَامَ الصَّلاَةَ.

٦٣٣- ئەبو جوحەیفە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ لە ئەبتەحدا بینی، جا بیلال هات و ئاگاداری پێغەمبەری کرد ﷺ کە نوێژە، پاشان بیلال نێزەیەکی هێنا و لە ئەبتەح لەبەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دایچەقاند، وە قامەتی نوێژی کرد.

---

[1] ضَجْنَانَ: شاخێکە بیست و پێنج میل لە مەککەوە دوورە لە نێوان مەککە و مەدینەدایە.

[2] بڕوانە: ٦٦٦.

[3] الأَبْطَحِ: جێگایەکە لە دەرەوەی مەدینەدایە.

### ١٩- بابٌ: هَلْ يَتَتَبَّعُ الْمُؤَذِّنُ فَاهُ هَا هُنَا وَهَا هُنَا، وَهَلْ يَلْتَفِتُ فِي الأَذَانِ؟

وَيُذْكَرُ عَنْ بِلَالٍ أَنهُ جَعَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ. وَكَانَ ابن عُمَرَ لَا يَجْعَلُ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: لَا بَأْسَ أَنْ يُؤَذِّنَ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ. وَقَالَ عَطَاءٌ: الوُضُوءُ حَقٌّ وَسُنَّةٌ. وَقَالَتْ عَائِشَةُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ اللهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ.

٦٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ ثَنَا سُفْيَانُ، عن عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيفَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ رَأى بِلَالًا يُؤَذِّنُ، فَجَعَلْتُ أَتَتَبَّعُ فَاهُ هَا هُنَا وَهَا هُنَا بِالأَذَانِ[1].

## ١٩- باسێک: ئایا بانگبێژ دەمی بەرەو لای ڕاست و لای چەپ دەسووڕێنێ؟ وە ئایا (بە سەری) لا دەکاتەوە (بۆ ڕاست و چەپ) لە بانگداندا؟

**لە بیلالەوە ﷺ دەگێڕدرێتەوە کە دوو پەنجەی دەخستە هەردوو گوێیەوە، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ پەنجەکانی نەدەخستە گوێیەوە، وە ئیبراهیم دەڵێ قەیناکا (بانگبێژ) بەبێدەستنوێژ بانگ بدات. وە عەتاو دەڵێ: دەستنوێژ هەق و سوننەتە (بۆ بانگبێژ). عائیشەش ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتێکدا یادی خوای دەکرد (با دەستنوێژیشی نەبووایە).**

**٦٣٤- عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە بیلالی بینیوە بانگی دەدا، (دەڵێ:) جا سەرنجی دەمیم دەدا، ئاوەها و ئاوەها (بەلای ڕاست و چەپدا دەیسووڕاند) لە کاتی بانگەکە.**

---

[1] بڕوانە: ١٨٧.

## ٢٠- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ: فَاتَتْنَا الصَّلَاةُ

وَكَرِهَ ابن سِيرِينَ أَنْ يَقُولَ: فَاتَتْنَا الصَّلَاةُ. ولكن لِيَقُلْ: لَمْ نُدْرِكْ. وَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ أَصَحُّ.

٦٣٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ سَمِعَ جَلَبَةَ رِجَالٍ، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: «مَا شَأْنُكُمْ؟». قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلَاةِ. قَالَ «فَلاَ تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا.

## ٢٠- باسی پیاو بڵێ: نوێژەکەمان فەوتا[1]

**ئیبنو سیرین پێی باش نییە کەسێك بڵێ: نوێژەکەمان فەوتا، بەڵکوو بڵێ بە نوێژ ڕانەگەیشتین، وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ڕاسترە (کە فەوتانی بەکار هێناوە).**

**٦٣٥- ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد، کە گوێی لە دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی پیاوانێك بوو، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ((ئەوە چیتانە؟)) وتیان: پەلەمان کرد بەنوێژ ڕابگەین، فەرمووی: ((وا مەکەن، کە هاتن بۆ نوێژ لەسەرخۆ و شێنەیی بن، جا ئەوەندەی پێی گەیشتن (لە نوێژی جەماعەت) بیکەن، ئەوەشی پێی نەگەیشتن، خۆتان بەتەنیا تەواوی بکەن)).**

## ٢١- بابٌ: لَا يَسْعَى إِلَى الصَّلَاةِ، وَلْيَأْتِ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ

وَقَالَ: ((مَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا)). قَالَهُ أَبُو قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

---

[1] ناپەسەندە یان ئاساییە و قەیناکات؟

[2] بڕوانە: ٦٣٥.

٦٣٦- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَعَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «إِذَا سَمِعْتُمُ الإِقَامَةَ فَامْشُوا إِلَى الصَّلاَةِ، وَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ وَلاَ تُسْرِعُوا، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا»[1].

## ٢١- باسێک: نوێژکەر لە هاتن بۆ نوێژ پەلە نەکات و بەلەسەرخۆیی و سەنگینی بێت بۆ نوێژ

**(پێغەمبەر ﷺ) دەفەرموێ: ((ئەوەندەی پێڕا گەیشتن (لە نوێژی بەکۆمەڵ) بیکەن، وە ئەوەشی پێڕا نەگەیشتن ئەوە بەتەنیا خۆتان تەواوی بکەن)).**

**٦٣٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((کاتێ گوێتان لە قامەت بوو، ئەوە بڕۆن بۆ نوێژی (جەماعەت) بەشێنەیی و هێمنی و سەنگینی و پەلەمە کەن، جا بە چەندیا گەیشتن بیکەن، ئەوەشی پێی نەگەیشتن (بەجەماعەت)، خۆتان بەتەنیا تەواوی بکەن)).**

## ٢٢- بابٌ: مَتَى يَقُومُ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الإِمَامَ عِنْدَ الإِقَامَةِ؟

٦٣٧- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ يَحْيَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي»[2].

---

[1] بڕوانە: ٩٠٨.

[2] بڕوانە: ٦٣٨، ٩٠٩.

## ٢٢- باسێک: نوێژکەران کەی هەستن (بۆ نوێژکردن) ئەگەر ئیمامیان بینی لە کاتی قامەتکردنی نوێژدا؟

٦٣٧- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ هەڵمەستن هەتا من دەبینن[1] (دێمە مزگەوتەوە بۆ نوێژکردن))).

## ٢٣- بابٌ: لَا يَسْعَى إِلَى الصَّلَاةِ مُسْتَعْجِلًا، وَلْيَقُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ

٦٣٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي، وَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ». تَابَعَهُ عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ[2].

## ٢٣- باسێک: نوێژکەر بە پەلە نەیەت بۆ نوێژ، وە با بەلەسەرخۆیی و ویقارەوە هەستێ بۆ نوێژ

٦٣٨- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ هەڵمەستن هەتا من دەبینن و لەسەرخۆ بن (لە هەستان بۆ نوێژ))). عەلی کوڕی موبارەك ئەم فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شەیبان دەکات.

---

[1] سەرنج: مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بووە بۆ ئەوەی خەڵک زۆر بەپێوە نەوستن هەتا ئیمام دێت. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢/٢٨٠.

[2] بڕوانە: ٦٣٧.

## ٢٤- بابُ هَل يَخرُجُ مِنَ المَسْجِد لِعِلَّةٍ؟

٦٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ وَقَدْ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَعُدِّلَتِ الصُّفُوفُ، حَتَّى إِذَا قَامَ فِي مُصَلاَّهُ انْتَظَرْنَا أَنْ يُكَبِّرَ، انْصَرَفَ، قَالَ: «عَلَى مَكَانِكُمْ». فَمَكَثْنَا عَلَى هَيْئَتِنَا حَتَّى خَرَجَ إِلَيْنَا يَنْطُفُ رَأْسُهُ مَاءً وَقَدِ اغْتَسَلَ[1].

## ٢٤- باسی ئایا نوێژکەر لەبەر هۆ و پێویستییەک دروستە لە مزگەوت بڕواتە دەرەوە؟

**٦٣٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: لەکاتێکدا قامەتی نوێژ کرابوو ڕیزەکان ڕێك کرابوون، پێغەمبەری خوا ﷺ هات هەتا لە شوێن نوێژەکەیدا وەستا، چاوەڕوانمان کرد الله أکبر بکات (نوێژ دەست پێ بکات)، گەڕایەوە و فەرمووی: ((لە شوێنی خۆتان ڕاوەستن))، ئیدی ئێمەش وەك خۆمان چۆن وەستابووین ماینەوە، هەتا هاتەوە بۆ لامان سەری ئاوی لێ دەتکا، چونکە خۆی شۆردبوو.**

## ٢٥- بابُ إِذَا قَالَ الإِمَامُ: مَكَانَكُمْ حَتَّى أَرْجِعَ انْتَظَرُوهُ

٦٤٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَسَوَّى النَّاسُ صُفُوفَهُمْ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَقَدَّمَ وَهْوَ جُنُبٌ ثُمَّ قَالَ: «عَلَى مَكَانِكُمْ». فَرَجَعَ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ خَرَجَ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ مَاءً، فَصَلَّى بِهِمْ[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٧٥.

[2] بڕوانە: ٢٧٥.

## ٢٥- باسی ئەگەر پێشنوێژ بڵێ: لە شوێنی خۆتان ڕاوەستن، هەتا دەگەڕێمەوە نوێژکەرەکان چاوەڕوانی دەکەن

٦٤٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: قامەتی نوێژ کرا و خەڵك ریزەکانیان ڕێك کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات و ڕۆیشتە پێشەوە، لە کاتێکدا لەشگران بوو، پاشان فەرمووی: ((لە شوێنی خۆتان بوەستن))، ئینجا گەڕایەوە (بۆ ماڵەوە) و خۆی شۆرد، پاشان هاتە دەرەوە بۆ مزگەوت و سەری ئاوی لێ دەتکا، جا پێشنوێژی بۆ کردن.

## ٢٦- بَابُ قَوْلِ الرَّجُلِ: مَا صَلَّيْنَا

٦٤١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ يَقُولُ: أَخْبَرَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَاءَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَقَالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كِدْتُ أَنْ أُصَلِّيَ حَتَّى كَادَتِ الشَّمْسُ تَغْرُبُ، وَذَلِكَ بَعْدَ مَا أَفْطَرَ الصَّائِمُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَاللَّهِ مَا صَلَّيْتُهَا». فَنَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى بُطْحَانَ وَأَنَا مَعَهُ، فَتَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى -يَعْنِي: الْعَصْرَ- بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ[1].

## ٢٦- باسی کەسێک بڵێت[2]: نوێژمان نەکردووە

٦٤١- جابیری کوڕی عەبدولا ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەنگی خەندەقدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەمتوانی نوێژ بکەم هەتا نزیك بوو خۆر ئاوا بێ، ئەوەش دوای ئەو کاتە بوو کە ڕۆژووەوان ڕۆژووی شکاندبوو، پێغەمبەریش ﷺ

---

[1] بڕوانە: ٥٩٦.

[2] لە ڕیوایەتی ئەبو زەڕ بۆ صەحیحی بوخاری بەم جۆرەیە: ئەگەر پیاوێك بڵێت بە پێغەمبەر ﷺ: نوێژمان نەکردووە.

فەرمووی: ((سوێند بە خوا منیش نوێژ (ی عەسر)م نەکردووە))، جا پێغەمبەر ﷺ دابەزی بۆ بوتحان و منیش لەگەڵیدا بووم، دەستنوێژی گرت و پاشان نوێژی کرد، -واتە: نوێژی عەسر- دوای ئەوەی خۆر ئاوا بووبوو، پاشان بەدوای نوێژی عەسردا نوێژی مەغریبی کرد.

## ٢٧- بَابُ الإِمَامِ تَعْرِضُ لَهُ الحَاجَةُ بَعْدَ الإِقَامَةِ

٦٤٢- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَالنَّبِيُّ ﷺ يُنَاجِي رَجُلًا فِي جَانِبِ الْمَسْجِدِ، فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ[1].

## ٢٧- باسی ئیمام پێویستییەکی بۆ بێتە پێش دوای قامەتکردن

٦٤٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: قامەتی نوێژ کرا و پێغەمبەر ﷺ لە بەشێکی مزگەوتدا لەگەڵ پیاوێك بەسرتە قسەی دەکرد، ئیدی هەڵنەستا بۆ نوێژ هەتا خەڵکەکە خەویان لێ کەوت.

## ٢٨- بَابُ الكَلَامِ إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ

٦٤٣- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ قَالَ: سَأَلْتُ ثَابِتًا الْبُنَانِيَّ عَنِ الرَّجُلِ يَتَكَلَّمُ بَعْدَ مَا تُقَامُ الصَّلاَةُ، فَحَدَّثَنِي عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَعَرَضَ لِلنَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ فَحَبَسَهُ بَعْدَ مَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ.

---

[1] بڕوانە: ٦٤٣، ٦٢٩٢.

## ٢٨- باسی قسەکردن لە کاتێکدا قامەتی نوێژ کرابێت

**٦٤٣- حومەید دەڵێ: پرسیارم لە سابیتی بونانی کرد دەربارەی کەسێك قسە بکات دوای ئەوەی قامەتی نوێژ کرابێ، ئەویش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە وتوویەتی: قامەتی نوێژ کرا و پیاوێك بەرۆکی پێغەمبەری ﷺ گرت و گیری دا، دوای ئەوەی قامەتی نوێژ کرابوو.**

## ٢٩- بابُ وُجُوبِ صَلَاةِ الجَمَاعَةِ

وَقَالَ الحَسَنُ: إِنْ مَنَعَتْهُ أُمُّهُ عَنِ العِشَاءِ فِي جَمَاعَةٍ شَفَقَةً عَلَيهِ لَم يُطِعْهَا[1].

٦٤٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقًا سَمِينًا أَوْ مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ الْعِشَاءَ»[2].

## ٢٩- باسی نوێژی جەماعەت واجبە

**حەسەن دەڵێ: ئەگەر کەسێك دایکی ڕێگری نوێژی جەماعەتی عیشای لێ کرد، بەهۆی بەزەییپیاهاتنەوەی (بە کوڕەکەیدا) با بەگوێی نەکات.**

**٦٤٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە نیازم بوو کە فەرمان بدەم هەندێ**

---

[1] بڕوانە: ٦٤٣.

[2] بڕوانە: ٦٥٧، ٢٤٢٠، ٧٢٢٤.

**دار كۆ بكرێتەوە، پاشان فەرمان بكەم بانگ بۆ نوێژ بدرێ، پاشان فەرمان بدەم بە پیاوێ پێشنوێژی بۆ خەڵك بكات، ئینجا بڕۆم بۆ سەر كەسانێك (كە نایەن بۆ نوێژی جەماعەت) خانووەكانیان بسووتێنم بەسەریاندا، وە سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر كەسێكیان بیزانیبایە (ئەگەر بێت بۆ نوێژی جەماعەت) ئێسقانێكی كەم گۆشتی[1] دەست دەكەوێ، یان گۆشتی نێوان پێچەكەی مەڕی دەست بكەوێ، ئەوە ئامادەی نوێژی عیشا دەبوو)).**

## ٣٠- بابُ فَضْلِ صَلَاةِ الجَمَاعَةِ

وَكَانَ الأَسْوَدُ إِذَا فَاتَتْهُ الجَمَاعَةُ ذَهَبَ إِلى مَسْجِدٍ آخَرَ. وَجَاءَ أَنَسٌ إِلى مَسْجِدٍ قَدْ صُلِّيَ فِيهِ، فَأَذَنَ وَأَقَامَ وَصَلَّى جَمَاعَةً.

٦٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[2].

## ٣٠- باسی گەورەیی نوێژی جەماعەت

**ئەسوەد ئەگەر نوێژی جەماعەتەكەی لەدەست چووبایە دەڕۆیشت بۆ مزگەوتێكی دیكە (تا بەجەماعەت بیكات)، وە ئەنەس ﷺ هات بۆ مزگەوتێك كە نوێژی تیا كرابوو، ئینجا بانگی دا و قامەتی كرد بەجەماعەت نوێژی كرد.**

**٦٤٥- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نوێژی جەماعەت بیست و حەوت پلە گەورەترە لە نوێژێ كە بەتەنها بكرێ)).**

---

[1] یان گرتكێك گۆشتی زۆر پێوە بێت. ئەم مانایەش ڕاستە.

[2] بڕوانە: ٦٤٩.

٦٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي ابْنُ الْهَادِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً».

**٦٤٦- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە فەرموویەتی: ((نوێژی جەماعەت بیست و پێنج پلە لە نوێژی بەتەنها گەورەترە)).**

٦٤٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ:حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلاَةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ الصَّلاَةُ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ، فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلِ الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ. وَلاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرَ الصَّلاَةَ»[1].

**٦٤٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نوێژكردنی كەسێك بەجەماعەت، پاداشتەكەی بیست و پێنج جار زیاترە لە نوێژكردن لەماڵەوە یان لە بازاڕ، ئەوە ئەگەر دەستنوێژ بگرێ بەدەستنوێژگرتنێكی جوان، پاشان لە ماڵ دەربچێ بۆ مزگەوت مەبەستی دەرچوونەكەی تەنها نوێژ بێت، ئەوا هەر هەنگاوێك كە دەینێ بەهۆیەوە پلەیەكی پێ بەرز دەبێتەوە و گوناهێكی پێی دەوەرێ، جا كە نوێژی كرد بەردەوام فریشتە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكەن تا لە نوێژگەكەیدا بێت و دەڵێ: خوایە لێی خۆش ببە، خوایە بەزەییت پێیدا بێتەوە، وە بەردەوام هەر یەك لە ئێوە لە نوێژدایە تا چاوەڕوانی نوێژ بكات)).**

---

[1] بڕوانە: ١٧٦.

## ٣١- بابُ فَضْلِ صَلَاةِ الفَجْرِ فِي جَمَاعَةٍ

٦٤٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ .تَفْضُلُ صَلاَةُ الْجَمِيعِ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا، وَتَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ. ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾ الإسراء[1].

## ٣١- باسى گەورەيى نوێژى بەيانى بەجەماعەت

**٦٤٨- سەعیدى كوڕى موسەیەب و سەلەمەى كوڕى عەبدوڕەحمان دەگێڕنەوە كە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرى خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((نوێژى جەماعەت بیست و پێنج پلە گەورەترە لە نوێژى كەسێكتان بەتەنها (خۆى بیكات)، وە فریشتەكانى شەو و فریشتەكانى ڕۆژ (كە لەگەڵتانن) لە نوێژى بەیانیدا كۆ دەبنەوە و بەیەك دەگەن))، پاشان ئەبو هورەیرە دەڵێ: ئەگەر دەتانەوێ (ڕاستى ئەم فەرموودەیە بزانن) ئەم ئایەتە بخوێننەوە: (بێگومان نوێژى بەیانى فریشتەكان ئامادەى دەبن).**

٦٤٩- قَالَ شُعَيْبٌ: وَحَدَّثَنِي نَافِعٌ، عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: تَفْضُلُهَا بِسَبْعٍ وعِشْرِينَ دَرَجَةً[2].

**٦٤٩- نافیع لەعەبدوڵاى كوڕى عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: نوێژى جەماعەت بیست و حەوت پلە گەورەترە لە نوێژى بەتەنها.**

---

[1] بڕوانە: ١٧٦.

[2] بڕوانە: ٦٤٥.

٦٥٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ سَالِمًا قَالَ: سَمِعْتُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ تَقُولُ: دَخَلَ عَلَيَّ أَبُو الدَّرْدَاءِ وَهْوَ مُغْضَبٌ، فَقُلْتُ: مَا أَغْضَبَكَ؟ فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أَعْرِفُ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ شَيْئًا إِلاَّ أَنَّهُمْ يُصَلُّونَ جَمِيعًا.

**٦٥٠- ئومو دەرِدا ﷺ دەڵێ: ئەبو دەرِدا ﷺ هات بۆ لام بەتوڕەییەوە، منیش وتم: ئەوە چی توڕەی کردوویت؟ وتی: سوێند بە خوا هیچ شتێك ناناسمەوە لە (ئایینی) ئوممەتی موحەممەد ﷺ نەیانگۆڕیبێ، جگە لەوەی کە نوێژ بەکۆمەڵ دەکەن.**

٦٥١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعْظَمُ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلاَةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشًى، وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الإِمَامِ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الَّذِى يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ».

**٦٥١- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((گەورەترین پاداشت لە نوێژ (ی بەکۆمەڵ)دا بۆ ئەو کەسەیە کە ڕێگای دوورترە، وە ئینجا ئەوەی دوای ئەو دێ لە دووریدا، وە ئەو کەسەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات هەتا لەگەڵ ئیمامدا بەجەماعەت بیکات، پاداشتی گەورەترە لەوەی بەتەنها نوێژەکەی دەکات و پاشان دەخەوێ)).**

## ٣٢- بابُ فَضْلِ التَّهْجِيرِ إِلَى الظُّهْرِ

٦٥٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُمَيٍّ -مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ- عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ»[1].

[1] بڕوانە: ٢٤٧٢.

# ٣٢- باسی گەورەیی زوو ڕۆیشتن بۆ نوێژی نیوەڕۆ

٦٥٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا پیاوێك بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت، لقێکی دڕکی بینی لە ڕێگاکەدا بوو، ئەویش دووری خستەوە لە ڕێگاکە، بەهۆیەوە خوا سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو)).

٦٥٣- ثُمَّ قَالَ: «الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: المَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِيقُ، وَصَاحِبُ الهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». وَقَالَ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلا أَنْ يَسْتَهِمُوا لَاسْتَهَمُوا عَلَيْهِ»[1].

٦٥٣- پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((شەهیدەکان پێنجن: ئەوەی بە تاعون بمرێ، ئەوەی بە سکئێشە بمرێ، ئەوەی لە ئاودا بخنکێ، کەسێ شت بڕوخێ بەسەریدا، ئەوەی لەڕێی خوا شەهید بێ))، وە فەرمووی: ((ئەگەر خەڵکی بیانزانیبایە بانگدان و ڕیزی یەکەمی نوێژ چەندە پاداشتی تێدایە، پاشان دەستیان نەکەوتایە بەوە نەبێ تیروپشك بکەن، بێگومان تیروپشکیان دەکرد لەسەری)).

٦٥٤- «وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي العَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[2].

٦٥٤- (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) ((وە ئەگەر بیانزانیبایە زوو ڕۆیشتن بۆ نوێژ چەند پاداشتی هەیە، بەدڵنیاییەوە پێشبڕکێیان دەکرد بۆی، وە ئەگەر بیانزانیبایە نوێژی عیشا و بەیانی چەند پاداشتی هەیە، بێگومان دەڕۆیشتن بۆ هەردووکیان با بەگاگۆڵکێش بووایە)).

---

[1] بڕوانە: ٧٢٠، ٢٨٢٩، ٥٧٣٣، ٦١٥.

[2] بڕوانە: ٦١٥.

## ٣٣- بابُ احْتِسَابِ الآثَارِ

٦٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَوْشَبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيدٌ، عَن أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا بَنِي سَلِمَةَ، أَلا تَحْتَسِبُونَ آثَارَكُمْ؟!». وَقَالَ مُجَاهِدٌ فِي قَوْلِهِ: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ﴿١٢﴾﴾ يس، قَالَ: خُطَاهُمْ[1].

## ٣٣- باسی چاوەڕوانی پاداشتی هەنگاوانی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت

**٦٥٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی (هۆزی) بەنو سەلەمە ئێوە بەتەمای پاداشتی هەنگاوەکانتان نین لای خوا؟)). موجاهید دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ﴿١٢﴾﴾ يس، ﴿وَآثَارَهُمْ﴾ واتە: هەنگاوەکانیان.**

٦٥٦- وَقَالَ ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ، حَدَّثَنِي أَنَسٌ، أَنَّ بَنِي سَلِمَةَ أَرَادُوا أَنْ يَتَحَوَّلُوا عَنْ مَنَازِلِهِمْ فَيَنْزِلُوا قَرِيبًا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُعْرُوا الْمَدِينَةَ فَقَالَ «أَلاَ تَحْتَسِبُونَ آثَارَكُمْ». قَالَ مُجَاهِدٌ: خُطَاهُمْ: آثَارُهُمْ أَنْ يُمْشَى فِي الأَرْضِ بِأَرْجُلِهِمْ[2].

**٦٥٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: (هۆزی) بەنو سەلەمە ویستیان ماڵەکانیان بگوازنەوە و بێن بۆ نزیکی (مزگەوتی) پێغەمبەر ﷺ، ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بوو مەدینە چۆڵ بکەن (هەموویان لە نزیك مزگەوت کۆ ببنەوە)، بۆیە**

---

[1] بڕوانە: ٦٥٦، ١٨٨٧.

[2] بڕوانە: ٦٥٥.

فەرمووی: ((ئایا ناتانەوێ پاداشتی هەنگاوەکانتان لای خوا بۆ بنووسرێ؟)). موجاهید دەڵێ: ﴿ وَءَاثَٰرَهُمۡ ﴾ واتە: هەنگاوەکانیان، کە بریتییە لە ڕۆیشتن بەسەر زەویدا بە پێ.

## ٣٤- بابُ فَضلِ العِشَاءِ فِي الجَمَاعَةِ

٦٥٧- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ صَلاَةٌ أَثْقَلَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ مِنَ الْفَجْرِ وَالْعِشَاءِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا، لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ الْمُؤَذِّنَ فَيُقِيمَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا يَؤُمُّ النَّاسَ، ثُمَّ آخُذَ شُعَلًا مِنْ نَارٍ فَأُحَرِّقَ عَلَى مَنْ لاَ يَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ بَعْدُ»[1].

## ٣٤- باسی گەورەیی نوێژی عیشا بەکۆمەڵ

٦٥٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ نوێژێك نییە بەئەندازەی نوێژی بەیانی و عیشا لەسەر دووڕووان قورس بێت، جا ئەگەر موسوڵمانان بیانزانیبایە چەند پاداشتیان هەیە دەهاتن بۆ هەردووکیان ئەگەر بەگاگۆڵکێش بووایە، بەڕاستی نیازم بوو فەرمان بکەم بەبانگبێژەکە قامەت بکا، پاشان فەرمان بکەم پیاوێك پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی، پاشان چڵوسکێ ئاگر لەگەڵ خۆم ببەم، ئەوەی لەمەودوا نایەت بۆ نوێژی جەماعەت، خانووەکەی بەسەردا بسووتێنم)).

## ٣٥- بابُ اثْنَانِ فَمَا فَوْقَهُمَا جَمَاعَةٌ

٦٥٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَأَذِّنَا وَأَقِيمَا ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا»[2]

---

[1] بڕوانە: ٦٤٤.

[2] بڕوانە: ٦٢٨.

## ٣٥- باسی دوو کەس و زیاتر بەجەماعەت دادەنرێ

٦٥٨- مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوەکە فەرموویەتی: ((ئەگەر کاتی نوێژ هات، ئەوە یەکێکتان بانگ بدەن و قامەت بکەن (لەو دووانەتان)، پاشان ئەوەتان کە گەورەترە پێشنوێژیتان بکات)) (ئەمانەی ئەم فەرموودەیان پێ وترا دوو کەس بوون).

## ٣٦- بابُ مَنْ جَلَسَ فِي المَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ، وَفَضْلِ المَسَاجِدِ

٦٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ مَا لَمْ يُحْدِثْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ. لاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا دَامَتِ الصَّلاَةُ تَحْبِسُهُ، لاَ يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْقَلِبَ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ الصَّلاَةُ»[1].

## ٣٦- باسی ئەو کەسەی لە مزگەوتدا دادەنیشێ و چاوەڕوانی نوێژ دەکات، هەروەها باسی گەورەیی مزگەوتەکان

٦٥٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کام لە ئێوە هەتا لە شوێنی نوێژەکەیدا بێت و دەستنوێژی نەشکێت، فریشتە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکات و دەڵێ: خوایە لێی خۆش بە، خوایە ڕەحمی پێ بکە، بەردەوام کە هەر یەك لە ئێوە لە نوێژدایە هەتا نوێژ هێڵابێتیەوە (لە مزگەوتدا)، هیچ شتێك ڕێگری ناکات لە گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە جگە لە نوێژەکەی)).

---

[1] بڕوانە: ١٧٦.

٦٦٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي خُبَيْبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: الإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ. وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ»[1].

**٦٦٠- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((حەوت جۆر كەس خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری (عەرشی) خۆیەوە، لە ڕۆژێكدا هیچ سێبەرێك نییە جگە لەسێبەری ئەو (كە ئەمانەن): پێشەوایەكی دادگەر، گەنجێك لەسەر خواپەرستی پێ بگات، كەسێك دڵی وابەستە بێت بە مزگەوتەوە، دوو كەس لەبەر خوا یەكدییان خۆش بووێ لەسەری لە ژیاندا پێكەوە بن، وە لەسەر ئەو خۆشەویستییە لە یەكدی جیا ببنەوە (بە مردنی یەكێكیان)، وە پیاوێك ئافرەتێكی بەدەسەڵات و جوان داوای داوێنپیسی لێ بكات، پیاوەكەش بڵێ: من لە خوا دەترسم، وە پیاوێك ماڵی بەخشیوە و شاردوویەتەوە، هەتا لای چەپی نەزانێ لای ڕاستی چی بەخشیوە، وە پیاوێك بەتەنیا بیر و یادی خوا بكات، چاوەكانی فرمێسك پیایاندا بێتە خوارەوە)).**

٦٦١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ: هَلِ اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا؟ فَقَالَ: نَعَمْ، أَخَّرَ لَيْلَةً صَلاَةَ الْعِشَاءِ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ بَعْدَ مَا صَلَّى فَقَالَ: «صَلَّى النَّاسُ وَرَقَدُوا، وَلَمْ تَزَالُوا فِي صَلاَةٍ مُنْذُ انْتَظَرْتُمُوهَا». قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ خَاتَمِهِ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٤٢٣، ٦٤٧٩، ٦٨٠٦.

[2] بڕوانە: ٥٧٢.

٦٦١- حومەید دەڵێ: پرسیار کرا لە ئەنەس ﷺ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەی لە پەنجەدا بوو؟ ئەنەس وتی: بەڵێ شەوێکیان (پێغەمبەر ﷺ) نوێژی عیشای تا نیوەی شەو دوا خست، پاشان ڕووی تێ کردین دوای ئەوەی نوێژەکەی کرد، ئینجا فەرمووی: ((خەڵکی نوێژیان کرد و خەوتن، بەڵام ئێوە بەردەوام لە نوێژدان لەوکاتەوەی چاوەڕوانی نوێژی عیشا دەکەن)) ئەنەس دەڵێ: دەڵێی ئێستا بریسکەی ئەنگوستیلەکەی بە بەرچاومەوەیە.

## ٣٧- بابُ فَضْلِ مَنْ غَدَا إِلَى المَسْجِدِ وَمَنْ رَاحَ

٦٦٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُطَرِّفٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ وَرَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ نُزُلَهُ مِنَ الْجَنَّةِ كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ».

## ٣٧- باسی گەورەیی کەسێک بەیانییان و ئێواران بڕوات بۆ مزگەوت

٦٦٢- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس بڕوات بۆ مزگەوت بە بەیانییان یان بە ئێواران، خوای گەورە جێگای بۆ ئامادە دەکات لە بەهەشتدا، هەر بەیانییەك یان ئێوارەیەك بڕوات بۆ مزگەوت (بۆ نوێژی جەماعەت))).

## ٣٨- بابُ إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا صَلَاةَ إِلَّا المَكْتُوبَةَ

٦٦٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ ابْنِ بُحَيْنَةَ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِرَجُلٍ. قَالَ: وَحَدَّثَنِي عَبْدُ

الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنَا بَهْزُ بْنُ أَسَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعْدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: سَمِعْتُ حَفْصَ بْنَ عَاصِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلًا مِنَ الأَزْدِ يُقَالُ لَهُ: مَالِكُ ابْنُ بُحَيْنَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلًا وَقَدْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَاثَ بِهِ النَّاسُ، وَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «آلصُّبْحَ أَرْبَعًا؟! آلصُّبْحَ أَرْبَعًا». تَابَعَهُ غُنْدَرٌ وَمُعَاذٌ عَنْ شُعْبَةَ فِي مَالِكٍ. تابعَهُ غُندَر ومُعاذ عن شُعبةَ عن ماليك،وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: عَنْ سَعْدٍ، عَنْ حَفْصٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ. وَقَالَ حَمَّادٌ: أَخْبَرَنَا سَعْدٌ، عَنْ حَفْصٍ، عَنْ مَالِكٍ.

## ٣٨- باسی کاتێ قامەتی نوێژ کرا نابێ نوێژ بکرێ جگە لە نوێژی فەرز

**٦٦٣- عەبدوڵای کوڕی مالیکی کوڕی بوحەینە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێ پەڕی بەلای پیاوێکدا، (لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ:) مالیکی کوڕی بوحەینە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی دوو ڕکات نوێژی سوننەتی کرد، لە کاتێکدا قامەت کرابوو بۆ نوێژی فەرز، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی بۆیەوە نوێژکەرەکان لێی کۆ بوونەوە، پێغەمبەریش ﷺ بەو پیاوەی فەرمووو: ((ئایا نوێژی بەیانی چوار ڕکات دەکەیت؟! ئایا نوێژی بەیانی چوار ڕکات دەکەیت؟!))، (واتە: نابێت سوننەت بکەیت کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژی فەرز). غوندەر و موعازیش لە شوعبە و لە مالیك ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی بەهزی کوڕی ئەسەد دەکەن، هەروەها ئیبنو ئیسحاق گێڕاویەتەوە لە سەعدەوە لە حەفصەوە ئەویش لە عەبدوڵای کوڕی بوحەینەوە، حەمادیش دەڵێ: سەعد بۆی گێڕاوینەتەوە لە حەفصەوە ئەویش لە مالیکەوە.**

## ٣٩- بابُ حَدِّ المَرِيضِ أَنْ يَشْهَدَ الجَمَاعَةَ؟

٦٦٤- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: الأَسْوَدُ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَائِشَةَ ﵂ فَذَكَرْنَا الْمُوَاظَبَةَ عَلَى الصَّلَاةِ وَالتَّعْظِيمَ لَهَا، قَالَتْ:

لَمَّا مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَأُذِّنَ، فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ». فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ، إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ. وَأَعَادَ فَأَعَادُوا لَهُ، فَأَعَادَ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: «إِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ». فَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فَصَلَّى، فَوَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ رِجْلَيْهِ تَخُطَّانِ مِنَ الْوَجَعِ، فَأَرَادَ أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ مَكَانَكَ. ثُمَّ أُتِيَ بِهِ حَتَّى جَلَسَ إِلَى جَنْبِهِ. قِيلَ لِلأَعْمَشِ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِصَلاَتِهِ، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ. فَقَالَ بِرَأْسِهِ نَعَمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ بَعْضَهُ. وَزَادَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: جَلَسَ عَنْ يَسَارِ أَبِي بَكْرٍ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي قَائِمًا[1].

## ٣٩- باسی تا چەندێ نەخۆش بێت دەبێ ئامادەی نوێژی جەماعەت بێ؟

**٦٦٤- ئەسوەد دەڵێ: ئێمە لای عائیشە ﵂ بووین باسی بەردەوام ئامادەبوونی نوێژی جەماعەت و گرنگی و گەورەیی جەماعەتمان کرد، عائیشە ﵂، وتی: لەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت ئەو نەخۆشییەی بەهۆیەوە وەفاتی کرد، کاتی نوێژ بوو بانگدرابوو، فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان بکات))، پێی وترا: ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە و ئەگەر لە جێگای تۆدا بوەستێ، ناتوانێ پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات، پێغەمبەر ﷺ وتەکەی دووبارە کردەوە، ئەوانیش هەمان وەڵامی پێشوویان دایەوە، جا**

---

[1] بڕوانە: ١٩٨.

سێبارەی کردەوە و فەرمووی: ((بەڕاستی ئێوەی ژنان وەك زولەیخای سەردەمی یوسف وان[١]، فەرمان بدەن بە ئەبو بەکر پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە))، جا ئەبو بەکر ڕۆیشت و پێشنوێژی کرد، پێغەمبەریش ﷺ لەشسووکییەکی لە خۆیدا هەست پێ کرد، بۆیە دوو پیاو چوونە ژێر باڵی و بەلارەلارە ڕۆیشت بۆ مزگەوت، دەڵێی ئێستایە بە بەرچاومەوەیە هەردوو پێی دەخشان بە زەویدا لەبەر ئێش و ئازاری، جا ئەبو بەکر ویستی بێتە دواوە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆت بمێنەرەوە، پاشان هێنایان تا لە تەنیشتی ئەبو بەکر دانیشت. بە ئەعمەشیان وت: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی دەکرد و ئەبو بەکریش پەیڕەوی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، خەڵکەکەش پەیڕەوی ئەبو بەکریان دەکرد لە نوێژەکەیاندا؟ ئەعمەش بەسەری ئاماژەی کرد: بەڵێ. ئەبوداود (ی تەیالیسی) بەشێکی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، لە شوعبەوە ئەویش لە ئەعمەشەوە، لەگێڕانەوەی ئەبو موعاویەدا فەرموودەکە ئەم زیادەیەی هەیە: پێغەمبەر ﷺ لەلای چەپی ئەو بەکرەوە دانیشت، جا ئەبو بەکر بەپێوە نوێژەکەی دەکرد.

٦٦٥- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ ﷺ وَاشْتَدَّ وَجَعُهُ اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي، فَأَذِنَّ لَهُ، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُطُّ رِجْلَاهُ الأَرْضَ، وَكَانَ

---

[١] سەرنج: مەبەستی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەیە وەک زولەیخای سەردەمی یوسف وان، لەوەی بە زمان شتێک دەڵێن لە ناخیشدا مەبەستیان ئامانجێکی دیکەیە و ئیلحاحی زۆر دەکەن، مەبەستی ئەوەیە عائیشە تۆ دەتەوێ خەڵک بە چاوی شومەوە سەیری ئەبو بەکر نەکەن. بڕوانە: عمدة القاري: ٥/ ٣٧٦-٣٧٧. وە کە دەفەرمووێ: ئێوە، مەبەستی عائیشەیە بەتەنها، وە مەبەستی بە (صواحب يوسف) زولەیخایە. بڕوانە: ارشاد الساري: ٣٠٨/٢ .

بَيْنَ الْعَبَّاسِ وَرَجُلٍ آخَرَ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ، فَقَالَ لِي: وَهَلْ تَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الَّذِي لَمْ تُسَمِّ عَائِشَةُ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ[1].

**٦٦٥- عوبەیدولاّی کوڕی عەبدولاّ دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ نەخۆشییەکەی قورس بوو ئازارەکەی زۆر بوو، مۆڵەتی خواست لە خێزانەکانی تا لە ماڵی مندا چاودێری نەخۆشییەکەی بکرێت، ئەوانیش مۆڵەتیان دا، ئینجا لەماڵ هاتە دەرەوە (بۆ مزگەوت) دوو پیاو چوونە ژێر باڵی، هەردوو پێی دەخشان بە زەویدا، پێغەمبەر ﷺ لە نێوانی عەباس و پیاوێکی دیکەدا بوو، عوبەیدولاّ دەڵێ: ئەم قسەیەی عائیشە کردی گێڕامەوە بۆ عەبدولاّی کوڕی عەباس ﵄، ئەویش پێی وتم: ئایا دەزانی ئەو پیاوەی عائیشە ناوی نەبردووە کێیە؟ وتم: نەخێر، وتی: ئەو پیاوە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو.**

## ٤٠- بابُ الرُّخْصَةِ فِي المَطَرِ وَالْعِلَّةِ أَنْ يُصَلِّيَ فِي رَحْلِهِ

٦٦٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ أَذَّنَ بِالصَّلاَةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ، ثُمَّ قَالَ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ. ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ ذَاتُ بَرْدٍ وَمَطَرٍ، يَقُولُ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ[2].

## ٤٠- باسی ڕێگەپێدراوە لەبەر باران و هۆکاری پێویستدا نوێژکەر لەماڵ و جێگای خۆیدا نوێژ بکات

**٦٦٦- نافیع دەڵێ: عەبدولاّی کوڕی عومەر ﵄ لە شەوێك بای سارد و سڕدا بانگی دا، پاشان وتی: ئاگادار بن لە ماڵەوەتان نوێژەکەتان بکەن، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ**

---

[1] بڕوانە: ١٩٨.

[2] بڕوانە: ٦٣٢.

**ئەگەر شەوێك سارد و باران بووایە فەرمانی دەكرد بە بانگبێژەكە كە بڵێ: ((ئاگادار بن لە ماڵەوەتان و شوێنی حەوانەوەتان نوێژ بكەن)).**

٦٦٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ كَانَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ وَهُوَ أَعْمَى، وَأَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: يا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا تَكُونُ الظُّلْمَةُ وَالسَّيْلُ وَأَنَا رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ، فَصَلِّ يا رَسُولَ اللَّهِ فِي بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذْهُ مُصَلًّى، فَجَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ؟». فَأَشَارَ إِلَى مَكَانٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[1].

**٦٦٧- مەحمودی كوڕی ڕەبیعی ئەنصاری دەگێڕێتەوە كە عیتبانی كوڕی مالیك پیاوێكی نابینا بوو پێشنوێژی بۆ خێڵەكەی دەكرد، وە جارێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان جاری وا هەیە شەو و تاریكییە یان لافاوە، منیش پیاوێكی كوێرم، ئەی پێغەمبەر ﷺ جەنابت تەشریف بێنە لە شوێنێكی ماڵی خۆمدا نوێژ بكە، بۆ ئەوەی بیكەمە نوێژگە، ئینجا پێغەمبەری خواش ﷺ هات بۆ ماڵیان و فەرمووی: ((حەز دەكەی لەكوێدا نوێژ بكەم؟))، ئەویش ئاماژەی كرد بۆ شوێنێك لە ماڵەكەیدا، پێغەمبەریش ﷺ لەو شوێنەدا نوێژی كرد.**

## ٤١- بابٌ: هَلْ يُصَلِّي الإِمَامُ بِمَنْ حَضَرَ؟ وَهَلْ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ فِي المَطَرِ؟

٦٦٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْحَمِيدِ صَاحِبُ الزِّيَادِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ قَالَ: خَطَبَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ فِي يَوْمٍ ذِي رَدْغٍ،

---

[1] بڕوانە: ٤٢٤.

فَأَمَرَ الْمُؤَذِّنَ، لَمَّا بَلَغَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. قَالَ: قُلِ الصَّلاَةُ فِي الرِّحَالِ، فَنَظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَكَأَنَّهُمْ أَنْكَرُوا، فَقَالَ: كَأَنَّكُمْ أَنْكَرْتُمْ هَذَا، إِنَّ هَذَا فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي -يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ إِنَّهَا عَزْمَةٌ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُحْرِجَكُمْ. وَعَنْ حَمَّادٍ عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ نَحْوَهُ، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: كَرِهْتُ أَنْ أُؤَثِّمَكُمْ، فَتَجِيئُونَ تَدُوسُونَ الطِّينَ إِلَى رُكَبِكُمْ[1].

## ٤١- باسێک: ئایا پێشنوێژ لەگەڵ ئەو کەسانەی ئامادەن پێشنوێژییان بۆ بکات؟ وە ئایا لە ڕۆژی هەینیدا ئەگەر باران بێ وتارخوێن وتار دەدات؟

**٦٦٨- عەبدوڵای کوڕی حاریس دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە ڕۆژێکی قوڕدا وتاری بۆ داین، ئینجا فەرمانی کرد بە بانگبێژەکە کاتێ گەیشتە (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)، وتی بڵێ: لە ماڵ و جێگای خۆتان نوێژ بکەن، نوێژکەرەکانیش سەیری یەکدییان کرد وەك ئەوەی بەڕاستیان نەزانی، عەبدوڵای کوڕی عەباس وتی: ئەڵێی ئەمە بەڕاست نازانن! بێگومان ئەمە ئەو کەسەی لە من چاکترە کردوویەتی -مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو-، هەرچەندە نوێژی هەینی پێویستە، بەڵام بەڕاستی من حەزم نەکرد ناڕەحەتتان بکەم. وێنەی ئەم فەرموودەیە لە حەمادەوە، ئەویش لە عاصیمەوە، ئەویش لە عەبدوڵای کوڕی حاریسەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە گێڕاویەتەوە، بەڵام ئەم زیادەی هەیە: حەزم نەکرد تاوانبارتان بکەم و بێن بۆ مزگەوت بە نێو قوڕدا تا ئەژنۆتان بچێتە قوڕەوە.**

٦٦٩- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، فَقَالَ: جَاءَتْ سَحَابَةٌ فَمَطَرَتْ حَتَّى سَالَ السَّقْفُ، وَكَانَ مِنْ جَرِيدِ النَّخْلِ، فَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْجُدُ فِي الْمَاءِ وَالطِّينِ، حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ الطِّينِ فِي جَبْهَتِهِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٦١٦.

[2] بڕوانە: ٨١٣، ٨٣٦، ٢٠١٦، ٢٠١٨، ٢٠٢٧، ٢٠٣٦، ٢٠٤٠.

**٦٦٩- ئەبو سەلەمە دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو سەعید ﷺ کرد (دەربارەی شەوی قەدر)[1]، ئەویش وتی: هەورێك هات و بارانی باراند، هەتا ئاو بە سەربانی مزگەوتدا هاتە خوارەوە، کە (سەربانی مزگەوت) لە پەلی دارخورما بوو، جا نوێژ دابەسترا و پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەنێو ئاوو قوڕەکەدا سوژدەی برد، هەتا شوێنەواری قوڕەکەم بە نێوچەوانیەوە بینی.**

٦٧٠- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ سِيرِينَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: إِنِّي لاَ أَسْتَطِيعُ الصَّلاَةَ مَعَكَ. وَكَانَ رَجُلًا ضَخْمًا، فَصَنَعَ لِلنَّبِيِّ ﷺ طَعَامًا فَدَعَاهُ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَبَسَطَ لَهُ حَصِيرًا وَنَضَحَ طَرَفَ الْحَصِيرِ، صَلَّى عَلَيْهِ رَكْعَتَيْنِ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ آلِ الْجَارُودِ لأَنَسٍ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَ: مَا رَأَيْتُهُ صَلاَّهَا إِلاَّ يَوْمَئِذٍ[2].

**٦٧٠- ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: پیاوێکی ئەنصاڕی (بە پێغەمبەری ﷺ) وت: بەڕاستی من ناتوانم لەگەڵ جەنابتدا نوێژ (ی جەماعەت) بکەم، پیاوێکی قەڵەو و گەورە بوو، جا خواردنێکی بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست کرد و دەعوەتی کرد بۆ ماڵەوەیان و حەسیرێکی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕاخست، وە ئاوی پرژاند لە بەشێکی حەسیرەکە، پێغەمبەریش ﷺ دوو ڕکات نوێژی لەسەر کرد، ئینجا پیاوێك لە بنەماڵەی جارود بە ئەنەسی وت: ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ ئەنەس وتی: ئەو ڕۆژە نەبێ نەمدیوە نوێژی چێشتەنگاو بکات.**

## ٤٢- بابٌ: إِذَا حَضَرَ الطَّعَامُ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ

وَكَانَ ابن عُمَرَ يَبْدَأُ بِالْعَشَاءِ. وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: مِنْ فِقْهِ الْمَرْءِ إِقْبَالُهُ عَلَى حَاجَتِهِ حَتَّى يُقْبِلَ عَلَى صَلَاتِهِ وَقَلْبُهُ فَارِغٌ.

---

[1] وەک لە ڕیوایەتەکانی دیکەی ئەم فەرموودەیەدا هاتووە لە باسی ئیعتیکافدا.

[2] بڕوانە: ١١٧٩، ٦٠٨٠.

٦٧١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ»[1].

## ٤٢- باسێک: ئەگەر خواردن ئامادە بوو کاتی نوێژ هات[2] (کامیان دەکرێ؟)

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەستی بە نانخواردن دەکرد پێش نوێژەکەی، ئەبو دەرداییش ﷺ دەڵێ: نیشانەی شارەزایی و تێگەیشتنی کەسێکە ڕوو لە پێویستییەکەی بکات و تەواوی کات، هەتا کە دەست بە نوێژەکەی دەکات دڵ و مێشکی هیچی دیکەی تێدا نەبێ (جگە لە نوێژەکەی).**

**٦٧١- عائیشە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر خواردنی ئێوارە دانرا و کاتی نوێژی ئێوارەش هاتبوو[3]، ئەوە لەپێشدا خواردنەکە بخۆن (دواتر نوێژەکەتان بکەن))).**

٦٧٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قُدِّمَ الْعَشَاءُ فَابْدَءُوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا صَلاَةَ الْمَغْرِبِ، وَلاَ تَعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ»[4].

---

[1] بڕوانە: ٥٤٦٥.

[2] وەک لە فەرموودەی: (٦٧٦)دا عائیشە دەڵێ: (فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ)، واتە: ئەگەر کاتی نوێژ هات، یان کاتی بانگ درا وەک لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: (فَإِذَا سَمِعَ الأَذَانَ خَرَجَ)، واتە: ئەگەر گوێی لە بانگ بووایە دەڕۆیشت بۆ مزگەوت. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢/٣١٨-٣١٩.

[3] یان بانگی نوێژی مەغریب درابوو. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢/٣١٩.

[4] بڕوانە: ٥٤٦٣.

**٦٧٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر خواردنی ئێوارەتان بۆ هێنرا، ئەوە لەپێشدا دەست بە خواردنی بکەن پێش ئەوەی نوێژی ئێوارە بکەن، وە پەلە مەکەن لە خواردنی ئێوارەکەتان)).**

٦٧٣- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَ عَشَاءُ أَحَدِكُمْ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ، وَلاَ يَعْجَلْ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهُ». وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُوضَعُ لَهُ الطَّعَامُ وَتُقَامُ الصَّلاَةُ فَلاَ يَأْتِيهَا حَتَّى يَفْرُغَ، وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قِرَاءَةَ الإِمَامِ[1].

**٦٧٣- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر خواردنی ئێوارە بۆ یەکێکتان دانرا و کاتی نوێژی ئێوارەش هاتبوو، ئەوە بە خواردنی خواردنەکە دەست پێ بکەن، با پەلەش نەکات هەتا لە خواردنەکە دەبێتەوە))، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ خواردنی بۆ دادەنرا و نوێژ دادەبەسترا، نەدەڕۆیشت بۆ نوێژەکە هەتا لە خواردنەکەی دەبۆیەوە، لە کاتێکدا گوێی لە قورئانخوێندنی ئیمامەکەش بوو.**

٦٧٤- وَقَالَ زُهَيْرٌ وَوَهْبُ بْنُ عُثْمَانَ: عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ عَلَى الطَّعَامِ فَلاَ يَعْجَلْ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ، وَإِنْ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ». رَوَاهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، عَنْ وَهْبِ بْنِ عُثْمَانَ، وَوَهْبٌ مَدِينِيٌّ[2].

**٦٧٤- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان لەسەر نانخواردن بوو، ئەوە با پەلە نەکات هەتا لە خواردنەکەی**

---

[1] بڕوانە: ٦٧٤، ٥٤٦٥.

[2] بڕوانە: ٦٧٣.

دەبێتەوە، با قامەتیش کرابێت))[1] . هەروەها ئەم فەرموودەیە ئیبڕاهیمی کوڕی مونزیر، لە وەهبی کوڕی عوسمانەوە گێڕاویەتەوە، وەهبیش مەدینەییە.

## ٤٣- بابُ إِذَا دُعِيَ الإِمَامُ إِلَى الصَّلَاةِ وَبِيَدِهِ مَا يَأْكُلُ

٦٧٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، أَنَّ أَبَاهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ ذِرَاعًا يَحْتَزُّ مِنْهَا، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَامَ فَطَرَحَ السِّكِّينَ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[2] .

## ٤٣- باسی ئەگەر ئیمام بانگ بکرێ بۆ نوێژکردن و شتێکی بە دەستەوە بێت بیخوات

٦٧٥- جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەیە دەڵێ باوکی وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە گۆشتی دەست (ی ئاژەڵێکی بە چەقۆ) دەبڕی و دەیخوارد، جا بانگ کرا بۆ نوێژکردن، ئیدی ئەویش هەڵسا و چەقۆکەی فڕێ دا و نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.

## ٤٤- بابُ مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَهْلِهِ فَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَخَرَجَ

٦٧٦- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَكَمُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَكُونُ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ -تَعْنِي خِدْمَةَ أَهْلِهِ- فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ[1] .

---

[1] یان بانگ درابێ بۆ نوێژ. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣١٩/٢.

[2] بڕوانە: ٢٠٨.

## ٤٤- باسی کەسێک خەریکی پێویستییەکی ماڵ و خێزانی بێ، جا قامەتی نوێژ بکرێ و بچێ بۆ مزگەوت

٦٧٦- ئەسوەد دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﵂ کرد: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی خۆیدا چ شتێك دەکات؟ عائیشەش وتی: پێغەمبەر ﷺ هەردەم خزمەتی پێشکەش ماڵ و منداڵی دەکرد -واتە لە خزمەتی خاوخێزانیدا بوو-، بەڵام کە نوێژ دەبوو دەڕۆیشت بۆ نوێژ (لە مزگەوت).

## ٤٥- باب مَنْ صَلَّى بِالنَّاسِ وَهُوَ لَا يُرِيدُ إِلَّا أَنْ يُعَلِّمَهُمْ صَلَاةَ النَّبِيِّ ﷺ وَسُنَّتَهُ

٦٧٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ قَالَ: جَاءَنَا مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ فِي مَسْجِدِنَا هَذَا فَقَالَ: إِنِّي لَأُصَلِّي بِكُمْ، وَمَا أُرِيدُ الصَّلَاةَ، أُصَلِّي كَيْفَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي. فَقُلْتُ لِأَبِي قِلَابَةَ: كَيْفَ كَانَ يُصَلِّي؟ قَالَ: مِثْلَ شَيْخِنَا هَذَا. قَالَ: وَكَانَ شَيْخًا يَجْلِسُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ قَبْلَ أَنْ يَنْهَضَ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى[٢].

## ٤٥- باسی کەسێک پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکەتەنها مەبەستی ئەوەیە فێری نوێژ و سوننەتی پێغەمبەریان ﷺ بکات

٦٧٧- ئەبو قیلابە دەڵێ: مالیکی کوڕی حوەیریس هات بۆ لامان بۆ ئەم مزگەوتە و وتی: من پێشنوێژیتان بۆ دەکەم مەبەستم نوێژکردن نییە، بۆ ئەوە نوێژ دەکەم (نیشانتان بدەم) چۆن پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی دەکرد، ئەیوب دەڵێ

---

[١] بڕوانە: ٥٣٦٣، ٦٠٣٩.

[٢] بڕوانە: ٨٠٢، ٨١٨، ٨٢٤.

وتم: ئەبو قیلابە چۆن نوێژی دەکرد؟ ئەبو قیلابە وتی: وەك ئەم مامۆستایەی خۆمان (کە عەمری کوڕی سەلەمەیە)، وتی: ئەم مامۆستایەمان کە سەری بەرز دەکردەوە لە سوژدە (ی دووەمی) ڕکاتی یەکەم، پێش ئەوەی هەڵسێتەوە دادەنیشت (ئینجا هەڵدەسایەوە).

## ٤٦- بابُ: أَهْلُ العِلْمِ وَالْفَضْلِ أَحَقُّ بِالإِمَامَةِ

٦٧٨- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: مَرِضَ النَّبِيُّ ﷺ فَاشْتَدَّ مَرَضُهُ فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ». قَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّهُ رَجُلٌ رَقِيقٌ، إِذَا قَامَ مَقَامَكَ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ. قَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ» فَعَادَتْ، فَقَالَ: «مُرِي أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَإِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ». فَأَتَاهُ الرَّسُولُ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٤٦- باسێك: ئەو کەسانەی زانا و خاوەن فەزڵ و گەورەیین شایستەترن پێشنوێژی بکەن

**٦٧٨- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ:پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکەی قورس بوو فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە ﷺ وتی: ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، ئەگەر لە شوێنی تۆدا بوەستێ (دڵتەنگ دەبێ و) ناتوانێ پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە وتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە،**

---

[1] بڕوانە: ٣٣٨٥.

**ئینجا فەرمووی: ((عائیشە فەرمان بدە بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی، چونکە بەڕاستی ئێوە وەك زولەیخای سەردەمی یوسف وان))، جا نێردراوەکەی پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای ئەبو بەکر و لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ پێشنوێژی کرد بۆ خەڵکی (تا وەفاتی).**

٦٧٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي مَرَضِهِ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ». قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْتُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ: قُولِي لَهُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ. فَفَعَلَتْ حَفْصَةُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَهْ، إِنَّكُنَّ لَأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ[1]، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ». فَقَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ: مَا كُنْتُ لِأُصِيبَ مِنْكِ خَيْرًا[2].

**٦٧٩- عوروە دەڵێ: عائیشە دایکی ئیمانداران ﵂ گێڕایەوە و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیی وەفاتیدا فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە دەڵێ منیش وتم: بەڕاستی ئەبو بەکر ئەگەر لە شوێنی تۆ بوەستێ (بۆ پێشنوێژی)، لەبەر گریان نوێژکەرەکان دەنگی نابیستن، فەرمان بکەن بە عومەر با پێش نوێژی بکات بۆ خەڵکی، جا عائیشە وتی: بە حەفصەم وت: تۆش بە پێغەمبەر ﷺ بڵێ بەڕاستی ئەبو بەکر ئەگەر لە شوێنی تۆدا بوەستێ لەبەر گریان خەڵك گوێیان لە دەنگی**

---

[1] کە دەفەرمووێ: (إِنَّكُنَّ) مەبەستی پێغەمبەر ﷺ عائیشەیە بەتەنها، وە مەبەستی بە (صواحب یوسف) زولەیخایە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٠٨/٢.

[2] بڕوانە: ١٩٨.

**نابێ، جا فەرمان بکە بە عومەر پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی، حەفصەش ﷺ پێی وت: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێدەنگ بە بەڕاستی ئێوە وەك زولەیخای سەردەمی یوسف وان، فەرمان بدەن بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، حەفصەش وتی (بە عائیشە): من هیچ کات لە تۆوە تووشی خێر و چاکە نەبووم. ( مەبەستی حەفصە ئەوە بوو کە عائیشە هۆکار بوو پێغەمبەر ﷺ لێی تورە ببێت) .**

٦٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ الأَنْصَارِيُّ -وَكَانَ تَبِعَ النَّبِيَّ ﷺ وَخَدَمَهُ وَصَحِبَهُ- أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَانَ يُصَلِّي لَهُمْ فِي وَجَعِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الاِثْنَيْنِ وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلاَةِ، فَكَشَفَ النَّبِيُّ ﷺ سِتْرَ الْحُجْرَةِ يَنْظُرُ إِلَيْنَا، وَهْوَ قَائِمٌ كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ، ثُمَّ تَبَسَّمَ يَضْحَكُ، فَهَمَمْنَا أَنْ نَفْتَتِنَ مِنَ الْفَرَحِ بِرُؤْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ الصَّفَّ، وَظَنَّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَارِجٌ إِلَى الصَّلاَةِ، فَأَشَارَ إِلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ، وَأَرْخَى السِّتْرَ، فَتُوُفِّيَ مِنْ يَوْمِهِ[1] .

**٦٨٠- زوهری دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەنصاری ﷺ بۆی گێڕامەوە -کە هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەردا بووە ﷺ خزمەتی کردووە و هاوەڵی بووە- دەڵێ: لەو نەخۆشییەی پێغەمبەردا ﷺ -کە تێیدا وەفاتی کرد، ئەبو بەکر پێشنوێژی بۆ خەڵکی دەکرد، هەتا ئەو ڕۆژەی کە دوو شەممە بوو، نوێژکەرەکان لە ڕیزی نوێژدا وەستابوون، پێغەمبەریش ﷺ پەردەی ژوورەکەی لادا و بەپێوە وەستابوو، سەیری ئێمەی دەکرد، ڕوخساری وەك پەڕەی قورئان وا بوو (لە جوانی و گەشیدا)، پاشان زەردەخەنەیەکی کرد و پێ کەنی، بۆیە خەریك بوو نوێژەکەمان لێ تێك بچێ لە خۆشییاندا کە پێغەمبەرمان ﷺ بەو شێوەیە بینی،**

---

[1] بڕوانە: ٦٨١، ٧٥٤، ١٢٠٥، ٤٤٤٨.

**جا ئەبو بەکر پاشەوپاش گەڕایەوە دواوە تا بگاتە ڕیزەکە، چونکە وای زانی پێغەمبەر ﷺ دێت بۆ نوێژ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردین: ((کە نوێژەکەتان تەواو بکەن)) و پەردەکەی دادایەوە و هەر لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد.**

٦٨١- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمْ يَخْرُجِ النَّبِيُّ ﷺ ثَلاَثًا، فَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يَتَقَدَّمُ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ بِالْحِجَابِ فَرَفَعَهُ، فَلَمَّا وَضَحَ وَجْهُ النَّبِيِّ ﷺ مَا نَظَرْنَا مَنْظَرًا كَانَ أَعْجَبَ إِلَيْنَا مِنْ وَجْهِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ وَضَحَ لَنَا، فَأَوْمَأَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ إِلَى أَبِي بَكْرٍ أَنْ يَتَقَدَّمَ، وَأَرْخَى النَّبِيُّ ﷺ الْحِجَابَ، فَلَمْ يُقْدَرْ عَلَيْهِ حَتَّى مَاتَ[1].

**٦٨١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سێ ڕۆژ لەماڵ نەهاتە دەرەوە، ئینجا قامەت کرا بۆ نوێژ و ئەبو بەکر پێش کەوت، پێغەمبەریش ﷺ پەردەی ژوورەکەی گرت و لای دا، جا کاتێ ڕوخساری پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت، هیچ دیمەنێکمان نەدیبوو بەئەندازەی ڕوخساری پێغەمبەر ﷺ لامان جوان بێ کاتێ لێمانەوە دەرکەوت، جا پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ ئەبو بەکر کە پێش بکەوێ، پێغەمبەر ﷺ پەردەکەی دادایەوە، ئیدی نەتوانرا ببینرێ هەتا وەفاتی کرد.**

٦٨٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَجَعُهُ قِيلَ لَهُ فِي الصَّلاَةِ فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ». قَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ رَقِيقٌ، إِذَا قَرَأَ غَلَبَهُ الْبُكَاءُ. قَالَ: «مُرُوهُ فَيُصَلِّي». فَعَاوَدَتْهُ. قَالَ: «مُرُوهُ فَيُصَلِّي، إِنَّكُنَّ

---

[1] بڕوانە: ٦٨٠.

صَوَاحِبُ يُوسُفَ». تَابَعَهُ الزُّبَيْدِيُّ، وَابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ، وَإِسْحَاقُ بْنُ يَحْيَى الْكَلْبِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ عُقَيْلٌ وَمَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حَمْزَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦٨٢- حەمزەی کوڕی عەبدوڵا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتی: کاتێ ئازار و نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ قورس بوو، دەربارەی نوێژ قسەی لەگەڵدا کرا، فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە وتی: ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، ئەگەر قورئان بخوێنێ گریان زۆری بۆ دێنێ، فەرمووی: ((فەرمانی پێ بکەن با پێشنوێژی بکات))، عائیشەش هەمان وەڵامی دووبارە کردەوە، فەرمووی: ((فەرمانی پێ بکەن با پێشنوێژی بکات، بەڕاستی ئێوە وەك زولەیخای سەردەمی یوسف وان))[1]. زوبەیدی و برازایەکی زوهری و ئیسحاقی کوڕی یەحیای کەلبی (هەموویان) ئەم فەرمودەیەیان لە زوهرییەوە گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یونوسی کوڕی یەزید دەکات، وە عوقەیل و مەعمەر لە زوهرییەوە، ئەویش لە حەمزەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە.**

## ٤٧- بابُ مَنْ قامَ إلى جَنْبِ الإِمَامِ لِعِلَّةٍ

**٦٨٣-** حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ فِي مَرَضِهِ، فَكَانَ يُصَلِّي بِهِمْ. قَالَ عُرْوَةُ فَوَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ فَإِذَا أَبُو بَكْرٍ يَؤُمُّ النَّاسَ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ اسْتَأْخَرَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ أَنْ كَمَا أَنْتَ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِذَاءَ أَبِي بَكْرٍ إِلَى جَنْبِهِ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ[2].

---

[1] سەرنج: مەبەستی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەیە وەک زولەیخای سەردەمی یوسف وان، لەوەی بە زمان شتێک دەڵێن، لە ناخیشدا مەبەستیان ئامانجێکی دیکەیە. بڕوانە: عمدة القاري: ٥/ ٣٧٦-٣٧٧.

[2] بڕوانە: ١٩٨.

# ٤٧- باسی نوێژكەرێك لەبەر نەخۆشی لە تەنیشت پێشنوێژدا بوەستێت

**٦٨٣- عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەكەیدا (كە وەفاتی كرد) فەرمانی كرد بە ئەبو بەكر ﵁ كە پێشنوێژی بۆ خەڵكی بكات، ئەبو بەكریش پێشنوێژی بۆ دەكردن، عوروە دەڵێ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەشسووكییەكی لەخۆیدا هەست پێ كرد بۆیە لە ماڵ هاتە دەرەوە (بۆ مزگەوت)، دەبینێ ئەبو بەكر پێشنوێژی دەكات بۆ خەڵكی، ئینجا ئەبو بەكر پێغەمبەری ﷺ بینی، هاتە دواوە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ كرد: ((چۆن وەستاوی هەر وا لە شوێنی خۆت بە))، ئیدی پێغەمبەر ﷺ ڕێكی ئەبو بەكر لە تەنیشتیەوە دانیشت، جا ئەبو بەكر بە نوێژەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد، خەڵكەكەش بە نوێژكردنەكەی ئەبو بەكر نوێژیان دەكرد.**

# ٤٨- بابُ مَنْ دَخَلَ لِيَؤُمَّ النَّاسَ فَجَاءَ الإِمَامُ الأَوَّلُ فَتَأَخَّرَ الأَوَّلُ أَوْ لَمْ يَتَأَخَّرْ، جَازَتْ صَلاَتُهُ

فِيهِ عَائِشَةُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٦٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي حَازِمِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَهَبَ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، فَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: أَتُصَلِّي لِلنَّاسِ فَأُقِيمَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسُ فِي الصَّلاَةِ، فَتَخَلَّصَ حَتَّى وَقَفَ فِي الصَّفِّ، فَصَفَّقَ النَّاسُ -وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لاَ يَلْتَفِتُ فِي صَلاَتِهِ- فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفَتَ فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنِ امْكُثْ مَكَانَكَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ ﵁ يَدَيْهِ، فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَى مَا أَمَرَهُ بِهِ

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ ذَلِكَ، ثُمَّ اسْتَأْخَرَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى اسْتَوَى فِي الصَّفِّ، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ إِذْ أَمَرْتُكَ؟». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا كَانَ لِابْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمُ التَّصْفِيقَ؟! مَنْ رَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ، فَإِنَّهُ إِذَا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ»[1].

## ٤٨- باسی کەسێک بڕواتە (پێشەوە) تا پێشنوێژی خەڵک بکات، جا پێشنوێژی یەکەم و هەمیشەیی بێ، ئەوەی یەکەم جار پێشنوێژ بووە بێتە دواوە، یان نەیەتە دواوە نوێژەکەی دروستە

**لەم باسەدا فەرموودەکەی عائیشە هاتووە ﵂، کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە[2].**

**٦٨٤- سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ نێو هۆزی عەمری کوڕی عەوف تا نێوانیان چاك بکات، نوێژ (ی عەسر) بووبوو، جا بانگبێژەکە هات بۆلای ئەبو بەکر و وتی: پێشنوێژی دەکەیت بۆ خەڵکەکە قامەت بکەم؟ ئەبو بەکریش وتی: بەڵێ، ئینجا ئەبو بەکر پێشنوێژی کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە و خەڵکەکەش لە نوێژدا بوون جا (بە نێو ڕیزەکاندا) ڕۆیشت تا لە ڕیزی یەکەمدا وەستا، نوێژکەرەکان چەپڵەیان لێ دا و ئەبو بەکر لە نوێژدا لای نەدەکردەوە، - جا کە خەڵکەکە زۆر چەپڵەیان لێ دا، ئەبو بەکر لای کردەوە و پێغەمبەری خوا ﷺی بینی، - پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد: ((کە لە شوێنی خۆت بمێنەرەوە)) -، ئەبو**

---

[1] بڕوانە: ١٢٠١، ١٢٠٤، ١٢١٨، ١٢٣٤، ٢٦٩٠، ٢٦٩٣، ٧١٩٠.

[2] لە فەرموودەی ژمارە (٦٨٣)دا کە عوروە لە عائیشەوە گێڕاویەتەوە.

بەكریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز كردەوە بۆ ئاسمان و سوپاسی خوای كرد لەسەر ئەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كرد بەردەوام بێت لە پێشنوێژییەكەیدا، پاشان ئەبو بەكر هاتە دواوە، هەتا لەگەڵ ڕیزی یەكەمی نوێژكەرەكاندا ڕێك بۆیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە پێشەوە و پێشنوێژی بۆ كردن، جا كاتێ لێ بۆیەوە فەرمووی: ((ئەی ئەبو بەكر بۆچی لە شوێنی خۆت نەمایتەوە كە فەرمانم پێ كردی؟))، ئەبو بەكریش وتی: بۆ كوڕی ئەبو قوحافە ڕەوا نییە لەپێش پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژ بكات، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو چەپڵەلێدانە زۆرەتان چی بوو كە بینیم؟ هەر كەس لەنێو نوێژەكەیدا شتێك ڕووی دا با بڵێ: (سُبْحَانَ الله)، چونكە بێگومان كە وتی: (سُبْحَانَ الله)، ئاوڕ دەدرێتەوە بەلایدا، لە ڕاستیدا چەپڵەلێدان بۆ ئافرەتانە)).

## ٤٩- بابٌ: إِذَا اسْتَوَوْا فِي القِرَاءَةِ فَلْيَؤُمَّهُمْ أَكْبَرُهُمْ

٦٨٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ شَبَبَةٌ، فَلَبِثْنَا عِنْدَهُ نَحْوًا مِنْ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ رَحِيمًا فَقَالَ: «لَوْ رَجَعْتُمْ إِلَى بِلَادِكُمْ فَعَلَّمْتُمُوهُمْ، مُرُوهُمْ فَلْيُصَلُّوا صَلَاةَ كَذَا فِي حِينِ كَذَا، وَصَلَاةَ كَذَا فِي حِينِ كَذَا، وَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»[1].

## ٤٩- باسێک: ئەگەر چەند كەسێک لە قورئانخوێندندا یەكسان بوون با بەتەمەنترینیان پێشنوێژییان بۆ بكات

٦٨٥- مالیكی كوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: ئێمە چەند گەنجێك بووین ڕۆیشتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا لە خزمەتیدا نزیكی بیست شەو و ڕۆژ ماینەوە،

---

[1] بڕوانە: ٦٢٨.

پێغەمبەر ﷺ بەمیهر و بەزەیی بوو، بۆیە فەرمووی: ((ئەگەر بگەڕانایەتەوە بۆ وڵات و جێگای خۆتان و کەسوکارتان شارەزا بکردایە، (ئەو کات) فەرمانیان پێ بکەن ئەو نوێژە لەو کاتەدا بکەن و ئەو نوێژەیان لەو کاتەدا بکەن، ئەگەر کاتی نوێژ هاتە پێشەوە با یەکێکتان بانگ بدات، وە با ئەوەتان کە لە هەمووتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات)).

## ٥٠- بابٌ: إِذَا زَارَ الإِمَامُ قومًا فَأَمَّهُمْ

٦٨٦- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ قَالَ: سَمِعْتُ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ الأَنْصَارِيَّ قَالَ: اسْتَأْذَنَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَذِنْتُ لَهُ، فَقَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ؟». فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي أُحِبُّ، فَقَامَ وَصَفَفْنَا خَلْفَهُ، ثُمَّ سَلَّمَ وَسَلَّمْنَا[1].

## ٥٠- باسێک: ئەگەر پێشەوا سەردانی خەڵکانێ بکات و پێشنوێژییان بۆ بکات

٦٨٦- عیتبانی کوڕی مالیکی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی خواست (بێتە ژوورەوە بۆ ماڵمان)، منیش مۆڵەتم دا (هاتە ژوورەوە)، ئینجا فەرمووی: ((حەز دەکەی لە چ شوێنێکی ماڵەکەتدا نوێژ بکەم؟)) (بۆ ئەوەی بیکەیتە نوێژگە)، منیش ئاماژەم بۆی کرد بۆ شوێنێك کە پێم خۆش بوو (ببێتە نوێژگە)، پێغەمبەریش ﷺ وەستا و ئێمەش لەدوایەوە ڕیز بووین، پاشان (نوێژەکەی تەواو کرد و) سەلامی دایەوە، ئێمەش سەلامان دایەوە.

---

[1] بڕوانە: ٤٢٤.

## ٥١- بابٌ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ

وَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فِي مَرَضِهِ الذِي تُوُفِّيَ فِيهِ بِالنَّاسِ وَهْوَ جَالِسٌ[1]. وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ: إِذَا رَفَعَ قَبْلَ الإِمَامِ يَعُودُ فَيَمْكُثُ بِقَدْرِ مَا رَفَعَ ثُمَّ يَتْبَعُ الإِمَامَ. وَقَالَ الحَسَنُ فِيمَنْ يَرْكَعُ مَعَ الإِمَامِ رَكعَتَيْنِ وَلَا يَقْدِرُ عَلَى السُّجُودِ: يَسْجُدُ لِلرَّكْعَةِ الآخِرَةِ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَقْضِي الرَّكْعَةَ الأُولَى بِسُجُودِهَا. وَفِيمَن نَسِيَ سَجْدَةً حَتَّى قَامَ: يَسْجُدُ.

٦٨٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَقُلْتُ: أَلَا تُحَدِّثِينِي عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: بَلَى، ثَقُلَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَصَلَّى النَّاسُ؟». قُلْنَا: لَا، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ. قَالَ: «ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ». قَالَتْ: فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، فَذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ ﷺ: «أَصَلَّى النَّاسُ؟». قُلْنَا لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ». قَالَتْ: فَقَعَدَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أَصَلَّى النَّاسُ؟». قُلْنَا: لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: «ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ». فَقَعَدَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أَصَلَّى النَّاسُ؟». فَقُلْنَا: لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ -وَالنَّاسُ عُكُوفٌ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُونَ النَّبِيَّ ﷺ لِصَلاَةِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ- فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى أَبِي بَكْرٍ بِأَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، فَأَتَاهُ الرَّسُولُ فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُكَ أَنْ تُصَلِّيَ بِالنَّاسِ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ -وَكَانَ رَجُلًا رَقِيقًا-: يا عُمَرُ، صَلِّ بِالنَّاسِ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَنْتَ أَحَقُّ بِذَلِكَ. فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ تِلْكَ الأَيَّامَ، ثُمَّ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَجَدَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ -أَحَدُهُمَا الْعَبَّاسُ- لِصَلاَةِ الظُّهْرِ، وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ بِأَنْ لاَ يَتَأَخَّرَ. قَالَ: «أَجْلِسَانِي إِلَى جَنْبِهِ». فَأَجْلَسَاهُ إِلَى جَنْبِ

---

[1] بڕوانە: ٩٨.

أَبِي بَكْرٍ. قَالَ فَجَعَلَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي وَهْوَ يَأْتَمُّ بِصَلاَةِ النَّبِيِّ ﷺ وَالنَّاسُ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَاعِدٌ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ لَهُ: أَلاَ أَعْرِضُ عَلَيْكَ مَا حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ عَنْ مَرَضِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: هَاتِ. فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَدِيثَهَا، فَمَا أَنْكَرَ مِنْهُ شَيْئًا، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: أَسَمَّتْ لَكَ الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ مَعَ الْعَبَّاسِ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: هُوَ عَلِيٌّ[1].

## ٥١- باسێک: پێشنوێژ بۆیە دانراوە پەیڕەوی لێوە بکرێ

**پێغەمبەر ﷺ بەدانیشتنەوە نوێژی کرد لەو نەخۆشییەیدا کە تێیدا وەفاتی کرد. وە عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: ئەگەر نوێژکەر پێش ئیمامەکەی بەرز بێتەوە، دەبێ بگەڕێتەوە بەئەندازەی پێشکەوتنی لە ئیمامەکەی بمێنێتەوە، پاشان شوێنی ئیمامەکەی بکەوێتەوە. وە حەسەن دەڵێ: دەربارەی کەسێك دوو ڕکات نوێژ لەگەڵ ئیمامدا بکات نەتوانێ سوژدە ببات (لەبەر قەرەباڵغی)، ئەوە دوو سوژدە دەبات بۆ ڕکاتی دووەم پاشان ڕکاتی یەکەم دەکاتەوە بە سوژدەکەشیەوە، وە دەربارەی کەسێ سوژدەی لەبیر بچێ و بیری نەکەوێتەوە هەتا هەڵدەستێتەوە، ئەوە سوژدە دەبات (لەجیاتی سوژدە لەبیرچووەکە).**

**٦٨٧- عەبدوڵای کوڕی عوتبە دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە ﵂ وتم: ئایا دەربارەی نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ قسەم بۆ دەکەی؟ عائیشەش وتی: بەڵێ. پێغەمبەر ﷺ نەخۆشییەکەی قورس و گران بوو، جا فەرمووی: ((ئەوە خەڵکی نوێژیان کرد؟))، وتمان: نەخێر، ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن، فەرمووی: ((لە تەشتێکدا ئاوم بۆ دانێن))، عائیشە دەڵێ: ئێمەش بۆمان دانا، ئینجا خۆی شۆرد ویستی هەستێ، بەڵام (نەیتوانی و) بووڕایەوە، پاشان هۆشی هاتەوە بە خۆیدا فەرمووی: ((ئەوە خەڵکی نوێژیان کرد؟))، وتمان: نەخێر ئەی**

---

[1] بڕوانە: ١٩٨.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن، فەرمووی: ((لە تەشتێکدا ئاوم بۆ دانێن))، عائیشە دەڵێ: جا دانیشت و خۆی شۆرد، پاشان ویستی هەستێ، بەڵام (نەیتوانی و) بوورایەوە، پاشان هۆشی هاتەوە بە خۆیدا و فەرمووی: ((ئەوە خەڵکی نوێژیان کرد؟)) وتمان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن، فەرمووی: ((لە تەشتێکدا ئاوم بۆ دانێن))، جا دانیشت و خۆی شورد، پاشان ویستی هەستێ بەڵام (نەیتوانی و) بوورایەوە، پاشان هۆشی هاتەوە و فەرمووی: ((ئەوە خەڵکی نوێژیان کرد؟))، ئێمەش وتمان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن، - وە خەڵکەکە لە مزگەوت مابوونەوە چاوەڕوانی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد بۆ نوێژی عیشا-، جا پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای ئەبو بەکر بۆ ئەوەی پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، جا نێردراوەکە هات بۆ لای ئەبو بەکر و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێ دەکات کە پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکەیت - ئەبوبەکریش پیاوێکی دڵناسك بوو-، بۆیە وتی: ئەی عومەر تۆ پێشنوێژی بکە بۆ خەڵکەکە عومەریش پێی وت: تۆ شایستەتری بەو کارە، ئیدی ئەبو بەکر ئەو چەند ڕۆژە پێشنوێژی کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستی بە لەشسووکییەك کرد لە خۆیدا (لە ئازارەکەی)، لە نێوان دوو پیاودا (کە چووبوونە ژێر باڵی)- یەکێکیان عەباس بوو- لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە (بۆ مزگەوت) بۆ نوێژی نیوەڕۆ، لەو کاتەدا ئەبو بەکر پێشنوێژی دەکرد بۆ خەڵکەکە، ئینجا کە ئەبو بەکر پێغەمبەری ﷺ بینی ویستی بێتە دواوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە نەیەتە دواوە (بە دوو پیاوەکەی) فەرموو: ((لە تەنیشتی (ئەبوبەکر)دا دامنیشێنن))، ئەوانیش لە تەنیشتی ئەبو بەکرەوە دایاننیشاند، دەڵێ: جا ئەبو بەکر بەپێوە نوێژی دەکرد، شوێنکەوتەی پێغەمبەر ﷺ بوو لە نوێژەکەیدا، خەڵکەکەش شوێنکەوتەی ئەبو بەکر بوون لە نوێژەکەیاندا، وە پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو (نوێژی دەکرد). عەبدوڵا دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ پێم وت: ئایا ئەو باسەی عائیشە

**بۆی گێڕامەوە، دەربارەی نەخۆشی پێغەمبەر ﷺ بۆت باس بکەم؟ ئەویش وتی: ئادەی باسی بکە، منیش وتەکەی عائیشەم بۆ باس کرد، عەبدوڵاش ڕەخنەی لە هیچی نەبوو، جگە لەوە نەبێ کە وتی: ئایا ناوی ئەو پیاوەی پێ وتیت کە لەگەڵ عەباسدا بوو؟ وتم: نەخێر، وتی: ئەو پیاوە عەلی بوو ﷺ.**

٦٨٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَّهَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِهِ وَهْوَ شَاكٍ، فَصَلَّى جَالِسًا وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ اجْلِسُوا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا»[1].

**٦٨٨- عائیشەی دایکی ئیمانداران ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بوو، لە ماڵەوە بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، کۆمەڵێك لەدوایەوە بەپێوە نوێژیان کرد، بۆیە ئاماژەی بۆ کردن: ((کە دانیشن))، جا کاتێ لە نوێژەکەی بۆیەوە فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە تا پەیڕەوی لێ بکرێ، کە وا بوو ئەگەر کڕنوشی برد، ئێوەش کڕنوش ببەن، وە ئەگەر بەرز بۆیەوە، ئێوەش بەرز ببنەوە، وە ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەمووتان بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن)).**

٦٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَكِبَ فَرَسًا فَصُرِعَ عَنْهُ، فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَصَلَّى صَلاَةً مِنَ الصَّلَوَاتِ وَهْوَ قَاعِدٌ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ الْحُمَيْدِيُّ: قَوْلُهُ: «إِذَا صَلَّى

---

[1] بڕوانە: ١١١٣، ١٢٣٦، ٥٦٥٨.

جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا. هُوَ فِي مَرَضِهِ الْقَدِيمِ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ جَالِسًا وَالنَّاسُ خَلْفَهُ قِيَامًا، لَمْ يَأْمُرْهُمْ بِالْقُعُودِ، وَإِنَّمَا يُؤْخَذُ بِالآخِرِ، فَالآخِرِ مِنْ فِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٦٨٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ئەسپێك بوو هەڵیدێرا، بەو هۆیەوە لای ڕاستی بریندار بوو، جا نوێژێك لە نوێژەکانی بەدانیشتنەوە کرد، ئێمەش لەدوایەوە بەدانیشتنەوە نوێژمان کرد، جا کە لێ بۆیەوە فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە تا پەیڕەوی لێ بکرێ، کە وا بوو ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد ئێوەش بەپێوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر کڕنوشی برد ئێوەش کڕنوش ببەن، وە ئەگەر بەرز بۆیەوە ئێوەش بەرز ببنەوە، وەکاتێ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، وە ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد ئێوەش بەپێوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن)). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: حومەیدی دەڵێ: ئەم ڕستەیە: ((ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن))، ئەوە لە نەخۆشییە کۆنەکەیدا بوو، پاشان دوای ئەوە خۆی بەدانیشتنەوە نوێژی کردووە، خەڵکەکە لەدوایەوە بەپێوە نوێژیان کردووە و فەرمانی پێ نەکردوون بە دانیشتن، بێگومان فەرموودەی دواتریان وەردەگیرێ، کە فەرموودەی دواتریشیان کرداری پێغەمبەرە ﷺ.**

## ٥٢- بابٌ: مَتَى يَسْجُدُ مَنْ خَلْفَ الإِمَامِ؟

قَالَ أَنَسٌ: فَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا[2].

٦٩٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ قَالَ: حَدَّثَنِي الْبَرَاءُ -وَهُوَ غَيْرُ كَذُوبٍ- قَالَ:

---

[1] بڕوانە: ٣٧٨.

[2] بڕوانە: ٣٧٨.

كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». لَمْ يَحْنِ أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ حَتَّى يَقَعَ النَّبِيُّ ﷺ سَاجِدًا، ثُمَّ نَقَعُ سُجُودًا بَعْدَهُ، حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، نَحْوَهُ بهذا[1].

## ٥٢- باسێک: ئەو کەسەی لەدوای پێشنوێژەوەیە چ کاتێ سوژدە دەبات؟

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: هەرکاتێ (پێشنوێژ) سوژدەی برد، ئێوەش سوژدە ببەن.**

**٦٩٠- عەبدوڵای کوڕی یەزید دەڵێ: بەڕاو -کە درۆزن نییە- بۆی گێڕامەوە وتی: هەمیشە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، هیچ کام لە ئێمە پشتی نەدەچەمایەوە، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ نەڕۆیشتایە بۆ سوژدە، پاشان ئێمە پاش ئەو سوژدەمان دەبرد. (ئیمام بوخاری دەڵێ:) ئەبو نوعەیم بۆی گێڕاینەوە لە سوفیانەوە، ئەویش لە ئەبو ئیسحاقەوە، وێنەی فەرموودەی پێشووی گێڕاوەتەوە بەم ڕشتەیە.**

## ٥٣- بابُ إِثْمِ مَنْ رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ

٦٩١- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ -أَوْ لاَ يَخْشَى أَحَدُكُمْ- إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ؟».

---

[1] بڕوانه: ٧٤٧، ٨١١.

## ٥٣- باسی تاوانی ئەو کەسەی پێش ئیمام سەری بەرز کاتەوە[1]

٦٩١- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەوە کەسێك لە ئێوە ناترسێ -یان کەسێکتان ناترسێ- ئەگەر سەری پێش ئیمام بەرز بکاتەوە، کە خوا سەری بکات بە سەری گوێدرێژ)) یان ((شێوەی بگۆڕێ بۆ شێوەی گوێدرێژ؟)).

## ٥٤- بَابُ إِمَامَةِ العَبْدِ وَالْمَوْلَى

وَكَانَتْ عَائِشَةُ يَؤُمُّهَا عَبْدُهَا ذَكْوَانُ مِنَ المُصْحَفِ، وَوَلَدِ البَغِيِّ وَالأَعْرَابِيِّ وَالْغُلَامِ الذِي لَمْ يَحْتَلِمْ. لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((يَؤُمُّهُمْ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ)).

## ٥٤- باسی (حوکمی) پێشنوێژی

## کۆیلەی ئازادنەکراو و ئازادکراو

عائیشە ﷺ زەکوان کە کۆیلەی بوو پێشنوێژی بۆ دەکرد لە قورئان (موصحەف)ـەکەدا قورئانی دەخوێند. وە باسی ئەوەی کە پێشنوێژ کوڕێکی زۆڵ بێ، یان عەرەبی دەشتەکی بێ، یان غولامێك بێ کە باڵغ نەبووبێ (دروستە). بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەو کەسەی شارەزاترە لە قورئانەکەی خوا پێشنوێژییان بۆ دەکات)).

٦٩٢- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، قَالَ حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ الْعُصْبَةَ - مَوْضِعٌ بِقُبَاءٍ - قَبْلَ مَقْدَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَؤُمُّهُمْ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا[1].

---

[1] سەری بەرز بکاتەوە لە سوژدە یان لە سوژدە و کڕنوش پێش ئیمام.

**٦٩٢- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێ یەکەمینەکان گەشتنە عوصبە -کە شوێنێکە لە قوبادا-، پێش هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ سالیم پێشنوێژی بۆ دەکردن کە کۆیلەی ئازادکراوی ئەبو حوزەیفە بوو، کە لە هەموویان زیاتر قورئانی دەزانی (یان لەبەریبوو).**

٦٩٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَإِنِ اسْتُعْمِلَ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ»[٢].

**٦٩٣-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بن، با بەندەیەکی حەبەشیش کرابێت بە کاربەدەستتان، کە سەری وەکوو دەنکەمێوژێك وا بێ)).**

## ٥٥- بابٌ: إِذَا لَمْ يُتِمَّ الإِمَامُ وَأَتَمَّ مَنْ خَلْفَهُ

٦٩٤- حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ سَهْلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُوسَى الأَشْيَبُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ، وَإِنْ أَخْطَئُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ».

---

[١] بڕوانە: ٧١٧٥.

[٢] بڕوانە: ٦٩٦، ٧١٤٢.

## ٥٥- باسێک: ئەگەر پێشنوێژ نوێژی ڕێکوپێک نەدەکرد، بەڵام ئەو کەسەی لە دوایەوە بوو نوێژی بەڕێکی دەکرد

**٦٩٤- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( (پێشنوێژەکانتان) بەرنوێژیتان بۆ دەکەن، جا ئەگەر بەرێك و ڕاستی کردیان ئەوە (پاداشتی بۆ خۆیان و) بۆ ئێوەشە، بەڵام ئەگەر هەڵەیان تێدا کرد، ئەوە (پاداشتی) بۆ ئێوەیەو گوناهەکەی بۆ ئەوانە)).**

## ٥٦- بابُ إِمَامَةِ المَفتُونِ وَالْمُبتَدِعِ

قال البخاري: وَقَالَ الحَسَنُ: صَلِّ وَعَلَيْهِ بِدْعَتُهُ.

٦٩٥- قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَ لَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ خِيَارٍ أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ وَهْوَ مَحْصُورٌ فَقَالَ: إِنَّكَ إِمَامُ عَامَّةٍ، وَنَزَلَ بِكَ مَا تَرَى، وَيُصَلِّي لَنَا إِمَامُ فِتْنَةٍ وَنَتَحَرَّجُ. فَقَالَ: الصَّلاَةُ أَحْسَنُ مَا يَعْمَلُ النَّاسُ، فَإِذَا أَحْسَنَ النَّاسُ فَأَحْسِنْ مَعَهُمْ، وَإِذَا أَسَاءُوا فَاجْتَنِبْ إِسَاءَتَهُمْ. وَقَالَ الزُّبَيْدِيُّ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: لاَ نَرَى أَنْ يُصَلَّى خَلْفَ الْمُخَنَّثِ إِلاَّ مِنْ ضَرُورَةٍ لاَ بُدَّ مِنْهَا.

## ٥٦- باسی (حوکمی)پێشنوێژکردنی ئاژاوەگێڕ و بیدعەچی

**حەسەن دەڵێ: نوێژ بکە لە دوای بیدعەچییەوە، چونکە تاوانی بیدعەکەی بۆ خۆیەتی.**

**٦٩٥- عەبدوڵای کوڕی عەدی کوڕی خیار دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ڕۆیشت بۆ ماڵی عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ لە کاتێکدا (ئاژاوەگێڕەکان) گەمارۆی ماڵیان دابوو، بە عوسمانی وت: بێگومان تۆ پێشەوای هەمووانی ئەمەشت بەسەردا هاتووە کە**

**دەیبینین، کەسێك پێشنوێژیمان بۆ دەکات کە سەرۆکی ئاژاوەگێڕانە، ئێمە دەترسین تاوانبار بین؟ عوسمان وتی: نوێژ چاکترین شتە خەڵکی بیکەن، جا ئەگەر خەڵك چاکەیان کرد ئەوە لەگەڵیاندا بیکە، وە ئەگەر خەڵك خراپەیان کرد ئەوە دوور کەوە لە خراپەکانیان. وە زوبەیدی دەڵێ: زوهری وتی: بەلای ئێمەوە نوێژکردن لەدوای پیاوی ژنانییەوە دروست نییە مەگەر لە ناچارییەکدا کە مرۆڤ دەرەتانی نەبێت.**

٦٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبَانَ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَبِي ذَرٍّ: «اسْمَعْ وَأَطِعْ، وَلَوْ لِحَبَشِيٍّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ»[1].

**٦٩٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو زەڕی فەرموو: ((گوێڕایەڵی و فەرمانبەردار بە با بۆ (کاربەدەستێکی) حەبەشیش بێت، سەری وەك دەنکەمێوژێك وا بێ)).**

## ٥٧- بابٌ: من يَقُومُ عن يَمِينِ الإِمَامِ بِحِذَائِهِ سَوَاءً إِذَا كَانَا اثْنَيْنِ

٦٩٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْعِشَاءَ، ثُمَّ جَاءَ فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ، فَجِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَصَلَّى خَمْسَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ نَامَ حَتَّى سَمِعْتُ غَطِيطَهُ -أَوْ قَالَ: خَطِيطَهُ- ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٩٣.

[2] بڕوانە: ١١٧.

## ٥٧- باسێک: نوێژکەر لای ڕاستی پێشنوێژ و لە ڕێکیدا دەوەستێ ئەگەر تەنها ئەو دوو کەس بوون

٦٩٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: شەو لە ماڵی مەیمونەی پوورم مامەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای کرد، پاشان هاتەوە (بۆ ماڵەوە) چوار ڕکات نوێژی کرد، پاشان خەوت، پاشان هەڵسا بۆ شەونوێژ، منیش ڕۆیشتمە لای چەپیەوە وەستام (نوێژم دابەست)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ خستمیە لای ڕاستیەوە و پێنج ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکاتی دیکەی کرد، پاشان خەوت هەتا گوێم لە دەنگی پرخەی بوو-یان وتی: گوێم لە نرکەی بوو-، پاشان لە ماڵ دەرچوو بۆ نوێژ (لە مزگەوت).

## ٥٨- بابٌ: إِذَا قَامَ الرَّجُلُ عَنْ يَسَارِ الإِمَامِ، فَحَوَّلَهُ الإِمَامُ إِلَى يَمِينِهِ لَمْ تَفْسُدْ صَلَاتُهُمَا

٦٩٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: نِمْتُ عِنْدَ مَيْمُونَةَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ عِنْدَهَا تِلْكَ اللَّيْلَةَ، فَتَوَضَّأَ ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ عَلَى يَسَارِهِ، فَأَخَذَنِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَصَلَّى ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ نَامَ حَتَّى نَفَخَ -وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ- ثُمَّ أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ، فَخَرَجَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قَالَ عَمْرٌو: فَحَدَّثْتُ بِهِ بُكَيْرًا، فَقَالَ: حَدَّثَنِي كُرَيْبٌ بِذَلِكَ[1].

## ٥٨- باسێک: ئەگەر کەسێک لای چەپی پێشنوێژەوە وەستا و پێشنوێژ بردیە لای ڕاستیەوە، نوێژی هیچیان بەتاڵ نابێتەوە

٦٩٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: لەماڵی مەیمونە (ی پوورم) خەوتم، لەو شەوەدا پێغەمبەر ﷺ لای ئەو بوو، جا دەستنوێژی گرت، پاشان هەستا

[1] بڕوانە: ١١٧.

نوێژی كرد، منیش لای چەپیەوە وەستام و نوێژم دابەست، پێغەمبەر ﷺ گرتمی و خستمیە لای ڕاستی خۆیەوە، جا سیانزە ڕكات نوێژی (شەونوێژی) كرد، پاشان خەوت تا پرخەی هات -وە هەمیشە كە بخەوتایە پرخەی لێ دەدا-، پاشان بانگبێژەكە هات بۆلای، پێغەمبەریش ﷺ لە ماڵ دەرچوو (بۆمزگەوت و) نوێژی كرد و دەستنوێژی نەگرتەوە. عەمر دەڵێ: بۆ بوكەیرم گێڕایەوە، ئەویش وتی: كوڕەیب ئەو فەرموودەیەی بۆ گێڕاوەمەتەوە.

## ٥٩- بابُ إِذَا لَمْ يَنْوِ الإِمَامُ أَنْ يَؤُمَّ، ثُمَّ جَاءَ قَوْمٌ فَأَمَّهُمْ

٦٩٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَقُمْتُ أُصَلِّي مَعَهُ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِرَأْسِي فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ[1].

## ٥٩- باسی ئەگەر پێشنوێژێک نەیەوێ پێشنوێژی بكات، پاشان كەسانێک بێنن پێشنوێژییان بۆ بكات

٦٩٩- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: شەو لەماڵی پوورم (مەیمونە) مامەوە، جا پێغەمبەر ﷺ هەستا لە شەودا شەونوێژی دەكرد، منیش هەستام لەگەڵیدا نوێژ بكەم و لەلای چەپیەوە وەستام، ئەویش سەرمی گرت و (بردمی بۆ) لای ڕاستیەوە وەستاندمی.

---

[1] بڕوانە: ١١٧.

## ٦٠- بابٌ: إِذَا طَوَّلَ الإِمَامُ وَكَانَ لِلرَّجُلِ حَاجَةٌ فَخَرَجَ فَصَلَّى

٧٠٠- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ[1].

## ٦٠- باسێک: ئەگەر ئیمام درێژەی بە نوێژەکەی دا ئەو کەسەی لە دوایەوەیە پێویستییەکی هەبوو نوێژەکەی بڕی و بەتەنها نوێژی کرد

**٧٠٠- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە و پێشنوێژی بۆ هۆزەکەی دەکرد.**

٧٠١- وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ فَقَرَأَ بِالْبَقَرَةِ، فَانْصَرَفَ الرَّجُلُ، فَكَأَنَّ مُعَاذًا تَنَاوَلَ مِنْهُ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «فَتَّانٌ فَتَّانٌ فَتَّانٌ» ثَلاَثَ مِرَارٍ، أَوْ قَالَ: «فَاتِنًا فَاتِنًا فَاتِنٌ» وَأَمَرَهُ بِسُورَتَيْنِ مِنْ أَوْسَطِ الْمُفَصَّلِ[2]. قَالَ عَمْرٌو لاَ أَحْفَظُهُمَا[3].

**٧٠١- عەمر دەڵێ: لە جابیری کوڕی عەبدوڵام ﷺ بیست وتی: موعازی کوڕی جەبەل هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە و**

---

[1] بڕوانە: ٧٠١، ٧٠٥، ٧١١، ٦١٠٦.

[2] (الْمُفَصَّلِ): لە ماناکەیدا چەند قسە و پێناسە هەیە، ڕاسترینیان ئەمەیە: ئەو سوورەتانەن کە لە سوورەتی (ق)ـەوە دەست پێ دەکەن تا کۆتایی قورئان. بڕوانە: فتح الباري: ٢٤٩/٣ . (أَوْسَطِ الْمُفَصَّلِ) لە سوورەتی (ق)ـەوە دەست پێ دەکەن تا سوورەتی (الضحى). بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٤٨/٢.

[3] بڕوانە: ٧٠٠.

پێشنوێژی بۆ هۆزەكەی دەكرد، جارێكیان نوێژی عیشای كرد (بۆ هۆزەكەی)، سووڕەتی بەقەڕەی خوێند، جا پیاوێك (نوێژی جەماعەتەكەی) بەجێی هێشت و ڕۆیشت، وەك بڵێی موعاز قسەی پێ وت، جا ئەو ڕووداوە گەشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەر لە نوێژكەران دەشێوێنێ، سەر لە نوێژكەران دەشێوێنێ، سەر لە نوێژكەران دەشێوێنێ)) سێجار فەرمووی، یان فەرمووی: ((تۆ سەرلێشێوێنی، تۆ سەرلێشێوێنی، تۆ سەرلێشێوێنی))، وە فەرمانی پێ كرد بەخوێندنی دوو سووڕەت لە سووڕەتە مامنێوەندەكانی سووڕەتە (مُفَصَّل)كان.
عەمر دەڵێ: دوو سووڕەتەكەم لەبیر نەماوە كامە بوون.

## ٦١- بابُ تَخْفِيفِ الإِمَامِ فِي القِيَامِ وَإِتْمَامِ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

٧٠٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: سَمِعْتُ قَيْسًا قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو مَسْعُودٍ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاَةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلاَنٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا. فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيَتَجَوَّزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَةِ»[١].

## ٦١- باسی ئیمام لە وەستانی نوێژدا زۆر نەوەستێ، بەڵام كڕنوش و سوژدە بەتەواوی ببات

٧٠٢- ئەبو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێك، وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی من لە نوێژی بەیانی دوا دەكەوم لەبەر فلان

[١] بڕوانە: ٩٠.

کەس، چونکە نوێژی درێژمان بۆ دەکات، ئەبو مەسعود دەڵێ: هیچ جارێ پێغەمبەرم ﷺ نەدیوە ئەوەندەی ئەو ڕۆژە لە ئامۆژگاریکردندا توورە بووبێ، پاشان فەرمووی: ((بێگومان لەنێوتاندا کەسی وا هەیە خەڵك لە ئیسلام دوور دەخاتەوە، بۆیە هەرکەسێکتان پێشنوێژی کرد بۆ خەڵکی با بەکورتی نوێژیان بۆ بکات و درێژەی پێ نەدات، چونکە بەڕاستی لەنێویاندا لاواز و پیر و خاوەن ئیشی تێدایە)).

## ٦٢- بابٌ: إِذَا صَلَّى لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ

٧٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ مِنْهُمُ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ».

## ٦٢- باسێک: ئەگەر کەسێک بەتەنها بۆ خۆی نوێژی کرد با بە ویستی خۆی درێژی بکاتەوە

٧٠٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان پێشنوێژی کرد بۆ خەڵکی با کورتی بکاتەوە، چونکە بەڕاستی لاواز و نەخۆش و پیریان تێدایە، بەڵام ئەگەر نوێژی تەنها بۆ خۆی کرد، چەند دەیەوێ با درێژی بکاتەوە)).

## ٦٣- بَابُ مَنْ شَكَا إِمَامَهُ إِذَا طَوَّلَ

وَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: طَوَّلْتَ بِنَايَا بُنَيَّ.

٧٠٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الْفَجْرِ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا فُلَانٌ فِيهَا. فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا رَأَيْتُهُ غَضِبَ فِي مَوْضِعٍ كَانَ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَمَنْ أَمَّ النَّاسَ فَلْيَتَجَوَّزْ، فَإِنَّ خَلْفَهُ الضَّعِيفَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَةِ»[1].

## ٦٣- باسی کەسێک سکاڵا لە دەست ئیمامەکەی بکات ئەگەر نوێژ درێژە پێ بدات

**وە ئەبو ئوسەید وتی (بە مونزیری کوڕی): کوڕە بچکۆلەکەم[2] نوێژێکی درێژت بۆ کردین.**

**٧٠٤- ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی من لە نوێژی (جەماعەتی) بەیانی دوا دەکەوم، لەبەرئەوەی فلان کەس پێشنوێژێکی درێژمان بۆ دەکات، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ تورە بوو لە هیچ شوێنێکدا نەمدیوە بەئەندازەی ئەو ڕۆژە تورە بووبێ، پاشان فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە بێگومان هی واتان هەیە خەڵك دوور دەخاتەوە (لە ئیسلام )، جا هەر کەس پێشنوێژی بۆ خەڵکی کرد با نوێژەکەی کورت بکاتەوە، چونکە بەڕاستی لەدوایەوە لاواز و پیرو خاوەن ئیش هەیە)).**

---

[1] بڕوانە: ٩٠.

[2] یان کوڕە شیرینەکەم، کوڕە خۆشەویستەکەم.

٧٠٥- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَارِبُ بْنُ دِثَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيَّ قَالَ: أَقْبَلَ رَجُلٌ بِنَاضِحَيْنِ وَقَدْ جَنَحَ اللَّيْلُ، فَوَافَقَ مُعَاذًا يُصَلِّي، فَتَرَكَ نَاضِحَهُ وَأَقْبَلَ إِلَى مُعَاذٍ، فَقَرَأَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ -أَوِ النِّسَاءِ- فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ، وَبَلَغَهُ أَنَّ مُعَاذًا نَالَ مِنْهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَشَكَا إِلَيْهِ مُعَاذًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا مُعَاذُ، أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟ -أَوْ أفَاتِنٌ؟!- ثَلَاثَ مِرَارٍ- فَلَوْلاَ صَلَّيْتَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، فَإِنَّهُ يُصَلِّي وَرَاءَكَ الْكَبِيرُ وَالضَّعِيفُ وَذُو الْحَاجَةِ». أَحْسِبُ هَذَا فِي الْحَدِيثِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَتَابَعَهُ سَعِيدُ بْنُ مَسْرُوقٍ، وَمِسْعَرٌ وَالشَّيْبَانِيُّ. قَالَ عَمْرٌو، وَعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مِقْسَمٍ، وَأَبُو الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ: قَرَأَ مُعَاذٌ فِي الْعِشَاءِ بِالْبَقَرَةِ. وَتَابَعَهُ الأَعْمَشُ عَنْ مُحَارِبٍ[1].

**٧٠٥- جابیری کوڕی عەبدوڵای ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بە دوو وشترەوە کە بۆ ئاوهەڵکۆزین بەکار دەهێنران، لە کاتێکدا شەو داهاتبوو، جا لەو کاتەدا موعاز پێشنوێژی دەکرد، پیاوەکە (دوو) وشترەکەی واز لێ هێنان و هات بۆ لای موعاز (نوێژی دابەست)، موعازیش سووڕەتی بەقەڕە -یان نیسائی- خوێند، بۆیە پیاوەکە (نوێژەکەی بڕی و) ڕۆیشت، وە پێی گەشتەوە کە موعاز قسەی پێ وتووە، ئیدی پیاوەکەش ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای موعازی لا کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی موعاز تۆ سەرلێشێوێنەری؟))، یان ((گومڕاکاری؟)) سێ جار ئەمەی وتەوە، وە فەرمووی: ((دەی بۆچی بە سووڕەتی (بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) پێشنوێژیت بۆ نەکردن، چونکە بێگومان پیر و لاواز و خاوەن ئیش لەدواتەوە نوێژ دەکەن)). (شوعبە) دەڵێ: وا گومان دەبەم ئەم ڕستەیە (چونکە ... تا ... لەدواتەوە نوێژ دەکەن) بەشێکە لە فەرموودەکە. ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: سەعیدی کوڕی مەسڕوق و میسعەر و شەیبانی ئەم**

---

[1] بڕوانە: ٧٠٠.

فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شوعبە دەکەن. وە عەمر و عوبەیدوڵای کوڕی میقسەم و ئەبو زوبەیر لە جابیرەوە گێڕاویانەتەوە کە دەڵێ: موعاز لە نوێژی عیشادا سوورەتی بەقەرەی خوێند، ئەم وتەیەی جابیر ئەعمەشیش لە موحاریبەوە گێڕاویەتەوە.

## ٦٤- بابُ الإِيجَازِ فِي الصَّلَاةِ وَإِكْمَالِهَا

٧٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوجِزُ الصَّلَاةَ وَيُكْمِلُهَا[1].

## ٦٤- باسی نوێژکردن بەکورتی لەگەڵ ڕێکوپێکیدا

٧٠٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە نوێژی (جەماعەتی) کورت دەکردەوە، بەڵام بەڕێکوپێکی و تەواوی دەیکرد.

## ٦٥- بابُ مَنْ أَخَفَّ الصَّلَاةَ عِنْدَ بُكَاءِ الصَّبِيِّ

٧٠٧- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا الْوَلِيدُ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنِّي لأَقُومُ فِي الصَّلَاةِ أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ». تَابَعَهُ بِشْرُ بْنُ بَكْرٍ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ وَبَقِيَّةُ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٠٨.

[2] بڕوانە: ٨٦٨.

# ٦٥- باسی کەسێک نوێژەکەی کورت بکاتەوە لە کاتی گریانی منداڵدا

**٧٠٧- ئەبو قەتادە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بەڕاستی من لەنوێژدا دەوەستم بەنیازم درێژەی پێ بدەم، لە پڕ گریانی منداڵێك دەبیستم، ئیدی نوێژەکەم کورت دەکەمەوە، چونکە حەز ناکەم ببمە هۆی نارەحەتی بەسەر دایکیەوە)). هەر یەك لە بیشری کوڕی بەکر و عەبدولای کوڕی موبارەك و بەقییە لە ئەوزاعییەوە هەمان فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی وەلیدی کوڕی موسلیم دەکەن.**

٧٠٨- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: مَا صَلَّيْتُ وَرَاءَ إِمَامٍ قَطُّ أَخَفَّ صَلاَةً وَلاَ أَتَمَّ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، وَإِنْ كَانَ لَيَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَيُخَفِّفُ مَخَافَةَ أَنْ تُفْتَنَ أُمُّهُ[1].

**٧٠٨- ئەنەس کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: هەرگیز لەدوای هیچ ئیمامێکەوە نوێژم نەکردووە نوێژی کورتتر و تەواوتر بێت لە پێغەمبەر ﷺ، کە گریانی منداڵی دەبیست نوێژەکەی کورت دەکردەوە، لە ترسی ئەوەی دایکی منداڵەکە نارەحەت و بێئاگا بێ لە نوێژەکەی.**

٧٠٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنِّي لأَدْخُلُ فِي الصَّلاَةِ وَأَنَا أُرِيدُ إِطَالَتَهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلاَتِي مِمَّا أَعْلَمُ مِنْ شِدَّةِ وَجْدِ أُمِّهِ مِنْ بُكَائِهِ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٠٦.

[2] بڕوانە: ٧١٠.

**٧٠٩- ئەنەس کوڕی مالیك ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان من دەڕۆمە نێو نوێژەوە و دەمەوێ درێژەی پێ بدەم، بەڵام گریانی منداڵم گوێ لێ دەبێ، ئیدی نوێژەکەم کورت دەکەمەوە، لەبەر ئەوەی کە دەزانم دایکی منداڵەکە بەگریانەکەی زۆر پەرۆشە و دڵی بۆی دەسووتێ)).**

٧١٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنِّي لأَدْخُلُ فِي الصَّلاَةِ فَأُرِيدُ إِطَالَتَهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ مِمَّا أَعْلَمُ مِنْ شِدَّةِ وَجْدِ أُمِّهِ مِنْ بُكَائِهِ». وقَالَ مُوسَى: حَدَّثَنَا أَبَانُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[1].

**٧١٠- ئەنەس کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((بەڕاستی من دەچمە نێو نوێژەوە دەمەوێ نوێژەکەم درێژە پێ بدەم، بەڵام گوێبیستی گریانی منداڵێك دەبم ئیدی کورتی دەکەمەوە، لەبەر ئەوەی کە دەزانم دایکی منداڵەکە بەگریانەکەی زۆر پەرۆشە و دڵی بۆی دەسووتێ)). (ئەم فەرموودەیە بەم ڕێگەش گێڕدراوەتەوە): مووسا دەڵێ: ئەبان بۆی گێڕاینەوە وتی: قەتادە بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەنەس بۆی گێڕاینەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەشێوەی فەرموودەکەی پێشوو.**

## ٦٦- بابٌ: إِذَا صَلَّى ثُمَّ أَمَّ قَوْمًا

٧١١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ وَأَبُو النُّعْمَانِ قَالَا: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ يَأْتِي قَوْمَهُ فَيُصَلِّي بِهِمْ[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٠٩.

[2] بڕوانە: ٧٠٠.

## ٦٦- باسێک: ئەگەر کەسێک نوێژی (بەجەماعەت) کرد، پاشان پێشنوێژی کرد بۆ کۆمەڵێک (دروستە)

**٧١١- جابیر ﷺ دەڵێ: موعاز هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی دەکرد بەکۆمەڵ، پاشان دەڕۆیشتەوە بۆ نێو هۆزەکەی پێشنوێژی بۆ دەکردن.**

## ٦٧- بابُ مَنْ أَسْمَعَ النَّاسَ تَكْبِيرَ الإِمَامِ

٧١٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دَاوُدَ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ لَمَّا مَرِضَ النَّبِيُّ ﷺ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَتَاهُ بِلاَلٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلاَةِ فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ». قُلْتُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ، إِنْ يَقُمْ مَقَامَكَ يَبْكِي فَلاَ يَقْدِرُ عَلَى الْقِرَاءَةِ. قَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ». فَقُلْتُ مِثْلَهُ، فَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: «إِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ». فَصَلَّى، وَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَخُطُّ بِرِجْلَيْهِ الأَرْضَ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ يَتَأَخَّرُ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ أَنْ صَلِّ، فَتَأَخَّرَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ وَقَعَدَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى جَنْبِهِ، وَأَبُو بَكْرٍ يُسْمِعُ النَّاسَ التَّكْبِيرَ. تَابَعَهُ مُحَاضِرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ[1].

## ٦٧- باسی کەسێک اللّٰه أکبری ئیمام دەگەیەنێ بە خەڵکی (تا بیبیستن)

**٧١٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت بەو نەخۆشییەی کە پێی وەفاتی کرد، بیلال هات ئاگاداری کرد بۆ نوێژکردن، ئەویش فەرمووی:**

---

[1] بڕوانە: ١٩٨.

((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با نوێژ بکات (بۆ خەڵکی)))، عائیشە دەڵێ: منیش وتم: بەڕاستی ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، ئەگەر لە شوێنی تۆدا بوەستێ دەست دەکات بە گریان و ئیدی ناتوانێ قورئان بخوێنێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فەرمان بکە بە ئەبو بەکر نوێژ بکات))، منیش وتەکەی پێشووم وتەوە، ئینجا بۆ جاری سێیەم یان چوارەم فەرمووی: ((بەڕاستی ئێوە وەکوو زولێخای سەردەمی یوسف وان، فەرمان بدەن بە ئەبو بەکر با نوێژ بکات))، ئیدی ئەبوبەکریش پێشنوێژی کرد، لەو کاتەدا پێغەمبەریش ﷺ لە ماڵ هاتە دەر بۆ مزگەوت لە نێوان دوو پیاودا، بەملاولادا لار دەبۆیەوە، دەڵێی بەپێش چاومەومیە قاچەکانی دەخشاند بە زەویدا، جا کە ئەبو بەکر پێغەمبەری ﷺ بینی ویستی بێتە دواوە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە نوێژەکەی بکات، جا ئەبو بەکر هاتە دواوە پێغەمبەریش ﷺ لە تەنیشتیدا دانیشت، وە ئەبو بەکر الله أكبرکردنی (پێغەمبەری ﷺ) دەگەیاند بە خەڵکەکە. موحازیر لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدوڵای کوڕی داود دەکات.

## ٦٨- بابٌ: الرَّجُلُ يَأْتَمُّ بِالإِمَامِ، وَيَأْتَمُّ النَّاسُ بِالْمَأْمُومِ

وُيذْكَرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ((ائْتَمُّوا بِي وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ)).

٧١٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَاءَ بِلاَلٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلاَةِ، فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ، وَإِنَّهُ مَتَى مَا يَقُمْ مَقَامَكَ لاَ يُسْمِعُ النَّاسَ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ. فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ». فَقُلْتُ

لِحَفْصَةَ: قُولِي لَهُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ، وَإِنَّهُ مَتَى يَقُمْ مَقَامَكَ لاَ يُسْمِعِ النَّاسَ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ. قَالَ .إِنَّكُنَّ لأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ.. فَلَمَّا دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَفْسِهِ خِفَّةً، فَقَامَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، وَرِجْلاَهُ يَخُطَّانِ فِي الأَرْضِ حَتَّى دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَلَمَّا سَمِعَ أَبُو بَكْرٍ حِسَّهُ ذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يَتَأَخَّرُ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى جَلَسَ عَنْ يَسَارِ أَبِي بَكْرٍ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي قَائِمًا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي قَاعِدًا، يَقْتَدِي أَبُو بَكْرٍ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَالنَّاسُ مُقْتَدُونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه[1].

## ٦٨- باسێک: کەسێک لەدوای ئیمامێکەوە نوێژ دەکات خەڵکیش لە دوای ئەو کەسەوە جەماعەت دەکەن

**لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: ((ئێوە پەیڕەوی لە من بکەن، ئەوانەش لەدوای ئێوەوەن پەیڕەوی لە ئێوە بکەن)).**

**٧١٣- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: کاتێ نەخۆشییەکەی پێغەمبەر ﷺ قورس بوو، بیلال هات ئاگاداری کرد بۆ نوێژکردن، ئەویش فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر کە پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە دەڵێ: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، دڵنیا بە کاتێ لە شوێنی تۆدا بوەستێ، خەڵکی گوێیان لە دەنگی نابێت، بۆیە ئەگەر فەرمانت بە عومەر بکردایە (چاکتر بوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر کە پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە دەڵێ: بە حەفصەم وت بە پێغەمبەر ﷺ بڵێ: بەڕاستی ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، دڵنیا بە کاتێ لە شوێنی تۆدا بوەستێ خەڵکی گوێیان لە دەنگی نابێت، بۆیە ئەگەر فەرمانت بە عومەر بکردایە (باشتر بوو)، فەرمووی: ((بەڕاستی ئێوە وەک**

---

[1] بڕوانە: ١٩٨.

زولێخای سەردەمی یوسف وان، فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر کە پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، جا کاتێ ئەبو بەکر چووە نوێژەکەوە دەستی پێ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ سووکییەکی لە لەشیدا هەست پێ کرد، بۆیە هەستا و لە نێوان دوو پیاودا بەلارەلارە (لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە) هەردوو قاچی دەخشاند بە زەویدا، هەتا ڕۆیشتە نێو مزگەوت، جا کە ئەبو بەکر گوێی لە جووڵە و خشەی بوو، ویستی بڕواتە دواوە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد (لە شوێنی خۆی بێ)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات هەتا لەلای چەپی ئەبوبەکرەوە دانیشت، جا ئەبو بەکر بەپێوە نوێژی دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد، ئەبو بەکر پەیڕەوی نوێژەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد، خەڵکیش پەیڕەوی نوێژەکەی ئەبو بەکریان دەکرد.

## ٦٩- بابٌ: هَلْ يَأْخُذُ الإِمَامُ إِذَا شَكَّ بِقَوْلِ النَّاسِ؟

٧١٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ أَبِي تَمِيمَةَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ انْصَرَفَ مِنَ اثْنَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو الْيَدَيْنِ: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ :أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟. فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ. فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى اثْنَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ[1].

## ٦٩- باسێک: ئایا ئەگەر پێشنوێژ گومانی هەبوو کار بە قسەی نوێژکەرەکان دەکات؟

٧١٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی دووەمدا نوێژەکەی کۆتایی پێ هێنا، جا پیاوە دەستدرێژەکە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا

---

[1] بڕوانە: ٤٨٢.

**ﷺ نوێژ کورت بۆتەوە یان لەبیرت چوو؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەریْ دەست درێژەکە ڕاست دەکات؟))، خەڵکەکەش وتیان: بەڵێ ڕاست دەکات، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و دوو ڕکاتی دیکە نوێژی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، ئینجا الله أكبرى كرد و سوژدەی برد بە وێنەی سوژدەکانی دیکەی یان درێژتر.**

٧١٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، فَقِيلَ: صَلَّيْتَ رَكْعَتَيْنِ. فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ[1].

**٧١٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژی نیوەڕۆ دوو ڕکاتی کرد، پێی وترا: دوو ڕکاتت کرد! بۆیە دوو ڕکاتی دیکەی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان دوو سوژدەی برد.**

## ٧٠- بابٌ: إِذَا بَكَى الإِمَامُ فِي صَلَاتِه

وَقَالَ عَبْدُ الله بْنُ شَدَّادٍ: سَمِعْتُ نَشِيجَ عُمَرَ وَأَنَا فِي آخِرِ الصُّفُوفِ يَقْرَأ: ﴿إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٨٦﴾﴾ يوسف.

٧١٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ فِي مَرَضِهِ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ». قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْتُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ. فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ». قَالَتْ عَائِشَةُ لِحَفْصَةَ: قُولِي لَهُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ،

---
[1] بڕوانە: ٤٨٢.

فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ. فَفَعَلَتْ حَفْصَةُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَهْ، إِنَّكُنَّ لَأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ. قَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ: مَا كُنْتُ لِأُصِيبَ مِنْكِ خَيْرًا[1].

## ٧٠- باسێک: ئەگەر پێشنوێژ لەنێو نوێژدا بگری (نوێژەکەی دروستە؟)

**وە عەبدوڵای کوڕی شەداد دەڵێ: من لە ڕیزی دواوە بووم گوێم لە گریانی عومەر بوو کە ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٨٦﴾﴾ یوسف. واتە: (من باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خوا دەکەم).**

**٧١٦- عائیشەی دایکی باوەڕداران ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر کە پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە وتی: وتم: بێگومان ئەبو بەکر ئەگەر لە جێگای تۆدا بوەستێ (پێشنوێژی بکات)، لەبەر گریان خەڵك گوێیان لە دەنگی نابێت، بۆیە فەرمان بکە با عومەر پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، عائیشە وتی: بە حەفصەم وت: تۆ پێی بڵێ: بەڕاستی ئەگەر ئەبو بەکر لە جێگای تۆدا بوەستێ، لەبەر گریان خەڵکی گوێیان لە دەنگی نابێت، بۆیە فەرمان بکە بە عومەر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی، حەفصەش ئەوەی کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێدەنگ بە بەڕاستی ئێوە وەك زولێخای سەردەمی یوسف وان، فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە))، حەفصە وتی بە عائیشە: من هیچ کات لە تۆوە تووشی خێر نەبووم، (واتە: بەهۆی تۆوە پێغەمبەر ﷺ لێم توڕە بوو) .**

---

[1] بڕوانە: ١٩٨.

## ٧١- بابُ تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ عِنْدَ الإِقَامَةِ وَبَعْدَهَا

٧١٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ سَالِمَ بْنَ أَبِي الْجَعْدِ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ».

## ٧١- باسی ڕێککردنی ڕیزەکان

## لە کاتی قامەتکردن (بۆ نوێژ) و دوای قامەتیش

**٧١٧- نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەخوا ڕیزەکانتان ڕێکوپێك دەکەن، یان خوا ڕووتان لە یەکدی دەترازێنێ و جیاوازی دەکەوێتە نێوانتانەوە)).**

٧١٨- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَقِيمُوا الصُّفُوفَ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ خَلْفَ ظَهْرِي»[١].

**٧١٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕیزەکانتان ڕێك بکەن، چونکە بەڕاستی من لە پشتی خۆمەوە دەتانبینم)).**

## ٧٢- بابُ إِقْبَالِ الإِمَامِ عَلَى النَّاسِ عِنْدَ تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ

٧١٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ بْنُ قُدَامَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي»[٢].

---

[١] بڕوانە: ٧١٩، ٧٢٥.

[٢] بڕوانە: ٧١٨.

## ٧٢- باسی پێشنوێژ ڕوو بکاتە نوێژکەرەکان لە کاتی ڕێککردنی ڕیزەکاندا

**٧١٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: قامەتی نوێژ کرا و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێ کردین و فەرمووی: ((ڕیزەکانتان ڕێك بکەن و پاڵ بدەن بە یەکدییەوە، چونکە بێگومان من لەپشت خۆمەوە دەتانبینم)).**

## ٧٣- بابُ الصَّفِّ الأَوَّلِ

٧٢٠- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الشُّهَدَاءُ: الْغَرِقُ، وَالْمَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْهَدْمُ»[1].

## ٧٣- باسی ڕیزی یەکەم

**٧٢٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((شەهیدەکان ئەمانەن: (لە ئاودا) خنکا و ئەوەی بە تاعون بمرێ، ئەوەی بە سکئێشە بمرێ، ئەوەی شتی بەسەردا بڕوخێ))**[2].

٧٢١- وَقَالَ: «وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ لَاسْتَهَمُوا»[3].

---

[1] بڕوانە: ٦٥٣.

[2] پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بە ڕیزی یەکەمی نوێژەوە لەو زیادەدایە کە لە فەرموودەی ژمارە: (٦٥٣)دا هاتووە: «ئەگەر خەڵکی بیانزانییایە لە بانگدان و ڕیزی یەکەمی نوێژ چەند پاداشتی تێدایە ... هتد».

[3] بڕوانە: ٦١٥.

**٧٢١- وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر بیانزانیبایە چ پاداشتێك لە زوو ڕۆیشتن بۆ مزگەوتدا هەیە، بێگومان پێشبڕكێیان دەكرد بۆی، وە ئەگەر بیانزانیبایە چ پاداشتێك لە نوێژی عیشا و بەیانیدا هەیە، بێگومان دەهاتن بۆ هەردوو نوێژەكە با بەگاگۆڵكێش بووایە، وە ئەگەر بیانزانیبایە چ پاداشتێك لە ڕیزی پێشەوەدا هەیە، پشكیان دەخست[1] بۆی)).**

## ٧٤- بابٌ: إِقامَةِ الصَّفِّ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ

٧٢٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: .إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَلاَ تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ. وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ، وَأَقِيمُوا الصَّفَّ فِي الصَّلاَةِ، فَإِنَّ إِقَامَةَ الصَّفِّ مِنْ حُسْنِ الصَّلاَةِ.[2] .

## ٧٤- باسێك: ڕێكی ڕیز بەشێكە لە تەواوی نوێژ (ی جەماعەت)

**٧٢٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە پەیڕەوی لێوە بكرێ، كەواتە لەگەڵی جیاواز مەبن، جا كاتێ كڕنوشی برد كڕنوش ببەن، وە كاتێ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، وە كاتێ سوژدەی برد سوژدە ببەن، وە ئەگەر بەدانیشتانەوە نوێژی كرد ئێوەش هەمووتان بەدانیشتانەوە نوێژ بكەن، وە لە كاتی نوێژدا ڕیزەكان ڕێك بكەن، چونكە بەڕاستی ڕێكی ڕیزەكان لە جوانی و تەواوی نوێژە))[3] .**

---

[1] یان تیروپشكیان دەكرد بۆی، یان تیرهاوێژییان بۆ دەكرد (جۆرێكە لە قورعە).

[2] بڕوانە: ٧٣٤.

[3] مەبەستی نوێژی جەماعەتە، چونكە ڕیز لە نوێژی جەماعەتدا هەیە.

٧٢٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلاَةِ».

**٧٢٣- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ڕیزەکانتان ڕێك بخەن، چونکە بێگومان ڕێککردنی ڕیزەکان لە تەواوی نوێژە)).**

## ٧٥- بابُ إِثمِ مَن لَم يُتِمَّ الصُّفُوفَ

٧٢٤- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا الْفَضْلُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ عُبَيْدٍ الطَّائِيُّ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّهُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَقِيلَ لَهُ: مَا أَنْكَرْتَ مِنَّا مُنْذُ يَوْمِ عَهِدْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: مَا أَنْكَرْتُ شَيْئًا إِلاَّ أَنَّكُمْ لاَ تُقِيمُونَ الصُّفُوفَ. وَقَالَ عُقْبَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ: قَدِمَ عَلَيْنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ الْمَدِينَةَ بِهَذَا.

## ٧٥- باسی تاوانی ئەو کەسەی ڕیزەکان تەواو ناکات

**٧٢٤- بوشەیری کوڕی یەساری ئەنصاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە هات بۆ مەدینە پێی وترا: چ شتێکی ئێمەت لا خراپە بەراورد بەو ڕۆژگارەی تۆ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوویت؟ وتی: هیچ شتێکتانم پێ خراپ نییە، جگە لەوەی ئێوە ڕیزەکانتان ڕێك ناکەن (کاتێ نوێژ دەکەن). (ئەم فەرموودەیە بەم ڕێگەش گێڕدراوەتەوە): عوقبەی کوڕی عوبەید دەگێڕێتەوە لە بوشەیری کوڕی یەسارەوە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك هات بۆ لامان بۆ مەدینە: ئینجا وێنەی ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە.**

## ٧٦- بابُ إلْزَاقِ المَنْكِبِ بِالْمَنْكِبِ، وَالْقَدَمِ بِالْقَدَمِ فِي الصَّفِّ

وَقَالَ النُّعْمَانُ بْنُ بَشِيرٍ: رَأَيْتُ الرَّجُلَ مِنَّا يُلْزِقُ كَعْبَهُ بِكَعْبِ صَاحِبِهِ.

٧٢٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: .أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي.. وَكَانَ أَحَدُنَا يُلْزِقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ وَقَدَمَهُ بِقَدَمِهِ[١].

## ٧٦- باسی شان و پێ بەیەکەوە نووساندنی (نوێژکەرەکان) لە ڕیزی نوێژدا

**وە نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: لەنێوماندا پیاوم بینیوە پاژنەی دەنووساند بە پاژنەی هاوڕێکەیەوە.**

**٧٢٥- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ((ڕیزەکانتان ڕێك بکەن، چونکە بێگومان من لەپشتی خۆمەوە دەتانبینم))، ئیدی هەر یەکەمان شانی دەلکاند بە شانی هاوڕێکەیەوە، وە پێی دەلکاند بە پێی هاوڕێکەیەوە.**

## ٧٧- بابٌ: إِذَا قَامَ الرَّجُلُ عَنْ يَسَارِ الإِمَامِ، وَحَوَّلَهُ الإِمَامُ خَلْفَهُ إِلَى يَمِينِهِ، تَمَّتْ صَلَاتُهُ

٧٢٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَأْسِي مِنْ وَرَائِي، فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَصَلَّى وَرَقَدَ فَجَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَقَامَ وَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٢].

---

[١] بڕوانە: ٧١٨.

[٢] بڕوانە: ١١٧.

## ٧٧- باسێک: ئەگەر کەسێک لای چەپی ئیمامەوە وەستا ئیمام لە پشتیەوە بردیە لای ڕاستی خۆی نوێژەکەی دروستە[١]

٧٢٦- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژم کرد و لای چەپیەوە وەستام، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ سەری گرتم لەدواوە و بردمییە لای ڕاستیەوە، جا نوێژی کرد و خەوت، ئینجا بانگبێژەکە هات بۆ لای (ئاگاداری کرد)، ئەویش هەستا و نوێژی کرد بێئەوەی دەستنوێژ بگرێتەوە.

## ٧٨- بَابٌ: المَرْأَةُ وَحْدَهَا تَكُونُ صَفًّا

٧٢٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْحَاقَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّيْتُ أَنَا وَيَتِيمٌ فِي بَيْتِنَا خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ، وَأُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا[٢].

## ٧٨- باسێک: ئافرەت بەتەنها خۆی دەبێتە ڕیزێک

٧٢٧- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: من و منداڵێکی هەتیو لە ماڵی ئێمەدا لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان کرد، ئومو سولەیمی دایکیشم لەدوای ئێمەوە بوو بەتەنها.

## ٧٩- بَابُ مَيْمَنَةِ المَسْجِدِ وَالإِمَامِ

٧٢٨- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا ثَابِتُ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قُمْتُ لَيْلَةً أُصَلِّي عَنْ يَسَارِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَخَذَ بِيَدِي -أَوْ بِعَضُدِي- حَتَّى أَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ، وَقَالَ بِيَدِهِ مِنْ وَرَائِي[٣].

---

[١] واتە: نوێژی ئەو کەسەی لەدوای ئیمامەوە نوێژ دەکات دروستە و بەتاڵ نابێتەوە.

[٢] بڕوانە: ٣٨٠.

[٣] بڕوانە: ١١٧.

## ٧٩- باسی لای ڕاستی مزگەوت و ئیمام (لە ڕیزی نوێژی جەماعەتدا)

**٧٢٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: شەوێکیان هەستام شەونوێژم کرد لەلای چەپی پێغەمبەرەوە ﷺ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەست- یان قژڵی- گرتم، هەتا لای ڕاستیەوە دایونام، وە بەدەستی لە پشتمەوە ئاماژەی کرد (بەبردنم بۆ لای ڕاستی).**

## ٨٠- بَابٌ: إِذَا كَانَ بَيْنَ الإِمَامِ وَبَيْنَ القَوْمِ حَائِطٌ أَوْ سُتْرَةٌ

وَقَالَ الحَسَنُ: لَا بَأْسَ أَنْ تُصَلِّيَ وَبَيْنَكَ وَبَيْنَهُ نَهْرٌ. وَقَالَ أَبُو مِجْلَزٍ: يَأْتَمُّ بِالإِمَامِ وَإِنْ كَانَ بَيْنَهُمَا طَرِيقٌ أَوْ جِدَارٌ إِذَا سَمِعَ تَكْبِيرَ الإِمَامِ.

## ٨٠- باسێک: ئەگەر لەنێوان ئیمام و نوێژکەرەکاندا دیوارێک یان بەربەستێک هەبوو

**حەسەن دەڵێ: هیچ زیانی نییە لەدوای ئیمامێکەوە نوێژ بکەیت لە نێوانتاندا ڕووبارێك هەبێت، ئەبو میجلەز دەڵێ: دروستە لەدوای ئیمامێکەوە نوێژ بکەیت با لە نێوانیاندا ڕێگایەك یان دیوارێك هەبێ، بە مەرجێ گوێی لە الله أکبرەکانی ئیمام بێت.**

٧٢٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ فِي حُجْرَتِهِ، وَجِدَارُ الْحُجْرَةِ قَصِيرٌ، فَرَأَى النَّاسُ شَخْصَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَامَ أُنَاسٌ يُصَلُّونَ بِصَلاَتِهِ، فَأَصْبَحُوا فَتَحَدَّثُوا بِذَلِكَ، فَقَامَ لَيْلَةَ الثَّانِيَةِ، فَقَامَ مَعَهُ أُنَاسٌ يُصَلُّونَ بِصَلاَتِهِ، صَنَعُوا ذَلِكَ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، حَتَّى إِذَا كَانَ بَعْدَ

ذَلِكَ جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَخْرُجْ، فَلَمَّا أَصْبَحَ ذَكَرَ ذَلِكَ النَّاسُ، فَقَالَ: «إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُكْتَبَ عَلَيْكُمْ صَلاَةُ اللَّيْلِ»[1].

**٧٢٩- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ له شەودا له ژوورەكەی ئەودا شەونوێژی دەكرد، دیواری ژوورەكەی نزم بوو خەڵكی لاشەی پێغەمبەریان ﷺ دەبینی، بۆیه خەڵكانێك لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژیان دەكرد، كه بەیانی ڕۆژ بۆیەوە باسی ئەوەیان كرد (بۆ خەڵك)، شەوی دووەمیش پێغەمبەر ﷺ شەونوێژی كرد، ئینجا كەسانێك له دوایەوە نوێژیان كرد، دوو شەو یان سێ شەو ئاوا نوێژیان كرد، ئینجا دوای ئەو سێ شەوە پێغەمبەر ﷺ دانیشت و نەڕۆیشتە دەرەوە، جا كاتێ ڕۆژ بۆیەوە خەڵكی باسی ئەوەیان كرد، بۆیه پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان (بۆیه پێشنوێژیم بۆ نەكردن) چونكه ترسام شەونوێژ لەسەرتان فەرز بكرێ و لەسەرتان بنووسرێت)).**

## ٨١- بابُ صَلَاةِ اللَّيْلِ

**٧٣٠-** حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَهُ حَصِيرٌ يَبْسُطُهُ بِالنَّهَارِ، وَيَحْتَجِرُهُ بِاللَّيْلِ، فَثَابَ إِلَيْهِ نَاسٌ، فَصَلَّوْا وَرَاءَهُ[2].

---

[1] بڕوانه: ٧٣٠، ٩٢٤، ١١٢٩، ٢٠١١، ٢٠١٢.

[2] بڕوانه: ٧٢٩.

# ٨١- باسی شەونوێژ

**٧٣٠- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەسیرێکی هەبوو بەڕۆژ ڕایدەخست (بۆ دانیشتن لەسەری)، بەشەویش بە دەوری خۆیدا دەیگێڕایەوە (دەیکرد بە ژوور و نوێژی تێدا دەکرد)، جا کەسانێك هاتن لێی کۆ بوونەوە و لە دوایەوە نوێژیان کرد.**

٧٣١- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ حُجْرَةً - قَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: مِنْ حَصِيرٍ - فِي رَمَضَانَ فَصَلَّى فِيهَا لَيَالِيَ، فَصَلَّى بِصَلاَتِهِ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَلَمَّا عَلِمَ بِهِمْ جَعَلَ يَقْعُدُ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ: «قَدْ عَرَفْتُ الَّذِي رَأَيْتُ مِنْ صَنِيعِكُمْ، فَصَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ أَفْضَلَ الصَّلاَةِ صَلاَةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ». قال عَفَّان: حَدَّثَنَا وهَيْبٌ، حَدَّثَنَا مُوسَى، سَمِعْتُ أَبَا النَّضْر، عَنْ بُسْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٧٣١- زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هۆدەیەکی دروست کرد، -دەڵێ: وا دەزانم وتی: بە حەسیر- بۆ خۆی دروستی کرد[2] لە ڕەمەزاندا، جا چەند شەوێك نوێژی تێدا کرد، چەند هاوەڵێکی لە دوایەوە نوێژیان کرد بەجەماعەت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ کە پێی زانین دانیشت، جا ڕۆیشت بۆ لایان و فەرمووی: ((بێگومان ئەو نوێژکردنەتانم بینی و ئاگادار بووم، ئەی خەڵکینە! لەماڵەوە نوێژ بکەن، چونکە بێگومان باشترین نوێژ ئەو**

---

[1] بڕوانە: ٦١١٣، ٧٢٩٠.

[2] واتە: حەسیری بەدەوری خۆیدا گێڕایەوە، وەک هۆدە شوێنێکی بۆ خۆی جیا کردەوە لە مزگەوتدا.

نوێژەیە مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا بیکات، جگە لە نوێژە فەرزەکان)). (ئەم فەرموودەیە بەم ڕێگەیەش گێڕدراوەتەوە): عەففان دەڵێ: وەهەیب بۆی گێڕاینەوە، وتی: مووسا بۆی گێڕاینەوە وتی: لە ئەبو نەزرم بیست لە بوسەرەوە ئەویش لە زەیدەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە.

## ٨٢- بابُ إِيجَابِ التَّكْبِيرِ وَافْتِتَاحِ الصَّلاَةِ

٧٣٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ الأَنْصَارِيُّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَكِبَ فَرَسًا، فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ. قَالَ أَنَسٌ ﷺ: فَصَلَّى لَنَا يَوْمَئِذٍ صَلاَةً مِنَ الصَّلَوَاتِ وَهْوَ قَاعِدٌ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، ثُمَّ قَالَ لَمَّا سَلَّمَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[1].

## ٨٢- باسی الله أکبرکردن واجبە لەگەڵ دەستپێکردنی نوێژدا

٧٣٢- زوهری دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ئەسپێك بوو (هەڵیدێرا) و لای ڕاستی بریندار بوو، ئەنەس دەڵێ: لەو ڕۆژەدا نوێژێك لە نوێژەکانی بەدانیشتنەوە بۆ کردین ئێمە لەدوایەوە بەدانیشتنەوە نوێژمان کرد، پاشان کاتێ سەلامی دایەوە فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆئەوەیە -یان پێشنوێژ بۆئەوە دانراوە- پەیڕەوی لێ بکرێ جا ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد ئێوەش بەپێوە نوێژ بکەن وە کاتێ کڕنوشی برد ئێوەش کڕنوش ببەن کاتێکیش بەرز بۆیەوە ئێوەش بەرز ببنەوە و کاتێ

[1] بڕوانە: ٣٧٨.

**سوژدەی برد ئێوەش سوژدە ببەن، کاتێکیش وتی:** (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) **ئێوەش بڵێن:** (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ))**.**

٧٣٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ قَالَ خَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ، فَصَلَّى لَنَا قَاعِدًا فَصَلَّيْنَا مَعَهُ قُعُودًا، ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: «إِنَّمَا الإِمَامُ -أَوْ إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ - لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ. وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا»[1].

**٧٣٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سواری ئەسپێ کەوتە خوارەوە و بریندار بوو، بۆیە بەدانیشتانەوە پێشنوێژی بۆ کردین، ئێمەش بەدانیشتنەوە نوێژمان کرد، پاشان لێ بۆیەوە فەرمووی: ((بەڕاستی پێشنوێژ بۆیە دانراوە تا پەیڕەوی لێ بکرێ، جا کاتێ الله أکبری کرد، ئێوەش الله أکبر بکەن، وە کاتێ کڕنوشی برد، ئێوەش کڕنوش ببەن، کاتێکیش بەرز بۆیەوە لە کڕنوش، ئێوەش بەرز ببنەوە، وە کاتێ وتی:** (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)**، ئێوەش بڵێن:** (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)**، کاتێکیش سوژدەی برد ئێوەش سوژدە ببەن)).**

٧٣٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٧٨.

[2] بڕوانە: ٧٢٢.

**٧٣٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەڕاستی پێشنوێژ بۆیە دانراوە تا پەیڕەوی لێ بکرێت، جا کاتێ الله أکبری کرد ئێوەش الله أکبر بکەن، کاتێکیش کڕنوشی برد ئێوەش کڕنوش ببەن، وە کاتێ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، وەکاتێ سوژدەی برد ئێوەش سوژدە ببەن، وە ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەمووتان بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن)).**

## ٨٣- بابُ رَفْعِ اليَدَيْنِ فِي التَّكْبِيرَةِ الأُولَى مَعَ الافْتِتَاحِ سَوَاءً

٧٣٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ، وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ أَيْضًا، وَقَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ». وَكَانَ لاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ[1]

## ٨٣- باسی بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی اللە أکبری یەکەمدا و لەگەڵ دەستپێکردنی نوێژدا وەک یەکن[2]

**٧٣٥- سالمی کوڕی عەبدوڵا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی ڕێکی شانەکانی بەرز دەکردەوە کاتێ دەستی بەنوێژ دەکرد، کاتێکیش الله أکبری دەکرد بۆ چوون بۆ کڕنوش، کاتێکیش سەری بەرز دەکردەوە**

---

[1] بڕوانە: ٧٣٦، ٧٣٨، ٧٣٩.

[2] ئەگەر بەم جۆرەش بوترێت ڕاستە: باسی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست دەبێت لەگەڵ الله أکبردا و دەسپێکردنی نوێژدا بەیەکەوە بن.

له كڕنوش، بەهەمان شێوه دەستەكانی بەرز دەكردەوه و دەیفەرموو: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ))، بەڵام له سوژدەدا وای نەدەكرد، (نه له ڕۆیشتن بۆ سوژده نه له هەستانەوه له سوژده).

## ٨٤- بابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ إِذَا كَبَّرَ، وَإِذَا رَكَعَ وَإِذَا رَفَعَ

٧٣٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ عَنِ الزُّهْرِيِّ أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ فِي الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ حِينَ يُكَبِّرُ لِلرُّكُوعِ، وَيَفْعَلُ ذَلِكَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ وَيَقُولُ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». وَلاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ[1].

## ٨٤- باسی بەرزكردنەوەی دەستەكان كاتێ نوێژكەر الله أكبر دەكات و كاتێ كڕنوش دەبات و كاتێ بەرز دەبێتەوه له كڕنوش

٧٣٦- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی كاتێ هەڵدەسا بۆ نوێژكردن، هەردوو دەستەكانی بەرز كردەوه هەتا ئاستی شانەكانی، وه كاتێكیش الله أكبری دەكرد بۆ چوون بۆ كڕنوش، بەهەمان شێوه دەستەكانی بەرز دەكردەوه، كاتێكیش سەری بەرز دەكردەوه له كڕنوش، ئەم دەستی بەرز دەكردەوه و دەیفەرموو: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))، بەڵام لەسوژدەدا دەستی بەرز نەدەكردەوه.

[1] بڕوانه: ٧٣٥.

٧٣٧- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْوَاسِطِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ الله، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ أَنَّهُ رَأَى مَالِكَ بْنَ الْحُوَيْرِثِ إِذَا صَلَّى كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَحَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَنَعَ هَكَذَا.

**٧٣٧- ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە کە مالیکی کوڕی حوەیریس کاتێ نوێژی بکردایە، الله أکبری دەکرد و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، کاتێکیش بیویستایە کڕنوش ببات، هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، وە کاتێکیش سەری بەرز کردبایەتەوە لە کڕنوش هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، وە گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوەهای کردووە (کە من کردم).**

## ٨٥- بابٌ: إِلَى أَيْنَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ؟

وَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ فِي أَصْحَابِهِ: رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ.

٧٣٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنَا سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ افْتَتَحَ التَّكْبِيرَ فِي الصَّلاَةِ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ يُكَبِّرُ حَتَّى يَجْعَلَهُمَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَهُ، وَإِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». فَعَلَ مِثْلَهُ وَقَالَ: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ». وَلاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ حِينَ يَسْجُدُ وَلاَ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ[1].

## ٨٥- باسێک: تا کوێ دەستەکانی بەرز دەکاتەوە؟

**ئەبوحومەید لەنێو هاوڕێکانیدا وتی: پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی تا ئاستی هەردوو شانی بەرز دەکردەوە.**

[1] بڕوانە: ٧٣٥.

**٧٣٨- عەبدولّای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ دی الله أکبری کرد و دەستی کرد بە نوێژ، جا هەردوو دەستی هەتا ئاستی شانەکانی بەرز کردەوە کاتێ الله أکبری کرد، کاتێکیش الله أکبری کرد بۆ چوون بۆ کڕنوش بەهەمان شێوەی کرد، وە کاتێ فەرمووی: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))، بەهەمان شێوە دەستەکانی بەرز کردەوە و فەرمووی: ((رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ))، بەڵام ئەم دەستبەرزکردنەوەی نەدەکرد نە کاتێ سوژدەی دەبرد، نەکاتێ سەری بەرز دەکردەوە لە سوژدە.**

## ٨٦- بابُ رَفْعِ اليَدَيْنِ إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ

٧٣٩- حَدَّثَنَا عَيَّاشٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. رَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ. وَرَفَعَ ذَلِكَ ابْنُ عُمَرَ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ. رَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَرَوَاهُ ابْنُ طَهْمَانَ، عَنْ أَيُّوبَ وَمُوسَى بْنِ عُقْبَةَ مُخْتَصَرًا[1].

## ٨٦- باسی بەرزکردنەوەی دەستەکان کاتێ (نوێکەر) لە دوو ڕکات نوێژ هەستایەوە[2]

**٧٣٩- نافیع دەڵێ: عەبدولّای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ دەستی بە نوێژ بکردایە الله أکبری دەکرد و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، وە کاتێ کڕنوشی ببردایە**

---

[1] بڕوانە: ٧٣٥.

[2] پاش خوێندن و تەواوکردنی تەحیاتی یەکەم.

هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، کاتێکیش دەیوت: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))، دەستەکانی بەرز دەکردەوە وە کاتی هەڵدەستایەوە لە دوو ڕکات هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، (نافیع دەڵێ:) عەبدوڵا ئەم دەستبەرزکردنەوانەی دەگێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ (کە وای کردووە). وە ئەم فەرموودەیە بەم ڕێگەش گێڕدراوەتەوە: حەمادی کوڕی سەلەمە لە ئەیوبەوە گێڕاویەتەوە، ئەویش لە نافیعەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ. هەروەها ئیبنو تەهمان لە ئەیوب و مووسای کوڕی عوقبەوە بەکورتی گێڕاویەتەوە.

## ٨٧- بابُ وَضْعِ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى فِي الصَّلَاةِ

٧٤٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ عَنْ مَالِكٍ عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُؤْمَرُونَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذِرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلَاةِ. قَالَ أَبُو حَازِمٍ: لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ يَنْمِي ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ إِسْمَاعِيلُ: يُنْمَى ذَلِكَ. وَلَمْ يَقُلْ: يَنْمِي.

## ٨٧- باسی دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ

٧٤٠- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: خەڵکی فەرمانیان پێ دەکرا لە نوێژدا نوێژکەر دەستی ڕاستی لەسەر باسکی (قۆڵی) چەپی دانێت. ئەبو حازم دەڵێ: وا نازانم سەهل ئەمە بڵێ ئیللا دەیدایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، ئیسماعیل دەڵێ: ئەوە دەدرایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، نەیووتوە دەیدایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ.

## ٨٨- بابُ الْخُشُوعِ فِي الصَّلَاةِ

٧٤١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «هَلْ تَرَوْنَ قِبْلَتِي هَا هُنَا؟ وَاللَّهِ مَا يَخْفَى عَلَيَّ رُكُوعُكُمْ وَلاَ خُشُوعُكُمْ، وَإِنِّي لأَرَاكُمْ وَرَاءَ ظَهْرِي»[1].

## ٨٨- باسی گەردنکەچی لە نوێژدا

**٧٤١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئایا ئێوە ڕووگەکەی من ئا لێرەوە دەبینن؟ سوێند بە خوا کڕنوش و ملکەچی ئێوە لە من ناشاردرێتەوە، وە بێگومان من لە پشتمەوە ئێوە دەبینم)).**

٧٤٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَقِيمُوا الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ بَعْدِي -وَرُبَّمَا قَالَ: مِنْ بَعْدِ ظَهْرِي - إِذَا رَكَعْتُمْ وَسَجَدْتُمْ»[2].

**٧٤٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کڕنوش و سوژدە بەرێکوپێکی ببەن، چونکە سوێند بە خوا دڵنیا بن من ئێوە لە دوای خۆمەوە دەبینم - وە هەندێ جار فەرموویەتی: لەپشتی خۆمەوە دەتانبینم کاتێ کڕنوش یان سوژدەتان برد)).**

---

[1] بڕوانە: ٤١٨.

[2] بڕوانە: ٤١٩.

## ٨٩- بَابُ مَا يَقرأ بَعْدَ التَّكْبِيرِ

٧٤٣- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الصَّلَاةَ بِـ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة.

## ٨٩- باسی ئەوەی نوێژکەر دوای الله أكبر دەیخوێنێ

**٧٤٣- ئەنەس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر رضي الله عنهما نوێژکردنیان بە خوێندنی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة. دەست پێ دەکرد.**

٧٤٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَارَةُ بْنُ الْقَعْقَاعِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً -قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ: هُنَيَّةً- فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ مَا تَقُولُ؟ قَالَ: ((أَقُولُ: اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ)).

**٧٤٤- ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان الله أكبر و خوێندنی فاتیحەدا کەمێك بێدەنگ دەبوو -دەڵێ وا بزانم وتی: تۆزێ بێدەنگ دەبوو- منیش وتم: دایك و باوکم بە قوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە نێوان الله أكبر و قوڕئانخوێندندا بێدەنگ دەبیت چی دەڵێی؟ فەرمووی: ((دەڵێم: خوایە نێوان من و تاوانەکانم دوور خەیتەوە، وەك چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستۆتەوە، خوایە لە تاوانەکانم پاکم کەیتەوە، وەك چۆن پۆشاکی سپی لە چڵك و چەپەڵی پاك دەکرێتەوە، خوایە تاوانەکانم بشۆری بە ئاو و بەفر و تەرزە)).**

## ٩٠- بابٌ

٧٤٥- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ؛ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى صَلاَةَ الْكُسُوفِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: «قَدْ دَنَتْ مِنِّي الْجَنَّةُ حَتَّى لَوِ اجْتَرَأْتُ عَلَيْهَا لَجِئْتُكُمْ بِقِطَافٍ مِنْ قِطَافِهَا، وَدَنَتْ مِنِّي النَّارُ حَتَّى قُلْتُ: أَيْ رَبِّ، وَأَنَا مَعَهُمْ؟ فَإِذَا امْرَأَةٌ - حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ- تَخْدِشُهَا هِرَّةٌ قُلْتُ: مَا شَأْنُ هَذِهِ؟ قَالُوا: حَبَسَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ جُوعًا، لاَ أَطْعَمَتْهَا، وَلاَ أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ» -قَالَ نَافِعٌ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ:- «مِنْ خَشِيشِ -أَوْ خُشَاشِ- الأَرْضِ»[1].

## ٩٠- باسێک

**٧٤٥- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی خۆرگیرانی کرد، جا وەستانێکی زۆر و درێژ وەستا، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، پاشان وەستانێکی دوورودرێژ وەستا، پاشان کڕنوشی برد، ماوەیەکی دوورودرێژ لە کڕنوشدا بوو، پاشان بەرزبوویەوە، پاشان سوژدەی برد و زۆر لە سوژدەدا مایەوە، پاشان بەرز بۆیەوە لە سوژدە، پاشان سوژدەی برد و زۆر لە سوژدەدا بوو، پاشان هەستایەوە زۆر بەپێوە وەستا، پاشان کڕنوشی برد، لە کڕنوشدا زۆر مایەوە، پاشان بەرز بۆیەوە زۆر بەپێوە وەستا، پاشان کڕنوشی برد لە کڕنوشدا زۆر مایەوە، پاشان بەرز بۆیەوە، جا سوژدەی برد و زۆر لە سوژدەدا مایەوە، پاشان بەرز بۆیەوە، پاشان سوژدەی برد و زۆر**

[1] بڕوانە: ٢٣٦٤.

مایەوە لە سوژدەدا، پاشان کۆتایی پێ هێنا و فەرمووی: ((بەڕاستی بەهەشت ئەوەندە لێم نزیك بۆیەوە، ئەگەر بوێرایە هێشوویەك لە هێشووەکانی میوەی بەهەشتم دەهێنا بۆتان، دۆزەخیش ئەوەندە نزیك بۆیەوە لێم هەتا وتم: ئەی پەروەردگار منیش لەگەڵ دۆزەخییانم؟ جا بینیم ئافرەتێك -وا بزانم وتی:- پشیلەیەك بە چڕنووك تێی بەربووە، وتم: ئەم پشیلەیە چییەتی؟ وتیان: ئەو ئافرەتە لە دونیا بەندی کردبوو هەتا لە برسا مرد، نە خۆی خواردنی پێ دا، نە بەڕەڵاشی کرد خۆی شت بخوات)). - نافیع دەڵێ: وا بزانم وتی- لە جرِوجانەوەری -یان مێرووی- سەر زەوی (بخوات))).

## ٩١- بابُ رَفْعِ البَصَرِ إِلَى الإِمَامِ فِي الصَّلَاةِ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي صَلَاةِ الكُسُوفِ: ((فَرَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا حِينَ رَأَيْتُمُونِي تَأَخَّرْتُ))[١].

٧٤٦- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: قُلْنَا لِخَبَّابٍ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْنَا: بِمَ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ ذَاكَ؟ قَالَ: بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ[٢].

## ٩١- باسی نوێژکەر لە نوێژدا چاوی بەرز کاتەوە و بۆ ئیمام (بڕوانێ)

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی نوێژی خۆرگیران فەرمووی: ((جا کاتێ منتان بینی هاتمە دواوە دۆزەخم بینی بەشێکی بەشەکەی دیکەی تێك دەشکاند)).

---

[١] بڕوانە: ١٠٤٤.

[٢] بڕوانە: ٧٦٠، ٧٦١، ٧٧٧.

**٧٤٦- ئەبو مەعمەر دەڵێ: بە خەبابمان وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قوڕئانی دەخوێند (لەدوای فاتیحەوە)؟ وتی: بەڵێ، وتمان: ئێوە بە چیدا ئەوەتان دەزانی؟ وتی: بە جوڵانەوەی ڕیشیدا ﷺ.**

٧٤٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَنْبَأَنَا أَبُو إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ يَخْطُبُ قَالَ: حَدَّثَنَا الْبَرَاءُ -وَكَانَ غَيْرَ كَذُوبٍ- أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا صَلَّوْا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَرَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَامُوا قِيَامًا، حَتَّى يَرَوْنَهُ قَدْ سَجَدَ[1].

**٧٤٧- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵای کوڕی یەزید بوو وتاری دەدا و دەیوت: بەڕاو ﷺ بۆی گێڕاینەوە -وە بەڕاو درۆزن نەبوو- کە بێگومان ئەوان ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژیان بکردایە و سەری بەرز بکردایەوە لە کڕنوش، هاوەڵان بەپێوە دەوەستان هەتا پێغەمبەریان ﷺ دەبینی سوژدەی دەبرد.**

٧٤٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلُ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ، ثُمَّ رَأَيْنَاكَ تَكَعْكَعْتَ. قَالَ: «إِنِّي أُرِيتُ الْجَنَّةَ، فَتَنَاوَلْتُ مِنْهَا عُنْقُودًا، وَلَوْ أَخَذْتُهُ لَأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا»[2].

**٧٤٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا و پێغەمبەر ﷺ نوێژی خۆرگیرانی کرد، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆمان بینی لە شوێنی خۆتەوە دەستت برد بۆ شتێ، پاشان**

[1] بڕوانە: ٦٩٠.

[2] بڕوانە: ٢٩.

**تۆمان دى گەڕایتە دواوە؟ فەرمووى: ((بێگومان من بەهەشتم نیشان درا، دەستم برد بۆ هێشوویەك ترێ، ئەگەر بمهێنایە هەتا دونیا ماوە لێتان دەخوارد)).**

٧٤٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ قَالَ: حَدَّثَنَا هِلاَلُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّى لَنَا النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ رَقَا الْمِنْبَرَ، فَأَشَارَ بِيَدَيْهِ قِبَلَ قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ ثُمَّ قَالَ: «لَقَدْ رَأَيْتُ الآنَ مُنْذُ صَلَّيْتُ لَكُمُ الصَّلاَةَ الجَنَّةَ وَالنَّارَ مُمَثَّلَتَيْنِ فِي قِبْلَةِ هَذَا الْجِدَارِ، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ» ثَلاَثًا[1].

**٧٤٩- ئەنەسى کوڕى مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژى بۆ کردین، پاشان چووە سەر دوانگەکە، جا بە دەستى ئاماژەى کرد بەرەو ڕووگەى مزگەوتەکە، پاشان فەرمووى: ((سوێند بە خوا بێگومان هەر ئێستا لەو کاتەوە پێشنوێژیم کرد بۆتان بەهەشت و دۆزەخم بینى بەئاشکرا و بەبەرچاومەوە لەبەردەم ئەو دیوارەدا، جا هیچ کات لە چاکە و خراپەدا ڕۆژى وەك ئەمڕۆم نەدیوە))، سێ جار ئەم وتەى دووبارە کردەوە.**

## ٩٢- بابُ رَفْعِ البَصَرِ إِلى السَّمَاءِ فِي الصَّلاةِ

٧٥٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَرُوبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُمْ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلاَتِهِمْ؟!» فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذَلِكَ حَتَّى قَالَ: «لَيَنْتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ».

---

[1] بڕوانە: ٩٣.

## ٩٢- باسی چاوبەرزكردنەوە بۆ ئاسمان لە نوێژدا (ناپەسەندە)

**٧٥٠- قەتادە دەڵێ: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕاینەوە و وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوە خەڵكانێك چییانە لە نوێژەكانیاندا چاویان بەرز دەكەنەوە بۆ ئاسمان!))، جا لەو بارەیەوە قسەی توندی كرد، هەتا فەرمووی: ((سوێند بێ، یان واز لەو چاوبەرزكردنەوەیە دێنن، یان چاویان یەكسەر بەخێرایی كوێر دەكرێ)).**

## ٩٣- بابُ الاِلْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ

٧٥١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَشْعَثُ بْنُ سُلَيْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الاِلْتِفَاتِ فِي الصَّلاَةِ، فَقَالَ: «هُوَ اخْتِلاَسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلاَةِ الْعَبْدِ»[1].

## ٩٣- باسی لاكردنەوە (ئاوڕدانەوە) لە كاتی نوێژكردندا (ناپەسەندە)

**٧٥١- عائیشە ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی لاكردنەوە لە نوێژدا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو لاكردنەوەیە دزییەكە كە شەیتان لە نوێژی بەندەی موسوڵمان دەیدزێت)).**

٧٥٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلاَمٌ فَقَالَ: «شَغَلَتْنِي أَعْلاَمُ هَذِهِ، اذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةٍ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٢٩١.

[2] بڕوانە: ٣٧٣.

٧٥٢- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە پۆشاکێکەوە کە نەخش و نیگاری هەبوو نوێژی کرد، ئینجا فەرمووی: ((ئەم پۆشاکە بێئاگای کردم، ئەم پۆشاکە ببەن بۆ ئەبو جەهم و پۆشاکێکی ئەستوری سادەم بۆ بێنن)).

## ٩٤- بابٌ: هَلْ يَلْتَفِتُ لِأَمْرٍ يَنْزِلُ بِهِ، أَوْ يَرَى شَيْئًا أَوْ بُصَاقًا فِي الْقِبْلَةِ؟!

وَقَالَ سَهْلٌ: التَفَتَ أَبُو بَكْرٍ ﵁ فَرَأَى النبِيَّ ﷺ.

٧٥٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، وَهْوَ يُصَلِّي بَيْنَ يَدَيِ النَّاسِ، فَحَتَّهَا ثُمَّ قَالَ حِينَ انْصَرَفَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا كَانَ فِي الصَّلاَةِ فَإِنَّ اللَّهَ قِبَلَ وَجْهِهِ، فَلاَ يَتَنَخَّمَنَّ أَحَدٌ قِبَلَ وَجْهِهِ فِي الصَّلاَةِ». رَوَاهُ مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، وَابْنُ أَبِي رَوَّادٍ، عَنْ نَافِعٍ[1].

## ٩٤- باسێک: ئایا نوێژکەر لا دەکاتەوە ئەگەر کارێکی بۆ پێش هات، یان شتێک ببینێ یان بەڵغەمی بینی لە قیبلەکەیدا؟!

سەهل دەڵێ: ئەبو بەکر ﵁ لای کردەوە و پێغەمبەری ﷺ بینی.

٧٥٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەڵغەمێکی لە ڕووگەی مزگەوتدا بینی، لە کاتێکدا پێشنوێژی دەکرد لەبەردەم خەڵکەکەوە، بە بەردێك کڕاندی، جا کە لەنوێژەکە بۆیەوە فەرمووی: ((بێگومان ئەگەر کەسێکتان لەنێو نوێژدا بوو، ئەوە بێگومان خوای گەورە بەرامبەرێتی، کەواتە با هیچ کەس بەڵغەم فڕێ نەداتە بەردەمی خۆیەوە لەنێو نوێژدا)). (ئەم فەرموودەیە جگە لە لەیس) هەریەك لە مووسای کوڕی عوقبە و ئیبنو ئەبو ڕەواد لە نافیعەوە گێڕاویانەتەوە.

---

[1] بڕوانە: ٤٠٦.

٧٥٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا لَيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسٌ قَالَ: بَيْنَمَا الْمُسْلِمُونَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ لَمْ يَفْجَأْهُمْ إِلاَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَشَفَ سِتْرَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمْ وَهُمْ صُفُوفٌ، فَتَبَسَّمَ يَضْحَكُ، وَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ لَهُ الصَّفَّ، فَظَنَّ أَنَّهُ يُرِيدُ الْخُرُوجَ، وَهَمَّ الْمُسْلِمُونَ أَنْ يَفْتَتِنُوا فِي صَلاَتِهِمْ، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ، فَأَرْخَى السِّتْرَ، وَتُوُفِّيَ مِنْ آخِرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ[1].

**٧٥٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا موسوڵمانان لە نوێژی بەیانیدا بوون، هەر ئەوەندەیان زانی لەپڕ پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی عائیشەکەی لادا، سەیری کرد هاوەڵان ڕیز بووبوون (نوێژیان دەکرد)، جا زەردەخەنەیەکی کرد و پێ کەنی، ئەبوبەکریش گەڕایەوە بۆ دواوە تا بگاتە ڕیزەکە، چونکە وای زانی پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ لە ماڵ بێتەدەر (بۆ نوێژ)، موسوڵمانانیش خەریك بوو ئاگایان لە خۆیان نەمێنێ لە نوێژەکەیاندا (لە خۆشییاندا کە پێغەمبەر ﷺ چاك بۆتەوە)، جا پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردن کە نوێژەکەتان تەواوکەن، ئینجا پەردەکەی دادایەوە، وە لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد.**

## ٩٥- بابُ وُجُوبِ القِرَاءَةِ لِلإِمَامِ وَالْمَأْمُومِ فِي الصَّلَوَاتِ كُلِّهَا، فِي الحَضَرِ وَالسَّفَرِ، وَمَا يُجْهَرُ فِيهَا وَمَا يُخَافَتُ

٧٥٥- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: شَكَا أَهْلُ الْكُوفَةِ سَعْدًا إِلَى عُمَرَ ﷺ، فَعَزَلَهُ وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ عَمَّارًا، فَشَكَوْا حَتَّى ذَكَرُوا أَنَّهُ لاَ يُحْسِنُ يُصَلِّي، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَقَالَ: يا أَبَا إِسْحَاقَ، إِنَّ هَؤُلاَءِ يَزْعُمُونَ أَنَّكَ لاَ تُحْسِنُ تُصَلِّي. قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: أَمَّا أَنَا وَاللَّهِ فَإِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي بِهِمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا

---

[1] بڕوانە: ٦٨٠.

أَخْرِمُ عَنْهَا، أُصَلِّي صَلاَةَ الْعِشَاءِ فَأَرْكُدُ فِي الأُولَيَيْنِ، وَأُخِفُّ فِي الأُخْرَيَيْنِ. قَالَ: ذَاكَ الظَّنُّ بِكَ يا أَبَا إِسْحَاقَ. فَأَرْسَلَ مَعَهُ رَجُلًا أَوْ رِجَالًا إِلَى الْكُوفَةِ، فَسَأَلَ عَنْهُ أَهْلَ الْكُوفَةِ، وَلَمْ يَدَعْ مَسْجِدًا إِلاَّ سَأَلَ عَنْهُ، وَيُثْنُونَ مَعْرُوفًا، حَتَّى دَخَلَ مَسْجِدًا لِبَنِي عَبْسٍ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ: أُسَامَةُ بْنُ قَتَادَةَ يُكْنَى أَبَا سَعْدَةَ قَالَ: أَمَّا إِذْ نَشَدْتَنَا فَإِنَّ سَعْدًا كَانَ لاَ يَسِيرُ بِالسَّرِيَّةِ، وَلاَ يَقْسِمُ بِالسَّوِيَّةِ، وَلاَ يَعْدِلُ فِي الْقَضِيَّةِ. قَالَ سَعْدٌ: أَمَا وَاللَّهِ لأَدْعُوَنَّ بِثَلاَثٍ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ عَبْدُكَ هَذَا كَاذِبًا، قَامَ رِيَاءً وَسُمْعَةً، فَأَطِلْ عُمْرَهُ، وَأَطِلْ فَقْرَهُ، وَعَرِّضْهُ بِالْفِتَنِ. وَكَانَ بَعْدُ إِذَا سُئِلَ يَقُولُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَفْتُونٌ، أَصَابَتْنِي دَعْوَةُ سَعْدٍ. قَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ: فَأَنَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ قَدْ سَقَطَ حَاجِبَاهُ عَلَى عَيْنَيْهِ مِنَ الْكِبَرِ، وَإِنَّهُ لَيَتَعَرَّضُ لِلْجَوَارِي فِي الطُّرُقِ يَغْمِزُهُنَّ[1].

## ٩٥- باسی واجبە ئیمام و ئەوەی لە دوایەوەیە لە هەموو نوێژەکاندا فاتیحە بخوێنن، چ لە ماڵدا بێ یان لە سەفەردا، لەو نوێژانەدا بێ کە دەنگی تێدا بەرز دەکرێتەوە یان دەنگی تێدا بەرز ناکرێتەوە

**٧٥٥- جابیری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: خەڵکی کوفە لەلای عومەر ﷺ سکاڵایان لە سەعد ﷺ کرد، عومەریش لای برد و عەماری کرد بە بەرپرسیان، سکاڵای سەعدیان کرد هەتا ئەو ڕادەی وتیان نازانێ بەچاکی نوێژ بکات، عومەریش کەسێکی نارد بەشوێنیدا (و هات)، عومەر پێی وت: ئەبو ئیسحاق[2] بەڕاستی ئەو خەڵکە ڕایان وایە تۆ نازانی بەچاکی نوێژ بکەیت بۆیان! ئەبو ئیسحاقیش وتی: دەی سوێند بە خوا من نوێژی پێغەمبەر ﷺ چۆنە ئاوا نوێژیان بۆ دەکەم و هیچی لێ کەم ناکەم، نوێژی عیشا دەکەم (بەم شێوە:) لە دوو ڕکاتی یەکەمدا**

---

[1] بڕوانە: ٧٥٨، ٧٧٠.

[2] کە نازناوی سەعد بوو، لە زمانی عەرەبیدا بە نازناو کەسەکان ناو دەبەن و بانگیان دەکەن.

زۆر (قورئان دەخوێنم و) بەپێوە دەوەستم، لەدوو ڕکاتی کۆتاییدا کورتی دەکەمەوە، عومەر وتی: هەر ئەوە گومانمان بوو دەربارەت (کە نوێژ بەچاکی دەکەیت بۆیان)، ئینجا عومەر پیاوێك یان چەند پیاوێکی نارد لەگەڵیدا بۆ کوفە و پرسیاری لە خەڵکی کوفە کرد، مزگەوت نەما ئەو پیاوەی (عومەر ناردبووی) پرسیار لەخەڵکەکەی نەکات دەربارەی سەعد، هەموویان وەسف و سەنایان کرد، هەتا ڕۆیشتە مزگەوتی خێڵی عەبس (پرسیاری کرد لەبارەی سەعدەوە)، پیاوێك لەنێویاندا هەستایەوە کە پێی دەوترا ئوسامەی کوڕی قەتادە، نازناوەکەی ئەبو سەعدە بوو، (ئەو پیاوە) وتی: کە مادام سوێندت داین (کە قسەی هەق بڵێین لەسەری)، بێگومان سەعد لەگەڵ سوپا ناڕوات (خۆی دەدزێتەوە)، وە دەستکەوت و سامان بەیەکسانی دابەش ناکات، وە لە قەزاوەتدا بەدادگەرانە بڕیار نادات، سەعدیش وتی: دەسا بە خوا منیش سێ دوعای لێ دەکەم: خوایە گیان ئەگەر ئەم بەندەی تۆ درۆزنە و لەبەر ڕیا و ناوبانگی هەستاوە (ئەم قسانە دەکات)، ئەوە تەمەنی درێژ بکەیت، ماوەیەکی دووروودرێژ هەژاری کەیت و تووشی جۆرەها بەڵا و تاقیکردنەوەی بکەیت، جا پاشان ئەو کابرایە کە پرسیاری لێ بکرایە دەیوت: پیرێکی بەساڵاچووی تووش بوو بە بەڵاو سەرلێشێواوم، دوعا و نزاکەی سەعد گیرا بووە لێم. عەبدولەلیك دەڵێ: من بۆ خۆم ئەو پیاوەم بینی ئەوەندە پیر بووبوو، برۆکانی هاتبوون بەسەر چاوەکانیدا، وە ڕێی بە کەنیزەك دەگرت و دەستی بۆ دەبردن لە ڕێگادا!

٧٥٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٣٩٤.

**٧٥٦- عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس سووڕەتی فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نییە)).**

٧٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَرَدَّ وَقَالَ: «ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». فَرَجَعَ يُصَلِّي كَمَا صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». ثَلاَثًا. فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ فَعَلِّمْنِي. فَقَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، وَافْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا»[١].

**٧٥٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مزگەوت، جا پیاوێکیش هاتە مزگەوت و نوێژی کرد، ئینجا هات و سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە و فەرمووی: ((بگەڕێوە نوێژەکەت بکە، چونکە بەڕاستی نوێژت نەکردووە!))، ئەویش گەڕایەوە نوێژی کرد وەك چۆن پێشتر نوێژی کرد، پاشان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سەلامی لێ کرد، پێغەمبەر ﷺ سێ جار فەرمووی: ((بڕۆ نوێژەکەت بکە، چونکە بێگومان نوێژت نەکردووە))، پیاوەکەش وتی: سوێند بەو زاتەی تۆی بەهەق ناردووە لەوە چاکتر نازانم (نوێژ بکەم)، کە وا بوو فێرم بکە! فەرمووی: ((کاتێ هەستای نوێژ بکەیت الله أكبر بکە، پاشان لەوەی کە لەبەرتە لە قوڕئان هەندێکی لێ بخوێنە، پاشان کڕنوش ببە و بوەستە تا لاشەت لە جوڵە دەوەستێت، پاشان بەرز بەرەوە بەجۆرێك هەتا**

---

[١] بڕوانە: ٧٩٣، ٦٢٥١، ٦٢٥٢، ٦٦٦٧.

تەواو ڕاست دەبيتەوە، پاشان سوژدە ببە (و بوەستە) هەتا لاشەت لە جوڵە دەكەوێت لە سوژدەدا، پاشان بەرز بەرەوە لە سوژدە و بوەستە هەتا لاشەت لە جوڵە دەكەوێت بە دانيشتنەوە، جا ئەمە بكە لە هەموو ڕكاتەكانى نوێژەكەتدا)).

## ٩٦- بابُ القِرَاءَةِ فِي الظُّهْرِ

٧٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ سَعْدٌ: كُنْتُ أُصَلِّي بِهِمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلاَتَيِ الْعَشِيِّ لاَ أَخْرِمُ عَنْهَا، أَرْكُدُ فِي الأُولَيَيْنِ، وَأَحْذِفُ فِي الأُخْرَيَيْنِ. فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: ذَلِكَ الظَّنُّ بِكَ[1].

## ٩٦- باسى قورئانخوێندن لە نوێژى نيوەڕۆدا

**٧٥٨- جابيرى كوڕى سەمورە دەڵێ: سەعد ﷺ وتى: من پێشنوێژى نيوەڕۆ و عەسريان بۆ دەكەم وەك پێشنوێژى پێغەمبەرى خوا ﷺ هيچى لێ كەم ناكەمەوە، (لە نوێژە چوار ڕكاتييەكاندا) دوو ڕكاتى يەكەم درێژە پێ دەدەم و دوو ڕكاتى دووەم كورت دەكەمەوە، جا عومەريش وتى: هەر ئەو گومانە (چاكە) بە تۆ دەبردرێ.**

٧٥٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ، وَيُسْمِعُ الآيَةَ أَحْيَانًا، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي الْعَصْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى، مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٥٥.

[2] بڕوانە: ٧٦٢، ٧٧٦، ٧٧٨، ٧٧٩.

**٧٥٩- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا سوورەتی فاتیحە و دوو سوورەتی دەخوێند، ڕکاتی یەکەمی درێژ دەکرد و ڕکاتی دووەمی کورت دەکرد، هەندێ جار ئایەتێکی لێ دەبیسترا (ئەوەندە دەنگی بەرز دەکردەوە)، وە لە نوێژی عەسردا سوورەتی فاتیحە و دوو سوورەتی دەخوێند، لە ڕکاتی یەکەمیاندا درێژەی پێ دەدا، هەروەها ڕکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی درێژە پێ دەدا و ڕکاتی دووەمی کورت دەکردەوە.**

٧٦٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنِي عُمَارَةُ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: سَأَلْنَا خَبَّابًا: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ نَعَمْ. قُلْنَا بِأَيِّ شَيْءٍ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ؟ قَالَ: بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ[1].

**٧٦٠- ئەبو مەعمەر دەڵێ: پرسیارمان لە خەباب ﷺ کرد: ئایا پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا (دوای سوورەتی فاتیحە) قوڕئانی دەخوێند؟ وتی: بەڵێ، وتمان: بە چیدا ئێوە دەتانزانی؟ وتی: بە جوڵانەوەی ڕیشیدا.**

## ٩٧- بابُ القِرَاءَةِ فِي العَصْرِ

٧٦١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: قُلْتُ لِخَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالعَصْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: قُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ قِرَاءَتَهُ؟ قَالَ: بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٤٦.

[2] بڕوانە: ٧٤٦.

## ٩٧- باسی قورئانخوێندن لە نوێژی عەسردا

**٧٦١- ئەبو مەعمەر دەڵێ: بە خەبابی کوڕی ئەڕەتم وت: ئایا پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا (دوای سوورەتی فاتیحە) قورئانی دەخوێند؟ وتی: بەڵێ، وتمان: بە چیدا ئێوە دەتانزانی؟ وتی: بە جووڵانەوەی ڕیشیدا.**

٧٦٢- حَدَّثَنَا المَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَسُورَةٍ سُورَةٍ، وَيُسْمِعُنَا الآيَةَ أَحْيَانًا[1].

**٧٦٢- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتی (یەکەمی) نیوەڕۆ و عەسردا سوورەتی فاتیحە و دوو سوورەتی دەخوێند، وە هەندێك جار ئایەتێکمان لێ دەبیست (ئەوەندە دەنگی بەرز دەکردەوە).**

## ٩٨- بابُ القِرَاءَةِ فِي المَغْرِبِ

٧٦٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ أُمَّ الْفَضْلِ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ۝١﴾ المرسلات، فَقَالَتْ:يا بُنَيَّ، وَاللَّهِ لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لَآخِرُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهَا فِي الْمَغْرِبِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٥٩.

[2] بڕوانە: ٤٤٢٩.

## ٩٨- باسی قورئانخوێندن لە نوێژی مەغریبدا

**٧٦٣- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کە ئومولفەزل گوێی لێ بوو (عەبدوڵا) سووڕەتی: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ۝١ ﴾ی دەخوێند، جا ئومولفەزل وتی: کوڕە شیرینەکەم وەڵاهی بەم سووڕەتەی خوێندت بیرت خستمەوە کە ئەمە کۆتا سووڕەت بوو لە پێغەمبەرم ﷺ بیست کە لە نوێژی مەغریبدا خوێندی.**

٧٦٤- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ قَالَ: قَالَ لِي زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: مَا لَكَ تَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِقِصَارٍ، وَقَدْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ بِطُولِ الطُّولَيَيْنِ؟!

**٧٦٤- مەڕوانی کوڕی حەکەم دەڵێ: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ پێی وتم: ئەوە چییە لە نوێژی مەغریبدا سووڕەتی کورت دەخوێنی، لە کاتێکدا گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە دوو سووڕەت کە درێژترینی سووڕەتە درێژەکان بوون دەیخوێند؟!**

## ٩٩- بابُ الجَهْرِ فِي المَغْرِبِ

٧٦٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ[1].

## ٩٩- باسی (حوکمی) دەنگبەرزکردنەوە لە نوێژی مەغریبدا

**٧٦٥- موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم لە جوبەیری باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژی مەغریبدا سووڕەتی: (والطُّورِ)ی خوێند.**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٥٠، ٤٠٢٣، ٤٨٥٤.

## ١٠٠- بابُ الجَهْرِ فِي العِشَاءِ

٧٦٦- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ بَكْرٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ الْعَتَمَةَ فَقَرَأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الانشقاق، فَسَجَدَ، فَقُلْتُ لَهُ، قَالَ: سَجَدْتُ خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ، فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ[1].

## ١٠٠- باسی دەنگبەرزکردنەوە لە نوێژی عیشادا

**٧٦٦- ئەبو ڕافیع دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا ﷺ نوێژی عیشام کرد، جا سووڕەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ی خوێند و سوژدەی برد، (دواتر) پێم وت: (بۆ سوژدەت برد؟)، وتی: لەدوای ئەبولقاسمەوە ﷺ سوژدەم بردووە، کەواتە هەتا دەگەم بە خزمەتی (لە قیامەتدا)، بەردەوام ئەم سوژدەیە دەبەم (کاتێ ئەم سووڕەتە بخوێنم).**

٧٦٧- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيٍّ قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي سَفَرٍ فَقَرَأَ فِي العِشَاءِ فِي إِحْدى الرَّكْعَتَيْنِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ[2].

**٧٦٧- بەڕا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا بوو، جا لە نوێژی عیشادا لە یەکێك لە دوو ڕکاتەکە (ی یەکەم)دا سووڕەتی (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی خوێند.**

## ١٠١- بابُ القِرَاءَةِ فِي العِشَاءِ بِالسَّجْدَةِ

٧٦٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ قَالَ: حَدَّثَنِي التَّيْمِيُّ، عَنْ بَكْرٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ الْعَتَمَةَ فَقَرَأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الانشقاق،

---

[1] بڕوانە: ٧٦٨، ١٠٧٤، ١٠٧٨.

[2] بڕوانە: ٧٦٩، ٤٩٥٢، ٧٥٤٦.

فَسَجَدَ، فَقُلْتُ مَا هَذِهِ؟ قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ[1].

## ١٠١- باسی قورئانخوێندن لە نوێژی عیشادا لەگەڵ (ئەو سوورەتەی) سوژدەی تێدایە

**٧٦٨- ڕافیع دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا ﷺ نوێژی عیشام کرد جا سوورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ی خوێند و سوژدەی برد، منیش وتم: ئەم سوژدەبردنە چییە؟ وتی: لەدوای ئەبولقاسمەوە ﷺ ئەم سوژدەم بردووە، جا هەتا بە خزمەتی دەگەم (لە ڕۆژی دواییدا)، بەردەوام ئەم سوژدەیە دەبەم (کاتێ ئەم سوورەتە بخوێنم).**

## ١٠٢- بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي الْعِشَاءِ

٧٦٩- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ، سَمِعَ الْبَرَاءَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ۝١﴾ التين، فِي العِشَاءِ، وَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ صَوْتًا مِنْهُ أَوْ قِرَاءَةً[2].

## ١٠٢- باسی قورئانخوێندن لە نوێژی عیشادا

**٧٦٩- عەدی کوڕی سابیت دەگێڕێتەوە کە لە بەڕائی ﷺ بیستووە دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست لە نوێژی عیشادا: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ۝١﴾ی دەخوێند، وە**

---

[1] بڕوانە: ٧٦٦.

[2] بڕوانە: ٧٦٧.

گوێم لە کەس نەبووە ئەوەندەی ئەو دەنگی خۆش بێت، یان قورئانخوێندنی خۆش بێت.

## ١٠٣- بابٌ: يُطَوِّلُ فِي الأُولَيَيْنِ وَيَحْذِفُ فِي الأُخْرَيَيْنِ

٧٧٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي عَوْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ عُمَرُ لِسَعْدٍ: لَقَدْ شَكَوْكَ فِي كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى الصَّلاَةِ. قَالَ: أَمَّا أَنَا فَأَمُدُّ فِي الأُولَيَيْنِ وَأَحْذِفُ فِي الأُخْرَيَيْنِ، وَلاَ آلُو مَا اقْتَدَيْتُ بِهِ مِنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قَالَ صَدَقْتَ، ذَاكَ الظَّنُّ بِكَ، أَوْ ظَنِّي بِكَ[1].

## ١٠٣- باسێک: پێشنوێژ (لە دوو ڕکاتی یەکەمی عیشادا) درێژەی پێ دەدات، لە دوو ڕکاتەکەی کۆتاییدا (دوای فاتیحە) هیچ ناخوێنێ

٧٧٠- جابیری کوڕی سەمورە دەڵێ: عومەر بە سەعدی وت: ﷺ بەڕاستی (خەڵکی کوفە) دەربارەی هەموو شتێك سکاڵا دەکەن لە دەستت هەتا لە نوێژکردنیشت! سەعد وتی: بەڵام من دوو ڕکاتی یەکەم (ی عیشا) درێژ دەکەمەوە (قورئانی زۆریان تێدا دەخوێنم)، وە لە دوو ڕکاتی کۆتاییدا (دوای فاتیحە) هیچ ناخوێنم، هیچ ناتەواوییەك ناکەم لە پەیڕەوکردن لە پێشنوێژی پێغەمبەری خوادا ﷺ، عومەر وتی: ڕاست دەکەیت، هەر ئەو گومانە (چاکە) بە تۆ دەبرێت، یان هەر ئەوەش گومانی منە بە تۆ.

---

[1] بڕوانە: ٧٥٥.

# پێڕستی بەرگی یەکەم

## ٣- پەڕاوی زانست و زانیاری ٩٧

## ٤- پەڕاوی دەستنوێژ ١٧٦

## ٥- پەڕاوى خۆشۆردن ٢٦١

## ٧- پەڕاوی تەیەمموم ٣٢٣

## ٨- پەڕاوی نوێــژ ٣٤١

## ٩- پەڕاوی کاتەکانی نوێژ ٤٧٢

## ١٠- پەڕاوی بانگدان ٥٢٩